# پەنجەکان یەکتری ئەشکێنین

## دیوی ناوەوەی رووداوەکانی کوردستانی عیراق ١٩٧٩-١٩٨٣

نەوشیروان مستەفا ئەمین

توتە، برای توتە، بالاّبەرزە، دۆشاومژە، ئەسپێکوژە، پێنج برا بوون.
توتە وتی: بابچین بۆ دزی !
برای توتە: لەکوێ؟
بالاّ بەرزە وتی : لە ماڵی خوا!
دۆشاومژە: حەرامە.
ئەسپێکوژە وتی: لە دینی ئێمەدا هیچ شتێ حەرام نیە.
لە ناو خۆیان دا بو بە شەڕیان، چواریان یەك کەوتن بۆ ڕاونانی پێنجەم.

١٩٩٧

# ناوەرۆک


١ . نیوەی یەکەمی ٧٩ (ل ٧ - ٣٤)
پنکەی ناوزەنگ. کۆمەڵە و کاری فیکری. کۆمەڵە و کاروباری ڕێکخراوەیی. کۆبونەوەی کومیتەی سەرکردایەتی. تیهران لە دوا قۆناغی ئینقیلاب دا. گەڕانەوەی حدکا. گەڕانەوەی ئیمام خومەینی. پادگانی مەهاباد. نەورۆزی سنە. شەڕی نەغەدە. حشع: ئاردی ناو دڕک. جیابونەوەی بزوتنەوە. سیروان و زیرینجو.

٢. بە بۆنەی مردنی مەلا مستەفاوە: مەلایی و جەلالی لە تەرازودا. (ل ٣٥ - ١١٦)

٣. نیوەی دوەمی ٧٩ (ل ١١٧ - ١٤٥)
خۆدزینەوە. کوچەی عەرەب. تەقویمی ئیرانی. بۆردومان. ڕێگای حەشیشە. سەفەری مامجەلال بۆ تاران. هاتنی صەددام. «وەحدە» ی سوریا و عیراق. کەلکی باریکی. شەڕی ٣ مانگەی کوردستان. دادگاکانی خالخالی. ناوبژی مامجەلال. هەیئەتی نوماینەدگی خەلکی کورد. خواستەکانی کورد. پیکهینانی حسک. گفتوگۆی حسک - بەعس. شەفیق و قورەبەرازە. کیشەی سیجن. کۆنگرەی نۆهەمی پارتی. دەیفید هیرست لە ناوزەنگ. کاری بەرەیی.

٤. سالی ٨٠ (ل ١٤٧ - ١٨٠)
کۆنگرەی چوارەمی حدکا. کۆبونەوەی لە تیرمینالی فڕۆکەوە بۆ چاپەری ستور. سەرکردایەتی یەکێتی. یەکیتی و حدکا. سەفەری مامجەلال بۆ دەرەوە. «علاقاتی امی». دامەزراندنی رادیو. نەخۆشخانە. بۆردومان. زیندان. دروستکردنی خانوی تازە. گرتنی بیگانە. گروهی حەوت نەفەر. جەنگی عیراق - ئیران. شەڕی ڕاگەیاندن. هاتنی لەشکری پارتی بۆ دولەتو. جوقد و جود. جەمیل ڕەنجبەر و پیرانە ڕەش. ستاری سەعید خەلەف. بەربونەوە لە چلهەمین فرین دا.

٥. سالی ٨١ (ل ١٨١ - ٢٣٢)

بۆچی چوم و توشی چی بوم. کاروباری کۆمەڵە. یەکەمین کۆنفرەنسی کۆمەڵە. حدک و پدک. لاک. گەڵ. تیکچونی یەکیتی و ئیران. پشیوانی هەلومەرجی کوردستان. یەکەمین شەری جود - یەکیتی. پاسۆک و یەکیتی. حسک و یەکیتی. حشع و یەکیتی. لەشکرکیشیەکەی سەید کاکە. گەلە کۆمەکێ ی چوار قۆڵی جود. ئاکۆیەتی. هەندی وشەی جوگرافی. وەرتێ.

٦. سالی ٨٢ ( ل ٢٣٣ - ٢٧٧)

شیرکۆ و چلورەفرۆشەکان. دوەمن بە ئاش. میتەرۆلۆجی. هەولی ئاشتبونەوە. ئەنوەر حسەن و قازان. یەکیتیی نوسەرانی کوردستان. هەولیکی سەرنەکەوتو لە گەل حسک. مەیدانی ئازاد. خۆپیشاندانی شارەکان. قاسملو و ناوبژی. خواستەکانی یەکیتی. شۆرشی بی مۆسیقا. ریککەوتنی ینک - پدک. دوەمین کۆنفرەنسی کۆمەلە. پیکهینانی یەکیتی شۆرشگیران. هیزی پشتیوان. پیکهینانی مەلبەندەکان. یەکیتی و حکومەت. سۆشیال دیموکرات. تۆری پەیوەندی بیتەل. تەفسیری قورئان.

٧. سالی ٨٣ ( ل ٢٧٩ - ٣٣٥)

ریککەوتنی ١٩ قۆلی. سەید صادق و بالاتەبران. کەمینیکی کویر. دارەکەی حسک. شەمال و باداوان. شەر لە شارباژیر. شەری یەکەمی جود. تەفسیری جود بۆ روداوەکان. ئیتیهامەکانی حشع. خۆشناوەتی. سماقولیەکان. حسەن مارگر. رقی ئافرەت. ئاژاوەی ناو ئەدیبان. شیرکۆ بیکەس. حسۆ لە جاسوسان. هاتنی مامجەلال بۆ خۆشناوەتی. جەمال تایەر. شەری دوەمی جود. هەنگوانی. شەرە جنیو بە هۆکی تۆکی. حسۆ لە کونەکۆتر. گیرانی بارزانیەکان. بەرەو ئاسۆس. بەرێ مەرگە. مەلبەندی یەک لە ناو شەری عیراق و ئیران دا. شەر لە ٣ مەیدان دا. ئازادکردنی بیتواتە. مفاوەضە لە گەل بەعس.

٨. پەلگە (ل ٣٣٧ - )

# کورتکراوەکان

پاسۆک: پارتی سوسیالیستی کورد

پدک: پارتی دیموکراتی کوردستان

توع: التجمع الوطني العراقي

جود: الجبهه الوطنیه الدیمقراطیه

جوقد: الجبهه الوطنیه والقومیه الدیمقراطیه

حاع: الحرکه الاشتراکیه العربیه

حدکا: حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئیران

حسک: حیزبی سوسیالیستی کوردستان، سەرەتا ناوی:
حیزبی سوسیالیستی یەکگرتوی کوردستان بو.

حشع: حیزبی شیوعی عیراق

کاژیک: کۆمەلەی ئازادی و ژیانەوە و یەکگرتنی کوردستان

سازکا: سازمان انقلابی زحمتکشان کردستان ایران، بە کوردی:
کۆمەلەی شۆرشگیری زەحمەتکیشانی کوردستانی ئیران

قم: قیادە موەققەتە (سەردەمی پارتی بەم ناوە ناسرا بو)

کۆزەک: کومەلەی رەنجدەرانی کوردستان

لاک: لەشکری ئیسلامی کورد

م: مەلبەند

م س: مەکتەبی سیاسی

م ع: مەکتەبی عەسکەری

م ق ث: مجلس قیادە الثورە

هـ: هەریم

ینک: یەکیتیی نیشتمانیی کوردستان

# نیوەی یەکەمی ١٩٧٩

## بنکەی ناوزەنگ

ناوزەنگ تا ئەمات ئاوەدانتر و قەرەباڵغتر ئەبو. زەلی و قولەعەرەبی بارەگایان تی دا دانرا.

لە ناوزەنگ، جگە لە مامجەلال لە ئەندامانی سەرکردایەتی: سالار، مەلابەختیار، عومەری حاجی عەبدوللا، فاضیل کەریم، هەروەها د. مەحمود عەلی عوسمان و قادر جەباری و، ژمارەیەک لە کادرەکانی کومەلە وەکو سەید کەریم، ئیبراهیم جەلال، ریباز کۆ بویونەوە. رەسول مامەندیش هات بوە زەلی. بەلام بەشداری کوبونەوەکانی سەرکردایەتی نەئەکرد. ویستمان کارەکان ریک بخەینەوە. من کاروباری کومەلەم هەلئەسوراند. سالار و جەعفەر لە گەل مامجەلال کاروباری مەکتەبی سیاسیيان ئەکرد. د. مەحمودیش لە زوری کوبونەوەکان دا بەشداری ئەکرد. لە میژ بو مەکتەبی سیاسی نوینەری بزوتنەوەی تی دا نەمابو، قادر عەزیزیان دانا بو بە نوینەری بزوتنەوە لای م س. بەلام قادر نە ئەندامی سەرکردایەتی بزوتنەوە بو، نە هی سەرکردایەتی یەکیتی. لە زوری کوبونەوەکان دا بەشداری ئەکرد، بەلام لە هەمویان دا وەکو پی یان وت بو کیشەی دروست ئەکرد و، زورجار لە گەل مامجەلال قسەیان لە یەک ئەگیرا.

کاروباری پیشمەرگە بە ملازم عومەر و راگەیاندن بە فاضیل سپیردرا.

ناوزەنگ ئاوەدانی تی دا نەبو. هەمومان لە خیوەت دا بوین. خیوەتەکان زور قەرەباڵغ بون. لە بەر ئەوە هەم مشوری خیوەتی زورترمان ئەخوارد و، هەم هی خانو دروست کردن. پیشمەرگە لادییەکان شارەزاتر و گورجوگولتر بون لە خانو دروست کردن دا. هەر زو ئەوان هەندی نوایان بو خویان ساز کرد.

من و، ملازم عومەر، حەمەسەعید، هاوری جەبار.. خیوەتیکی گەورەمان هەلدا و، لە نایلونمان گرت. نایلونیکی ئەستورمان راخست بو لە سەری ئەنوستین یەکی یەک بەتانیمان هەبو. چرای غازمان لە ئیرانەوە بو ئەمات. خیوەتەکەمان لە پال شاخەکەدا هەلدا بو، زوری پی نەچو ژیرەکەی بو بە ئاوەزی، کانیەکی تی دا تەقی بو، بە جوگا ئاوەزییەکمان بو دەرەوە بو کرد.

لە ناوزەنگ چەند جیگایەکمان دیاری کرد خانوەکانیان تی دا بکری. سالار و فاضیل مان راسپارد بو خەریکی دروستکردنی خانو بن. خانوەکان ئەگەرچی لە هەمان ناوچەدا بون، بەلام لە ٣ لای جیاوازدا دروست ئەکران. دەستەیەکیان فاضیل بو خوی و مامجەلال و د. مەحمود و، دەستەیەک سالار، بو خوی و عومەر و من و، دەستەیەک عەلی ئامەخان بو پیشمەرگەکان. هەندی لە فەرماندەی کەرتەکانی هەریمی پاریزگاریش لە نزیک ئەو بارەگایانەوە خەریک بون. شوینەکان بە ناوی سەرپەرشتیکەرەکانەوە ناو نرا بون: سالارئاوا، جەعفەرئاوا، عەلیئاوا... ئەم ناوانەمان بو خوشیی لی نابون، بەلام سالار و جەعفەر (فاضیل) پییان ناخوش بو، لە بەر ئەوە وازمان لی هینا. خانوەکان، لە گەل

خانوی تەنگ و تاریک و دواکەوتوی جوتیارەکان دا هیچ جیاوازیەکیان نەبو، بە هەمان کەرستە و هەندەسە دروستکرا بون.

*

من ئەو ماوەیە کارم زۆر بو: نوسین و سەرپەرشتی چاپ و بلاو کردنەوەی بلاوکراوەکان، بە تایبەتی وەرزنامەی «کۆمەلە». وەلامدانەوەی زوری ئەو نامانەی لە ریکخراوە نهێنیەکان و، لە هەریم و لقەکانەوە ئەگەیشتن. بینین و گفتوگۆ لە گەل ئەو کادر و پیشمەرگە و هاوولاتیانەی بۆ ئیشوکار ئەهاتن. تایپ و رۆنیوکەیشی حەمە سەعید و هاوری جیهار ئەیان کرد.

بە لامەوە گرنگ نەبو لە کوی بم، گرنگ ئەوە بو نوایەکم هەبی ستاری تی دا بگرم و ئیشەکانی تی دا بکەم. لە بەر ئەوە ئەوەندە گویم نەئەدایە شوینی ژیان و ئەوەندەیش کاتم نەبو خەریکی دروستکردنی خانو و، گیروگرفتی رۆژانەی پەیوەستیەکانی بارەگا و، پیشمەرگەکانی بم. راستیەکەی ئەرکی بارەگا لەو شاخە چۆلە زۆر بو: دابینکردنی نان و خواردەمەنی، سوتەمەنی، رایەخ و پیخەف، بەری کردنی میوان. من حەزم ئەکرد، بۆ ئەوەی لەو دەردیەسەریانە دور بم، خانوی بە کۆمەلمان هەبی پیکەوە بژین. بەلام سەبەر ئەوە بو زۆری برادەرەکان، تەنانەت هەندی لە لیپرسراوەکانیش، خویندنەوە و نوسین و چاپیان بە کاری ماندوکەر دانەنا، لایان وابو ئەمیش سەرگەرمیەکە بۆ خۆخلافاندن وەکو دامە و ئەزنیف و تاولە!

کە خانوەکمان: ژوریکی دریژ و دالانیک، سەری گیرا، هیشتا تەر بو چوینە ناویەوە. شوینەکەمان تەنگ و میوانمان زور بو. ئەو زستانە بەفر زور باری، من لە بەر دەرگای دالانەکەدا ئەنوستم.

*

ساواک لە ئیران دەسەلاتی نەما بو، خەریک بو هەلئەوەشا. بە ئاسانی بە ئیران دا هاتوچۆ ئەکرا. ئیمە ئەدرەسی هەندی لە دۆستەکانی ناو ئیرانمان نارد بو بۆ هەڤالاتی دەرەوە بۆ ئەوەی بە ریگای ئەوان دا، بۆ بەشداری لە کۆبونەوەی کۆمیتەی سەرکردایەتی دا، بگەرینەوە کوردستان. سالار بە هەمان ریگەدا گەرا بوەوە. زستانی ٧٨ - ٧٩ عومەر شیخموس، عومەر مستەفا، د. فوئاد مەعصوم، د. کەمال خۆشناو، عادل موراد گەیشتنە ناوزەنگ. کەمال و عادل هاتنە لای ئیمە. ئەوانی تریش چونە لای مامجەلال.

*

## کۆمەلە و کاری فیکری

ئەو ماوەیەی لە قەندیل بوین چەند وتاریکم نوسی بە ناوی کۆمەلەوە چاپ و بلاومان کردنەوە لەوانە:

- دەربارەی پەیوەستی بونی ریکخراوی تایبەتی چینی کریکار و رەنجدەرانی کوردستان (١٢ ل)
- مەسەلەی ئەندامەتی (٩ ل)
- ریکخستنی بنک بەهیز بکەن! ریکخستنی کەلک بەهیز بکەن و، یەکیتی بیروڕا، ویست، ریکخستن و کردەوە لە ریزەکانی دا، بە دی بهینن!

- فرمانەکانی قۆناغی ئێستای خەباتمان

ئەم زنجیرە وتارە، کە هەر یەکەیان نامیلکەیەک بو، لە ماوەیەکی کورت دا بە دوای یەک دا بڵاو کرانەوە، کارێکی باشی لە کادرەکان و، تێکرای ڕێکخستن کرد. بوژانەوەیەکی تی دا بە دی هێنان و، ڕیزەکانی یەک و یەکگرتو کردن. بەڵام ئەمانە بەس نەبون ئەبو بڵاوکراوەیەکی دەوری دەربکەین. بۆ ئەوەی «کۆمەڵە» باشتر بناسری لە ناو خەڵک دا بڕیارمان دا بڵاوکراوەکەیشمان وەکو ڕێکخراوەکەمان ناوی «کومەڵە» بێ و، هەر وەرزە ژمارەیەکی لێ دەربکەین.

«هەواڵنامە» کە بۆ دەنگوباس تەرخان کرا بو، من وتارەکانیم ئامادە ئەکرد و، سەرپەرشتی لە چاپدانیم ئەکرد، بۆ ئەوەی دەستم بۆ کۆمەڵە بەتاڵ بێ، ئیتر دەستم لەو هەڵگرت و، خۆم بۆ دەرکردنی کۆمەڵە تەرخان کرد.

*

ژمارەی یەکەمی کۆمەڵە لە وەرزی پاییزی ١٩٧٨ دا دەرچو. باس و بابەتەکانی بریتی بو لە:

سەروتار: بە بۆنەی وەرزنامەی کۆمەڵەوە (ل ١ - ٢) فاشیستەکان سوپاکەیان بۆ کوێ ئەنێرن: بۆ (جبهەی شیمالی و بانی جولان) یاخود بۆ چیاکانی کوردستان؟(ل ٣ - ٥) خەباتی گەلان: ئێران: جزیرەی ئارام یا گۆمی خوێن؟(ل ٦ - ١٢) بابەتی جۆراوجۆر: بە سەر ناوی حەمامیشەوە پیاوەتی وەها ناکرێ. خومەینی دەرئەکەن و پیشوازی لە شاهانو ئەکەن. ڕژێمی عیراق چەند مرۆڤ دۆستە. دەزگاکانی ئۆتۆنۆمیە درۆزنەکە ئەو دەسەڵاتانەی دراوەتی کە نین.(ل ١٤ - ١٥) لە دەفتەری سەروەری دا: جەمال ڕەش، بەڵگەی قارەمانەتی(ل ١٦ - ٢٣) باسێکی تیوری: چۆن مارکسیزم - لینینیزم فێر بین؟ (ل ٢٤ - ٢٩) ئازادی بۆ تێکۆشەرانی کوردستان. بژنباخی ستولیبین، بژنباخی بەعسی (ل ٣٠).

*

بو شارەزا بون لە ڕێبازی گۆڤارەکە و، مەبەست لە دەرکردنی لێرەدا سەروتاری یەکەمین ژمارەی وەکو خۆی ئەنوسمەوە:

بە بۆنەی وەرزنامەی کۆمەڵەوە

لە ڕۆژهەڵاتی ناوەراست دا نەتەوەیەک ئەژی کە نیشتمانەکەی لە دوای یەکەم جەنگی جیهانییەوە بە پێ ی قازانجە ستراتیجی، سیاسی، ئابوری و پەترولییەکانی ئیمپریالیزمی جیهانی و کۆنەپەرستی تورک، عەرەب، فارس و کورد، بێ گوێ دانە ئارەزوی دانیشتوانی ناوچەکە، بە سەر دەوڵەتەکانی تورکیا، ئێران، عیراق و سوریا دابەش کراوە.

ئەگەرچی ئەم نەتەوەیە هەموی بە سەر یەکەوە، بە ژمارە، لە هەندێک میللەت و نەتەوەی تری ڕۆژهەڵات زۆرترە و نیشتمانەکەی لە کۆن دا مەڵبەندی شارستانیتی بوە و، خاکێکی بە پیت و فەری هەیە و خۆیشی لە زۆر کۆنەوە لە پیناوی ڕزگاری دا لە خەباتێکی بێ وچانی خوێناوی دایە بە جۆرێکی ئەوتۆ کە بەشێکی گەورەی مێژوی جەنگیی ناوچەکە پێک دێت لە پێکادانی ئەم و میللەتانی دراوسێ و لەشکرەکانی بێگانە و داگیرکەر، بێ ئەوەی سەرکەوتنێکی ئەوتۆی بە دەس هێنا بێت و گەیشتبێتە یەکێک لە

ئامانجە نەتەوەییەکانی.

بەلام سەرەرای چەوساندنەوەی سەختی نەتەوایەتی و دابەشکردن و پچڕپچڕ کردنی سیاسی و ئابووری و زمان و فەرهەنگ، سەرەرای سیاسەتی فەرامۆش کردنی ئابووری و کۆمەلایەتی، سیاسەتی راگوێزان و جێ پێ گۆڕین و دەربەدەر کردن و جنسیە لێ سەندنەوە، پرسی کردن و هەژار خستن و ملک و مال زەوت کردن، بە نیازی لە ناو بردن و تەفروتوناکردن و تواندنەوەی... هێشتا:

– لە سەر زەوییەکی پێکەوە بەستراودا ئەژی کە مەلبەندی کۆنینتی و بە درێژایی مێژو تیا جێگیر بوە و گەشەی کردوە و پێ گەیشتوە.

– جگە لە جیاوازییەکی کەمی نێوان لە هجەکانی، بنچینەی زمانێکی یەکگرتوی ئاخافتن و لە یەک گەیشتنی هەیە، کە ئەشێ ببێتە زمانی نەتەوەیی نوسین و ئاخافتن.

– مێژوویەکی شارستانی و جەنگی و سیاسی ناوکۆیی هەیە.

– خاوەنی خووڕەوشتی کۆمەلایەتی، نەریت و دابی لە یەکچوی شێوەی ژیان، فۆلکلۆر و بیروڕا... کە خۆی لە پێکهاتنی سایکۆلۆجی لە یەکچودا ئەنوێنێتەوە.

– سەرەرای سنوری سیاسی و لە یەک داببڕینی ئابووری و بەستراوەنەوەی بە چەند رژێمی جیا جیاوە بنچینەی ئابوورییەکی یەکگرتوی هەیە کە تا ئێستاش خۆی لە بازرگانی قاچاخی سەر سنورەکان و هاتوچۆی خێل و هۆزە رەوەندەکان و هاتوچۆی کرێکارانی لادێ دا ئەنوێنێت.

ئەم میللەتەی کە رەنگە لە دنیای ئەمڕودا، تەنیا نەتەوەی گەورە بێت کە هێشتا نەک بە مافی سەربەستی چارەی خۆنوسین و رزگاری نەتەوەیی نەگەیشتوە، بەلکو لە نیشتمانەکەی خۆیشی دا بە بێگانە و ناحەز ئەژمێردرێت و مافی مان و خەملاندن و گەشەکردنی نیە، میللەتە بەش بەش و دیلەکەی ئیمەیە کە ناوی: کوردە.

گەلی کورد لە خاکەکەی خۆی دا بێگانەیە، بێ بەشە لە هەمو مافێکی نەتەوەیی و دیموکراتی، بگرە لە هەمو مافێکی مرۆڤی ئەم سەردەمە، ولاتێکی بە پیت و جوان و دەولەمەندی هەیە کە شوێنێکی جوگرافی گرنگی هەیە و دابەشکراوە و لە چەند سەرەوە ئەچەوسێنرێتەوە:

– چەوسێنەرەکانی هاونەتەوە: دەرەبەگ، بورجوازی کۆزمۆپولیت و کومپرادووری کورد.

– چینە کۆنەپەرست و چەوسێنەرەوەکانی نەتەوە دەسەلاتدارەکان، بە تایبەتی بورجوازی بیروکراتی.

– ئیمپریالیزم و کۆلۆنیالیزمی نوێ.

لە بەر ئەوەی گەل و نیشتمانەکەمان هەروەکو لە ریزی ولاتە هەرە دواکەوتوەکانی دنیادایە، هەروەها لە ناو هەر یەکێک لەو دەولەتانەی بە سەریشیان دا دابەش کراوە لە ریزی ناوچە هەرە دواکەوتوەکانی ئەو ولاتەش دایە.

ئیمە گەرەکمانە و خەبات ئەکەین بۆ گۆڕینی ئەم دۆخە نالەبارە. خەبات ئەکەین بۆ نەهێشتنی چەوسانەوە بە هەمو شێوەکانیەوە: چ رەگەزی، نەتەوایەتی، چینایەتی، دینی، مەزهەبی..

خەبات ئەکەین بۆ گۆڕین و نەهێشتنی پەیوەندی زالمانەی نێوان کورد و کورد، چ

نێوان کورد و حکومەتە داگیرکەرەکانی کوردستان، هی نێوان کورد و ئیمپریالیزمی جیهانی.

ئێمە ئەمانەوێ بە خۆشی و تێری وەکو مرۆڤ، بە سەربەستی و ئازادی دور لە چەوسانەوە و ئازار و زۆرلێکران لە سەر خاکی باووباپیرانمان بە ئاشتی بژین.

خەباتی کۆمەڵەمان لە پێناوی ئەم ئامانجە رەوا و پیرۆزانەدایە، کە ئامانجی گەلەکەمانە..

خەباتی وەرزنامەی «کۆمەڵە» یش کە کۆبونەوەی فراوانی کادرانی کۆمەڵە لە تشرینی دوەمی ١٩٧٨ دا بریاری دەرکردنی داوە، بەشێکە لەم خەباتە رەوا و پیرۆزەی کۆمەڵەمان و گەلەکەمان.

وەرزنامەی کۆمەڵە لە قۆناغێکدا دێتە کۆری خەباتەوە کە خەباتی گەلەکەمان گەیشتوتە بەرزترین و بالاترین پلەی، واتە پلەی خەباتی چەکدارانە، واتە لایەلا کردنی ناکوکی سروشت دوژمنانە و سەرەکی نێوان بورجوازی بیروکراتی رەگەزپەرست و شۆڤێنی عەرەبیی عیراق و نەتەوەی کورد لە رێگای بەکار هێنانی زەبروزەنگی شۆرشگێرانەوە چەکەوە.

کۆمەڵەمان، لەم قۆناغە گرنگ و بایەخدارەی مێژوی کوردستانی عیراق دا کە روبەروی فرمانە مێژوییەکانی سەرشانی بوە، لە مەیدانە جیاجیاکانی خەبات و تێکۆشانی سیاسی، ئایدیولوجی، پێشمەرگەیی، رێکخراوەیی.. دا هەول ئەدات بۆ تەواوکردنی ئەم ئەرکانە لە رێگەی دەرکردنی وەرزنامەی کۆمەڵەوە کە ئەبێت نوێنەرەوەی رێبازی سیاسی، فیکری، پێشمەرگەیی کۆمەڵە و هەڵگری مەشخەڵی بیروراکانی ئەو بێت و هەول ئەدات لە بەر تیشکی چرای مارکسیزم لینینیزم دا رێگەی سەرکەوتنی خەباتی گەلەکەمان رۆشن بکاتەوە و بەشدار بێت لە گەیاندنی مەرجەکانی سەرکەوتنی دا.

دەرکردنی وەرزنامەی کۆمەڵە سێهەمین تەقەللای کۆمەڵەیە بۆ دەرکردنی بلاو کراوەیەکی دەوری رێکوپێک، کە بێتە زمانی حالی کەلک و بیروڕا و هەلویستەکانی ئەو دەربریت لە روداوەکانی کوردستان و عیراق و دنیادا.

تەقەللای یەکەم - دەرکردنی ئالای سور بو لە سالی ١٩٧٣ دا کە شەهیدی نەمر هاوری شەهاب شێخ نوری دەوری سەرەکی گێرا و لە دوایی دا بە هۆی هەلومەرجی ئەو کاتەوە هەر ٣ ژمارەی لی بلاو کرایەوە.

تەقەللای دوەم - دەرکردنی ئالای شۆرش بو کە لە ئەیلولی ١٩٧٧ دا ژمارەی یەکەمی بە دەس پێشکەری و رەنجی شەهیدی نەمر هاوری شاسوار جەلال (ئارام) چاپ و بلاوکرایەوە، بەلام شەهید بونی هاوری ئارام پەکی دەرچونی بلاوکراوەکەیشی خست.

تەقەللای سێهەم - دەرکردنی وەرزنامەی کۆمەڵەیە کە ئەمە ژمارەی یەکەمە و، ئومێدمان وایە بە هەول و خەباتی هەمو لایەکمان بتوانین هیچ نەبی هەر وەرزەی ژمارەیەکی لی دەربکەین.

*

ژمارەی دوەمی کۆمەڵە لە وەرزی زستانی ١٩٧٩ دا دەرچو. باس و بابەتەکانی بریتی بو لە:

سەروتار: لە یادی قارەمانێکی نەمردا (ل ٣١) چەند روالەتێکی نوی ی پیلانەکانی

وەڵامێ بۆ بەگژاچوونی شۆڕشی کوردستانی عیراق (ل ٣٢ - ٤٠) بۆچی وەرزنامەکەمان ناوی نراوە «کۆمەڵە» (ل ٤١ - ٤٤) ڕەگەزپەرستەکانی عیراق پێشکەوتن و ئاوەدانی دێننە کوردستانەوە (ل ٤٤) گرتنی هێڵی ڕاست و دروستی سیاسی و ئایدیۆلۆجی سەرکەوتن ئەهێنێتە دی (ل ٤٥ - ٤٦) ڕۆڵە قارەمانەکانی کوردستان بە خوێنی گەش مێژووی نوێ ی گەلەکەیان ئەنوسنەوە (ل ٤٦) لە دەفتەری سەروەری دا: ئەبوبەکر شێخ نوری، لوتکەی بلندی بیروباوەر (ل ٤٧ - ٥٣) فاشیستەکانی عیراق چۆن ڕەفتار لە گەڵ هاوپەیمانەکانیان ئەکەن؟ (ل ٥٣) ئەبی کێ لە کێ بپرسێت؟ (ل ٥٤ - ٥٥) کاربەدەستە فاشیستەکانی عیراق حورمەتی پەیمان و ڕێککەوتنە جیهانیەکان ناگرن (ل ٥٥) وەرن بە دەنگ ئازادیخوازانی عیراق و کوردستانەوە (ل ٥٦ - ٥٩) بانگێکە و دو هەوا (ل ٥٩) خەباتی گەلان: ئێران - چارەنوسی شۆڕش (ل ٦٠ - ٦٤)

*

ژمارەی سێیەمی کۆمەڵە لە وەرزی زستانی ١٩٧٩ دا دەرچو. باس و بابەتەکانی بریتی بو لە:

سەروتار: گەلانی قارەمانی ئێران! یەکەمین سەرکەوتنتان پیرۆز و هەمو ڕۆژێکتان هەر سەرکەوتن بێ (ل ٦٥) بەرەو پێکهێنانی حیزبی پێشڕەوی کرێکاران و ڕەنجدەرانی کوردستان (ل ٦٦ - ١١٧) بابەتی جۆراوجۆر: ئازار و بەهار (شیعر). ئەی ئازادیخوازانی دنیا وەرن بە دەنگ ئازادیخوازانی کوردستانەوە. ڕۆڵە قارەمانەکانی کوردستان بە خوێنی خۆیان مێژووی نوێ ی گەلەکەیان ئەنوسنەوە. سەروەری بۆ هاوڕێ د. بەختیار خالید. خوێنی شەهیدان خانەی موعینی و محەممەد حسین کەریمی بە فیڕۆ ناچێت (ل ١١٧ - ١١٨)

*

ژمارەی چوارەمی کۆمەڵە لە وەرزی بەهاری ١٩٧٩ دا دەرچو. باس و بابەتەکانی بریتی بو لە:

سەروتار: ئاشبەتاڵی ١٩٧٥ - بیرەوەرییەکی تاڵ بەلام پڕ تەجروبەی هێژا (ل ١١٩ - ١٣١) لە ساڵرۆژی شەهید بونی هاوڕێ محەمەد ئەمین پۆلا (ل ١٣٢ - ١٣٤) فروفێڵەکانی شۆڕشی چەواشە شارەزا بن (ل ١٣٥ - ١٤٠) هەندێ لە گیروگرفتەکانی ئیستای جەنگی پارتیزانی (ل ١٤١ - ١٤٦) لە دەفتەری سەروەری دا: هێزی بیروباوەر لە بەرامبەر باروت و قورقوشم و پۆلادا (ل ١٤٧ - ١٥٤) شەهید بونی مامۆستا عەزیز مەحمودی قارەمان (ل ١٥٤)

*

بەشی زۆری بابەتەکانی ئەم چوار ژمارەیە (بە ناوی جیاجیا یان بە بێ ناو) من نوسیومە یا من ئامادەم کردوە. د. جەعفەری شەفیعی (بە ناوی پۆشو) لە ژمارەی یەکەمی و دوەمی دا دو وتاری درێژی لە سەر ڕاپەڕینەکەی تهران و، مامجەلال (بە ناوی توانا) هەندێ باسی تیوری و، د. مەحمود (بە ناوی هیوا) هەندێ کورتە تەعلیقی نوسی. ئیتر کۆمەڵە بەردەوام دەرئەچو. هەندێ لە هاوڕێکانی تریش، لەوانە: فاضیل کەریم (بە ناوی ج. صادق)، مەلا بەختیار (بە ناوی باوکی ئاوارە)، دوایی تر فەرەیدون عەبدولقادریش بەشداری نوسین بون.

بە کارهێنانی وشەی «وەرزنامە» شتێکی تازە بو. ئەمانویست هەندێ وشە و

تیگەیشتنی دیاریکراو وەکو: «ڕۆژنامە» بۆ بڵاوکراوەی ڕۆژانە، «حەفتەنامە» بۆ بڵاوکراوەی حەفتانە، «مانگنامە» بۆ بڵاوکراوەی مانگانە، «وەرزنامە» بۆ بڵاوکراوەی ٣ مانگە و، «ساڵنامە» بۆ بڵاوکراوەی ساڵانە لە ڕۆژنامەوانی کوردی دا بچەسپێنین. ئەپارەکان وەرزنامەکەیان ناو نابوو: وەرسنامە.

## کۆمەڵە و کاروباری ڕێکخراوەیی

دوای ئەوەی ئارام هات بوە شاخ هەمو ڕێکخستنیان یەک خست بو لە ژێر ناوی «کومیتەی هەڵمەت» دا. چەند خەتی تر و کەسی کەش بە جیا لەمان هەبون. جەمال تایەر (سەرکەوت) دینەمۆی کۆمیتەی هەڵمەت بو. پاش ماوەیەک ئەم کۆمیتەیەمان کرد بە «کۆمیتەی سەرکردایەتی ڕێکخستنی ناوخۆ».

جگە لەم کۆمیتەیە دو ڕێکخستنی گەورەی ترمان هەبو یەکێکیان «کومیتەی ڕاپەڕین» بو کە حەسەن کوێستانی لێپرسراویان و، ئەوی تریان خەتێک بو د. خەسرەو خاڵ (زۆراب) لێپرسراویان بو.

کومیتەی ڕاپەڕین تۆڕێکی فراوانی ڕێکخستنی لە چۆمان، قەسری، گەلاڵە، ڕەواندز، شەقڵاوە، هەولێر.. هەبو.

کومیتەکەی زۆرابیش تۆڕێکی ڕێکخستنی فراوانی لە ئەندازیار و پزیشک و مامۆستا و ئەفسەر و موچەخۆری گەورە لە سلێمانی و هەولێر و بەغداد دامەزراند بو.

ڕێگەمان دابو بە هەمو کادرە سیاسی و پێشمەرگەییەکانی یەکێتی هەر کەسە لە لای خۆیەوە، چەندی لە توانای دا بێ، کەسانی دڵسۆز ڕێک بخا و، بەرەو ڕوی ناوەند یا دەزگا ڕێکخراوەییەکانی بکاتەوە. ئەو ڕێکخستنە تازانە ماوەیەک لە ژێر سەرپەرشتی خۆمان دا ئەمایەوە، ئەگەر بە تەواوی دڵنیا بوینایە لە خاوێنی ڕیزەکانی ئینجا بەرەو ڕوی یەکێ لە ڕێکخراوەکانی شار ئەکرانەوە.

ساڵانی ٧٦ - ٧٩ هەزاران تێکۆشەری تازە هاتنە ڕیزی ڕێکخراوەکانی کۆمەڵەوە بە دەیان شانە، شانەی سەرەکی و ڕێکخراوی تازەیان لە سەرانسەری کوردستان دا دامەزران. سەرکردایەتی بزوتنەوە و، لقەکانی یەکێتی یش هەر یەکەیان لە لای خۆیەوە چەندین تۆڕی ڕێکخستنیان پێکەوە نا بو. یەکێتی ڕێکخراوێکی سیاسی بو زیاتر لەوەی پێشمەرگەیی بێ و، خەباتەکەیشی ئامانجی سیاسی هەبو نەک عەسکەری. هەر لە سەرەتاوە باوەڕمان وابو کە تەنی خەباتی چەکدار بو پشتیوانی بێ لە خەباتی سیاسی، چونکە خەباتی سیاسی ئەگەر پشتیوانێکی چەکداری نەبێ بەعس بە ئاسانی ورد و خاشی ئەکات. هەر لە بەر ئەوە ترسی داوودەزگا سەرکوتکەرەکانی بەعس لە ڕێکخراوە نهێنییەکانی شار زۆرتر بو وەک لە ڕێکخراوە ئاشکراکانی پێشمەرگە. بەو پەڕی دڕندایەتییەوە سزراخی ئەکردن و، لە هەرجێیەک سوسەی بکردایە بە گرتن و ئەشکەنجە و کوشتن هەوڵی ئەدا لە ڕەگوڕیشەوە دەریان بهێنێ.

*

ساڵی ٧٦ ڕێکخراوێک لە سلێمانی گیرا ١٢ کەسیان لێ ئیعدام کردن لەوانە: یاسین محەمەد حەسەن، ئیسماعیل قاسم عەلی، محەمەد قاسم عەلی، خەسرەو عەبدوڵڵا، نەصرەدین نەجمەدین، مستەفا قادر، صەلاح مەجید، فەرەیدون عەبدولقادر.. ئەمانە

پەیوەندییان لە گەڵ فەرهادی مەلا رەزا کرد بو. فەرهاد زمانی لی دابون.
سەرەتای ٧٧ عەبدوللا حەسەن گیرا و بە ئەشکەنجە کوژرا.
ساڵی ٧٧ ریکخراویک لە هەولیر گیرا چەند کەسیکیان لی ئیعدام کردن لەوانە: عوسمان گچکە کە بە ئەشکەنجە کوژرا. پەیوەندییان لە گەڵ موختاری یەکی لە گروەکەکانی هەولیر کرد بو. موختار زمانی لی دابون.
ساڵی ٧٨ ریکخراوی «هەلۆی سور» لە بەغدا گیرا و چەند کەسیکیان لی ئیعدام کردن لەوانە: جوامیر سیامیر، سڵطان داود، عەبدولسەلام عەبدولرەزاق، سەلام، شیرۆ. پەیوەندییان لە گەڵ کاوە فانیح کرد بو. کاوە زمانی لی دابون.
ساڵی ٨٠ ریکخراویک لە هەولیر گیرا لەوانە: کەریم رەسول، طەها فەقی یوسف، ئیسماعیل حەسەن. کەریمیان بە ئەشکەنجە کوشت و ئەوانی تریان ئیعدام کرد. ئەمانە پەیوەندییان کرد بو بە جەلال کاکو. جەلال زمانی لی دابون.
جگە لە مانەی کە بە کۆمەڵ ئەگیران، بە سەدان کەسی تر بە بیانوی هاوکاری لە گەڵ ریکخستن و هاوکاری لە گەڵ پیشمەرگە ئەگیران و زۆر جار لە سیدارە ئەدران.

*

دوای لیکۆلینەوەی هەمو ئەو روداوانە بۆمان دەرکەوت کە هۆی ئەم ئاشکرابونانە چەند شتیکە:

١. پەیوەندی کردن بە نۆکەرانی داوودەزگا سەرکوتکەرەکانی بەعس.
٢. تیکەلاوکردنی کاری ریکخراوەیی و کاری پیشمەرگەیی.
٣. شیوەی هەرەمیی ریکخستن.

بۆ ئەوەی ئیتر ریکخراوەکان لە لیدانی دوژمن و قوربانی دانی بی هودە بپاریزین، ریوشوینی نویمان دانا بۆ کارکردن.

*

جیاکردنەوەی کاری پیشمەرگەیی لە کاری ریکخراوەیی

ریکخراوەکانی کۆمەلە بو کاری سیاسی تەرخان کرا بون. ئەرکی سەرەکییان بلاوکردنەوەی بیروباوەری کۆمەلە و پروپاگاندە بو بۆ یەکیتی و جولانەوەکە و، راکیشانی کەسانی تازە بۆ ریزی تیکۆشان. بۆ ئەوەی توشی لیدان نەبن، ئەمانە تیکەلاو نەئەکران بە پیشمەرگەی ناو شار.
ریکخراوەکانی ناوشار سەرچاوەیەکی گرنگی پیگەیاندنی کادر و پیشمەرگە بون.
هەروەها سەرچاوەیەکی گرنگی ئاگاداری جۆراوجۆر و زانیاری بە ترخ بون لە سەر هەلومەرجی سیاسی، ئابوری، کۆمەلایەتی، سپایی عیراق.
پیشمەرگەی ناوشار لە مەفرەزەی تایبەتی دا ریکخرا بون. راستەوخو بەسترا بون بە لیپرسراوی سەرکردایەتی ناوخۆ یان بە ناوەندی کۆمەلەوە.

*

گۆرینی شیوەی هەرەمی بە تەزبیع و هیشو

ریکخستنی کۆمەلەش وەکو ریکخستنی حیزبی شیوعی لە سەر بنچینەی دابەشبونی ئیداری و ریکخستنی هەرەمی لە سەرەوە بو خوارەوە دامەزرا بو. ئەم جۆرە ریکخستنە کە بەر لیدانی داوودەزگا سەرکوتکەرەکانی بەعس ئەکەوتن، ئازاری زۆریان پی

ئەگەیشت بە تایبەتی ئەگەر یەکێ لە گیراوەکان یا زیاتر خۆی لە بەر ئەشکەنجەدا پێ نەگیرابە و قسەی بکردایە. لە سۆنگەی ئەمەوە زۆر لە ڕێکخراوە تازەکانی کۆمەڵە، بە تایبەتی لە هەولێر، بەر لێدان کەوت.

ڕێکخستنی «هەرەمی» مان گۆڕی بە ڕێکخستنی «هێشویی» و «تەزبیحی»

لە ڕێکخستنی هێشویی دا بۆ نموونە:

أ لە سلیمانی دانیشت چەند کەسێکی ڕێک خست بو یەکێکیان ب بو.

ب لە هەولێر چەند کەسێکی ڕێکخست بو یەکێکیان ج بو.

ج لە ئوردوگاکانی گەرمیان چەند شانەیەکیان دامەزراند بو.

لەم جۆرە ڕێکخستنە چەند هێشوی جیاوازی لێ ئەکەوتەوە بێ ئەوەی هیچیان ئەوانی تر بناسێ. لەم ڕێکخستنەدا وەکو گوێ نەئەدرایە شوێن و شار، گوێ نەئەدرایە کار و پیشە و، ژن و پیاو. تێکەڵاو بو لە پیشەی جیاواز و تەمەنی جیاواز و دانیشتوانی ناوچەی جیاواز.

لە ڕێکخستنی تەزبیحی دا چۆن دەنکەکانی تەزبیحەکە یەک بە یەکەوە بەستراون، لەمیش دا شانە و کۆمیتە نیە و، زەلامی تەنیا لە گەڵ دو کەس پەیوەندی هەیە یەکێک لە سەرو خۆی و یەکێ لە خواروی خۆی.

هەندێ جار لە ناو هێشوەکانی ڕێکخستن دا بۆ سەلامەتی زیاتر پەیرەوی ڕێکخستنی تەزبیحیش ئەکرا و، هەردوکیان تێکەڵاو ئەکران.

هەرچەندە پەیوەندی کردن دژوار و زوری ئەخایاند بەلام لە چاو هەمو شێوە ڕێکخراوەییەکانی ترا سەلامەت تر بو. کەمتر دوژمن زەفەری پێ ئەبرد.

*

## کۆبونەوەی کومیتەی سەرکردایەتی

دوای کارەساتی هەکاری سەرکردایەتی توشی جورێ لە هەلوەشان بوبو، پێویستی بە ڕێکخستنەوە هەبو. لە مێژ بو کۆبونەوەی سەرکردایەتی یەکێتی نەکرا بو. داوا لە ئەندامەکانی دەرەوە کرا بە ئێران دا بگەرێنەوە بۆ کۆبونەوە. ئێران بێ سەرو بەری تێ کەوت بو بە ئاسانی هاتوچوی پێ دا ئەکرا. دۆستەکانمان لە ئێران هەندێ ئادریسیان بۆ نارد بوین بۆ ئەو جۆرە هاتوچۆیانە بەکاریان بهێنین. بەو ڕێگایەدا عومەر مستەفا، عومەر شێخموس، کەمال خۆشناو، عادل موراد، فوئاد مەعصوم.. گەیشتنە ناوزەنگ.

بار و دۆخی یەکێتی پاچونەوەیەکی هەمە لایەنە و قولی گەرەک بو. کاروبارەکانی یەکێتی لقوپۆپی زوریان لێ کەوت بوەوە و، ئەرکەکان زور و جوراوجور بون، دەزگا سەرکردایەتییەکان پێویستیان بە پڕ کردنەوە و بەهێزکردن هەبو.

لە ناو سەرکردایەتی یەکێتی دا دو فەیلی بەغدایی: عەبدولرەزاق میرزا عەزیز، عادل مورادی.. تێ دابو. عەبدولرەزاق نەجات بوەوە، عادلیش لەم کۆبونەوانەدا زیز بو ڕویشتە تاران.

*

## گەرەکەی بەکر پیرۆت

شا وەکو دوا چارە، حکومەتەکەی جەنەرال ئەزهاری لێ خست، لە ٩ ی کانونی دوەمی ٧٩ دا شاپوری بەختیاری کرد بە سەرۆکی وەزیران.

شاپور، تەمەنی ٦٣ ساڵ و، سەرۆکی حیزبی ئیران بو، کە یەکێ لە حیزبەکانی «جەبهەی میللی» بو. لە وەزارەتەکەی موصەددەق دا جێگری وەزیری کار و، بە تۆمەتی سوکایەتی بە «مەقامی سەلتەنەت» ٣ ساڵ زیندانی کرا بو. شاپور بەڵێنی گۆڕینی زۆر شتی دا. چونکە لە لایەن شاوە دانرا بو خومەینی دژی وەستا و، داوای کرد درێژە بە قیام بدری. حیزبی ئیران و جەبهەی میللی حاشایان لێ کرد. «قیام» تا ئەهات زیاتر تەشەنەی ئەکرد و، گەیشت بوە ئەو کەرتانەی خەڵک کە لە ژیانی کۆمەڵ دا کاریگەر بون، وەکو مانگرتنی کرێکارانی نەوت و، لە ئەنجامی ئەوەش دا کەمبونەوەی دەرهێنانی نەوت و دەرامەتی دارایی ئیران. مانگرتنی کارکەرانی بانکەکان. مانگرتنی رۆژنامەوانەکانی تاران و، راوەستانی هەمو رۆژنامەکان. مانگرتنی کارکەرانی رادیو و تەلەفزیون. سەرەرای مانگرتنی بازار.

لەو سەردەمەدا ولاخ بۆ راپەراندنی کار و پێویستی بارەگاکانی پێشمەرگە و رەبیە و سەنگەرەکانی هێزەکانی حکومەت هۆیەکی بەنرخی گویزانەوەی کەلوپەل بو. بارەگاکەی بەکر پیرۆت لە نزیک گۆڕەشێر بو. بەرزاییەکانی گۆڕەشێر هێزی ئیرانی لێ بو. کەرەکەی بەکر پیرۆت بەڵەسە بوبو هەڵی تیزان بو بۆ گۆڕەشێر. سەربازە ئیرانیەکان کەرەکەیان وەکو دەسکەوتێکی بە نرخ، گل دابوەوە بۆ خۆیان. بەکر جوابی بۆ نارد بون کەرەکەی بدەنەوە. گوێیان نەدابویە. لە سەر ئەوە چوە سەریان سەربازەکانی گرت و کەرەکەی لێ سەندنەوە. پاش چەند سەعاتێ سەربازەکانیان ئازاد کرد بو.

بەختیار بەیانێکی دەرکرد مامجەلالی تاوانبار کرد بە دەستوەردانە کاروباری ناوخۆی ئیران. حکومەتی عیراق جولانەوەکەمانی لە «تعتیم اعلامی» بەهێزدا خنکاند بو. لە مێژ بو دەزگاکانی راگەیاندن هیچ باسێکی جولانەوەی کوردیان نەکرد بو. هەرچۆنێ باسیان بکردبنایە هەر پێمان خۆش بو تەنانەت ئەگەر بە هۆی رێکەوتێکی وەهایشەوە بوایە. لە بۆنەیەکی وەها دا شێخ رەزا وتویەتی:

بۆ کەری ئیملاتی حەربی کرد لە سەرمان شێخ حەسەن
سەیری کەن یاران! چ گۆیەندێکی گێڕا ئەم کەرە؟

*

## ئێران لە دوا قۆناغی ئینقیلاب دا

لە کاتی قیام دا، شار و ناوچەکانی کوردستان، هەندێکیان ئارام و هەندێکیان جمەوجولێکی کەمی تێ دا بو. لە کاتێک دا لە سەرانسەری ئیران دا ساواک کرا بونە کونەوە و، لە هەندێ جێ داوودەزگاکانیان پێ پێچرا بونەوە، کەچی لە زۆر شوێنی کوردستان ساواک هەروەکو جاران حوکمرانی ئەکرد.

کوردستانی ئیران بۆشایی سیاسی و رێکخراوەیی تێ دا بو. کادرەکانی حدکا هێشتا لە عیراق و ولاتانی تری ئەوروپا بون. کۆمەڵەی شۆڕشگێری زەحمەتکێشانی کوردستانی ئیران (سازمان انقلابی زحمتکشان کردستان ایران: سازکا) ژمارەیەکی کەم کادری هەبو، نەیئەویست خۆی ئاشکرا بکات و هەندێ بیروڕای سەیریان هەبو دەربارەی کاری جەماوەری و سیاسی و رێکخراوەیی. رێکخراوە ئیرانیەکانی وەکو حیزبی تودە، جەبهەی میللی، چریکی فیدایی و موجاهیدینی خەڵک لە کوردستان نەبون. چەند

مەلایەک لە مەیدانی سیاسی دا چالاک بون و، خەلک لەوان کۆ بوبونەوە، وەکو شیخ عیزەدینی حوسەینی لە مەهاباد، مەلا شیخ جەلالی برای لە بانە، ئەحمەدی موفتی زادە لە سنە... کاتی غەنی بلوریان و هەندی لە گیراوە سیاسیەکان، دوای بەردرانیان، گەرانەوە مەهاباد، مەلا شیخ عیزەدین ریبەری کوبونەوەی پیشوازیی کەرەکانی کرد.

بە هەلوەشاندنی ساواک و رویشتنی شا و، دانانی شاپوری بەختیار بە سەروەزیران و، گەرانەوەی خومەینی و تیکچونی وەزارەتەکەی بەختیار، بە کردەوە لە کوردستانی ئیران دا دەسەلاتی حکومەت نەما بو. لە زوری شارەکانی کوردستانی ئیران دا «شورا» یان لە پیاوە ناسراوەکانی شارەکە پیک ئەهینا بو بەریوەبردنی کاروباری شارەکەیان.

*

گەرانەوەی حدکا

کادرەکانی حدکا دەستیان کرد بە گەرانەوە بو کوردستان. د. ئەورەحمانی قاسملو، سکرتیری حیزب، گەرایەوە. زوریان لە قەلادزەوە ئەهاتن و، بە نزیک ئیمەدا تی ئەپەرین، بی ئەوەی خویان لە ئیمە بگەیەنن.

تەنیا کەسیان کە لە گەرانەوەدا لە ناوزەنگ سەردانیکی کورتی کردین «هیمن» بو. ئەوە یەکەمین جار و دواجار بو من هیمن ببینم. لە گەل مامجەلال و هاوریکانی تر پیشوازییەکی گەرمان کرد. هیمن لەو سەردانە کورتەدا لە گەل من لوتفی نواند. لە ناو قسەکانی دوشتی باس کرد: یەکیکیان باسی ئەو وتارەی کرد کە لە ۱۹۷۲ دا دەربارەی زاراوەکانی کوری زانیاری کورد لە ڤییەنناوە بو حەفتەنامەی هاوکاریم نارد بو. وای پیشان دا کە بوچونەکانی بە دل بون. هیمن ئەو کاتە لە کوری زانیاری کاری ئەکرد. بیگومان ئەمە نیشانەی زیرەکی بو ئەو هەمو سالە ئەمەی لە بیر مابو. دوەمیان وتی: «شیعریکم بو شەهاب و، شیعریکیشم بو لەیلا قاسم نوسیوە» شیعرەکەی بو شەهابی دانا بو بەیتیکیان تیهەلکیش بو لە گەل نیوە بەیتیکی نالی کە ئەلی: «ئەستیرەکانی رادەکشین وەک شەهابی نور» ئەوەی بو لەیلاییشی دانا بو، چوارینەیەک بو. نازانم بو موجامەلەی ئیمە «ئیرتیجالی» دای نابون، یان پیشتر دای نابون و لە بەر هەلومەرجی سیاسی عیراق بلاوی نەکرد بونەوە، چونکە لە هیچ بەرهەمیکی تری دا بلاوی نەکرد بونەوە.

لەو وتارەدا کە لە سەر «زاراوەکانی کوڕ» نوسی بوم، پیشنیارم کرد بو بەر لە داتاشینی وشەی تازە کورە و، بەر لە وەرگرتنی وشەی بیگانە، وشە خومالیەکان کوبکرینەوە و ریز بکرین و بەراورد بکرین لە گەل زاراوە زانستیەکانی زمانەکانی کەدا. ئەوەی هەبو لە جی ی دابنری و، ئەوەی نەبو ئینجا وشەی بو داهیناشری یا بخوازری. وەکو نمونەیەک لە جیبەجی کردنی ئەم میتودە بو کوکردنەوەی وشەی کوردی لیرەدا بە یادی ماموستا هیمن هەندی زاراوی جوتیاری کە ئەچیتە خانەی زانستی کشتوکالەوە تومار ئەکەم.

## گەنم لە داچاندنەوە تا هارین

گەنم، بە مادەیەکی ستراتیجی دائەنری بو ژیانی مروڤ و، هەبونی لە ولات دا بە ئەندازەی کافی ژیانی دانیشتوان، یەکیکە لە مەرجە سەرەکیەکانی دابینکردنی «ئاسایشی خوراک» کە ئەویش کولەکەیەکی بنەرەتیی «ئاسایشی نەتەوەیی»ە.

پیش ئەوەی مەکینەی جوت و دروینە و ئاشی ئاگر دابی. بەرهەم هینانی گەنم

کارێکی سەخت بو.
زەوی بۆ ئامادە ئەکرا. ئەرز ئەگەر چەند ساڵێ بێ نەکێڵرا بێ پێی ئەڵێن: «بەیار»
خالصی بە شێخ مەحمود ئەڵێ:
بەیار کێڵان و گای لەڕ، پیر و کچ خواستن، ژن و تەدبیر،
سەگ و جۆ، ئەسپ و ئیستقان، جرج و ناو کانێ
ئەگەر یەک ساڵ بێ نەکێڵرا بێ: «بور» و، ئەگەر یەکجار کێڵرا بێ «شێف»
پێشینان وتویانە: «شەڕ لە شێف و ئاشتی لە خەرمان»
ئەگەر دو جار کێڵرا بێ: «وەرد».
ئەرز بە دو گاجوت یان بە دو ئێستر ئەکێڵرا. دەزگای جوت پێک هات بو لە «گاسن» کە لە ئاسن دروست ئەکرا بۆ کێڵان و، بە «هەوجار» ئەبەسترا بە «مژان» و مژانیش بە «ویژانیەر» ئەبەسترا بە «نیر» ەوە. نیر (:نیل، نیڵە) «کەڵەمە» ی ملی گاکانی بە یەکەوە ئەبەست. جوتیار بە «نەقیزە» گاجوتەکانی لێ ئەخوڕی و بۆ هاندانیان هۆ هۆی لێ ئەکردن. پێشینان وتویانە: «هۆ هۆ حساب نیە، کۆ کۆ حسابە»
داچاندنی گەنم پشت بە باران ئەبەستێ. پێشینان وتویانە: «چی بچێنی، ئەوە ئەدرویتەوە». دوای «وشاندنی تۆو» چاوەڕوانی بارانی پەلە ئەبون. ئینجا گەنم «چەکەرە» ئەکا و سەر دەر ئەهێنێ. پێش ئەوەی گوڵ بکا پێ ی ئەڵێن: «قەرسیل». هەندێ جار کارژۆلە و بەرخۆلەی بۆ لەوەڕ تێ ئەکەن. گەنم «پنج» ی لە خاک دایە و «سەروت» لاسکەکەیەتی و «گوڵ» ئەگرێ. پێشینان وتویانە: «بە هۆی گولە گەنێکەوە چەندەها گولە مرۆر ئاو ئەخواتەوە». سەری هەمو دەنکێکی «داسو» یەکی پێوەیە.
ئەگەر باران بە ئەندازەی پێویست بباری و خاکەکەی «ریژەن» و بە «پیت» بێ، ئەوساڵە «هات» ئەبێ و گەنم بە «بڕشت» ئەبێ. بڕشت لە بڕەن داتاشراوە، گەنم یەکودە یا زیاتری بڕیوە. ئەگەر باران لە ئەندازەی پێویست زیاتر بباری «ژەنگ» لە بنجەکەی ئەدا. ئەگەر لە ئەندازەی پێویست کەمتر بباری، یا ئافەتی بۆ بێ وەکو سون و کیسەڵە «شیرە» کەی ئەمژن ئەبێ بە «کوێرو» و یان کوڵلە کە هەموی ئەخوا، ئەوساڵە «نەهات» ئەبێ.
ئەگەر زو داچێنرا بێ و، زو گەورە بوبێ «هەراش» ە و، ئەگەر درەنگ داچێنرا بێ و، درەنگ گەورە بوبێ «کۆزیە» یە.
بۆ ئەوەی لە چاوەزار بە دور و، لە زەرەری ناحەز و نەیار پارێزراو بێ قورئان لە ناو پەلەی گەنمەکەدا هەڵئەواسرا و، بۆ ئەوەی چۆلەکە و مەلی زیانەخۆری لێ دور بخەنەوە «داهۆڵ» یان دائەنا. داهۆڵ زەلامێکە لە پەرۆ دروست ئەکرێ.
کە پێ ئەگەیی دروێنە ئەکرا. بۆ دروێنە خاوەنی گەنم هەندێ کەسی بە کرێ ئەگرت پێیان ئەوت: «پالە» یان «مزور» پێشینان وتویانە: «لە بێ کەسی دا رەجەب سەرپاڵەیەدا». یان لە گەڵ یەکێکا رێک ئەکەوت تا لە هەڵگرتنی خەرمان ئەهێنەوە کاری تێ دا بکا بەرامبەر بە بەشێکی بەرهەمەکەی پێیان ئەوت: «سەپان». پێشینان وتویانە: «شا بە سەپانی خۆی رانا گرێ»، هەروەها: «داس لە سەپان ئەشارێتەوە»، هەروەها: «خزمی خەزووری سەپانی لەتکە هەرمێ ی ماڵی شێخە»
گولە گەنم کە تازە پێ ئەگات و هێشتا نەریکە، هەندێکی لێ ئەدرون و بە ئاگر هەڵی ئەبرژێنن، ئەبێ بە «گوڵەبرژە» (قەرەخەرمان).

«دروێنە» بە کۆمەڵ «گەلە درەو» یان بە تەنیا ئەکرا. «درەو» بە دەس و بە «داس» ئەکرا. دروێنەکەر بۆ ئەوەی دەستی بریندار نەبێ «قەیغان» ی لە دەس ئەکرد و، بۆ ئەوەی خۆر کاری تێ نەکا «کڵاوقۆزی» لە سەر ئەکرد. قەیغان لە ئاسن و کڵاوقۆزی لە لباد دروست ئەکران. لە کاتی دروێنەدا سەپان هەر قوڵی گەنم کە بە داس ئەیبڕی لە شوێنی خۆیا لە سەر ئەرز دائەنێ، پێیان ئەوت: «گۆزلم» یان «سواڵە» دوای ئەوەی چەند گۆزلمێکی ئەبڕی کۆی ئەکردنەوە ئەبو بە «مەڵۆ» و چەند مەڵۆیەکی کۆ ئەکردەوە ئەبو بە «شارا». گۆزلم چەپکێکە بە دەس و مەڵۆ بە باوەش و شارا بە کۆڵ هەڵئەگیرێ. لە شاراکانەوە بە کۆڵ «کێشە» ئەکرێ بۆ سەر «خەرمان». لە هەندێ ناوچە بە خەرمان ئەڵێن: «جۆخین».

جێگای خەرمان لە سەر ئەرزێکی رەق ئامادە ئەکرا و خاوێن ئەکرایەوە «کرشە»ەکان بە خۆڕی هەڵئەچنران.

«گێرە» بە گا یان بە ئێستر یان بە جەنجەڕ ئەکرا. جەنجەڕ بە ئێستر رائەکێشرا. ئەگەر گێرە بە گا بکرایە سێ تا چوار گایان بە تەنیشتی یەکەوە ئەبەستەوە و «گێرەوان» بە نەقیزە لێ ی ئەخوڕین. ئەو گایە لە ناوەڕاستی خەرمانەکەدایە بە کۆڵەکەیەکەوە بەستراوەتەوە، پێ ی ئەڵێن: «گای بنە».

حاجی قادر لە باسی سوڵتان عەبدولحەمیدا ئەڵێ:

حاکمی ڕێگری مەعمورەیە، قازی دزی ڕۆژ،
وزەرا و وکەلا گورگن ڕەعییەت کەلەیە
بۆ ڕەعییەت ئەمە، ئەم گێرە و دەرەکەی داناوە
زەجر و تەوبیخی مەکە، چونکی خەتای «گای بنە» یە!

گای بنە ئەگەر ڕاهاتو بێ باش گێرە ئەکا و، ئەگەر خراپ بێ گێرەکە ئەشێوێنێ. «گێرە شێوێن» لەمەوە داکەوتوە.

شوکری فەزلی بە شێخ مەحمود ئەڵێ:

گێرەشێوێنێ کە گای کۆنی بە بادا لە کنت
چاکە هەر لێ ی خوڕی، سەیری دەم و کاوێژی نەکەی!

بە زەلامی زۆرخۆر و بەهێز، بەڵام بێ بەرهەم ئەڵێن: «ئەڵێ ی گای گێرەنەکەرە!» کێشە و گێرە دو کاری سەخت و ئاڵۆز و ماندوکەرن. بۆیە ئەگەر کارێ دژوار بێ ئەڵێن: «گێرە و کێشەی زۆرە!»

دوای ئەوەی خەرمان کوترا و، دان و پوشەکەی لە یەک جیا بوەوە، ئەکرێ بە «تارم» ئێواران بە فێنکی کە «بای شەماڵ» هەڵی کرد «شەن» ئەکرا. پێشینان بۆ پیاوی هەلپەرست وتویانە: «لە هەر لایەکەوە با بێ، ئەو شەن ئەکا». شەن وەکو پەنجەکانی دەس لە شولی دار یان لە ئاسن دروست ئەکرا و، دەسکێکی درێژی هەبو. کوتراوەکە ئەدرایە بەر با. دانەکەی قورسە لە شوێنی خۆی دا بەرئەبوەوە و خەرمانەکە «سور» ئەبو و، «کا» یەکەی سوکە با ئەیبرد و دور ئەکەوتەوە. پێشینان وتویانە: «لە سوری دۆڕاندوە، ئەیەوێ لە لابای تێ هەڵیهێنێتەوە». «لابا» ئەو گەنمەیە کە با بە تویکڵەوە بردویەتی.

گەنم بە جیا و کا بە جیا خەرمان ئەکرا. گەنمەکە بۆ ئەوەی ئەگەر دزی لێ بکرێ دیار بێ تا ئەگوێزرایەوە بە تەختەیەکی لوسی یان «شەقڵ» ئەکرا.

هەر لە سەر خەرمانەکە لە پێش دا بە «کەو» (:کڵگیر، سەرەن) گێڕاویانە گڵەتک

و ئەکوتراوەکەی لێ جیا ئەکرایەوە، ئینجا جارێکی تریش بە «بێژنگ» (:قەلبێر) ئەبێژرایەوە بۆ ئەوەی «سەرکوژەر» ەکەی بگرن. پێشینان وتویانە: «قسە بیکێژە، بیبێژە، ئینجا بیوێژە!». گڵگیر شاشترە لە بێژنگ. پێشینان وتویانە: «بەری ڕۆژ بە بێژنگ ناگیرێت»

حەریق لە ستایشی شێخی بورهان دا ئەڵێ:

بۆ کەناری سەوزەیی دەوری گوڵی ڕوت شین دەکەم

خاکی کۆی عیشقت بە بێژنگی سەرم بێژایەوە

دوای پاککردنی ئەپێورا. گەنم بە «ڕبە» و «تەغار» ئەپێورا. بۆ ئەوەی بە چاوەوە نەبی لە کاتی پێوان دا ژمارەکانیان لە گەڵ ناوێکی پیرۆزدا لێک ئەدا. بۆ نمونە لە ڕبەی یەکەم دا ئەیانوت: «یەک هەر خوایە» و، لە ڕبەی چوارەم دا ئەیانوت: «چوار یاری پێغەمبەر» ئیتر بە مجورە.

گەنم بە «تێر» و «هۆر» و «جەواڵ» ئەگوێزرایە بۆ ماڵ و، کا بە «ڕشکە» ئەگوێزرایەوە بۆ «کادان» و تەرخان ئەکرا بۆ ئالیکی ئاژەڵ و ولاخ. پێشینان وتویانە: «ئەوی لە مشک بێ جەواڵ ئەدڕێ!». بۆ زۆرخۆری هەوانتەچی ئەڵێن: «ئەگەر کاکە هی خۆت نیە کادانەکە هی خۆتە!». بۆ کاری بێ هودە ئەڵێن: «کا لە پوش ئەبژێرێ». بۆ هەڵگیرسێنەری شەر و فیتنە ئەڵێن: «ئاگری بن کا» یە. بۆ یەکێ شتی خەڵکی کە بە خۆرایی ببەخشێ ئەڵێن: «خەنجەر لە کا ئەدا!»

گەنم هەندێکی هەڵئەگیرا بۆ «بەنەتۆو» ی وەرزی داهاتو و، هەندێکی ئەکرا بە «ساوەر» و هەندێکی بۆ خواردنی خۆیان ئەکرایە «کەندو» یا «چاڵ» و هەندێکیشی ئەفرۆشرا.

بۆ هاڕین ئەبرا بۆ ئاش. ئاش بە ئاو ئەگەڕا. ئاشەوان لە نرخی هاڕینی دا پارەی نەئەسەند، بەڵکو «مزە» ی وەرئەگرت. مزە بەشێکی دیاریکراوی «هاراش» ەکە بو گلی ئەدایەوە. پێشینان وتویانە: «ئاش لە خەیاڵێک و ئاشەوان لە خەیاڵێ»، هەروەها: «ئاشی نەزان خوا ئەیگێڕێ»، هەروەها: «ئاش بە نۆرە ئەگەڕێ!».

ئارد بە «هێڵەک» ئەبێژرایەوە و «کەپەک» (:سۆس) ی لێ ئەگیرا.

نالی ئەڵێ:

دەورانییە، وەک هێڵەکی سەودا، سەری گێژم

بۆیە بە دەقیقی مەثەلە هەرچی دەبێژم

ئارد بۆ نان و کەپەک تەرخان ئەکرا بۆ ولاخ. لە ئاردی «بە پیز» نانی باش و لە ئاردی «بێ پیز» نانی خراپ دروست ئەکرا.

## *
## گەڕانەوەی ئیمام خومەینی

خومەینی لە پاریسەوە تارانی هەژاند بو، گرنگی دەزگای ڕاگەیاندنی ئەزانی. وەکو هەیکەل ئەڵێ: ئەو کاتەی لە نۆفیل لا شاتو بو، زۆری کاتی لە بەر عەدەسەی تەلەفزیون دا بە سەر ئەبرد، ڕۆژی ٤ تا پێنج گفتوگۆی ڕۆژنامەوانی ئەکرد و، لەو ٣ مانگەدا تا گەڕایەوە تاران زیاتر لە چوار سەد گفتوگۆی ڕۆژنامەوانی لە گەڵ هۆکانی ڕاگەیاندن: ڕادیو، تەلەفزیون، ڕۆژنامە.. کرد بو. بی بی سی، یەکی بو لە گرنگترینی ئەو دەزگایانەی

رای گشتی ئیرانی دژی شا و، به قازانجی شورش ئەوروژان.
ئەو تاکتیکەی خومەینی بۆ یەکخستنی هەمو خەلک دژی شا و، بۆ بیلایەنکردنی ئەمرتەش بە کاری هینا، تا ئەندازەیەکی زۆر سەرکەوتو بو. دەسەلاتی شا و داوودەزگاکانی بەرەو هەلوەشان ئەچون. خومەینی خۆی ئامادە کرد بۆ گەرانەوە.
کە وەختی گەرانەوەی هات، خومەینی لە گەل چەند کەسی لە دەسوپەیوەندەکانی لەوانە: ئەبولحەسەنی بەنی صەدر، ئیبراهیم یەزدی، قوطبزادە.. و نزیکەی ..١٠ رۆژنامەوان بە فرۆکەیەکی «ئەیر فرانس» بەرەو تاران بە ری کەوتن. کەس نەیئەزانی چیبان لی بە سەر دی: فرۆکەکەیان بەر ئەدریتەوە، یان بە سەلامەتی لە تاران ئەنیشیتەوە؟ خومەینی لە نهومی سەرەوەی فرۆکەکە دوای ئەوەی نوێژی کرد، دۆشەکیان بۆ راخست، ئیتر نوست و، تا گەیشتنە ئاسمانی تاران هەلنەستا. چەند ملیون کەس چو بون بۆ پیشوازی.
هەندی شتی سەیر لەم سەفەرە ئەگیرنەوە، وەکو:
– لەو کاتەدا کە لە فرۆکە دابەزی و پی ی نایەوە سەر ئەرزی ئیران یەکی لە رۆژنامەوانەکان لی ی پرسی: «دوای ئەو هەمو سالە دورییە کە ئیستا هاتیتەوە بۆ نیشتمانەکەی خۆت و بەمجورە پیشوازیت لی ئەکەن، هەستت چیە؟» لە وەلام دا وت بوی: «هیچ!»
– موحسینی رەفیقدوست، کە دوایی بو بە وەزیری پاسداران، ئوتومۆبیلەکەی ئیمام خومەینی لی خوربوە بۆ ئەوەی لە فرۆکەخانەوە بیبا بۆ شوینی خۆی. لە ریگا زەبەللاحیک قولی خۆی هەلکردوە و، بە خال و میل نەخشاندویەتی، دیتە بەردەمیان چەند جاری دەست ئەمالی بە جامی پیشەوەی ئوتومۆبیلەکەی خومەینی دا و، بە خیر هاتنەوەی ئیمام ئەکا و جنیو بە دایک و ژن و کچی شا ئەدا، چەند جاری ئەمە دوبارە ئەکاتەوە، رەفیقدوست جامەکەی لای خۆی دائەداتەوە و، بۆ ئەوەی دوری بخاتەوە بە تورەییەوە پالی بە کابراوە ئەنی. ئیمام ئەلی: «بۆ وای لی ئەکەی؟». رەفیقدوست ئەلی: «بی ئەدەبی ئەکا». ئیمام ئەلی: «ولی ی گەری با قسەی خۆی بکا، هەر کەسی بە زمانی خۆی عیبادەت ئەکا!»

*

لە بەر قەرەبالغی ریگا نەیانتوانی بە ئوتومۆبیل دریژە بە رۆیشتن بدەن. بە هالیکۆپتەر چو بۆ «بەهەشتی زەهرا» و، دوای ئەویش بۆ «حوسەینیە» یەکی تاران. لەویوە کاروباری شورشەکەی بەریوە ئەبرد. بە گەرانەوەی پیشەوای شورش حکومەتەکەی بەختیار هەرەسی هینا و، مەهدی بازرگان وەزارەتیکی تازەی لە سەر داوای ئەو دامەزراند.
سەردانی وفدی یەکیتی لە خومەینی
دوای سەرکەوتنی شورش بە چەند رۆژی، لە کوتایی شوباتی ٧٩ دا دەستەی نوینەرایەتی یەکیتی کە پیک هات بو لە: عومەر مستەفا، د. فوئاد مەعصوم، فاضل کەریم لە ناوزەنگەوە چون بۆ تاران بۆ سەردانی ئیمام خومەینی، د. جەعفەری شەفیعی یش بۆ تەرجومە لە گەلیان چو.
پیشتریش لە پاریس وەفدیکی یەکیتی کە پیک هات بو لە: د. فوئاد مەعصوم، عادل موراد، ئەحمەد بامەرنی لە تشرینی دوەمی ٧٨ دا سەردانیان کرد بو. ئەمجارەیان عادل نەخرا بوە ئەم وەفدەوە، لەمە نارەحەت بو.
وەفدەکە، لە دیدارەکەدا پشتیوانی یەکیتی نیشتمانی لە شورشی ئیران دەرئەبرن،

دیدارەکانی پاریسی بە بیر ئەهێننەوە، داوای لێ ئەکەن کە پشتیوانی بکا لە خەباتی گەلی عیراق بە گشتی و خەباتی گەلی کورد بە تایبەتی و، پێویستیەکانی جولانەوەکەی ئەخەنە پێش چاو.

خومەینی ئەلێ: «من کابرایەکی روحانیم پاش چەند رۆژێکی تر ئەچمەوە بۆ قوم، ئەو شتانەی ئێوە داوای ئەکەن کاری دەوڵەتە!»

ئەوانیش تکای لێ ئەکەن دەستور بە دەوڵەت بدا کارەکانیان بۆ جێبەجێ بکا.

حوسەین نەوەی خومەینی، ئەو زەمانە زۆر نزیکی باپیری بو، ئەویش لە دانیشتنەکەدا ئەبێ، ئیمام بە حسێن ئەلێ: ئاگاداری دەفتەری بازرگان بکا کارەکانیان جێبەجێ بکەن. لەو کاتەدا موهەندیس مەهدی بازرگان سەرۆوەزیری ئێران بو.

رۆژی دوایی ئاگاداریان ئەکەن، کە دەفتەری بازرگان کارەکانی بەرەو روی داریوشی فروهەر کردوتەوە سەردانی ئەو بکەن. فروهەر وەزیری کار و سەرۆکی حیزبی میللەتی ئێران بو. وەفدەکە سەردانی فروهەریان کرد. پەیوەندی لە نێوان حکومەتی ئێران و یەکێتی دا دروست بو.

قسەکانی خومەینی وەکو «فتوا» حساب ئەکران، لە بەر ئەوە نەئەبو قسە لە قسەکانی دا بکرێ و، موناقشەی قسەکانی بکرێ. بۆیە ئەوەی ئەچو بۆ لای و، پێویستایە باسێکی لە باری سەرنجی خۆیەوە بۆ رون بکاتەوە، ئەبو دەس پێشکەری بکردایە لە قسە کردن دا، بیروراکانی و خواستەکانی باس بکردایە، دوای ئەو کە خومەینی قسەی ئەکرد، باسەکە کوتایی پێ ئەهات و دائەخرا. زۆر کەس ئەمەیان نەئەزانی.

*

جولانەوەی کورد لە عیراق دا لەو کاتەدا دابەش بوبو. لایەکی بنەماڵەی بارزانی و، لایەکەی تری یەکێتی بو. بنەماڵەی بارزانی و، سەرانی پارتی، تاوانبار بون بەوەی دۆستی شا و هاوکاری ساواک بون، لە ناو ئێران دا بەدناو بون. مەلا مستەفا لە ئەمەریکاوە بروسکەیەکی پیرۆزبایی و پشتیوانی بۆ خومەینی نارد، بەڵام هیچ رۆژنامەیەکی ئێرانی بڵاوی نەکردەوە، ناچار خۆیان بە پارە وەکو «ئیعلان» لە هەندی رۆژنامەی تاران دا بڵاویان کردەوە. زۆری نەخایاند بنەماڵەی بارزانی لە گەڵ سەرانی شۆرش و، کاربەدەستانی تازەی ئێران دۆستایەتیان تازە کردەوە.

تازە کارەساتی هەکاری قەوما بو، یەکێتی و پارتی بە خوێنی سەری یەکتری تینو بون. هەردولایان لە لای کاربەدەستانی ئێران هەولیان ئەدا، ئێران بە لای خۆی دا رابکێشی و لایەکەی تر لە لای ئێران بەدناو بکا. زۆری نەخایاند لایەنی سێیەمیش، کە حسک بو، پەیدا بو. ئەوانیش، بە هۆی محەممەد رەحیم (خاڵە حاجی) یەوە، گەیشتنە لای سەرانی شۆرش و، دریغیان نەکرد لە هەوڵدان بۆ بەدناو کردنی هەردولای ناکۆک. بە دوای ئەوان دا هەندی کەس و تاقمی تریش هاتنە کایەوە.

لە ناو رێکخراوە کوردیەکانی عیراق دا، یەکێتی دو نوقتەی لاوازی هەبو، نەیارەکانی بە ئاسانی ئەیانتوانی لای ئێران بو دژایەتی یەکێتی بە کاری بهێنن: یەکەمیان، هاوکاری پێشمەرگەکانی یەکێتی بو لە گەڵ حدکا و کۆمەڵەی زەحمەتکێشان دژی داوودەزگاکانی ئێران. لەم بارەیەوە هەر ئاگاداریەکیان هەبوایە، دوای لێ زیاد کردن و زل کردن، ئەیان گەیاندە کاربەدەستانی ئێرانی. دوەمیان، یەکێتی چەپ بو، لە ناو ئەویش دا

ڕێکخراوێکی مارکسی - لینینی تی دا بو، تاوانبار کردنی یەکیەتی بە کۆمۆنیزم، کە سەرانی شۆڕش لە ئێران دا بە دوژمنی دین و ئیسلامیان دائەنا، کارێکی ئاسان بو.

ئەگەر ڕێکخراوە کوردیەکانی عیراق، لە لای ئێرانیەکان دژی یەکتری قسەیان نەکردایە و، نهێنیەکانی یەکتریان بۆ ئێران ئاشکرا نەکردایە، بە دەنگێکی یەکگرتو داواکانی خۆیان پێشکەش بکردایە، بێگومان ڕێزی کوردی عیراق زیاتر ئەبو، لەوانەیش بو زۆری داواکانیان کە بریتی بو لە پشتیوانی سیاسی و یارمەتیدانی مادی دژی بەعس، جێبەجێ ببوایە. بەلام هەرزو پارتی، بۆ ئەوەی باوەڕی کاربەدەستانی ئێران بە دەس بهێنێ، بو ژیاندنەوەی ڕێکخراوەکان و هێزەکانی، خۆی خستە خزمەتی ئێرانەوە.

*

خەلکی کوردستانی ئێران، بو یەکەمین جار بو، هەست بە ئازادی بکەن. چەندین تاقمی سیاسی لە شارەکانی کوردستان دا کەوتنە هەولی پێکهێنانی ڕێکخستن. کادرەکانی حدکا کە تازە گەڕا بونەوە، خەریکی کۆکردنەوە و سازدانی خەلک و پێکهێنانی ڕێکخراوی ئاشکرا بون. کادرەکانی کۆمەلەی شۆڕشگێری زەحمەتکێشانی کوردستانی ئێران (سازکا) یش خەریکی پێکهێنانی «ڕێکخراوی چەتر» بون بە ناوی جیا جیاوە. چریکی فیدایی و، حیزبی تودە و، دەیان ڕێکخراوی تری وەکو: سازمانی موجاهیدین، پەیکار، وەحدەتی کومونیست.. خەریکی خۆ ڕێکخستن بون. ئەمەش ڕەنگدانەوەی هەلومەرجی سیاسی تاران بو.

لە ناو ئەم ڕێکخراوانەدا، سازکا، لە چاو ئەوانی تردا لە هەمویان زیاتر کادری خۆشناو و ناسراوی هەبو، هەر لە ناو ئێران دا مابونەوە، ناوکێکی پچوکی ڕێکخراوەییان هەبو. زەمینەی گەشەکردن و پەرەسەندنی ئەمان لە هەمویان لە بارتر بو، بەلام بە هۆی جۆری بیرکردنەوەیان و شێوەی کارکردنیانەوە نەیانتوانی ببن بە گەورەترین هێزی کوردستانی ئێران. لە کاتێک دا حدکا بە هۆی ئەو ناوبانگەوە کە لە سەردەمی قازی محەممەد و جمهوریەتی مەهابادەوە بە میرات بۆیان بە جێ مابو، لە ماوەیەکی کورت دا هەزاران کەسیان کۆ کردەوە و، هەزاران چەکداریان ڕێکخست و، توانییان ببن بە حوکمرانی ڕاستەقینەی زۆر شار و ناوچە. ئەم زلبونە کتوپڕە سەرانی حدکای غەررا کرد بو.

*

## قازی و مەلا

حدکا لە لایەن قازی محەممەد و پ د ک لە لایەن مەلا مستەفاوە دامەزرێنراوە. قازی محەممەد دوای ئیعدام کرانی ئیتر حیزبەکەی ماوەیەک کز بو، تا سەرکەوتنی شۆڕشی ئێران خۆی بۆ ڕێک نەخرابوەوە. بەلام کەس لە کادرەکانی حدکا هەرگیز بیریان لەوە نەکرد بوەوە کە یەکێک لە بنەمالەی قازی بکەن بە سەرۆکی حیزبەکەیان، ئەگەرچی زۆر کەسی ناسراویان تی دا بو. بە پێچەوانەی پارتی کە هەر لە سەرەتاوە مەلا مستەفا و، دوای مردنی ئەویش کوڕەکەیان کرد، بە سەرۆکی خۆیان. بێگومان ئەمە نیشانەی پێشکەوتنی فیکریی حدک ی ئێران بو لە چاو پدک ی عیراق دا.

*

لەو زەمانەدا پێشنیارمان بۆ سازکا و بو حدکا کرد کە:

- ڕۆژنامەیەکی کوردی - فارسی ڕۆژانە لە تاران دەربکەن. بەلێنمان پی دان بۆ

کاریکی وەها ئیمەش هاوکاریان بکەین.

- یەکیتی پیشەیی بۆ خوێندکاران، لاوان، ئافرەتان، مامۆستایان.. دروست بکەن.

- لە ناو خۆیان دا تەبا و گونجاو بن و، لە گەل کاربەدەستانی تازەی ئیران هەول بدەن بە زمانی نەرم بدوین و، بە گفتوگۆ کیشەکانیان چارەسەر بکەن.

هەردولایان گالتەیان بە پیشنیارەکانی ئیمە ئەهات. لایان وابو، چونکە ئیمە لە پاش چەندین سال خەبات هیچ سەرکەوتنیکمان بە دەس نەهیناوە، تەجروبەی کوردستانی عیراق بۆ ئەوە ناشی چاوی لی بکری یا سودی لی وەربگیری و، تەگبیرەکانیشمان بە کەلکی کوردستانی ئیران نایەن.

*

سازکا بە بیانوی ئەوەی کادرەکانی ئاشکرا نەبن، لە باتی ئەوەی ریکخستنیکی سەرانسەری، بە ناوی خۆیەوە، لە هەمو شارەکانی کوردستان دا دابمەزرینی، لە هەر شارە بە ناویکی جیاوازەوە، ریکخراویکی دامەزراند لە گەل ریکخراوی شارەکانی تر پەیوەندی نەبو. ناوەکان دریژ و، لە ژیانی سیاسی دا بەلگەی توندرەوی بون. وەکو:

- جمعیت دفاع از حقوق خلق کرد، لە ورمی.
- جمعیت دفاع از حقوق زحمتکشان و حقوق ملی خلق کرد، لە سەقز.
- جمعیت مبارزه برای ازادی و حقوق ملی خلق کرد، لە بۆکان.
- جمعیت دفاع از ازادی و حقوق زحمتکشان، لە نەغەدە.
- جمعیت راه رهائی زحمتکشان در کردستان ایران، لە مەهاباد.
- جمعیت دفاع از ازادی و انقلاب، لە سنە.
- اتحادیه دهقانان مریوان.

*

کمال فوئاد دەربارەی ئەم هەمو ناوە دریژ و جیاوازانە قسەیەکی خۆشی گیرایەوە: کابرایەکی ریبوار لە ریگایەک توشی کابرایەکی سنەیی ئەبی، لی ی ئەپرسی: «برا ناوت چیە؟» ئەلی: «بە ئەلفازگەل عەجیبو و ئەلقاوگەل شیرینەوە، مەرحوم جەنابی باوکم نامی نیاگم مولا محەمەد نەسیمی شەگەری؟» کابرا بە توڕەییەوە تی ی ئەخوڕی: «ئیژم نامت چەس؟» یەکسەر ئەلی: «حەمە»

حیکمەت لە جیاوازی ناوەکان و، لەم ناوە دریژانە چی بو؟ ئەگەر بۆ ئەوەیی کە خەلک ئەم کومیتانە بە سەربەخۆ لە سازکا و، کاری جەماوەر بزانی، سەرانی سازکا لەوەدا بە هەلە چوبون، هەمو کەس ئەو کومیتانەی بە دەسکردی سازکا ئەزانی.

*

## پادگانی مەهاباد

رۆژی ۵۷/۱۲/۱ ی ئیرانی، سەرکردایەتی حدکا پلانیکی دانا بە هاوکاری چەند ئەفسەریکی کورد دەستی بە سەر پادگانی مەهابادا گرت. ۱۸ تانک و ۳۶ توپی سەنگین و هەزاران پارچە چەکی تی دا بو. حدکا هیشتا زور لاواز بو نەیتوانی بە ریکوپیکی دەست بە سەر کەلوپەلی ناو پادگانەکەدا بگری. خەلک رژانە ناوی تالانیان کرد و، ئەوی بۆ حدکا مایەوە تەنها ئەو شتانە بو کە خەلک پیمان نەئەگویزرایەوە. حدکا، وەکو حیزب،

کەلکێکی ئەوتۆی لە چەک و دەسکەوتەکانی ناو پادگان وەرنەگرت، بەڵام ئەم کارە کە تەنیا ٨ ڕۆژ دوای سەرکەوتنی شۆرش ڕووی دا، دەلاقەیەکی گەورەی کردە نێوان سەرانی شۆرش و کوردەوە، بە تایبەتی حدکا کە، وەکو کاربەدەستانی ئێران ئەیانوت، هیچ دەورێکی ئەبو بو لە «قیام» دا دژی شا، کەچی دوای سەرکەوتنی «قیام» ڕاستەوخۆ کەوتە دوژمنایەتی «ئینقیلاب».

*

ئەورۆزی سنە

ئەحمەدی موفتی زادە، کە لایەنگرەکانی خۆی بە «عەللامە» ناویان ئەبرد، لە سنە بەهێزترین کەسایەتی گوێ لێ گیراو بو. دژی ڕێکخراوە چەپەکان بو بە گشتی، بە تایبەتی دژی ڕێکخراوە مارکسیەکان بو، لە گەڵ حدکایش نێوانی ئەبو، خۆی لەوان بە زلتر ئەزانی. ئاینپەرستێکی سونتی شارەزا بو، کێشەی نەتەوایەتی کوردی بە لاوە گرنگ ئەبو. لە دوای سەرکەوتنی شۆرش بو بو بە ناوەندێکی دەسەلات لە ناو شاری سنە و دەورووپشتی دا. ژمارەیەکی زور ئاینپەرستی لە دەوری خۆی بە ناوی «مەکتەبی قورئان» ەوە کۆ کرد بوەوە. کاربەدەستانی شۆرشی ئێرانیش هەندێ ئاخوندی شیعەیان بە نوێنەرایەتی خۆیان نارد بو بۆ سنە، ئەوانیش «دەفتەر» یان دانا بو دەسەلاتەکانیان لە سەرو هەمو دەسەلاتێکەوە بو، کابرایەک سەرپەرشتی ئەکردن ناوی صەفدەری بو.

حدکا، سازکا، چریکی فیدایی، پەیکار، تودە و زور ڕێکخراوی تریش لە سنە بارەگایان دانا بو چالاکییان ئەنواند.

لە نێوان لایەنگرانی موفتی زادە و لایەنگرانی صەفدەری دا هەندێ کێشە ڕووی دابو، بو بو بە هۆی تێکهەڵچونی چەکدار. ئەمە تەشەنەی کرد. خەڵک هەڵیان کوتایە سەر داوودەزگاکانی حکومەت. «شەهرەبانی» یان چەک کرد و، چونە سەر «پادگان» ی سنە ئەویش بگرن. پادگانی سنە گەورە و قەرەبالغ بو. هێزی پەلاماردەرەکانیش ناڕێکوپێک و تێکەڵ و پێکەڵ بون. زووری بۆ تالان چو بون. پادگانەکە خوی نەدا بە دەستەوە بەرگری کرد و، لە کرماشانەوە بە هالیکوپتەر هێزی پشتیوانییان بۆ هات و، نەگیرا. بەڵام شار کەوت بوە دەس خەڵک و، خرۆشانەکە نە نیشت بوەوە. لە تارانەوە دەستەیەکی نوێنەرایەتی پایەبەرز کە پێک هات بو لە: ئایەتوللا سەید مەحمودی طالقانی، ئەبولحەسەنی بەنی صەدر، هاشمی رەفسنجانی.. چون بۆ سنە بۆ لێکولینەوە لە هوی شەڕەکە و، گفتوگۆ لە گەڵ نوێنەرانی ڕێکخراوە سیاسیەکان.

نوێنەرانی ڕێکخراوە سیاسیەکان لە ناو خۆیان دا یەکگرتو ئەبون، بەرنامەیەکی سیاسی هاوبەشیان ئەبو، هەر یەکەیان شتێکی ئەوت و شتێکی داوا ئەکرد، هەموشیان دژی سەرکردایەتی دینیی شۆرش بون. ئەیانویست لە سنەوە ئێران بگۆڕن. سەرەنجام پێکهاتن لە سەر ئەوەی کە دانیشتوانی سنە خۆیان شورایەک هەڵبژێرن بۆ بەڕێوەبردنی شارەکەیان و، لە تارانەوە کەسیان بە سەردا نەسەپێنن.

لەو ڕوژانەدا چەندین کۆبونەوەی جەماوەری فراوان کرا بو، نوێنەرانی ڕێکخراوە سیاسیەکان قسە، یان وەکو خۆیان ئەیانوت «سوخەنرانی» یان تێ دا ئەکرد، لە یەکێ لەو کۆبونەوانەدا کە دەیان هەزار کەسی تێ دا ئامادە بو، غەنی بلوریان قسەی کرد بو. غەنی بلوریان زیاتر لە ۲۰ ساڵ لە زیندانی شادا بو بو، لە ڕوژانی قیام دا ئازاد بوبو، ئەگەرچی

له سەرکردایەتی حدکا بو بەلام بە بیروباوەر تودەیی بو، بە هوی سالانی دریژی زیندانەوە لە دنیا دابراو و بی ئاگا بو لە گورانەکانی هەلومەرجی کوردستان. قسەکانی پیچەوانەی چاوەروانییەکانی خەلک و، خواستەکانیان ئەبی. هەزاران کەس بە یەک دەنگ قسەکانی پی ئەبرن و هاوار ئەکەن: «مامە غەنی بلوریان، بچورەوە بو زیندان!»

*

شەری نەغەدە

حدکا ویستی بە خوپیشاندانیکی سیاسی - چەکدار پارەگاکەی لە نەغەدە بکاتەوە. بو ئەو مەبەستە لە هەمو شارەکانی کوردستانی ئیرانەوە چەکدارەکانی خوی بانگ کرد بو کوبونەوە لە شاری نەغەدە. زورایەتی دانیشتوانی نەغەدە ئازەرین و، کورد کەمایەتیە لە ناو شارەکەدا. ئەم خوپیشاندانەی حدکا بو بە هوی ترس و وروژاندنی ئازەرییەکان. چەکدارەکانی ئەوانیش دامەزران. خوپیشاندانەکە بو بە شەری کورد و ئازەری. شەر چەند روژیکی خایاند و، سەدان کەسی تی دا کوژرا و، سەدان مال و دوکانی تی دا تالان کرا. زوری کوردەکانی نەغەدە ئاوارە بون.

ئەم رووداوە سەرنجی منی راکیشا. کەوتمە لیکولینەوەی پەیوەندی کورد و ئازەری. کەرستەیەکی زورم لە لا کو بوەوە. کتیبی «کورد و عەجەم» ی لی پەیدا بو.

*

گرتنی پادگانی مەهاباد لە ٥٧/١٢/١ و، گەمارودانی پادگانی سنە لە ٥٧/١٢/٢٧ و، هەلگیرسانی شەری نەغەدە ٣١ فروردین ٥٨ (٧٩/٤/٢٤) ئەم رووداوانە بە دوای یەک دا کە هیشتا حکومەتی شورش خوی نەگرت بو، بیوورایەکی زور خراپی لە لای سەرانی شورش و کاربەدەستانی ئیران دروست کرد.

بەشدارانی قیام، سەرەرای جیاوازی بیروباوەر و پایەی کومەلایەتییان، تەنیا لە سەر یەک مەسەلە ریک بون، ئەویش: دوژمنایەتی شا بو، ئەگینا بەرنامەیەکی پیشەکی یا ئامادەکراویان نەبو بو قوناغی دوای شا. تەنیا کەس کە بەرچاوی رون و ئەیزانی چی ئەوی خومەینی بو، خومەینی پش لە هەمویان بە دەسەلاتتر بو. ململانی لە سەر دەسەلات لە ناو بالی دینیی دا، ململانی لە نیوان بالی دینیی و بالی نەدینیی، لە ناو سەرکردایەتی شورشەکەدا هیشتا بە لادا نەکەوت بو. جوری رژیمی داهاتوی ئیران و، جوری دارشتنی پەیوەندییەکانی لە گەل دنیای دەرەوە، گرنگترینی کیشەکانی ناو سەرکردایەتی بو. ئەوەی خومەینی و سەرانی تری شورشەکە بیریان لی نەکرد بوەوە: مەسەلەی نەتەوایەتی بو.

شەرەکانی مەهاباد و سنە و نەغەدە، خواستە سیاسییەکانی کورد کە دران بە نوینەرانی حکومەتی شورش و خومەینی، کاربەدەستانی ئیرانی هوشیار کردەوە.

*

## حشع: ئاردی ناو درک

لە ٩ ی نیسانی ١٩٧٣ دا حکومەتی بەعس «پەیمانی دوستایەتی و هاوکاری» لە گەل یەکیتی سوڤیت ئیمزا کرد. ئەم هەنگاوەی بەعس بە لای سەرانی حشعەوە ئەوەندە گرنگ بو، ئیتر هەمو جورە هاوکارییەکی بو حەلال ئەکردن. بەعس بو پتەوکردنی ریزەکانی ناوخویشی ویستی «جەبهە» یەک لە گەل پارتی و حشع ئیمزا بکا. لەم جەبهەیەدا:

١. بەعس لە بریاردانی سیاسی ناو جەبهە و دەولەت دا، «حیزبی قائید» و،

حیزبەکانی تر حیزبی دوەم ئەبون. هەمو رەخنەیەک لە داوودەزگاکانی حکومەت و حیزبی دەسەلاتدار ئەبو لە ناو چوارچیوەی جبهەدا نەبریتە دەرەوە.

٢. ریکخستنی سیاسی لە ناو هیزە چەکدارەکان دا: جەیش، جەیشی شەعبی، شورطە، ئەمن.. بە تەنیا پاوانی بەعس ئەبو، هیچ حیزبیکی کە بۆی نەبو حیزبایەتیهان تی دا بکا.

٣. ریکخراوە پیشەیی و دیموکراتیەکانی کریکاران، جوتیاران، قوتابیان، مامۆستایان.. ئەبو یەک بخرین.

٤. حوکمی عیراق لە ریگای «مجلس قیادە الثورە» وە بە تەنیا لە دەس خوی دا ئەبی.

لە ناو سەرکردایەتی پارتی دا هەبو، بە تایبەتی هەندی لەوانەی وەزیر بون، بەشدار بونی لەم جبهەیەدا بە چاک ئەزانی، بەلام مەلا مستەفا بی سیودو رەتی کردەوە. حشع بەو مەرجە قورسانە بە تەنیا لە گەل بەعس چوە جبهەوە، بەلام «بەرەیەکی سیاسی نابەرامبەر» بو.

*

سالی ١٩٧٤ کە شەری بەعس و کورد دەستی پی کردەوە، دوسال زیاتر بو حشع هاوپەیمانی بەعس بو. چالاکی قانونی دەس پی کرد بو: ریکخراوەکانی بارەگای ئاشکرایان لە شارەکان دا دامەزراند بو، رۆژنامەی «طریق الشعب» و هەفتەنامەی عەرەبی - کوردی «الفکر الجدید - بیری نوی» ی لە بەغدا دەرئەکرد و، لە بەرەدا بوبون بە ئەندام و، بە دو وەزیر: عامیر عەبدوللا و موکەررەم تالەبانی، بەشداری لە وەزارەت دا و، بە چەند ئەندامی: یوسف حەننا، شیروان عەلی ئەمین، ئەحمەد حامید قادر، ئەحمەد دلزار، ئیبراهیم حاجی مەحمود، حەمە سەعید حەبیب، قادر رشید، خەیری عەبدولحەمید قازی، مەحمود فەقی خدر، سامیە شاکیر، لە داوودەزگا کارتۆنیەکانی حوکمی زاتی بەعسی دا (مەجلیسی تەنفیزی و مەجلیسی تەشریعی) دا، بەشداری کرد بو.

حشع لە سەرەتادا هیوای زوریان لە سەر هاوکاری خویان و بەعس هەلچنی بو، «پەیمانی دۆستایەتی و هاوکاری» لە گەل یەکیتی سۆڤیەت و، «ریگای ناسەرمایەداری» بەعس و دروشمە بریقەدارەکانی، بە جۆری سەری لە سەرانی حشع شیواند بو، کەسیکی خاوەن ئەزمونی دریژی وەکو عەزیز محەممەدی سکرتیری یەکەمی کومیتەی ناوەندی حیزبەکە، چاوەروانی ئەوە بو صەددام حسین ببیتە «کاسترۆ» ی عیراق و، سەرەنجام حیزبی شیوعی و حیزبی بەعس تیکەلاو بین و، ببن بە یەک حیزب.

لە ململانی ی بەعس و کوردا سالی ١٩٧٤، حشع هەمو قورسایی خوی خست بوە لای بەعس. لە سەر ئاستی دنیا، هەولیکی زوری دا، شورشی کورد بەدناو بکا و، لە هەمو حیزبە کومونیستی و سوسیالیستیەکانی دنیای داببری. لە سەر ئاستی ناوخوش، هەرچیەکی پی کرا لە بواری سیاسی، راگەیاندن، چەکدار، تەنانەت کوکردنەوەی دەنگوباس و هەوال بو حیزبی بەعس و دەزگا ئەمنیەکانی کردی.

*

حشع سالی ١٩٣٤ دامەزراوە. لە ١٩٣٤ وە تا سالی ١٩٧٩، کاتی جیابونەوەی لە بەعس، تەنیا ٣ جار کونگرەی گرتوە.

کۆنگرەی سێیەمینی حیزب، لە تەمەنی ٤٢ سالیی حیزب دا، لە ژێر دروشمی: «دەس لە ناو دەس بۆ پێشەوە بەرەو دامەزراندنی سۆشیالیزم لە عێراق دا» لە ناوەراستی ئایاری ٧٦ دا لە بارەگای، حیزب لە گەرەکی مەسبەح لە بەغداد بە ئامادە بونی ٣٠٠ ئەندام بەسترا. بەلگەنامەکانی کۆنگرەکە بە زوری تەرخان کرا بۆ بۆ پیا هەلدانی دەسکەوتەکانی حوکم و، بەرە.

عەزیز محەممەد لەو تەقریرەدا کە بە ناوی کۆمیتەی ناوەندیەوە لە بەردەمی کۆنگرەدا خویندیەوە لە چەند جێگایەکی دا بەمجۆرە باسی جولانەوەی کوردی کرد:

- «ویقف فی مقدمة منجزات الجبهة وضع قانون الحکم الذاتی لمنطقة کردستان وتصفیة التمرد الیمینی الرجعی فیها»

- «وان انهیار التمرد الرجعی المسلح خلق امکانیة موضوعیة افضل لتطبیق الحل السلمی - الدیمقراطی للمسألة الکردیة»

د. موکەررەم تالەبانی، کە ئەوسا یەکی بو لە دو وەزیرەکەی حشع لە ناو وەزارەتەکەی بەعس دا، لە ستایشی ئەو عەفوەدا کە بەعس بۆ بەشدارانی جولانەوەکەی دەرکرد، سەر وتاریکی بە عەرەبی لە ژێر ناونیشانی: «اشداء علی الکفار رحماء بینهم» بۆ گۆڤاری «رۆژی کوردستان - شمس کردستان» نوسی. لە وتاریکی کەوا کە بە کوردی بۆ هەمان گۆڤاری نوسی بو بە بۆنەی گرتنی دو کۆنگرەی جیاوازی کۆمەلەی خویندکارانەوە بە هۆی ناکۆکی یەکیتی و پارتیەوە، ئەم دو لایەنەی شوبهاند بو بە سەگەکانی لەیلان و تەپلو.

پیخوشحالی ئاشکرای حشع بە تیشکانی بزوتنەوەی کورد و، پشتیوانی لە ریککەوتنی جەزائیر، لە لایەک بۆ رازی کردنی سەرکردایەتی بەعس، بە تایبەتی صەددام حسین و، لە لایەکی ترەوە لە بەر ئەوە بو وای ئەزانی ئەو بۆشاییە گەورەیەی لە ئەنجامی ئاشبەتالی سەرکردایەتی بارزانی دا دروست بوە، بەمان پر ئەکریتەوە. ئەمە خەیالیکی بەتال دەرچو. بەعس ئەیویست خۆی بۆشاییەکە پر بکاتەوە. کە لە مەسەلەی کوردا یەک چاو بوەوە و، ئیتر ئیشیکی بە حشع نەما، کەوتە تەنگ هەلچنین بە بنکەکانی حیزب و، ئازاردانی ئەندامەکانی پلەکانی خوارەوە.

کۆمیتەی ناوەندی لە ئازاری ١٩٧٨ دا کۆبونەوەی تەواوی ئەندامەکانی کرد و، راپورتیکی دریژی لە سەر هەلومەرجی جیهانی و، عەرەبی و، ناوخو بلاو کردەوە. مانشیتی راپورتەکە ئەمە بو: «صیانة التحالف الوطنی وتعمیق المسیرة الثوریة مهمة کل قوی شعبنا التقدمیة».

سەرەتا راپورتەکە بەمجورە دەس پی ئەکا:

«شهد العالم خلال السنة المنصرمة - منذ انعقاد الاجتماع الکامل الاعتیادی للجنة المرکزیة فی ١٨/ شباط ١٩٧٧ - استمرارا لعملیة تغیر میزان القوی لصالح القوی الثوریة العالمیة، وفی طلیعتها المنظومة الاشتراکیة.

فقد تحققت فی بلدان المنظومة الاشتراکیة، وفی مقدمتها الاتحاد السوفیتی، انجازات کبیرة فی تنفیذ خطط تطویر الاقتصاد الوطنی علی طریق تعزیز اسس المجتمع الاشتراکی المتطور، وبناء القاعدة المادیة والتکنیکیة للشیوعیة، واحراز منجزات ضخمة فی میادین العلم والتکنیك، وتعزیز القدرة الدفاعیة، وتوطد التلاحم والتعاون الوثیق بین الاحزاب الشیوعیة

في بلدان المنظومة الاشتراكية، ويتعزز التكامل الاقتصادي فيما بينها.»

له باسی هەلومەرجی ناوخۆدا دوای ئەوەی ستایشی سیاسەتی عیراق ئەکا لە دوژمنایەتی پیلانەکانی ئیمپریالیزم و سەهیونیزم و کۆنەپەرستی دا، باسی خۆش بونی گوزەرانی زور لە کەرتەکانی گەل و، پەدیهێنانی مافی شارستانیی ئافرەتان، ئەکا، ئینجا ئەنوسی: «وواصل العراق سياسته المعادية للامبريالية، على الصعيد الدولي، وساند سياسة التعايش السلمي والانفراج الدولي ونزع السلاح، و عارض بحزم سباق التسلح وانتاج القنبله النيوترونيه. وقدم الدعم السياسي والمادي لحركات التحرر الوطني في اسيا وافريقيا وامريكا اللاتينيه. وكان موقف العراق في منظمه الامم المتحده ووكالاتها والمنظمات العالميه بارزا في الدفاع عن مصالح الشعوب والتصدي للسياسه الامبرياليه.

ان مسيرة العراق التقدمية هذه تثير حقد الدوائر الامبريالية والصهيونية والرجعية، التي راحت تخطط، ضمن الهجمة الشرسة على حركة التحرر الوطني العربية للتامر على العراق. واصبح العراق هدفا مباشرا لهذا التامر، خاصة بعد التطورات الاخيرة، في اوضاع المنطقة، اثر زياره السادات للقدس المحتله وتزايد المساعي لاحياء الاحلاف العسكريه الرجعيه - الامبرياليه، وتوريد السلاح الامريكي بكميات هائله ونوعيات متطوره الى الانظمه الرجعيه في المنطقه.

ومما له دلالته الخاصه، بهذا الصدد، اتساع الحمله الفكريه والاعلاميه الامبرياليه - الرجعيه ضد العراق. اذ دابت وسائل الاعلام، بشكل ملحوظ موخرا، في بعض الدول الرجعيه في المنطقه والقوى الرجعيه واليمينيه في الداخل، على السعي لشق الصف الوطني، واثاره الخلافات بين اطرافه، ومهاجمه الجبهه الوطنيه والقوميه التقدميه، والتحالف بين حزب البعث العربي والحزب الشيوعي العراقي. وتسعير العداء للشيوعيه والتشكيك بعلاقات الصداقه والتعاون مع الاتحاد السوفيتي، ومهاجمه تعزيز القدرات الدفاعيه للعراق، والتهديد باثاره المصاعب الداخليه وتقديم المساعدات للعناصر المعاديه للسلطه الوطنيه.»

هەرکەس بە چاوی بەراورد و رەخنەوە لەم راپورتە ورد ببیتەوە بەزەیی بە جەماوەری حشع دا دیتەوە، چ سەرکردایەتیەکی هەبوە و، چۆنی سەرکردایەتی کردوە، دەربارەی حیزبی بەعس هەمو بۆچونەکان پیچەوانە دەرچون:

- عیراق لە چوارچێوەی سیاسەتی ئەمەریکی دا پەیمانی جەزائیری لە گەڵ شا مور کرد بو، بۆ ئەوەی کیشەی کوردی لە کول ببیتەوە و، دەستی بەتاڵ بی بۆ دوژمنایەتی سوریا، چونکە سوریا لەو کاتەدا دژی ریککەوتنی «فصل القوات» ی ئیسرائیلی - عەرەبی بو.

- عیراق خەریکی دروستکردنی چەکی کوشتنی بە کۆمەڵ بو: چەکی ناوکی، کیمیایی، بایولوجی.

- عیراق سیاسەتی پیکەوە ژیان بە ئاشتی نەگرت بو، لە گەڵ دراوسیکانی: سوریا و ئیران ناکوک بو، زوری نەخایاند هیرشی کردە سەر ئیران جەنگیکی خویناوی دریژی هەڵگیرساند لە هەردو میللەت سەدان هەزار کەس کوژرا و، سەدان ملیار دولار زیانی ماددییان لی کەوت.

- ستایشی یەکیتی سۆڤیت و پیشکەوتنی ئابوری و تەکنولوجی بە راست دەر نەچو، چونکە ئەویش هەرەسی هینا و، کە حشع بەر لیدان کەوت نە سۆڤیت و، نەهیچ

ولاتیکی تری «مەنظومە» ی ولاتانی سوسیالیستی لە سەری هەڵ ئەدایە و، لە سەری نەکردەوە.

*

بەعس لەو کاتەوە هات بونە سەر کار دەستی بە سەر هەمو رۆژنامەکانی عیراق دا گرت بو:

– الثورە، رۆژنامەی سەرکردایەتی حیزبی بەعس بو.

– الجمهوریە، رۆژنامەی وەزارەتی ئیعلام، واتە رۆژنامەی حکومەت بو.

– التاخی، رۆژنامەی پارتی بو، دوای دەس پی کردنەوەی شەر بەعس خۆیان بە ناوی حیزبە کارتۆنییەکانی کوردەوە دەریان ئەکرد. دواییتر ناوەکەیان گۆری بە العراق.

– طریق الشعب، رۆژنامەی حیزبی شیوعی بو.

– حەفتەنامە و مانگنامەی عەرەبی، ئینگلیزی، کوردی، تورکمانی کە لە عیراق دەرئەچون، هەمویان مولکی دەولەت بون، رۆژنامە و گۆڤاری ئازاد یا مولکی تایبەتی نەما بو.

– الراصد، کۆلکە رۆژنامەیەکی عەرەبی بو لە پاشماوەی رۆژنامەکانی سەردەمی عارف، کابرایەکی قەلەمفرۆش بە ناوی: مصطفی عبداللطیف الفکیکی، ناو بە ناو بە فەرمانی بەعس، بۆ باسی بابەتیکی تایبەتی، بلاوی ئەکردەوە.

دوای بلاوکردنەوەی راپورتەکەی حشع، «الراصد» هەر چوار لاپەرەکەی ژمارەی ٤٢٨ ی رۆژی ٢٩ ی نیسان – ١٢ ئاباری ١٩٧٨ ی بۆ بەرپەرچدانەوەی ئەم راپۆرتە تەرخان کرد بو. بە مانشێتیکی گەورە نوسی بوی: «نهج غیر موضوعی علی حساب الحقیقە: مناقشە نقدیە للتقریر السیاسی للجنە المرکزیە للحزب الشیوعی العراقی». دیار بو بەعس ئیتر ئیشی بە حشع نەمابو، گەری پی ئەکرد، حشع ئەبو لە قیکەی خۆی تی بگەیشتایە.

هەمو ئەم مەدح و سەنایە، حیزبی بەعسی رازی نەکرد، لە مانگی مایس دا ٣١ ئەندامی حیزبی شیوعی، بە تاوانی ئەوەی لە ناو ریزی هیزە چەکدارەکانی عیراق دا ریکخستنیان دروست کرد بو، بە ئیعدام حوکم دا و ئیعدامی کردن و، کەوتە گرتن و راونانی ئەندامەکانی. سەرکردایەتی حیزب چاوەروانی هیرشی وەهای نەئەکرد لە بەر ئەوە هیچ پلانیکی نەبو بۆ خۆپارستن. هەمو هەولەکەیان ئەوە بو عەزیز محەممەد چو بۆ بینینی صەددام بۆ ئەوەی تکای لی بکات ئەگەر هەر ئیعدامیان ئەکات، لە رۆژی دامەزراندنی حشع دا ئیعدامیان نەکات، بەلکو جیبەجی کردنەکەی چەند رۆژی دوا بخات، بۆ ئەوەی ئەو یادەیان لی تیک نەچی و سوکایەتییان بە سەردا نەیەت. ئەندامانی سەرکردایەتی بە دوای یەک دا چونە دەرەوەی عیراق. بە ولاتانی سۆشیالیستی و یەمەن و لوبنان و سوریادا بلاو بونەوە. چەند کەسیکیان لە بەغداد و کوردستان مابونەوە. دەزگاکانی ئەمن شیوعیەکانیان زەلیل ئەکرد، ئەیان گرتن و پاکانەیان پی ئەکردن و، ئیعترافیان پی ئەنوسین.

لەو هەلومەرجە سەختەدا کە شیوعیەکانی تی کەوت بو، مەلا ئەحمەدی بانیخیلانی: ئەندامی کومیتەی ناوەندی حشع، لە شوباتی ١٩٧٩ دا گەیشتە ناوزەنگ. مامجەلالی بینی. مەلا ئەحمەد نەیئەزانی حیزبەکەیان بە تەمای چیە و چی ئەکا. لەو کاتەدا دەسەلاتی حکومەتی ناوەندی لە کوردستانی ئیران دا نەما بو. حدکا خەریک بو دەسەلاتی پەیدا

ئەکرد. چو بۆ تیهران لەوی سەردانی حدکای کرد. بە تەمای ئەوە بو کادر و ئەندامە راونراو و لیقەوماوەکانیان لە کوردستانی ئیران دا نیشتەجی بکا تا ئاسوی سیاسی رون ئەبیتەوە و، دەرئەکەوی کە پەیوەندیەکانی نیوان ئەوان و حیزبی بەعس بە کوی ئەگا. وا دیار بو حدکا بە دەنگیەوە نەهات بو. مەلا ئەحمەد گەرایەوە ناوزەنگ پارەگایەکی پچوکی دانا.
سەرکردایەتی یەکیتی هەندی چەکیان بە دیاری دایە و، خەرجی ژیانی پارەگاکەیانی وەکو هەمو پارەگاکانی تری یەکیتی دابین کرد. تاک و تەرا شیوعیەکان ئەگەیشتنە بنکەکەی خویان و، یەکیتی «تعلیمات» ی دابو بە هەمو ریکخراوەکانی و پیشمەرگەکانی لە هەر کوی یەک هەر شیوعیەک پیویستی بە یارمەتی بو کومەکی بکەن، بە تایبەتی بۆ دەرباز بون لە چنگ داوودەزگاکانی بەعس. لە ئەندامانی کومیتەی ناوەندی حشع: فاتح رەسول و توما توماس و، هەندی لە کادرە ناسراوەکانیان گەیشتنە ناوزەنگ. بەمجورە سەدان شیوعی دەرباز کران و، زوری پی نەچو ژمارەیان گەیشتە چەند سەد کەسی.
مامجەلال و هاوریکانی تر بە خوشییەکی زورەوە جیابونەوەی بەعس و حشع یان وەرگرت. یەکەم، چونکە لایان وابو بە هاتنی حشع بۆ شاخ، پشتیوانی یەکیتی سوڤییت و هەمو حیزبە شیوعییەکانی دنیا لە گەڵ خوی ئەهینی بۆ شاخەکانی کوردستان. دوەمیان، بوچونەکانیان سەبارەت بە حیزبی بەعس و سروشتی رژیمەکەی و، پاشەروژی هاوپەیمانیتی شیوعی - بەعس، بە راست دەرچو بو.

*

لە مانگی نیسان دا بەهائەدین نوری و کەریم ئەحمەد بە دوای یەک دا گەیشتنە ناوزەنگ. هەردوکیان لە سوریاوە بە ریگای تاران دا هات بون. ئەوان هاوریکانی خویان و ئیمەیان ئاگادار کرد کە حشع بریاری داوە خەباتی چەکدار بکا بۆ روخاندنی رژیمی بەعس و، ئەیانەوی بەرەیەکی سیاسی فراوان لە هەمو هیزە عیراقیەکانی نەیاری بەعس پیک بهینن. بەهائەدین و کەریم زور نەمانەوە گەرانەوە بۆ ئیران لەویوە چونەوە بۆ سوریا. مەلا ئەحمەدیش زوری وەختەکە لە ئیران بو، بە زوری فاتیح رەسول لە ناوزەنگ بو.
تا ئەو کاتە جگە لە ناوزەنگ لە هیچ جیگایەکی تر بنکەیان نەبو و، هیشتا مەفرەزەی چەکداریشیان دروست نەکرد بو.
سەرانی حشع بە یەک چاو سەیری یەکیتی و پارتیان ئەکرد. لە ناکوکی نیوان یەکیتی و قم دا، ئەیانویست دەوری ریش سپی ببینن. کەوتنە هەوڵدان بۆ ئەوەی لە گەڵ قم یش دوستایەتی دابمەزرینن. قم ئەو کاتە هیزیکی سیاسی بەدناوی دابراو بو لە هیزەکانی تر، پیویستی بە دوستایەتی حشع هەبو، بۆ ئەوەی ناوبانگی خوی چاک بکا لە ناو کوڕە پیشکەوتنخوازەکان دا، حشع یش چونکە لە گەڵ بەعس هاوکاری کرد بو دژی شورشی کورد و پارتی، ئەیویست ئەو رابوردوە ناشیرینەی خوی لە گەڵ پارتی پاک بکاتەوە. راستیەکەیشی حشع پیویستیەکی زوریان بە پارتی هەبو، چونکە ئەوان لە بادینان ئەیانتوانی بۆ کاری حیزبی و هاتوچوی سوریا، ریگایان بدەن یا ریگایان لی بگرن.
سەرانی حشع بەرامبەر بەعس باوەریان وابو: بەعس لەو روژەوە خراپ بوە کە لە مانی داوە.
لە هەموی سەیرتر ئەوەبو، حشع ئەوسا و ئیستایش خوی بە نوینەری (تیار) ی دیموکراتی دائەنا. کە هیزەکانی موعارەضەی عیراقی پوڵ پوڵ ئەکران بۆ (تیار) ی قەومی

عەرەبی، دینیی، کوردی.. ئەو خۆی بە نوێنەری تەیاری دیموکراتی دائەنا. لە کاتێک دا کۆمۆنیزم، بە تایبەتی لەو زەمانەدا، باوەری بە دیکتاتوریەتی پرولیتاریا هەبو نەک بە دیموکراسی.

من خۆم پێشتر هیچ تێکەلاوییەکم لە گەڵ سەرانی حشع نەبو، کەسم لە سەرکردەکانیان لە نزیکەوە نەدی بو و، نەئەناسی، بەلام لە سەردەمی «اتحاد الشعب» و «ئازادی» ەوە تا سەردەمی «طریق الشعب» و «الفكر الجديد» و «الثقافة الجديدة» بەردەوام رۆژنامە و بلاو کراوە ئاشکرا و نهێنیەکانم خوێند بونەوە و، چاودێری رەوتی سیاسی و ناکۆکییەکانی ناو ریزەکانیانم کرد بو. زۆر لە هاوڕێکانم کە پێشتر ناوی هەندی لە سەرکردەکانی حشعی بیست بو، کە دەیان ساڵ ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی و، مەکتەبی سیاسی بون و، لە سۆڤیەت خوێند بویان و، سەردانی چەندین کۆنگرەی جیهانییان کرد بو، وایان ئەزانی ئەمانە سیاسی زانا و بلیمەت و، فەیلەسوفی هەلکەوتون، تین و تەوژمێکی سیاسی و ئایدیۆلۆجی بە جولانەوەکە ئەدەن. دوای ناسین و ئاشنا بون، وەکو ئەڵێن: «دەنگی دەهۆڵ لە دور خۆشە!» دەرکەوت زۆری ئەمانە کەسانی بێ ئاگا بون لە روداوەکانی کوردستان و عیراق و ناوچەکە و دنیا. سەرچاوەی سەرەکی رۆشنبیریان هەندی لە نامیلکە و کتێبەکانی «دار التقدم» و، سەرچاوەی ئاگاداری و زانیارییەکانیشیان بەشی عەرەبی رادیۆی مۆسکۆ بو.

*

## جیابونەوەی بزوتنەوە

ئیمە لە خۆشیی روخانی شا و سەرکەوتنی گەلانی ئێران دا بوین، هەزار و یەک هیوای سەوز و سورمان لە سەر هەلچنی بو، لە پر یەکێتی دەلاقەیەکی تێ کەوت.

نەورۆزی ٧٩ رەسول مامەند بارەگاکەی خۆی لە زەلی وە گویزایەوە بۆ گۆرەشێر و، د. مەحمود عەلی عوسمانیش لە ناوزەنگەوە چو بۆ لای. بەمجۆرە بزوتنەوە جیابونەوەی خۆی لە یەکێتی راگەیاند و، د. مەحمودیش دورکەوتنەوەی خۆی ئاشکرا کرد و، «بزوتنەوە» و «کۆمیتەی ئامادە کردن» پێکەوە کەوتنە هەولی دروستکردنی حیزبێکی تازە. چەند رۆژی بو حازم لە سوریاوە هات بو. حازم ئەو زەمانە «امین سر» ی «قیادەی قطری» ی حیزبی بەعسی سەر بە سوریا و، لێپرسراوی «مكتب شوون العراق» بو لە «قیادەی قەومی» لە شام. هەولێکی زۆری لە گەل داین، جیابونەوەکەیان دوا بخەن و، ئەو بکەوێتە ناوبژی بۆ چارەسەرکردنی ناکۆکییەکانی نێوان یەکێتی و ئەوان. هەولەکەی سەری نەگرت بو.

ئەم تاقمە لەم جیابونەوەیە بە تەمای چەند شتێ بون:

- لایان وابو ئەگەر لە یەکێتی جیا ببنەوە و، سەربەخۆیی سیاسی و رێکخراوەیی و پێشمەرگەیان هەبی، زورتر گەشە ئەکەن و زیاد ئەکەن و، بەهێز ئەبن.
- لایان وابو ئەتوانن خەتی سێهەم لە نێوان جەلالی و مەلایی دا دروست بکەن و، هاوسەنگی نێوان ئەم دو حیزبە تێک بدەن. زوری پێشمەرگەکانی هەردولا و، ئەندام و کادرەکانیان کە لە ناکۆکی ئەم دولایە و، شەری براکوژی بێزار بون، لە مان کۆ ئەبنەوە.

- لایان وابو حکومەتی عیراق ئامادەیە بە ریگای گفتوگوی سیاسی چارسەری کیشەی کورد بکا، بەلام یەکیتی بو رازی کردنی سوریا و توع دریژە بە شەر ئەدا، ئەگەر ئەمان سەربەخو بن بە جیا لە یەکیتی ئەتوانن لە گەل بەعس ریک بکەون.
بو جیابونەوەکەیشیان چەند بیانویەکیان ئەهینایەوە:
- مامجەلال تاکرەوە، گوی ناداتە سەرکردایەتی بە کومەل، بیروراکانی خوی ئەسەپینی، تورە ئەبی و ریزی شعوری هاوریکانی ناگری.
- مامجەلال بە لای کومەلەدا دائەشکینی، کومەلە لە سەر حسابی بزوتنەوە بە هیز ئەکا. لە دابەشکردنی چەک و پارەدا زورتر بەشی کومەلە ئەدا، کومەلەیش «ماوی» و «متطرف» ن، دژی دین و مەلان و، دژی ئاغا و سەروک عشیرەتن.
هیچ هەول و تەقەلایەک بو پەشیمان کردنەوەیان لەم هەنگاوە سەری نەگرت. سور بون لە سەر هەلویستی خویان. حدکاییش، بە تایبەتی د. قاسملو، کە ئەو کاتە بوبون بە هیزیکی گرنگ لە ناوچەکەدا، هانی دابون و بەلینی دابونی پارمەتییان بدات و کارئاسانییان بو بکات.

*

رەسول مامەند لە سەرەتادا کە چوە گورشیر و جیابونەوەی بزوتنەوەی لە یەکیتی راگەیاند، لە ئەندامانی سەرکردایەتی: تایەری عەلی والی، حاجی حاجی ئیبراهیم، سەید کاکە، قادر عەزیز، مەلا ناصیح و، د. مەحمودیش، قادر جەباری و عەدنان موفتی لە گەل رویشت بو. بە هەمویان ۱۰ کەسیک ئەبون. جیابونەوەی رەسول شتیکی چاوەروانکراو بو، بەلام رویشتنی د. مەحمود بو هەمومان کتوپر بو، چونکە هیچ کاتی باسی شتی وای نەکرد بو. بەلام دوایی دەرکەوت د. مەحمود دەستیکی بالای هەبوبو لە هاندانی رەسول و هاوریکانی دا بو ئەم کارە. ئیمە کە دانیشتین بو لیکولینەوەی کیشەکە و، دیاریکردنی هەلویستی یەکیتی لەوان، گەیشتینە ئەو باوەرەی مادەم ئەوان بە هاوخەباتی ئیمە رازی نین خواحافیزیان بی و، هەرکەسیکی کەش ئەروا بو لایان ریگەی لی نەگرین خوا حافیزی بی.
ئەم کارە هیزەکانی یەکیتی و ریکخراوەکانی بزوتنەوەی لە سەرانسەری کوردستان دا لەت کرد و، پشیوی و ئاژاوەی قولی خستە ناو ریزەکانی پیشمەرگەوە. پاش چەند روژی هەندی لە فەرماندەکانی پیشمەرگەیش جیابونەوەی خویان راگەیاند. بە کردەوە بەشی هەرەزوری سەرکردەکانی بزوتنەوە و، ریکخراوەکانی و کادرەکانی و پیشمەرگەکانیان لیمان جیا بونەوە. عومەر مستەفا مابوەوە، ئەویش کەسی لە بزوتنەوە بە دەورەوە نەبو.
مامجەلال حەزی نەئەکرد ئەو راستیە بسەلمینی کە: بزوتنەوە لە یەکیتی جیا بوتەوە، بەلکو ئەیوت ئەمە بالیکی بزوتنەوەیە و بزوتنەوەی راستەقینە لە گەل یەکیتی ماون. لە گەل کاک عومەر قسەی کرد بو ئەوەی بزوتنەوە دروست بکەنەوە. نامەیان بو هەندی لە کادرەکانی شار نوسی کە لە ریزی بزوتنەوەدا کاریان ئەکرد و، زوریان کونە جەلالی بون پینە دەرەوە. بە دوای یەک دا هاتن. لە راستی دا بزوتنەوەکەی ئەمان لە چاو ئەوەی رەسول دا لاواز و، تا رادەیەک دروستکراو بو، نەیتوانی کادر و فەرماندەکانی بزوتنەوە رابکیشیتەوە بو لای خوی، هەرگیز نەیتوانی ئەو بوشاییە لە ناو یەکیتی دا پر بکاتەوە کە بە جیابونەوەی رەسول و هاوریکانی دروست بوبو.

*

**سیروان و زیرینجو**

شەوی ۲۹ - ۳۰ ی نیسانی ۷۹ جاشەکانی زەراین، بە سەرکردایەتی حەمە خانی حاجی دارا، بۆسەیەکی گەورەیان لە نزیک ئاوایی زیرینجو لە دەشتی شارەزوور دانا. سیروان (فەیصەل رشید تالەبانی) و، تاقمی لە پێشمەرگەکانی هەرێمی کەرکوک کە لە سەرکردایەتییەوە ئەگەڕانەوە بۆ بەری قەرەداغ کەوتنە ناوی. پێشمەرگەکان لە ناو عەرەبانەی تراکتوریک دا سوار بوبون. لە بۆسەکەدا ٥ پێشمەرگە: سیروان (فەیصەل تالەبانی)، صدیق ئیبراهیم (حاجی چاوشین)، حەسەن ئەحمەد خاوی بی، عەلی چەلەبی، نەجات رەحیم کەریم و، دوهاولاتی: کوژران و، ئەوانی تریان زۆر بە زەحمەت دەرباز بون.

حەمەخان وەکو دوایی دەرکەوت جاش - پێشمەرگەی پارتی بو، کە ئەم لەو ناوچەیەدا چاند بوی.

سیروان، هاوڕێ ی کومەلە و، یەکی بو لە پێشمەرگەکانی مەفرەزەکانی سەرەتای دەسپێکردنەوەی خەباتی چەکدار. لە پێشمەرگایەتییەوە دەستی پی کرد بو، بوبو بە فەرماندەی مەفرەزە و، کەرت و، ئینجا فەرماندەی هەرێمی کەرکوک. یەکی بو لە باشترین فەرماندەکانی پێشمەرگە. شارەزاییەکی زۆری لە ناوچەکە و دانیشتوانی و، هێزەکانی دوژمن دا پەیدا کرد بو. سەرکردایەتی دەیان چالاکی کرد بو. داوودزگا سەرکوتکەرەکانی ڕژێم بە تایبەتی جەیش زور بە داخ بون لی ی. لە مایسی ۷۹ دا هاتە ناوزەنگ. ماوەیەک مایەوە، چەند ڕۆژێکی میوانی من بو. لەو بی سەر و بەرەیدا کە ئێرانی تی کەوت بو، زۆری پادگان و پاسگاکان تالان کرا بون، چەک و تفاقی جەنگ لە بازاری شارەکان دا ئەفرۆشران. هەندی چەکی سوک و ناولەی و نارنجۆک و مین و هوکی توکی مان بۆ هەرێمەکەی کری و، گەڕایەوە بۆ ناوچەی قەرەداغ.

سیروان لە ناو پێشمەرگە و خەلک دا خۆشەویست بو، کوژرانی زەرەرێکی گەورە بو لە کۆمەلە و یەکیتی.

ئەم خیزانە تێکۆشەرە لە شۆرش دا زەرەری زۆریان لی کەوت. جگە لە سیروان، براکانی تری: ئەیوب و غەریب و عومەر، هەریەکەیان لە مەیدانێکی تێکۆشان دا کوژران.

*

به بۆنەی مردنی مەلا مستەفاوە:

# مەلایی و جەلالی لە تەرازودا

ڕۆژی ١ ی مارتی ١٩٧٩ ئاژانسەکانی دەنگوباس بڵاویان کردەوە کە مەلا مستەفای بارزانی لە نەخۆشخانەیەکی واشنتۆن کۆچی دوایی کردوە. ئەم هەواڵە چاوەڕوانکراو بو، چونکە لە مێژ بو مەلا مستەفا تۆشی سەرەتانی سی بوبو، هەر بەو بیانوەشە لە ئێرانەوە چو بوە ئەمەریکا و لەوێ مابوەوە. ڕۆژنامەی «دەیلی تەلەگراف» ی لەندەنی لە ژمارەی ڕۆژی ٣ ی مارت دا نوسی بوی کە بارزانی لە سەر حسابی «سیا» تیمار کراوە. بەڵام ق م ئەم هەواڵەی بە درۆ خستەوە و، نوسی کە خۆیان خەرجی نەخۆشخانەکەیان داوە، داوایان لە ڕۆژنامەکە کرد بە درۆ خستنەوەکەیان بڵاو بکاتەوە، ڕۆژنامەکە پشت گوێ ی خست.

کۆچی مەلا مستەفا لە کوردستان و، لە ناوچەکە و، لە ناو حیزبە کوردیەکانی کوردستان دا، بە جۆری جیا جیا دەنگی دایەوە.

ناوبانگی مەلا مستەفا و پارتی لە ئێران دا باش نەبو. بە نۆکەری شا و ساواک ناسرا بون. لە ناو کوردا بە بەرپرسی خوێنی سلیمانی موعینی و چەندین کەس لە کوردەکانی ئێران ناسرا بو. هەر لەبەر ئەوەش لە خۆپیشاندانی شارەکانی کوردستانی ئێران دا، یەکێ لەو هوتافانەی دوبارەیان ئەکردەوە:

قیادەی موەقەتە - گورگە لە ناو میللەتا.

کێ بو کاک سولەیمانی کوشت؟ بارزانی بو بارزانی!

لە کۆبونەوەی نوێنەرانی شورای شارەکانی کوردستان دا لە مەهاباد یەکێ لە داواکانیان لە نوێنەرانی حکومەتی ئێران دەرکردنی سەرانی قیادەی موەقەتە بو.

مردنی مەلا مستەفا لە ناو ئێران دا بە جۆری جیاواز دەنگی دایەوە. ڕۆژنامەکانی تاران، بە تایبەتی ئەوانەی لای چەپ بون، بە خراپی لە سەریان نوسی. قسەکەرێکی حدکا لە ڕۆژنامەکانی تاران دا دژی قسەی کرد و، کۆمەڵەی زەحمەتکێشان بەیانێکی درێژی لە سەر دەرکرد کردەوەکانی مەلا مستەفای بەرامبەر کوردەکانی ئێران بە بیر هێنا بوەوە. بەڵام هەڵوێستی ڕەسمیی حکومەتی ئێران جیاواز بو. ڕێگەیان دا تەرمەکەی لە ئەمەریکاوە بهێننەوە بۆ تاران و، حکومەتی ئێران خۆی بە هالیکۆپتەر گوێزایانەوە بۆ شنۆ و، ڕێگەیان دا بە پارتی ئەمە بکا بە موناسەبەتێک بۆ خۆپیشاندانی سیاسی و چەکدار.

بنەماڵەی بارزانی و سەرانی پارتی ویستیان ئەم ڕوداوە بکەن بە بۆنەی کڕینەوەی ئابڕوی خۆیان. ساڵی ١٩٤٥ کە بارزانیەکان چونەتە ئێران بە هۆی نەخۆشی تیفوسەوە چەند سەد کەسێکیان لێ مرد بو، لە شنۆ نێژرا بون. تەرمی مەلا مستەفایان بە فڕۆکە هێنایەوە تاران و، حکومەتی ئێران بە هالیکۆپتەر گوێزایەوە شنۆ. پارتی هەر دۆستێکیان لە کوردستانی ئێران دا هەبو نامەیان بۆ هەمویان نوسی، هەروەها هەمو بارزانیەکان و ئەندامەکانی پارتی و چەکدارەکانیان بانگ کرد لە شنۆ کۆ ببنەوە. مەراسیمی ناشتنی تەرمەکەیان بە جێ هێنا. چەند کەسی بەم بۆنەیەوە شیعریان خوێندەوە و مەسعودیش لە

باتی بنەماڵەکەیان سپاسی بەشدارەکانی کرد.
بێگومان مەلا مستەفا یەکێ بو لە گەورەترین سەرکردەکانی کورد لەم قەرنەدا. لە ناو خەلکی کوردستان دا لە هەمو سەرکردەکانی کە زیاتر پشتیوانی لێ کراوە، لە هەمویان زورتر سەرکردایەتی جولانەوەکەی کردوە و، لە هەمویان زیاتر لە سیاسەتی ناوەوەی عیراق و، لە سیاسەتی کوردیی دەولەتانی ناوچەیی ئیران و تورکیا و، دەولەتانی گەورە: بەریتانیا، یەکیتی سوڤیەت، ئەمەریکادا دەوری هەبوە.
بە زور زمانی جیاواز، وتار و نامیلکە و کتیب لە سەر مەلا مستەفا و بارزانیەکان نوسراوە. زوری ئەم کتیبانە بیلایەن نین، یا دەرویشەکانی بارزانی نوسیویانە بو ستایش و پیا هەلدان، یا دوژمنەکانی نوسیویانە بو شکاندن و سوکایەتی پی کردن. هەتا ئیستا بیوگرافی مەلا مستەفا و لیکولینەوەیەکی بیلایەن، پشت ئەستور بە بەلگەکانی کورد خوی و، بە بەلگەی ناو ئارشیفەکانی عیراق، ئیران، تورکیا، یەکیتی سوڤیەت، بەریتانیا و ئەمەریکا، لە سەر خوی و جولانەوەکانی نەنوسراوە. بێگومان ئەمە ناتەواوییەکی گەورەیە لە روشنبیری کوردی دا.
ئەوانەی هاوچەرخ و هاوکاری مەلا مستەفا بون، کەسیان شتیکی ئەوتویان لە سەر نەنوسیوە. هەندیکیان مردون و هەندیکیشیان بە ریگاوەن بەرەو مردن. رەنگە زور مەسەلەی گرنگ کە رونکردنەوەی بو میژوی کورد پیویست بی، بە مردنی ئەمانە بچیتە ژیر گل.
بە مردنی مەلا مستەفا دەوری بنەماڵەی بارزانی لە ناو جولانەوەی کوردا تەواو نەبو. ناکوکی نیوان یەکیتی و پارتی هەرما. بو تیگەیشتن لە پیشینەی میژویی ئەم ناکوکییە لیرەدا بە پیویستی ئەزانم ئاگادارییەکانی خوم، کە هەندیکیم لە کتیب و سەرچاوەی جوراوجور وەرگرتوە و، هەندیکیم لە هاوکارەکانی بیستوە و، هەندیکیشی خوم تیا ژیاوم، بەم بونەیەوە بگیرمەوە. خوزگەم ئەوی ئەم باسەی من ئەخوینیتەوە، باسەکەی هەژاری موکریانی یشی ئەخویندەوە کە کردویەتی بە پاشەکی چاپی تارانی «شەرەفنامە» بو ئەوەی تیگەیشتنیکی باشتری لە لا دروست بیی. هیوادارم لە پاشەروژدا کەسانی کە لیکولینەوەی زانستی لە سەر لایەنە جیاوازەکانی ژیانی مەلا مستەفا بنوسن.

*

## شیخ محەمەدی بارزانی

ناوی بنەماڵەی بارزانی لە میژ نیە کەوتوتە ناو میژوی سیاسی کوردەوە. ریچەلەکیشیان بو دور ناچی. هەرچەندە هەندی نوسەری تازەی کورد، ریچەلەکیان ئەبەنەوە بو سەر میرەکانی ئامیدی و، لەوانیشەوە بو سەر خەلیفەکانی عەبباسی، بەلام جگە لە ئیدیعایەکی بی بناغەی مەلا مستەفا خوی، کە لە سالانی دوایی تەمەنی دا کردویەتی، هیچ بەلگەیەکی میژویی پشتیوانی لەم چیروکە ناکا. بێگومان مەلا مستەفا نەوەی خەلیفەکانی عەبباسی بی یا نەبی هیچ لە مەسەلەکە و، لە هەلسەنگاندنەکان ناگوری.
ناوی ئەم بنەماڵەیە، بو یەکەمین جار لە سەردەمی شیخ عەبدولسەلام (؟ - ۱۹۱٤) دا کەوتوتە ناو ناوان.
شیخ عەبدولسەلام برا گەورەی شیخ ئەحمەد، مەلا مستەفا، شیخ محەمەد صدیق، شیخ بابو بوە و، کوری شیخ محەمەد بوە. شیخ محەمەدیش کوری شیخ عەبدولسەلام.

ئەمانە شیخی ئیرشادی تەریقەتی نەقشی بون لە بارزان. لەو سەردەمەدا سەدان خانەقا و تەکیە لە کوردستان دا هەبوە. شیخانی بارزان تەریقەتیان لە شیخانی نەهری وەرگرتوە و، خانەقای بارزان سەر بە خانەقای نەهری بوە. دوای روداوەکانی ۱۸۸۰ کە خانەقای نەهری تیکچو، شیخ عوبەیدوللای نەهری و کورەکانی دور خرانەوە بو حیجاز، خانەقای بارزان ئیتر ئازادیەکی زورتری هەبوە. بەلگەیەکی نوسراو لە سەر شیخانی بارزان و خانەقاکەیان، کە بگەریتەوە بو سەردەمی پیش شیخ عەبدولسەلام، ژیانی کومەلایەتی، سیاسی، فەرهەنگیان رون بکاتەوە، لە بەر دەس دا نیە. عوسمان صەبری، ئەدیب و سکرتیری پارتی دیموکراتی کورد لە سوریا، چیروکیکی لە سەر مردنی شیخ محەممەد نوسیوە، ئەبی لە خویانی بیست بی، چونکە ماوەیەک لە ناو بارزانیەکان دا ژیاوە.

عوسمان صەبری لە ژمارەی ۱۷ ی دوەمین سالی گوڤاری «روناهی» ریکەوتی ۱ ی تابی ۱۹٤۳ کە لە شام لە لایەن «میر جەلادەت بەدرخان» ەوە چاپ و بلاو کراوەتەوە، ئەم چیرۆکەی بلاو کردۆتەوە.

*

## شیخی بارزانیان چون هەلفراند؟

ئەمرۆ لە ناو کوردەکانی خواروودا کاتی باسی شیخی بارزان ئەکەن، پیاو شیخ ئەحمەدی بیر ئەکەویتەوە کە بە خودانی بارزان ناسراوە. ئەم شیخەی کە هەلفرینراوە، شیخ ئەحمەدی خودانی بارزان نیە، بەلکو شیخ محەممەدی باوکیتی. دەرهەق خودانی بارزانیش، لە ژمارەکانی تردا، من زانینی خوم ئەنوسم.

ئەم چیروکەی کە ئەمەوی بیگیرمەوە، شتیکی خەیالی نیە، بەلکو شتیکی قەوماو و راستە. لە پیشەوە من ئەم چیروکەم لە دەمی شیخی گارسی شیخ ئەورەحمان بیست، پاشان دورودریژ پرسیم و دوایی کە چومە بنجوینداوانی، قسەکانی شیخی گارسی رەحمەتی بە تەواوی راست دەرچو.

شیخ محەممەدی بارزان یەکی بو لە شیخەکانی تەریقەت، لەو شیخانەی کە نازانن شیخایەتی و موریدایەتی چیە، بە تەنیا لە نەزانیی میللەت کەلک وەرئەگرن و، خویان لە ژیر ناوی شیخایەتی دا بە سەر کوردی هەژارەوە ئەکەن بە گەورە و ریگای دەرباریکی شاهانە بو خویان و ریگای مەزنایەتی بو کورەکانیان خوش ئەکەن. سەرەرای ئەمەش شیخ محەممەد مروڤیکی بەرادایی نەبو لە زور شیخ چاکتر و باشتر بو. وەک شیخەکانی ترمان ری ی بی فەرمانیی خوای نەگرتوە، ئەگەر گوناحیکیشی هەبویی، ئەوە بو بی ئەوەی هیزیکی مەعنەوی هەبی، خوی بە خاوەن مەعنەویەت پیشان دابو و لە قەزای زیبار دا زور کەسی بە مورید لە دەوری خوی کو کرد بوەوە، هەر ئەم گوناحەش بو کە بو بە هوی هەلفراندنی.

لە سەرەتای سەدەی بیستەم دا لە قەزای زیبار شیخ محەممەدی بارزان لە ناو عەشیرەتەکانی مزوری، شیروان و بەروژیان دا ناوبانگیکی باشی پەیدا کرد بو، خەلکی ئەوی ئەوەندەیان خوش ئەویست، لە پیناوی شیخ و داخوازیەکانی دا، مردنیان بە بەختیاریەکی گەورە دائەنا. سەرەرای دلپاکی خەلکی، دلچاکی و روخوشی شیخ ئەم خوشەویستیەی روژ بە روژ زیاد ئەکرد. هەمو روژی دوای نویژی ئیواری، شیخ ئاموژگاری دینیی موریدەکانی ئەکرد و، دژواریی روژی قیامەت و ئاگری دوزەخی بە بیر ئەهینانەوە.

شیخ، ڕۆژی لە ڕۆژان لە ناو ئامۆژگاریەکانی دا باسی ڕابوونی جەنابی مەهدی ئەکا، لەوی دا یەکێ لە موریدە بە سالاچوەکان ناو و سیفەتەکانی مەهدی و چونیەتی و دەمی ڕابوونی لە شیخ ئەپرسی. شیخ بەم جۆرە وەلامی موریدەکەی ئەداتەوە:

- مەهدی، لە دوای پیغەمەر چاکترین پیاوی خوایە، ناوی محەممەدە، ملی لە هی هەمو کەس درێژترە، گونای ڕومەتی نوری لێ ئەباری، هەروەک شمشیر نایبڕی تفەنگیش کاری تی ناکا، کاتی هەلسانی زۆر نزیکە. ڕەنگە ئەمرو هاتبیتە دنیاوە. ئەو ڕۆژەی کە خوا فەرمانی پی ئەدا دەرئەکەوی..

موریدێکی تر هەلئەستی و ئەپرسی:

- قوربان! بەو شیوەیەی کە ئیمە لە شیخمان بیست، جەجالیش وەک مەهدی هەلئەستی و کەرەکەیشی زۆر خیرایە، ئەتوانی بە ڕۆژی ڕیگای سالیک بەری. گەلۆ، جەنابی مەهدی چۆن لەم زالمە ڕزگار ئەبی؟

بیگومان ئەو کاتەی کاتی شیخ باسی جەجال و کەرە خیراکەی بۆ موریدەکانی کرد بو، شیوەی ڕزگار بونی مەهدی بە بیردا نەهات بو، بەلام وا یەکێ لە موریدەکان ئەپرسی و پرسیارەکەیش ئەبی وەلامی بدریتەوە. نەزانین لە لای شیخان نیە! کاتی شیخ بینی هەمو گویگرەکان چاویان تی بڕیوە و چاوەڕوانی وەلامیکن، شیخ بی ڕامان ئیلی:

- ئەفری، ئەفری کوڕم ئەفری...

لە هیچ کتیبیک دا حیکایەتی فڕینی مەهدی نیە. بەلام بۆ ئەوەی شیخ خۆی بە نەزان پیشان نەدا ئەمەی وت موریدەکانیش باوەڕیان پی کرد، بەلام نازانم خوایش ئەم درۆیەی لە شیخ قوبول ئەکرد یا نە.. ئەمە لە سەرەنجامی شیخ دا ئەبینین. دوای ئەوەی شیخ ئامۆژگاریەکانی تەواو ئەکا لە مزگەوت دەرئەچی و ئەچی بۆ دیوەخان.

ئەوانەی کە مالی شیخی بارزانیان بینیوە ئەزانن شوینی دیوەخانی شیخ چەند بەرزە. کاتی خوارەوەی مزگەوتە، هی دوەم خانەقایە (تەکی) و، هینی سیەمیش دیوەخانە.

کاتی شیخ لە مزگەوتەوە ئەچی بۆ دیوەخان، موریدەکان لە ناو خۆیان دا لە سەر ئامۆژگاریەکانی ئەو ڕۆژەی شیخ (سیفەتەکانی مەهدی) ئەدوین. ئەیانویست بزانن کە ئەم سیفەتانە لە کی دا هەیە. لە بەر ئەوەی ئەو سیفەتانەی شیخ باسی کرد بون هەموی لە خۆی دا هەبون، هەندی لە موریدەکان ئەلین: هەبی و نەبی شیخی ئیمە خۆی مەهدیە. هەندیکی تریان ئەلین: کەی شیخ ڕاستیی لە ئیمە شاردۆتەوە تا ئەمرۆ لیمان بشاریتەوە، ئەگەر ئەو مەهدی بوایە خۆی پی ی ئەوتین. لە سەر ئەم قسەیە برای گەورە ئەلی:

- ئەی نایەتە بیرتان کە شیخ وتی: وەدەمی ڕابونی زۆر نزیکە، لەوانەیە ئەمرۆ هاتبیتە دنیاوە و ئەو ڕۆژەی کە خوا فەرمانی پی ئەدا دەر ئەکەوی». بەلی شیخ، مەهدی خۆیەتی، بەلام بە فەرمانی خوا دەرئەکەوی.

برای دوەم لە سەر قسەکەی سورە کە شیخ مەهدی نیە. ئەم گفتوگۆیەیان درێژە ئەکیشی و لە هەردو لا کەسیان ناتوانی ئەوی تر بهینیتە سەر قسەی خۆی. ئەوسا ڕیش سپییەک لە موریدەکان بە هەردو برا ئەلی:

- کە عەقل هەبی پیویست ناکا بەم شیوەیە بە گژ یەکتری دا بچن. نایەتە بیرتان شیخ وتی: تفەنگ کار لە مەهدی ناکا. وەرن بچین بۆ دیوەخان بیدەینە بەر تفەنگ، ئەگەر مەهدی بی گوللە نایبڕی.

ئەم ئاقلەی بارزان بیری لەوە نەکرد بووەوە کە ئەگەر شێخ مەهدی نەبێ، بمرێ ئەمرێ. ئەمە بە بیری هەردوو برایش دا نەهات. قسەی هەموویان لە سەر ئەم تەگبیرە ئەبێ بە یەک. شەش پیاو تفەنگەکانیان هەڵئەگرن و ئەچنە دیوەخان. لە پڕ هەر شەشیان لولەی تفەنگەکانیان لە شێخ ئەکەن و پەنجە ئەخەنە سەر پەلەپیتکە.

لە دەنگی تفەنگان و راچڵەکینی دوای ئەو، شێخ تێئەگەیشت کە ئەمانە بە بێ بەختی ئەیکوژن. بۆیە یەکسەر هەڵئەستێ و را ئەکا. موریدەکان لە بەر دەرگا ئەیگرن. سەیر ئەکەن هەموو گوللەکان بە جلەکانی کەوتوون و بە لەشی نەکەوتوون. دوای ئەم تەجروبەیە ئیتر گومانیان نامێنێ کە شێخ مەهدیە.

بەڵام هەندێک لە موریدەکان دیسان ناپانەوی باوەڕ بەمە بهێنن، بۆیە لە نێوان ئەمان و ئەوانی تر (ئەوانەی باوەڕیان بە مەهدیەتی شێخ هێناوە) ئەبێ بە دەمەقاڵێ. ئەوسا ئەو ئاقلەی کە ڕێگای تفەنگ بە شێخەوە نانی پێشانی موریدەکان دابو ئەکەوێتە بەینیان و ئەڵێ:

- ئایا ئەم قسانەی ئێوە پێویست بەم دەمەقاڵەیە ئەکا؟ نایەتە بیرتان شێخ وتی: مەهدی ئەتوانێ بفڕێ؟ وەرن با تاقی بکەینەوە.

ئەم قسەیە ئەچێ بە مێشکی هەموویان دا و پێکەوە ئەچنە لای شێخ و بەم شێوەیە داواکەیانی پێ ئەڵێن:

- قوربان! زۆرمان باوەڕمان وایە کە شێخ مەهدیە، بەڵام هەندێ بێ ئیمان لە ناو ئێمەدا هەن باوەڕ بەمە ناهێنن. ئەمانەوی شێخ ئەم گومانەیان لە دڵ دەرکا!

- من چۆن ئەتوانم ئەم گومانەیان لە دڵ دەربکەم و کێ پێ ی وتوون کە من مەهدیم؟

- قوربان! دڵی ئێمە هەموو ئەڵێ تۆ مەهدیت. ئەی شێخ نەیوتوە دڵی چل موسوڵمان لە سەر هەر شتێک بێ بە یەک ئەو شتە راستە و درۆ نیە؟ هەر گومانێ لە دڵی هەندێ لە موریدەکان دا هەبێ ئەتوانی تۆ بەم فڕینە لە دڵیان دەربکەی.

- کوڕە ئێوە چەن ئەحمەقن، من چۆن ئەتوانم بفڕم؟

ئەوسا ئاقڵەکەی بارزان، ئەو موریدەی کە پێشتر ڕێگای تەجروبەی تفەنگەکەی پێشانی هاوڕێکانی دابو، ئەڵێ:

- گەلی موریدان! لە بەر ئەوەی دەمی راپونی مەهدی هێشتا نەهاتوە، بۆیە شێخ خۆی ئاشکرا ناکا، بەڵام ئێمە ئەتوانین تاقی بکەینەوە. وەرن با دەست و قاچی شێخ بگرین و لە سەر خانەقاوە بەری بدەینەوە خوارێ! ئەو کاتە ناچار ئەبێ بفڕێ!

هێشتا ئاقڵەکەی بارزان قسەکەی تەواو نەکرد بو موریدەکان دەست و لنگی شێخ ئەگرن و بێ ئەوەی گوێ بدەنە داد و هاواری ئەو ڕەبەنە لە سەر خانەقاوە ئەیهاوێژن بۆ خوارێ.

شێخ محەممەد کە زەلامێکی کەتە بو بە سەلامەتی ناکاتە حەوشە. هەردوو دەست و قاچێکی و ملی و پشتی لە شەش جێگاوە ئەشکێ و شێخ بە راستی ئەبێ بە مەهدی! دوای ئەوەی وقان پشت و ملی شێخ شکا بو، ئیتر پێویست ناکا بڵێین ڕۆژی دوایی گیانی بە گیانکێش سپارد و و لەشی بە گۆڕ! ئەو کاتە ئەم شێخ ئەحمەدەی کە بە خودانی بارزان ناسراوە تەمەنی شەش ساڵ بو. عوسمان صەبری

*

ئەم چیروکـە هەندی لایەنی باوەری بارزانیـەکـان و شیـخـەکـانیـان رون ئەکـاتەوە. عوسمان صەبری وەکو بەلینی دا بو لە ژمارەکانی ترا زانیاریەکانی خوی لە سەر خودانی بارزان بنوسی، بەلینەکەی بە جی نەهیناوە. هوکەی چی بوە، دیار نیە.

ئەم چیروکە راست بی یان هەلبەستراو، ئوبالەکەی لە ئەستوی عوسمان صەبری دایە، کە بە دریژایی ژیانی و هەتا مردیش دلسوزی مەلا مستەفا بو.

*

## شیخ عەبدولسەلام

لە دوای مردنی شیخ محەمەد، شیخ عەبدولسەلامی کوری لە جیگای دانیشت. عەبدولسەلام برا گەورەی شیخ ئەحمەد، محەمەد صدیق، شیخ بابو، مستەفا بو. بارزان گوندیکە کەوتوتە نیوان رەواندز و ئاکری و سنوری تورکیا و لە بەینی هەردو روباری زی ی بادینان و روکوچک دایە.

شیـخـەکـانی ئەوی توانی بویان هەندی لە عـەشیـرەتەکـانی دەوری خویان لەوانە: شیروانی، دولەمەری، مزوری، بەروژی، نزاری و، بەشیکی گەردی و هەرکی بنەجی، بهیننە سـەر باوەری خـویان. ئەوانەی چوبونە سـەر ری و رەوشـتی شـیـخی بارزان، خـویان بە «میللەت» یک دائەنا کە دلسوزی و گویرایەلی بو شیخی بارزان پیکەوەی ئەبەستن، لەناو خویان دا هاوکاری یەکتریان ئەکرد، بەدەنگ یەکەوە ئەچون و ژن و ژنخوازیان تەنیا لەناو خویان دا ئەکرد. بە شیخی «بارزان» پشیان ئەوت «خودان» کە بەرزترین دەسەلاتی دینی و دنیایی ئەوان بو. «خودان» واتەی خاوەن و، جوریکە لە «صاحب الزمان» ی شیعە.

شیخ عـەبدولسـەلام پیاویکی هەلکەوتو بوە. لە سـەردەمی ئەودا بارزان ئەهمیـەتی پەیداکرد، نفوزی زیادی کرد، «خودان» بو نەهیشتنی زولمی کومەلایەتی لەناو میللەتەکەی خوی دا هەندیک ریفورمی ئابوری، کومەلایەتی کرد، مولکیەتی زەویزاری هەلوەشاندەوە کردیە خاوەنیتی گشتی هەموان، ژن و ژنخوازی ئاسان کردو مارەیی هەلگرت، هەولی دا عەشیرەتەکانی ژیر دەستی خویان چەکدار کەن، بارزان بوبوە پەناگای زورلیکراوان.

شیخ عـەبدولسـەلام نیوانی لەگەل مـەسیـحیـەکان خوش بو، حورمەتی ئەگرتن و، لەگەل میسیونیرەکانی ئینگلیزیش برایان: «ویگرام» دوستایەتی خوش بو. لە کتیبەکەیان دا: «کوردستان: بیشکەی شارستانیتی» باسی ئەم دوستایەتیە ئەکەن.

شیخ عەبدولسەلام پەیوەندی لەگەل ریکخراوە سیاسیە کوردیەکانی ئەستەمول هەبوە، کە دوای ئینقیلابی عوسمانی (١٩٠٨) دامەزرابون، بە تایبەتی لە گەل شیخ عەبدولقادری شەمزینی، کـە ئاشنایەتیـەکی دیرینەی بنەمالەیـان هەبوە. بلاو کراوەکـانی ئەم ریکخـراوانە ئەگەیشتە خانەقاکەیان لە بارزان.

یەکی لە هەولە نیشتمانییەکانی شیخ عەبدولسـەلام تەلەگرافیکە کە بو کاربەدەستانی عوسـمانی ناردوە دەربارەی هەندی مافی روشنبیری و بەریوەبەرایەتی و دینیی کورد، پی ئەچی ئەمـەی بە هاندان و بۆ پشتیوانی لە شیخ عـەبدولقادری شەمزینی بوبی، کە ئەوسا پیشەوای بزوتنەوەی نەتەوەیی کورد بوە لە ئەستەمول.

دالدەدانی زورلیکراوان لە بارزان و رەفـتـاری خـودان لەگـەل مـیللەتەکـەی و، ریفورمەکانی کە بوبون بە هوی پەژارەی سەروکی عەشیرەت و شیخەکانی دەوروپشتی و،

گازاندەی بەردەوامی ئەوانە لەرەفتاری خودانی بارزان لە لای کاربەدەستانی تورک، هەروەها ناردنی ئەم تەلەگرافە و کەمبونەوەی دەسەلاتی عوسمانی لەناوچەکە، کاربەدەستانی عوسمانی لە موسل تورە ئەکاو، بریار ئەدەن شیخی بارزان تەمی بکەن و ناوچەکە بهیننەوە ژیر دەسەلاتی حکومەت. فەریق محەمەد فاضیل پاشای داغستانی سەرکردایەتی هیزیکی گەورەی عوسمانی ئەکا بو هیرشی سەر بارزان. عەشیرەتەکانی دراوسیی بارزان نەک هاوکاری عەبدولسەلام ناکەن، بەلکو ئالیکاری عوسمانی ئەکەن بو داگیر کردنی ناوچەکە. بارزانیەکان چەن روژیک بەرەنگاری هیرشەکە ئەکەن، سەرەنجام خویان پی راناگیری. شیخ عەبدولسەلام خوی ئەشاریتەوە پەنا ئەباتە بەر مارشەمعون لە هەکاری. مارشەمعون دالدەی ئەدا. داغستانی بارزان داگیرئەکا، هەندی لە گوندەکانی تالان ئەکاو ئەسوتینی و، هەر کەسی بەردەس ئەکەوی بە دیلی ئەیبا بو موسل. لەناو دیلەکان دا مەلا مستەفا و دایکی ئەگیرین.

شیخ عەبدولسەلام بە نهینی گەرایەوە بارزان چەکدارەکانی لەچیای شیرین کوکردەوە، کەوتە پەلاماردانی هیزەکانی عوسمانی، ناچاری کردن لە ناوچەکە بکشینەوە. والی نوی ی موسل بە نەرمی لەگەلی جولایەوە، کەوتە گفتوگو لەگەلی، دیلەکانی بەردان، هەندی زەرەری بو بژاردن، ژیانی ئاسایی گەرایەوە بو ناوچەکە.

لە ۱۹۱۳ دا والی موسل سولەیمان نەظیف، کە روشنبیریکی کوردی «ئیتیحاد» ی بو، هیزیکی گەورەی نارده سەر بارزان بو گرتنی شیخ عەبدولسەلام. سەرخیلەکانی کورد، بە تایبەتی فارس ئاغای زیباری، هاوکاری لەشکری تورکیان کرد. شیخ ئەمجارەش خوی نەدا بە دەستەوە و سەرلەنوی خوی شاردەوە، بە نهینی چو بو راژان بو لای سەید طەهای شەمزینی و، سەردانی سمکوی کرد و، پیکەوە چون بو تفلیس بو دیتنی جینشینی قەیسەری روسیا، بو ئەوەی داوای پشتیوانی لی بکەن. کاربەدەستانی تورک خەلاتیکیان دانا بو بز ئەو کەسەی شیخ عەبدولسەلام بە زیندویەتی یا بە مردویەتی بگری. شیخ لە گەرانەوەدا لە گوندیکی ناوچەی سوما برادوست لە لایەن کابرایەکی شوکاکەوە لەگەل ۳ پاسەوانی دا بە فیل لە خەو دا گیران، و لە پایزی ۱۹۱٤ دا لە «سیرو» تەسلیمی کاربەدەستانی عوسمانی کردن. لەویوە بە گیراوی برانە زیندانی موسل. پاش محاکەمەیەکی روکەش لە ١٤ی کانونی یەکەمی ۱۹۱٤ دا شیخ عەبدولسەلام و هاوریکانی لە دار دران.

*

شیخ ئەحمەد

لەپاش هەلواسینی شیخ عەبدولسەلام، شیخ ئەحمەدی برای جیگای گرتەوە.

شیخ ئەحمەد دوەمین کوری محەمەد و، براگەورەی محمد صدیق و شیخ بابو و مەلا مستەفا بو.

شیخ ئەحمەد سالی ۱۸۹٦ لە بارزان لە دایک بوە، سالی ۱۹۱٤ کە عەبدولسەلامی برای لە موسل هەلواسرا، شیخ ئەحمەد لە جیگەی ئەو بو بە «خودانی میللەتی بارزان».

شیخ ئەحمەد خویندەواری نەبو، بەلام لە بەریوەبردنی کاروباری بارزانیەکان دا شارەزا بو، جیگەی بروای هەموبان بو، گویرایەلیی بی چەن و چونیان ئەکرد، تەنانەت مەلا مستەفاو براکانیشی کە ئەچون بو زیارەتی ئەبو لەبەردەمی دا بە «چوک» دا بین. بەلام




پایتەخت

شارکە دانیشتوانی زیاتر لە ١٠٠٠٠٠

شارکە دانیشتوانی کەمتر لە ١٠٠٠٠٠

شارۆچکە

شاخ

رووبار

دەریاچکە

سەد

جادە

خەتی شەمەندەفەر

بیری نەوت

# کوردستانی عیراق

1 : 2 500 000

0 — 100 km

رۆشنبیریی گشتی نەبو، شارەزای کاروباری سیاسی کوردستان و عیراق و دنیا نەبو، هەروەها شارەزای کاروباری جەنگی نەبو. بایەخیشی پێ نەئەدا. هەولی ئەدا خۆی و عەشیرەتەکەی لە کاروباری سیاسیەوە نەگلێن، بە گۆشەگیری دور لە کارتێکردنی دەوروو پشت بژین.

لەسەردەمی عوسمانی دا بە هۆی هەلواسینی براکەی و لەشکرکێشی عوسمانیەکانەوە بۆ سەر ناوچەکەیان، هەلویستی لە حکومەت سەلبی بو، بروای پێ نەئەکردن و دوای هاتنی ئینگلیزیش ١٩١٨ دیسان هەلویستی لە پەرسەندنی دەسەلاتی حکومەت سەلبی بو، بە ئاگاداری ئەم هەندێ لە بارزانیەکان بەشداری دانانی ئەو بوسەیە بون کە لە ١٤ ی تشرینی دوەمی ١٩١٩ لە «بیرە کەپرە» بۆ حاکمی سیاسی موسل کولونیل بیل و حاکمی سیاسی ئاکری کاپتن سکوت دانراو هەردوکیان کوژران، لەدەس پەسەراگرتنی شاری ئاکرێ یش دا بەشدار بون. هەروەها توشی چەن تێکهەلچونی چەکدار بون لەگەل ئاسوریەکان کاتێک ئینگلیز ئەیویست لە ناوچەکانی ئەوان دا نیشتەجێی یان بکەن. دوای ئەوە ئیتر لە بارزان گۆشەگیری هەلبژارد، خۆی لە کاروباری سیاسی و حکومەتی هەلنەئەقورتاند.

شێخ ئەحمەد هەولی دا نەریتەکانی شێخەکانی بارزان دایان هێنا بۆ بچەسپێنێ، هاوکاری یەکتری، دامەزراندنی پەیوەندی لەسەر بنچینەی دادپەروەری و وەکیەکی، گوێرایەلی بێ چەن و چونی میللەت بۆ خودان، پارێزگاری میللەتی بارزان لە تێخزانی نوفوزی حکومەت و بیرو باوەری دەرەوە. هەولی ئەدا میللەتی بارزان وەکو کومەلێکی داخراو بمێنێتەوە، نوفوزی دەولەتی تێ نەیەت، لەبەر ئەوە: دژی دامەزراندنی دەسەلات و دەزگا ئیداریەکانی حکومەت و، دژی دامەزراندنی قوتابخانە و، دژی تێکەلاوی بو لەگەل کاربەدەستانی حکومەت لە شارەکان، تەنانەت براکانی نەخستە بەر خوێندن بو ئەوەی فێری خوێندەواری نەبن، هەروەها دژی چالاکی پارتایەتی بو لەناو بارزانیەکان دا.

شێخ ئەحمەد نوێژ و حەجی لە سەر بارزانیەکان هەلگرت. ئەمەش لە لایەن دراوسێکانیەوە بە لە دین دەرچون دائەنرا.

ناوچەی ژیانی بارزانیەکان مەلبەندێکی شاخاویە، ئەرزی کشتوکالی کەمە، بەرووبومی زوری نیە. مازوچنین و کۆکردنەوەی تووی کنگر و، ئاژەلداری، بە تایبەتی راگرتنی بزن، یەکێک بو لە سەرچاوەکانی ژیانیان. لەبەر ئەوە لە سەر مەسەلەی لەوەرگا و پاوان هەمیشە لەگەل عەشیرەتەکانی دراوسێ یاندا: برادوست، زیباری، سورچی، هەرکی، ریکانی ... کێشەیان بوە.

*

## شورشی بارزان ١٩٣١ - ١٩٣٢

لە هاوینی ١٩٣١دا برادوستیەکان هێرشیکیان کردە سەر گوندەکانی: کرکال، کولەک، بابکی، لە ناوچەی شێروانیەکان، هەندێ خانویان سوتاندن، ئاژەل و گاو گوتالیان بە تالان بردن. هێزێکی بارزانیەکان بەسەروکایەتی مەلا مستەفا چون بە دویان دا، لە دەشتی هیرتی پەلاماریان دان تالانیەکانیان لێ گێرانەوە.

زنجیرەیەک تێکهەلچونی چەکدار لە نێوان برادوست و بارزانی دا روی دا مەلا مستەفا کە برا بچوکی شێخ ئەحمەد و براکانی تری بو وەکو قارەمانی ئەو شەرانە ناوی دەرکرد. قائیمقامی زیبار بو ناوبژی کردنی هەردو عەشیرەت سەرانی هەردوکیانی بانگ

گرد، شیخ ئەحمەد چونکە لە کۆنەوە لە حکومەت بەدگومان بو، هەروەها گومانی ئەکرد کە قائیمقام بەلای دوژمنەکانیان دا دایشکێنی، خوی نەچو، بەلکو یەکێ لە براکانی لە جێگەی خوی نارد. لە بەیانی ٩ ی کانونی یەکەمی ١٩٣١ دا هێزێکی جەیشی عێراقی کە پارەگاکەی لە « بلە» بو بە سەرکردایەتی عقید برقی العسکری دەوری گوندی بارزانی گرت و داوای لە شیخ ئەحمەد کرد خوی بەدەستەوە بدا. شیخ ئەحمەد ئامادە نەبو خوی بەدەستەوە بدا، بارزانیەکان هەلیانکوتایە سەر هێزەکانی عیراق و شکاندیان.

جموجولی سپایی بە هوی زستانەوە راوەستا. لە ١٢ ی کانونی دوەمی ١٩٣٢ دا ئەنجومەنی وەزیران بە بەهانەی یاخی بونی شیخ ئەحمەد و پەلاماردانی ئەو عەشیرەتانەی سەریان بو دەسەلاتی حکومەت دانەنواندوە و، بە بەهانەی نەدانی باجەوە.. بو دامەزراندنی «أداره مدنیه منظمه» کە مەبەستی مەخفەری پولیس و دەزگای مدیری ناحیە بو بریاری دا جەیش بنێریتە سەر بارزان، جیبەجی کردنیشی سپارد بە وەزارەتەکانی دیفاع و کاروباری ناوخو.

لە ١٠ ی مارتی ١٩٣٢ دا وەزارەتی داخلیە ئینزاری شیخ ئەحمەدی کرد کە لە ماوەی ٤ روژدا بو دەربرینی گوێرایەلی و دلسوزی بو حکومەت لە بەردەمی قائیمقامی زیباردا ئامادە بی، هەروەها حاکمی سیاسی ئینگلیزیش هەمان داوای-لی کرد. بەلام شیخ ئەحمەد ئامادە نەبو بچی چونکە ئەترسا بیگرن، بەلکو خوی بو بەرگری ئامادەکرد. لە ١٥ ی مارتی ١٩٣٢ هێزی زەمینی عیراق بە یارمەتی فروکەکانی بەریتانیا هەلیان کوتایە سەر بارزان، ئاوایەکان زەرەری زوریان لی کەوت، بەلام نەیانتوانی شیخ ئەحمەد بگرن، وە نەیانتوانی بەتەواوی دەست بەسەر ناوچەکەدا بگرن. دو فروکەی بەریتانی کەوتنە خواری، یەکێکیان فروکەوانەکانی تی دا مرد و، ئەوی کەیان دو فروکەوانی بە پەرەشوت لی دابەزی و گیران. کاپتن هولت بو بەردانی فروکەوانەکان چو بو دیدەنی شیخ ئەحمەد، لەبەرامبەر ئازادکردنی ٢٥ بارزانی گیراودا بەردران. دوای ئەو شیخ نورەدینی بریفکانی بە نوینەرایەتی حکومەتی عیراق چو بو گفتوگو لە گەل شیخ ئەحمەد. شیخ ئەحمەد هیچ خواستی سیاسی یا نەتەوەیی لە حکومەت نەبو، بەلکو ئەیویست: «عفو» بکری و وازیان لی بهێنن لە شوینی خویان بژین، حکومەت دەست وەرنەداتە کاروباری ناوچەکەیانەوە، لە ناکوکی ئەوان و عەشیرەتەکانی تردا بەلای دوژمنەکانی دا دانەشکێنی. بەلام حکومەت هیچ یەکێ لە خواستەکانی قەبول نەکرد و، داوای خۆبەدەستەوەدانی بی مەرج و، ریگە نەگرتن لە دامەزراندنی دەزگاکانی پولیس و ئیدارەیان لی کرد.

دوای چەند پیکادانێک جەیش لە ١٨ی مایسی ١٩٣٢ دا بە بی شەر بارزانی گرت و پیشرەوی کرد بو چەند شوینێکی تر. شیخ ئەحمەد بریاری دا خاکی عیراق بەجی بهیلی و بچیتە تورکیا. نامەیەکی مالئاوایی بو قائیمقامی زیبار نوسی. لەگەل ٤٠٠ خیزان روژی ٢٢ ی حوزەیرانی ١٩٣٢ پەرینەوە گوندی گرانە لەناو تورکیا کە سەربازگەیەکی تورکی لی بو، لەوی چەکەکانیان دانا. کاربەدەستانی تورک شیخ ئەحمەدیان بردە ئەنقەرە، چەن مالیکیان گویزانەوە ئەرزروم، پاش ماوەیەک مەلا مستەفاو بارزانیەکانی کەیان ریگە دا بگەرینەوە ناوچەی شەمزینان.

لەشکرکیشی جەیشی عیراق دژی شورشی بارزان ٣ مانگ و ٥ روژی خایاند. ٦ فەوجی پیادە و ٢ بەطەریەی چیایی و کەتیبەیەک سوارە بەشدار بون کە هەموی ئەیکردە:

۲.۵ ئەفسەر و ٤٤٣٧ سەرباز. بە هەموی ٤٨ کەسیان لی کوژرا (لەوانە ۳ ئەفسەر) و ۷۸ کەسیان بریندار بو. لە شورشگیرانی بارزانیش ۱۹ کەس کوژراوە.

*

## لیبوردنی گشتی و دور خرانەوەی شیخەکانیان

تورکیا و عیراق و بەریتانیا کەوتنە گفتوگو بو دیاریکردنی چارەنوسی بارزانییەکان. سەرەنجام عیراق لە ۱۳ ی نیسانی ۱۹۳۳ دا «لیبوردنی گشتی» بو دەرکردن. مەلا مستەفا و شیخ محەممەد صدیق و ئولوبەگ لە گەل ۲.. کەسی کە لە ۲۹ ی حوزەیرانی ۱۹۳۳ دا لە شیروانی مەزن خویان بە دەستەوە دا. دوای ئەوانیش شیخ ئەحمەد گەرایەوە.

عیراق شیخ ئەحمەدی لە موسل دەس بەسەر دانا و پاش ماوەیەک ریگەیان دا بگەریتەوە بارزان. تاقمیک لە بارزانیەکان بەسەرکردایەتی خەلیل خوشەوی بە چەکداری لە ناوچەکەدا مابونەوە، تەسلیم نەبەبون، چونکە بەر لیبوردن نەکەوت بون. عیراق ئەترسا سەرلەنوی راپەرینیکی چەکدار بقەومی. شیخ ئەحمەد و براکانیان بانگ کردنە موسل لەوی دەسبەسەر گل درانەوە، بو دابینکردنی ژیانیان حکومەت موچەیەکی کەمی بو برینەوە. لە کوتایی ۱۹۳٦ دا گویزرانەوە بو بەغداد و لە ویوە برانە ناصریە. کە جینگی جیهانی دوەم هەلگیرسا، بەریتانیا ئەیویست کورد ئارام بکاتەوە و لەگەلی نەرم بی، شیخ ئەحمەد و براکانی لەسەر داوای خویان لە ناصریەوە، کە شاریکی عەرەبی بو، گویزرانەوە بو سلیمانی، کە شاریکی کوردی بو (۱۹۳۹)، ئەوسا دورخراوەکان بە ژن و پیاو و، گەورە و منالەوە ۸٦ کەس بون.

*

## بارزانییەکان لە سلیمانی

مەلا مستەفا بە منالی نەخرا بوە بەر خویندن. هەرگیز خویندنی مەلایەتی نەخویند بو و، لای هیچ کەس و لە هیچ مزگەوتیکیش دا «ئیجازە» ی مەلایەتی وەرنەگرت بو. مەلایەتیەکەی لە نازناویک زیاتر نەبو. ئەو ماوەیەی لە سلیمانی بو هەندی دەرسی لای مەلا عەبدوللای چروستانی و هەندی دەرسیشی لای مەلا مستەفای صەفوەت خویند.

مەلا مستەفا نائومید بو لەوەی ریگای بدەن بگەریتەوە سەر جیگاوریگای خوی لە بارزان، خەرجیان تەعیین کرد بو بە «قزلچی غابات» و هەندی لە خزمەکانیشی بە «حەسحەسی شەو». ئەو موچەیەی بویان بری بونەوە بەشی ژیانی نەئەکردن. بیری لەوە کردەوە بە بی موافەقەتی حکومەت بە نهینی بگەریتەوە بارزان و، زور بو حکومەت بهینی ریگای شیخ ئەحمەد و بارزانیەکان بدا بگەرینەوە ناوچەکانی خویان. شیخ لەتیفی حەفید لە مەدا یارمەتی دا. چەند کەسیکی بو هاودەنگی و شارەزایی لە گەل نارد، لەوانە محەی سالە سور، مەجیدی قالەی حەمامچی، تا بە لای پینجوین دا، بە نهینی بیگەیەننە بانە لە دیوی ئیران.

مەلا مستەفا روژی ۱۲ ی تەموزی ۱۹٤۳ سلیمانی بەجی هیشت بەرەو بانە و مەهاباد و بە لای ئەشنەدا بو ناوچەی شنو و، لە ویوە چوەوە ناوچەی برادوست لە دیوی عیراق و روژی ۲۸ ی تەموز گەیشتەوە بارزان.

مەلا مستەفا لە ریگای گەرانەوەی دا بو بارزان، چەند کەسیکی لەو بارزانیانەی لە

گوندەکانی نزیک ئەغـدە و شنۆ دانیشت بون، لە گەڵ خۆی برد بوەوە و، لە براد‌ۆستیش تاقمی بارزانی لە حکومەت قاچاخ بون ئەوانیشی دزیبەوە. ئەمانە هەمو پەکیان گرتەوە.

مەلا مستەفا، بە هۆی ئامیر مەخفەری شیتنەوە خۆی هەوالی بۆ حکومەت نارد گەوا: گەڕشتۆتەوە ناوچەکە و، لە بەر خراپی هەلومەرجی ژیانیان و، رەفتاری کاربەدەستان هەلاتوە، نیازی شەر و خراپەی نیە و، ئامادەیە بە گفتوگۆ هەمو گیروگرفتەکان چارەسەر بکا. حکومەت خواستەکانی مەلا مستەفای پشت گوی خست و، شیخ ئەحمەد و بارزانیەکانی لە سلێمانیەوە دور خستەوە بۆ حیللە.

بە درێژایی مانگی ئاب و ئەیلول بە ناوچەکەدا گەرا، تا ئەهات هیزەکەی زیادی ئەکرد. مەلا مستەفا کە زانی حکومەت گوی ی ناداتی کەوتە گوشاربردن. لە مانگی تشرینی یەکەم دا کەوتە پەلاماردانی مەخفەرەکانی ناوچەکە. هەندی لە بارزانیەکان بو بون بە پۆلیس، لەم مەخفەرانەدا بلاو بوبونەوە، ئەمەیش کارەکەی مەلا مستەفای ئاسان ئەکرد. مەخفەرەکانی: شانەدەر، خیرەزۆک، بیرەکەپرە، زیت، چەمی، سیلکی، میرۆز، ئەرگوس، طیل، شنگیل، کانی بۆت، بیدیال، شیروان، ریزان، شیتنە، بیدارون، کانی رەش.. گیران. بارزانیەکان پر چەک بون و هیزەکەیان گەورە بو. بەلام مەخفەرەکانی: میرگە سور، بارزان، بلە، کە لە وانی تر گرنگتر بون نەگیران. عیراق لیوایەک سەربازی جەیشی نارد بۆ میرگە سور. ئەم لیوایە رۆژانی ٦ و ٨ و ١٠ ی تشرینی دوەمی ٤٣ بە پشتیوانی فرۆکە، چەند هیرشیکی کرد، بەلام لە هەمویان دا شکا. راستیەکەی چەند ئەفسەریکی کوردپەروەر لەم لیوایەدا بون، لەوانە: نوری مەلا مارف، ئەورحمان قازی، نوری مەلا حەکیم، نوری ئەحمەد طەها.. بە نهینی هاوکاریان لە گەل مەلا مستەفا ئەکرد.

*

پیوەندی و گفتوگو لە نیوان مەلا مستەفا و کاربەدەستانی عیراقی و بەریتانی دا دەستی پی کرد. داواکانی مەلا مستەفا لە سنوری گیروگرفت و خواستەکانی عەشیرەتەکەی دەرنەئەچو. داوای ئەکرد: ریگای شیخ ئەحمەد و بارزانیەکان بدری بگەرینەوە شوینەکانی خویان و، لەو سەردەمەدا کە خوراک بە هوی جەنگی جیهانیەوە بە «کارتی تەموین» دابەش ئەکرا، بەشی ئەمانیش ئازوقەیان بۆ دابین بکری. فەرمانبەرانی تەموین لەو کاتەدا بارییان بە قوتی هەژاران ئەکرد.

*

## حیزبی هیوا و شورشی بارزان

حیزبی هیوا، گەورەترین ریکخراوی سیاسی ئەوسای کورد، ویستی گەشە بە جولانەوەکە بدا لە بزوتنەوەیەکی خیلەکی دابراوەوە بیگوری بۆ بزوتنەوەیەکی سیاسی نەتەوەیی. پەیوەندی لە گەل مەلا مستەفا دامەزراند. بۆ پشتیوانی لە شورش و تاوانبار کردنی حکومەت لە بەغداد بەیانی دەرئەکرد و، بیرخەرەوەی بە سەفارەتی دەولەتە گەورەکان ئەدا.

جولانەوەی کورد لە و زەمانەدا بی پیشەوا بو. بۆشایی سەرکردایەتی تی دا دروست ببو. شیخ مەحمود لە کوردستان دور خرابوەوە و، دەستی لە کاری سیاسی هەلگرت بو. رەفیق حیلمی کە بو بو بە سەرۆکی حیزبی هیوا، لە ناو حیزبەکەی دا جیگای پی لیژ ببو، حیزبەکەیشی خەریک بو هەلئەوەشا. کەسیکی وا هەلنەکەوت بو ئەم بۆشاییە پر

بکاتەوە. لەو کاتەدا کورد پێویستی بە یەکێ بو، یان وەکو ئەو زەمانە وتویانە بە «زەعیم» هەبو، ڕیبەری بکا. حیزبی هیوا و ئەفسەر و ڕوشنبیرەکانی کورد ئەم «زەعامەت»ەیان بە شیاوی مەلا مستەفا ئەزانی و، هەر ئەو زەمانە بە «زەعیم مەلا مستەفا» ناویان ئەبرد.

*

لەو کاتەدا هێشتا دوەمین جەنگی جیهانی بە لادا نەکەوت بو. پشێوی و نائارامی بە قازانجی بەریتانیا نەبو. بەریتانیا داوای لە مەلا مستەفا کرد، دەس لە شورش هەلبگری، هەڕەشەی لی کرد، کە درێژەدان بە شورش دژی عیراق، واتە دوژمنایەتی بەریتانیا و دەولەتانی هاوپەیمان و، داوای لە حکومەتی عیراقیش کرد کیشەکە بە خوشی چارەسەر بکا.

*

نوری سەعید، لە ٢٥ی کانونی یەکەمی ٤٣ دا وەزارەتێکی نوی ی پیک هینا. ٣ کورد لە وەزارەتەکەی دا بو. دوانیان: ئەحمەد موختار بابان و عومەر نەظمی، پەیوەندیان بە جولانەوەی کوردەوە نەبو، بەلام سی یەمیان، سیاسی ناسراوی کورد: ماجید مستەفا بو، کە ماوەیەکی درێژ هاوکاری شیخ مەحمود بو لە شورشەکانی دا و، دواییتر پاش کوتایی شورشەکانی شیخ مەحمود چو بوە ناو دەزگای بەڕیوەبەرایەتی عیراقەوە. کرایە وەزیری دەولەت. چارەسەرکردنی کیشەی کورد بەم سپیردرا.

*

ماجید سەردانی شیخ ئەحمەدی کرد لە حیللە. داوای لی کرد یەکی لە کورەکانی بنیری بو لای مەلا مستەفا بو ڕاگرتنی شەڕ و دانانی ڕیوشوینی گفتوگو. شیخ ئەحمەد، محەممەد خالیدی نارد و، دوای موافەقەتی مەلا مستەفا، ڕوژی ٢٩ی کانونی یەکەمی ٤٣ گەڕایەوە. بە دوای ئەمەدا ماجید مستەفا ڕوژی ٧ی کانونی دوەمی ٤٤ چو بو سەردانی مەلا مستەفا لە میرگە سور. ماجید دوای یەک ڕوژ گەڕایەوە بەغداد.

ماجید مستەفا لە دیدەنی بارزانی دا هانی دابو، کە لە باتی خواستی ناوچەیی داوای مافی نەتەوەیی بکا و، ئەفسەرەکانی پەیوەندی بش هەمان ئاموژگاری و داوایان لە مەلا مستەفا ئەکرد و، بەلینیان ئەدایە هاوکاری بکەن و، لە جموجولی جەیش و حکومەت ئاگاداریان ئەکرد.

دوای ئەمە ئیتر، ناوەروکی شورشی بارزان خەریک بو ئەگورا. ئەگەر تا ئەوسا شورشیکی خیلەکی بو، دژی زولمی کومەلایەتی و، لە پیناوی چەسپاندنی دادی کومەلایەتی دا، بو بە شورشیکی کوردی خاوەن داوای سیاسی.

*

لە سەر داوای ماجید وەزارەتەکەی نوری سەعید لە دانیشتنی ڕوژی ٢٥ ی کانونی دوەمی ٤٤ دا بڕیاری دا چەند ئەفسەریکی کورد، کە تا ئەوسا لە ڕیزی جەیش دا بون، دابنی بە ئەفسەری پەیوەندی لە ناوچەکانی کوردستان دا. ئەمانە زوریان ئەندامی حیزبی هیوا بون، کران بە ئەفسەری پەیوەندی: بەهادین نوری بو سلیمانی، ئەمین ڕەواندزی بو ڕەواندز، عیززەت عەزیز بو بارزان، مستەفا خوشناو بو بلە، میرحاج ئەحمەد بو ئاکری، مەجید عەلی بو ئامیدی، سەید عەزیزی شەمزینی بو میرگە سور، فوئاد عارف بو پشدەر. حکومەت دەسەلاتی سپایی و شارستانی دابونی بو چاودیری جوری دابەشکردنی ئازوقەی

تەموین و، رەفتاری کاربەدەستان و، تەهیلن فەرمانبەرانی حکومەت رەفتاری خراپ بکەن. ئەم ئەفسەرانە بەسترا بون، بە وەزیری دەولەت، ماجید مستەفاوە.

*

رۆژی ۱۲ ی شوباتی ٤٤ شیخ ئەحمەد و خیزانەکەی و دەستوپەیوەندەکانی گەرانەوە بۆ بارزان.

رۆژی ۲۲ ی شوباتی ٤٤ مەلا مستەفا گەیشتە بەغداد. لەم سەفەرەدا وەصی، نوری سەعید، سەفیری بەریتانی، وەزیری پەیوەندیدار، سەرانی حیزبی هیوا و، گەلی کەسایەتی کورد و عەرەبی.. بینی. سەردانەکەی هەفتەیەکی خایاند و گەرایەوە بارزان.

بێگومان ئەمە سەرکەوتنێکی سیاسی گەورە بو لە ژیانی مەلا مستەفادا گۆرینێکی گەورەی بە دی هێنا. لە کابرایەکی خێلەکی ئاوارە و دەس بە سەری موحتاجی موچەی حکومەت بو بە پێشەوایەکی نەتەوەیی، جێگەی ئۆمێدی کورد و، جێگەی بایەخ پی دانی حکومەتەکانی عێراق و بەریتانیا.

*

نوری سەعید گەشتێکی بۆ کوردستان کرد. لە کەرکوک لە گەڵ سەرانی خێلەکانی کورد کۆ بوەوە، بەڵێنی سەلماندنی مافە نەتەوایەتیەکانی کوردی پی دان.

وەزارەت، سەبارەت بە مافەکانی کورد، لە ناو خوی دا ناکۆک بو. لە دەرەوەی وەزارەتیش لە ناو هەندی لە کۆرە نەتەوەپەرستەکانی عەرەب دا نارەزایی هەبو. لە ۳ ی حوزەیرانی ٤٤ دا نوری سەعید دەستی لە وەزارەت هەڵگرت و، حەمدی پاچەچی وەزارەتێکی نوی ی پێک هێنا.

ئەم وەزارەتەیش دو کوردی تی دا بو: ئەحمەد موختار و تۆفیق وەهبی، بەلام ماجیدی لی دور خرایەوە. کاری ئەفسەرانی پەیوەندیش تەواو بو، داوایان لی کرا بگەرێنەوە شوێنەکانی خۆیان لە ناو جەیش دا.

هەمو لایان وابو کە حکومەتی تازە بەڵێنەکانی حکومەتی پێشو سەبارەت بە مافەکانی کورد جێبەجی ناکا.

*

ئەفسەرەکان چالاکی سیاسی زۆریان دەس پی کرد. هەندێکیان لە بارزان مانەوە بۆ هاوکاری مەلا مستەفا و، مستەفا خۆشناو و میرحاج چون بۆ کوردستانی ئیران و، عیزەت عەزیز چو بۆ سوریا بۆ پەیوەندی لە گەڵ حیزبی خویبون، بۆ بە دەسهێنانی پشتیوانی بۆ جولانەوەکەیان.

مەلا مستەفا لە نیوەی دوەمی سالی ۱۹٤٤ دا، لە گەڵ هەندی لە ئەفسەرەکانی هاوکاری، گەشتی سیاسی دەس پی کرد بۆ سەردانی هەمو سەرانی ئێل و پیاوە دەس رۆیشتوەکانی زیباری، سورچی، هەرکی، خۆشناو، شەقلاوە، دەشتی هەولیر. هەر لەم گەشتەدا سەردانی سەعید قەزاز، موتەصەریفی هەولیری کرد.

حکومەتی عێراق لە گەشتەکەی مەلا مستەفا و، چالاکی ئەفسەرەکان کەوتە گومان و پەژارە. هێزەکانی جەیش و شورطەی ساز ئەدا.

*

لە ۱۷ی تشرینی یەکەمی۱۹٤٤ دا مەلا مستەفا یادداشتێکی دا بە وەزیری

کاروباری ناوخۆ. کورتەکەی ئەمە بو:

١. یەکخستنی ناوچە کوردنشینەکانی کەرکوک، سلێمانی، هەولێر، دهوک، خانەقین.

٢. دانانی وەزیرێکی کورد لە وەزارەت دا کە بەرپرسی کوردستان بێ.

٣. لە هەر وەزارەتێک دا جێگرێکی وەزیر لە کورد داینرێ.

٤. کاروباری روشنبیری، ئابوری، کشتوکاڵ، جگە لە کاروباری جەیش و شورطە، لە دەسەلاتی ئەم وحدە اداریە بێ.

بۆ یەکەمین جار خواستەکانی مەلا مستەفا لە داوای تایبەتی و خێلەکیەوە گورا بو بۆ خواستنی سیاسی و، لە پاتی کورد ئەدوا. کاربەدەستانی حکومەت ئەم گۆرینەیان بە فیتی ئەفسەرە کوردەکان دائەنا.

عیراق کەوتە راونان و گرتن و دورخستنەوەی ئەفسەرەکانی گومانی لێ ئەکردن. بەلام ئەوان لە چالاکی نەکەوتن و، عیزەت عەزیز، مستەفا خۆشناو، میرحاج ئەحمەد، محەمەد مەحمود، جەلال ئەمین بەگ.. دایانە پاڵ مەلا مستەفا.

لە ١٥ ی کانونی دوەمی ٤٥ دا ئەفسەرەکان ریکخراوێکی تازەیان بە سەرۆکایەتی مەلا مستەفا بە ناوی «هەیئەتی ئازادی» وە دامەزراند. بەرنامەکەیان بە کورتی بریتی بو لە:

١. یەکخستنی عشیرەتەکان.

٢. رزگار کردنی کوردستان بە ریگای سیاسی.

٣. دامەزراندنی پەیوەندی لە گەل حیزبە سیاسیەکانی کورد.

٤. دانی خواستەکانی کورد بە نوینەرانی سیاسی دەولەتانی بیگانە.

٥. کاری راگەیاندن و بلاو کراوە.

٦. خەبات دژی سیاسەتی ئیستیعماریی عیراق.

٧. ریکخستنی هیزی چەکدار.

*

ئەم هەیئەتە، وەکو لە نامەکانی دا بۆ سەرکردایەتی حیزبی هیوا و لقەکانی دا دەرئەکەوێ، ئەیەو سەرکردایەتی شورش بکا. لەو کاتەدا حیزبی هیوا هەبو، ئەم ئەفسەرانەیش هەمویان ئەندامی هیوا بون، بۆچی ریکخراوێکی تازەیان دامەزراندوە. رەنگە یەکێ لەم دو هۆیەی هەبوبی: یان لە توانا و ویستی حیزبی هیوا نائومید بون سەبارەت بە بەشداری و سەرکردایەتی شورش، یان ئەم هەیئەتەیان دامەزراندوە باسکی جەنگیی شورشەکە و، حیزبی هیوا باسکی سیاسی جولانەوەکە بێ.

*

لە نامەیەک دا کە لە ٣٠ ی کانونی دوەمی ٤٥ بە ئیمزای سەرۆکی حیزبی هیوا بۆ مەلا مستەفا نوسراوە، ئەلێ: «هەمو بزوتنەوەیەکی نەتەوەیی ئەگەر بە ریکوپیکی بە پێ ی بەرنامەیەکی ورد ریک نەخرێ، بیگومان ئەنجامەکەی سەرگەردانی و مالویرانی و سەرنەکەوتن ئەبێ. هەروەکو ئیوەیش ئەزانن بزوتنەوەی نەتەوەیی ئەبێ سەرکردەیەک و دو دەستی بەهیزی هەبێ: دەستیکی سیاسی و دەستیکی چەکدار.»

*

ئەم ئالوگۆڕانە حیزبی هیوایان شلەقاند و، توشی تەنگوچەڵەمەیەکی ناوخۆیی قوڵیان کرد. ئاژاوەی تێ کەوت و یەکیتی ریزەکانی تێکچو. لە سەر دو مەسەلەی سەرەکی لە ناو خۆیان دا ناکۆک بون: یەکەمیان، پشتیوانی لە شۆڕشی بارزان بکری یا دەستی لێ هەڵبگیری، دوای ئەوەی دەرکەوت ئینگلیز دوژمنایەتی ئەکات؟ دوەمیان، کورد لە خەباتی رزگاریخوازی دا پشت بە ئینگلیز یان بە یەکیتی سۆڤیت ببەستێ.

ئەوسا و ئێستایش، بێ ئەوەی هیچ بەلگەیەک بە دەستەوە بێ، زۆر کەس ماجید مستەفا تاوانبار ئەکەن بە نۆکەرایەتی ئینگلیز و، بە پیلانگێران بۆ تێکدانی حیزبی هیوا.

*

ئەگەرچی هەیئەتی ئازادی لە گەڵ حیزبی هیوا پەیوەندی بە هێزی هەبو و، داوای لێ کرد نامە و بیرخەرەوە بدا بە سەفارەتی دەوڵەتە گەورەکان، بەلام خۆیشی کەوتە چالاکی: بیرخەرەوەی بۆ حکومەتی عیراق نوسی، داوای لێ کرد کۆبونەوەی هێزەکانی بلاوە پێ بکا و، مافەکانی کورد بسەلمێنی. نامەی بۆ سەفارەتەکان نوسی. بەیانی ئاراستەی گەلی عیراق کرد دەربارەی رەوایی خەباتی کورد. ئیشوکاری بە سەر ئەندامەکانی دا دابەش کرد.

*

بە درێژایی ٣ مانگ لە مارتەوە تا حوزەیران چەندین یەکتربینین لە نیوان مەلا مستەفا و ئەفسەرانی بەریتانی و کاربەدەستانی عیراقی دا و، لە نیوان هەندێ لە ئەفسەرەکان و، نوێنەرانی بەریتانی و عیراقی دا بو. لەم دیدەنیانەدا داوایان لە مەلا مستەفا ئەکرد: رێگە لە موناوەرە و لەشکرکێشیەکانی جەیش نەگرێ. ئەفسەرە کوردەکان بنێریتەوە سەر کارەکانی خۆیان لە ناو جەیش دا.

نیشتمانپەروەرانی کورد هیوایەکی زوریان لە سەر مەلا مستەفا و جولانەوەکەی هەلچنی بو.

*

وەکو لە نامەی رۆژی ٣ ی مارتی ١٩٤٥ دا کە بە ئیمزای سەرۆکی هەیئەتی ئازادی بۆ حیزبی هیوا نوسراوە، هەیئەتی ئازادی بەرنامەی بۆ شۆڕش ئامادە ئەکرد، کورتەی خالە سەرەکییەکانی:

- مانگی مارت بە مانگی شورش دابنین.
- حیزبی هیوا دەسەلاتی هەبی نامە و بەیان و یادداشت بە ناوی «زەعیم» ەوە بلاو بکاتەوە.
- پەیوەندی لە گەڵ نوێنەرانی دەولەتانی بیگانە بکەن.
- دوای دەس پێ کردنی جولانەوەکە، بە ناوی هەیئەتی ئازادیەوە بەیانێک بۆ گەلی عیراق دەربکەن ئامانجەکانی رون بکاتەوە.
- ئەوانەی ئەیانەوێ بەشدار بن لە ئەفسەر و روشنبیر بنێرن بۆ لایان.
- لە گەڵ دەس پێ کردنی شۆڕش دا ئەم کارانە بکرێ: مانگرتنی قوتابیان لە شارەکان. خۆپیشاندان و بەیان دەرکردن لە هەمو شارەکانی کوردستان دا. تێکدانی رێگاوبان و بڕینی تەلی تەلگراف و تەقە لە ناوەندەکانی حکومەت. هاوکاری نەکردن لە گەڵ حکومەت و، لە ناوبردنی ئەوانەی هاوکاری ئەکەن.

*

حیزبی هیوا به ناوی خۆی و زەعیم و یەکیتی لاوانەوە بەیانی بۆ گەلی عیراق و، ئەفسەرانی جەیش دەرکرد و، یادداشتی بۆ سەفارەتەکانی ئەمریکا، فەرەنسا، یەکیتی سۆڤیت و چین نارد.

*

بارزانیەکان بە چەکداری هاتوچۆی داوودەزگاکانی حکومەتیان ئەکرد. رۆژی ۸ ی ئابی ٤٥ لە ناو مەخفەری میرگە سوردا لە مشتومڕیک دا لە سەر ئازوقەی تەموین وەلی بەگ کوژرا. وەلی بەگ خزمی نزیکی خودان و، یەکی لە پیاوە ناسراوەکانی بارزان بو. لە ناو مەخفەرەکەدا بو بە شەر و چەند پولیسیک کوژرا و، مەخفەرەکە گیرا. بارزانیەکان، لە تۆڵەی خوینی وەلی بەگ دا، لە چەند جیگای تر هەلیان کوتایە سەر مەخفەرەکانی ناوچەکە. نیوانی بارزانیەکان و عیراق تیک چو.

حکومەت ئیتزاری مەلا مستەفایان کرد تاوانبارەکان تسلیم بکا و، خۆیشی لە بەردەمی کاربەدەستانی حکومەت دا ئامادە بی. لە هەمان کات دا حوکمی عورفی لە ۱۹ ی ئاب دا لە موسل و هەولیر راگەیەندرا و، جەیش خۆی ئامادە کرد بۆ لەشکرکیشی.

رۆژی ۲٥ ی ئابی ٤٥ یەکەمین پیکادان لە قۆلی رەواندز روی دا.

سەر لە نوی شەری بارزانی - عیراقی هەلگیرسایەوە.

مەلا مستەفا هەمو هیزەکانی و ئەفسەرەکانی هاوکاری لە دەوری بارزان کۆ کرد بوەوە و، جەبهەیەکی لی دامەزراند بو بۆ بەرەنگاری هیرشی گەورەی جەیشی عیراق. پی ئەچی ئامانجی سەرەکی پاراستنی ناوچەی بارزان بوبی، ئەگینا ئەبو: هیزەکانی لە سەنگەردا دانەمەزرینی بۆ شەری جەبهەیی لە گەل جەیشی عیراق، هیزەکانی و هاوکارەکانی لە سەرانسەری کوردستان دا بلاوە پی بکا. چالاکی پیشمەرگەیی لە هەمو شوینەکان بنوینن.

عیراق هەمو هیزەکانی خۆی بە پشتیوانی هیزی ئاسمانی لە سەر بارزان کۆ کردەوە. بیگومان هیزیکی خیلەکیی ناریکوپیکی بی پشتیوان و یارمەتی، چەندە ئازا و لە خۆ بوردو بی، لە بەردەم جەیشیکی نیزامی دا، لە شەریکی جەبهەیی دا، خۆی پی راناگیری.

*

## کشانەوەی بارزانیەکان بۆ ئیران

دانوسەندنی بارزانی - عیراقی تیکچو. جەیشی عیراقی لەشکرکیشیی دەس پیکرد (ئابی ۱۹٤٥ - تشرینی یەکەمی ۱۹٤٥). بارزانی بریاری دا بەر لە بارینی بەفر و گیرانی ریگاکان بکشیتەوە کوردستانی ئیران (تشرینی یەکەمی ۱۹٤٥) کە ئەوسا لە ژیر دەسەلاتی سۆڤیتی دا بو. رۆژی ۱۱ ی تشرینی یەکەمی ۱۹٤٥ لە کیلەشین ئاوا بون.

*

لەم لەشکرکیشیانەی جەیشی عیراق دا ٥ جەحفەل لیوا: لیواکانی ۱ جگە لە فەوجیکی، لیواکانی ۳ و ٤ و ٥ و لیوای ۱٥ جگە لە فەوجیکی، فەوجیکی لیوای ۱٤ و ٥ فەوجی شورطە و، هیزی عەشایری کورد، بەشدار بون. بە هەموی ۳۷٤ کوژراو و برینداریان هەبو. لە شۆرشگیرانی بارزان ۲۲ کەس کوژراوە.

*

## مەلا مستەفا لە کوردستانی ئێران

بارزانییەکان چوونە ئێران لە ناوچەکانی شنۆ، نەغەدە، تەرگەوەر و مەرگەوەر بڵاو بوونەوە. کاربەدەستانی سۆڤیەتی ئاگادار بوون لە ئاڵوگۆڕی نامە و هاتوچۆی نوێنەرانی بارزانی و بەریتانیا بۆ لای یەکتری. باوەڕیان بە مەلا مستەفا نەبوو. گومانیان لێ ئەکرد بە فیتی ئینگلیز چوبێتە ئێران بۆ ئاژاوە نانەوە. لە بەر ئەوە داوایان لێ کرد ماوەیەک خۆی ون بکا و، لە بەرچاوان نەمێنێ. قازی محەممەد و سەرانی دیموکراتیش گوێیان نەدانێ. مەلا مستەفا چوە میراوای سەردەشت دانیشت.

مەلا مستەفا خەریک بو نائومێد بێ. دونامەی بۆ ئیبراهیم ئەحمەد نارد یەکێکیان بۆ خۆی و ئەوی تریان بۆ بابەعەلی شێخ مەحمود. داوای لێ کرد بو نامەکەی بە بابەعەلی بگەیەنێ. ئیبرایم ئەحمەد و هاوڕێکانی لە ژ ک لقی کوردستانی عێراق نامەکەیان کرد بوەوە. مەلا مستەفا داوای لە بابەعەلی کرد بو قسە لە گەڵ کاربەدەستانی عێراق بکا لێیان خۆش بێ بۆ ئەوەی بە کۆمەڵ بگەڕێنەوە و تەسلیمی حکومەتی عێراق بینەوە. ئەگەر هەر لێبوردنیشیان بۆ دەرناکەن وا ئامادەن بگەڕێنەوە عێراق و بچنە زیندانەوە بەو مەرجەی حوکمی ئیعدامەکانیان بۆ بگۆڕن بە مۆئەبەد. ئیبراهیم ئەحمەد نامەکە ناگەیەنێ بە بابەعەلی لە باتی ئەوە بە یارمەتی شێخ لەتیفی شێخ مەحمود مەزبەتەیەک ئەنوسن بە ناوی کوردەکانی عێراقەوە، بە زۆر سەرۆکی عەشیرەت و پیاوی ناسراوی کوردستانی عێراقی ئیمزا ئەکەن، کەوا مەلا مستەفا نوێنەری کوردەکانی عێراقە و ڕێزگرتن و یارمەتی دانی واتە ڕێزگرتن و یارمەتی دانی کوردەکانی عێراقە. دوای گەیشتنی ئەم مەزبەتەیە ئینجا قازی محەممەد لا لە مەلا مستەفا ئەکاتەوە و، بانگی ئەکەن بۆ مەهاباد و، بارزانییەکانیان کرد بە پێشمەرگە و پلەی «جەنەراڵ» یشیان دا بە مەلا مستەفا.

چوار لک لە بارزانییەکان پێک هێنرا و، ئەفسەرە کوردەکان بون بە فەرماندەیان و، پارێزگاری لای سەقزیان پێ سپێردرا. ئازایانەو بە دڵسۆزی تا ڕوخانی حکومەتی کوردستان ناوچەکەیان لە هێرشی ئەرتەشی ئێران پاراست.

*

## دامەزراندنی پارتی

ئەو ماوەیەی لە مەهاباد بون بە چاولێکەری حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران، مەلا مستەفا و ئەفسەرەکانی هاوکاری لە گەڵ حەمزە عەبدوللا قسەیان کرد بە یەک بۆ دامەزراندنی حیزبێکی لەو بابەتە کە جێگەی هەمو ڕێکخراوە کوردیەکانی عێراق بگرێتەوە. بۆ ئەم مەبەستە حەمزە عەبدوللای ناردەوە بۆ کوردستانی عێراق. حەمزە پەیوەندی لە گەڵ سەرکردایەتی حیزبەکانی: شۆڕش، ڕزگاری، لقی کوردستانی عێراقی ژ - ک.. کرد بۆ یەکگرتن لەم حیزبە نوێ یەدا. لە ١٦ ی ئابی ١٩٤٦ دا لە بەغدا یەکەمین کونگرەی دامەزراندنی «پارتی دیموکراتی کورد» بەسترا. لەم کونگرەیەدا پرۆژەی ئەو پرۆگرامەی حەمزە لە ئێرانەوە هێنا بوی پەسند کرا و، کومیتەیەکی ناوەندی بۆ هەڵبژێردرا و، مەلا مستەفایش بە سەرۆکی حیزب دانرا. زۆری سەرکردە و ئەندامەکانی شۆڕش و ڕزگاری چونە ئەم حیزبە تازەیەوە. ئیبراهیم ئەحمەد ئەگەرچی لەم کۆنگرەیەدا بەشداری کرد، بەڵام لەو کاتەدا ئامادە نەبو ڕێکخراوەکەی خۆی: ژ ک هەڵوەشێنێتەوە و تێکەڵاوی پارتی بێ.

کە جمهوریەتی مەهاباد ڕوخا بارزانییەکان خۆیان نەدا بەدەستەوە، کەوتنە گفتوگو

لەگەڵ ئیران، مەلا مستەفا چو بۆ تاران، شا و سەرۆوەزیران و، گەورە ئەفسەرانی ئەرتەش و، سەفیری ئەمەریکای بینی. داوای لە سەفیر کرد بو کە خوی و هەمو عەشیرەتەکەی بە پەنابەر لە ئەمەریکا وەربگیرین. سەفیر داواکەی جیبەجی نەکرد بو. تەهران داوای لە مەلا مستەفا کرد: چەک دابنین و، لە نزیک هەمەدان نیشتەجی بکرین. مەلا مستەفا بە رواڵەت رەزامەندی خوی بۆ دەربری بون، بەڵام وت بوی دوا بریار لە دەس شیخ ئەحمەد دایە، ئەبی ئەویش موافەقەت بکا، بەم بەهانەیە گەرابەوە ناو بارزانیەکان.

شیخ ئەحمەد رازی نەبو بچی بۆ هەمەدان، بریاری دابو بروانەوە بۆ عیراق. ئیران پەلەی بو ئەم هیزە چەکدارە، کە بە مەترسی ئەزانی بۆ سەر خوی، هەڵبوەشینی، ئەوانیش ئەیانویست کات بە سەر بەرن تا زستان تی ئەپەری و ریگە بەفراویەکانی کیلەشین - دالاتپەر ئەکرینەوە، بو ئەوەی بە خوشی لە ئەنجامی ریکەوتن لەگەڵ عیراق یاخود بەشەر بگەرینەوە ناوچەکانی خویان. کاربەدەستانی ئیرانی ئەمەیان لی وەرنەگرتن، داوایان لی کردن: یا دەستبەجی چەک دابنین و بچنە ناوچەی هەمەدان خەریکی کشتوکاڵ بن، یاخود دەستبەجی بگەرینەوە بو عیراق.

*

## بارزانی ئەگەریتەوە بۆ کوردستانی عیراق

ئەرتەشی ئیرانی ویستی بە زور چەکیان بکا و بیانگویزیتەوە بو دەرەوەی کوردستان، چەن تیکهەڵچونی چەکدار لە نیوان هیزەکانی بارزانی - ئیرانی دا روی دا. بارزانیەکان بەرگرییەکی ئازایەنەیان کرد و، بە دەم شەرەوە بەرەو سنوری عیراق کشانەوە (نیسانی ١٩٤٧). وەکو جەلالی ئەمین بەگ چەند جار ئەیگیرایەوە: هەندی لە ئەفسەرەکان زور لە گەڵ مەلا مستەفا خەریک بون بۆ ئەوەی قانیعی بکەن نە بیر لە خو بە دەستەوەدان بکاتەوە و، نە بیر لە پەنابردن بۆ یەکیتی سۆفیت، بەڵکو دریژە بە شورش بدا. مەلا مستەفا گوی ی لی نەگرتن. لە میژوی نوی ی کوردا چونی مەلا مستەفا بو سۆفیت بە قارەمانەتییەکی بی وینە دائەنری، کەچی هیچ کەس ناپرسی: بۆچی مەلا مستەفا نەمایەوە و، هیزەکانی بە ناو کوردستان دا بڵاو نەکردەوە و، دریژەی بە جەنگی پارتیزانی نەدا، لە کاتیک دا زیاتر لە ٥٠٠ چەکداری گەنجی گیانباز و گویرایەڵی لە گەڵ بوە و، هەمو هیزە چەکدارەکانی عیراق لەو کاتەدا نەئەگەیشتە ١٠ هەزار کەس؟

عیراق ئامادە نەبو لیبوردنی گشتی «عفو عام» یان بو دەربکا، زۆری لی ئەکردن بی قەیدو شەرت تەسلیم بین. مەلا مستەفا ٥٦٠ چەکداری لی هەڵبژاردن و کەوتە ری بەرەو ناوچەی بارزان، شیخ ئەحمەدیش لەگەڵ هەمو بارزانیەکانی کە دا بە خاووخیزانەوە خویان دا بە دەست عیراقەوە. بە پی ی «بەیانی رەسمی» حکومەتی عیراق: ژمارەی ئەو بارزانیانەی لە روژانی ١٧ و ١٨ ی نیسانی ١٩٤٧ دا بە بی قەید و شەرت بە دو کاروان خویان بە دەستەوە دا بریتی بو لە ١٥٥٠ پیاو و، ١٦٨٦ ئافرەت و، ١٣٢٩ منال. بارزانیەکان پۆل پۆل کران. هەندیکیان لە دەشتی دیانا، شوینیکی دور لە بارزان، نیشتەجی کران، شیخ ئەحمەدو هەندیکی تریان درانە دادگاو حوکمی جیاجیا دران. شیخ ئەحمەد خوی حوکمی ئیعدام درا.

مەلا مستەفا ٣ ژنی هەبو. هەمویان گەرانەوە عیراق. دوانیان لە گەڵ کورەکانیان تا ماوەیەک گیران و دواتر دەس بەسەر دانران. سی یەمیان کە کچی مەحمود ئاغای زیباری

بو لە گەڵ مەسعودی کوڕی چوەوە ماڵی باوکی لە موسل. لە کاتی شۆڕشی بارزان دا مەحمود ئاغا جاشی چەکداری حکومەتی عیراق بو.

*

چونی بارزانی بۆ سۆڤیێت

مەلا مستەفا نەیتوانی عیراق واڵی بکا «لیبوردنی گشتی» یان بو دەربکا، پاش ئەوەی نائومید بو بە ناو سنوری ئیرانی - تورکی دا کەوتە ری بەرەو یەکیتی سۆڤیەت. ئەم ری پیوانە دریژە ٥٢ رۆژی خایاندوە. کاربەدەستانی سۆڤیەتی چەکیان لی وەرگرتن و، پەرش و بلاویان کردنەوە بە ناو کۆمارەکانی سۆڤیەتی دا. دەربارەی ژیانی مەلا مستەفا لە سۆڤیەت زۆر کەم ئەزانری، خۆیشی زور کەمی باس کردوە. سەرانی پارتی وایان بلاو ئەکردەوە کە جەنەراڵە لە لەشکری سوردا، بەلام ئەلین تا مردنی ستالین قەسابی کردوە، دوای مردنی ئەو ئینجا گوزەرانیان نەختی باشتر بوە و، ئازادیەکی کەمیان دراوەتی.

*

ئیعدامی ئەفسەرەکان

شیخ ئەحمەد ئیعدام نەکرا، بەلام بە حوکمدراوی لە زیندانی بەصرا گلدرایەوە تا شۆڕشی ١٤ تەموزی ١٩٥٨. ٤ لەو ئەفسەرانەی هاوبەشی شۆڕشی بارزان بون: عیزەت عەبدولعەزیز، خەیروللا عەبدولکەریم، مستەفا خۆشناو، محەمەد مەحمود هەلواسران. بەر لە هەلواسینیان بە چەند سەعاتی بە کومەڵ نامەیەکیان بۆ میللەتی کورد نوسیوە. نامەکەیان ٤ بەندە، لە یەکیکیان دا داوا لە گەلی کورد ئەکەن: «دوای جەهالەت نەکەوی!». هەمو ئەوانەی شارەزای بەروبوچونی ئەم ٤ شەهیدە بون، ئەلین: «مەبەستیان لە - جەهالەت - سەرکردایەتی مەلا مستەفای بارزانی بوە».

*

سەروکایەتی پارتی

پارتی دوای ئەوەی لە کونگرەی یەکەمی دا مەلا مستەفای هەلبژارد بە سەروکی خوی، لە دو کونگرەی تریشی دا: کونگرەی دوەم (مارتی ١٩٥٠ لە بەغداد) و کونگرەی سیهەم ( کانونی دوەمی ١٩٥٣ لە کەرکوک)، سەروکایەتیەکەی نوی کردەوە. بە دریژایی ئەو ماوەیەی مەلا مستەفا لە یەکیتی سۆڤیەت بو (١٩٤٧ - ١٩٥٨) بی ئەوەی سەرکردایەتی پارتی و مەلا مستەفا ئاگایان لە یەکتری بی، پارتی پروپاگاندەیەکی بەربلاوی بۆ مەلا مستەفا ئەکرد، وەکو قارەمانی نیشتمانیی کورد و، کاوەی سەدەی بیستەم و، جەنەراڵی لەشکری سوری سۆڤیەتی، لە بەیان و وتارەکانی دا بە شان و شکوی بارزانی دا هەلئەدا و، وینەکانی بلاو ئەکردەوە. حەمزە عەبدوللا نامیلکەیەکی بە عەرەبی لە سەر شۆڕشی بارزان نوسی، هەر ئەو زەمانە پارتی بلاوی کردەوە و مەرحوم محەمەد ئەمین کردی بە کوردی. مەلا مستەفا لای خەلک کرا بو بە سەرکردەیەکی ئەفسانەیی لە شکان نەهاتو و، بگرە بە «بتیکی پەرستراو». بیگومان ئەمە نیشانەی لاوازیی کەسایەتی سەرکردەکانی ئەوسای پارتی بوە، کە هیچیان بە خۆیان دا رانەئەبەرمون سەروکایەتی پارتی و، سەرکردایەتی جولانەوەی کورد بگرنە دەس و، بۆ کەسایەتیەکی نەخویندەواری خیلەکیی دور ولاتی چارەنوس نەزانراویان بە جی هیشت بو.

*

## ١٤ تەمموز و بارزانی

بۆ پیرۆزبایی لە شۆرشی ١٤ تەمموزی ١٩٥٨ مەلا مستەفا لە رۆژانی یەکەم دا تەلەگرافیکی بۆ سەرکردایەتی شۆرشەکە نارد، لایەنگری و پشتیوانی خۆی دەربڕی بو، داوای کرد بو ریگای بدەن بگەرێتەوە بۆ عیراق بۆ خزمەتی جمهوریەت. رۆژنامە کوردیەکانی ئەو کاتە بروسکەکەیان بلاو کردەوە. نوێنەرەکانی پارتی: ئیبراهیم ئەحمەد و عەلی عەبدوللا لە سەردانی کاربەدەستانی عیراق دا داوای بەردانی بارزانیە گیراوەکان و گەرانەوەی ئەوانەی دەرەوەیان کرد بو.

شۆرشی ١٤ تەمموز لێبوردنی گشتی بۆ هەمو بارزانیەکان دەرکرد، چ ئەوانی لە زیندان بون و چ ئەوانی لەدەرەوە پەنابەر بون. شیخ ئەحمەد ئازاد کرا لە ناو خەلک دا وەکو قارەمانی نیشتیمان سەیری ئەکرا. رۆژنامە کوردیەکان لەسەریان ئەنوسی، وێنەیان بلاوئەکردەوە، گفتوگۆیان لەگەل ئەکرد. شیخ ئەحمەد هیچ ئارەزوی سیاسی نیشان نەئەدا.

تا ئیستاش وا باوە عەبدولکەریم قاسم مەلا مستەفای هیناوەتەوە و، عەبدولسەلام عارف موافیق نەبوە لە سەر گەرانەوەی. عەزیز عوقەیلی یش لە بیرخەرەوەکەی دا وا ئەلی. بەلام ئیبراهیم ئەحمەد، کە ئەوسا سکرتێری پارتی و، خۆی چو بە دوای بارزانی دا بۆ هینانەوەی روداوەکە بە جۆریکی تر ئەگیرێتەوە.

مەلا مستەفا دو جار بە بروسکە داوای لە سەرکردایەتی شۆرشی تەمموز کرد بو: ریگای بدەن بگەرێتەوە عیراق، بەلام هیچ وەلامیکیان لی نەگیرا بوەوە. ئەمانیش بە بابەعەلی شیخ مەحمود ئەلین، کە ئەوسا وەزیر ئەبی لە وەزارەتەکەی قاسم دا، داوا لە کاربەدەستان بکا کارئاسانی گەرانەوەی بکەن، ئەویش هیچ دەنگیکی نابی. مەلا مستەفا تەلەگرافیک بۆ ئیبراهیم ئەحمەد ئەکا، داوای لی ئەکا: ٣ پاسپورت، بۆ خۆی و میرحاج ئەحمەد و ئەسعەد خۆشەوی پەیدا بکا و، موافەقەتی کاربەدەستانی عیراقیان بۆ وەربگرن بۆ گەرانەوەیان.

ئیبراهیم ئەحمەد بە هۆی کەریم قەرەنیەوە ئەچی بۆ لای تاهیر یەحیا، کە ئەوسا بەریوەبەری گشتی پۆلیس ئەبی، داوای لی ئەکا لەو روەوە یارمەتی بدەن. ئەویش پیشنیاریان بۆ ئەکا کە سەردانی ئەبو ئەحمەد بکەن، ئەو ئەتوانی کارەکەیان بۆ جیبەجی بکا. مەبەستی لە ئەبو ئەحمەد عەبدولسەلام عارف ئەبی، کە ئەوسا جیگری سەروکی وەزیران و وەزیری کاروباری ناوخۆ بو. بە تەلەفون دیدەنیەکیان بۆ ریک ئەخا. مەسەلەکە لە گەل عارف باس ئەکەن. بە روی خۆشەوە گوییان لی ئەگری و، بەلینیان ئەداتی کارەکەیان بۆ جیبەجی بکا. بە تەلەفون لە گەل دەزگای پەیوەندیدار قسە ئەکا بۆ راپەراندنی کارەکەیان. ئامۆژگاریشیان ئەکا کە لە ریگای گەرانەوەدا بە قاهیرەدا بینەوە بۆ ئەوەی عەبدولناصریش ببینن، بزانن بیروڕای ئەو چیە لە سەر کیشەی کورد. ئیبراهیم ئەحمەد بە دوای کارەکەدا ئەچی و پاسپۆرتەکانی بۆ ئامادە ئەکەن. رۆژی ١٧ ئەیلول، ئیبراهیم ئەحمەد سکرتێری پارتی و، نوری ئەحمەد طەها بە نوینەرایەتی کومیتەی ناوەندی پارتی و، شیخ صادقی بارزانی، بە فرۆکە ئەگەنە پراگ: پایتەختی چیکوسلوفاکیا.

مەلا مستەفا لە سەر داوای خۆی لە روسیاوە بەری کرا بو بۆ پراگ لەوی چاوەروانی گەرانەوەی ئەکرد بۆ عیراق. لە کۆشکیک دا لە گوندیکی نزیک شاری پراگ دانرا بو. ئیبراهیم ئەحمەد و هاوریکانی لە میوانخانەی پارتی کومونیست دائەبەزین. پاش چەند

رۆژی بە فڕۆکە چونە قاهیرە. لەو کاتەدا فایەق سامەڕائی سەفیری عیراق ئەبی لە میصر، بە هۆی ئەوەوە لەوی سەرۆک عەبدولناصریان بینی. ناصر رەئی وا ئەبی کە شێوەی بەڕێوە بردنی «محافظات» لە میصر بکری بە نمونە بۆ چارەسەری کێشەی کورد لە عیراق دا.

لە قاهیرەوە بە ڕێ کەوتن، ڕۆژی ٦ ی تشرینی یەکەمی ١٩٥٨ گەیشتنە بەغداد. مەلا مستەفا وەکو قارەمانی سەرکەوتو پێشوازی کرا.

مەلا مستەفا لە کۆشکەکەی نوریی سەعید دانرا. قاسم مانگی ٥٠٠ دیناری بۆ خۆی و ١٥٠ دیناری بۆ عوبێدوڵڵای کوری و ٥٠ دیناری بۆ لوقمان بڕیەوە. مانگی نیسانی ٥٩ بارزانیەکان، ئەوانەی لە یەکێتی سۆڤیەت بون، بە کەشتی گەیشتنەوە بەصرا. پێشوازی حکومەتی و حیزبیان لی کرا. بۆ ئەوانیش مانگی ٣٥ دینار بۆ سەلت و ٥٠ دینار بۆ خێزاندار موچەیان بۆ بڕدرایەوە. هەروەها بۆ شێخ ئەحمەد ١٥٠ دینار و هەمو ئەوانەی لە گەڵی گیرا بون لە نێوان ٣٠ تا ٥٠ دیناریان بۆ بڕینەوە. زیاتر لە ٦٠٠ تفەنگیشیان دانی بۆ پارێزگاری خۆیان.

*

## گەڕانەوەی بارزانی لە شیعری کوردی دا

لە ژێر تەئسیری ئەو پروپاگاندە زۆرەدا، کە چەندین ساڵ بو سەرانی پارتی بۆ مەلا مستەفایان کرد بو، کە گەڕایەوە خەڵک وەکو قارەمانی نەتەوەی کورد پێشوازی کرد. ڕۆژنامە و گۆڤارەکانی ئەو سەردەمە: ژین، هەتاو، پێشکەوتن - التقدم، خەبات، ئازادی، ڕۆژی نوی، بڵێسە، نەورۆز.. بابەت و باسی زۆریان لە سەر نوسی. ئەگەرچی زۆری هەڵدانە بە شان و باڵی بارزانی دا، بەڵام بۆ یەکی کە بیەوی لە سەر ئەو ماوەیە بکۆڵێتەوە کەرەستەی بە نرخیان تی دایە. شاعیرە ناودارەکان: کامەران، دیلان، کاکەی فەلاح، هەژار، قەدری جان و، شاعیرە لاوەکان: شێرکۆ بێکەس، جەمال شارباژێری... شیعری درێژیان لە ستایشی بارزانی و بە بۆنەی گەڕانەوەیەوە دانا. تەنانەت بەشی کوردی رادیۆی بەغداد کە هەندی لەم شیعرانەی بە دەنگی شاعیرەکان بڵاو ئەکردەوە، شیعرێکی درێژی کابرایەکی فەیلی، ناوی مەلا نامدار بو، بڵاو کردەوە لە دوای هەمو بەندێکی شیعرەکەی دا ئەم دێرەی دوبارە ئەکردەوە: «هاتەوە خۆش هاتەوە، شێر و شەکر هاتەوە، ئەکبەر وەطنچی هاتەوە!»

*

میرحاج ئەحمەد کە یەکی لە ئەفسەرە چالاکەکانی حیزبی هیوا بو و، بەشداری شۆڕشی بارزان بو، لە گەڵیان چو بۆ مەهاباد و، لەویش فەرماندەی یەکی لە فەوجەکانی هێزی بارزانیان بو، لە گەڵ مەلا مستەفا چو بۆ یەکێتی سۆڤیەت و، هەر لە گەڵ ئەویش گەڕایەوە بۆ عیراق، پارتی کردیان بە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی، بەڵام میرحاج هەتا مرد تێوخنی کاروباری پارتی نەکەوت و، تێکەڵاوی سیاسەت نەبو، وەکو ئەیانوت لە گەڕانەوەی دا وت بوی: «کاری سیاسی لە گەڵ مەلا مستەفا ناکری».

*

دوای شۆڕشی ١٤ ی تەموز بە ماوەیەکی کەم ناکۆکی لە نێوان نەتەوەپەرستەکانی عەرەب و شیوعی و دیموکراتەکان دا لە سەر کێشەی «وحدە» لە گەڵ کۆماری عەرەبی یەکگرتو (سوریا و میصر) دروست بو. مشتومڕێکی توند دامەزرا کە ئاخۆ عیراق «وحدە» یان «ئیتیحاد» بکا. شیوعیەکان بە توندی دژی هەردوکیان بون. قاسمیش زۆرتر

عیراقی بو تا عەرەب. ئەم مشتومڕە بو بە کیشەیەکی گەورە. نەتەوەپەرستەکان ویستیان لە ریگای پیلانگیرانەوە ئەم کارە بکەن. لە ٨ ی مارتی ٥٩ دا لە موسل یاخیبونیکی سپایی بە سەرکردایەتی عەقید شەواف روی دا. یاخیبونەکە بە توندی سەرکوت کرا. بارزانیەکان لەم سەرکوتکردنەدا بەشدار بون و، هەندی چەکیان لە «مقاومە شعبی» وەرگرت. ریکخراوی «مقاومە شعبی» هیزیکی چەکدار بو لە خەلک دروست کرا بو بۆ سەرکوتکردنی نەیارەکانی حکومەتی قاسم و، لە ژیر نفوز و دەسەلاتی حشع دا بو.

*

## کۆنگرەی چوارەمی پارتی

لە چین و ئەلمانیای دیموکرات لە پال پارتی کومونیست دا هەندی وردە پارتی سیاسی تر هەبون، وەکو قەوارەیەکی روکەش و دروستکراو، بو سەلماندنی هاوپەیمانیتی پرولیتاریا و بورجوازی پچوک لە قوناغی دامەزراندنی سۆشیالیزم دا، هیلرا بونەوە. لە دوای شورشی ١٤ ی تەموز حشع بە جوریکی چاوەری نەکراو پەرەی سەند و گەورە بو، زور لەوانەی چەپ بون لایان وابو دەوری حیزبە سیاسیەکانی تر نەماوە و، ئەگەر مابی ئەبی ببن بە قوتابخانەی پیگەیاندنی دۆستی شیوعی، وەکو لە چین و ئەلمانیای دیموکراتی کراوە. هەمزە عەبدوللا، سکرتیری پارتی و هەندی لە هاوریکانی لەم باوەرەدا بون. بە ئاشکرا بە لای حشع دا دایان ئەشکاند.

لە روژی ١ ی ئاباری ٥٩ دا «خەبات» ی ئورگانی پارتی بە مانشیتی گەورە نوسی: «سلاو لە چینی کریکار و پیشرەوەکەی». مەبەست لە پیشرەوەکەی چینی کریکار: حشع بو. بەکیتیەکانی: لاوان، قوتابیان، ئافرەتان، کریکاران، جوتیارانی کوردستان، هەلوەشینرانەوە و چونە ناو ریکخراوە عیراقیەکانەوە کە بە دەس حشع وە بون.

باسکی نەتەوەیی ناو سەرکردایەتی پارتی لە گەل ئەم باسکەدا لە بەربەرەکانی و ململانی دا بو، بەلام توانای یەکلایی کردنەوەی نەبو. مەلا مستەفا (لە ٣٠ ی حوزەیرانی ١٩٥٩ دا) تاقمی چەکداری ناردە سەر بارەگای حیزب لە شەقامی «موتنبی» لە بەغدا، دەستیان بە سەر بارەگاکەدا گرت و، هەمزە و هاوریکانی: ئەزاد ئەحمەد، خەسرەو تۆفیقیان.. بە زور دەرکرد و، ئیبراهیم ئەحمەد و هاوریکانیان لە جیگا دانان. ئەمەش یەکەمین جار بو زور بە کار بهینری بۆ یەلاداخستنی ناکوکیە ئایدیولوجی و ریکخراوەییەکانی ناو حیزب.

دوای ئەوە کۆنگرەی چوارەم (تشرینی یەکەمی ١٩٥٩ لە بەغداد)، هەمزە و هاوریکانی بە یەکجاری لە پارتی دەرکرد. سەرکردایەتییەک هەلبژیردرا جیگای رەزامەندی بارزانی بو. مەلا مستەفا هەمیشە بایەخیکی تایبەتی ئەدا بەو کەسانەی گومانی جاسوسی یەکی لە دەولەتە گەورەکانی لی بکرایە. لەم کۆنگرەیەدا مەلا مستەفا د. موراد عەزیز، کە کوردیکی ئیرانی بو، دانا بە ئەندامی م س چونکە گومانی لی ئەکرد جاسوسی سۆڤیەت بی.

*

## کۆنگرەی پینجەمی پارتی

سالی ١٩٦٠ کە پارتی ئیجازەی کاری قانونی درا کۆنگرەی پینجەمی لە ٥ - ٨ ی مایسی ٦٠ دا لە بەغدا بە ئاشکرا بەست. مەلا مستەفا بۆ ئەوەی بەشداری کونگرە نەبی

یان خۆی قورس رابگری گەرا بووەوە بارزان. دەستەیەک لە نوێنەرانی کونگرە چون بە دوی دا بۆ بارزان و، بە هەزار تکا و پارانەوە ئینجا رازییان کرد بێتە کونگرە، کە هات پێیش وت بوی: «حەز ئەکەم سەرۆکی قەحبە بم و سەروکی ـئیوە نەمە! حەز ئەکەم پێم بلێن: حیز بە و، حەز ناکەم پێم بلێن حیزبی بە!». ئەو رۆژە مەلا مستەفا ئەیویست گەورەیی خۆی و بچوکی ئەوان بسەلمێنی، سەرانی پارتی ئەم سوکایەتی پێ کردن و جنێوانەیان قوبوڵ کرد و، کونگرەی پێنجەم بە تێکرای دەنگ مەلا مستەفای هەلبژاردەوە بە سەروکی پارتی. بەهانەکەی قوبولکردنی ئەم سوکایەتیەیش ئەوەبو: قاسم حیزبی شیوعی و وەطەنی دیموقراطی لەت کردوە، گەرەکیتی پارتی یش لەت بکا، بۆ ئەوەی یەکیتی ریزەکانی حیزب بپارێزن و ئەحیلن پیلانەکەی قاسم سەر بگری، ئەمەیان کرد.

بێگومان ئەمە ناتوانری بە نیشانەی هەستکردنی سەرکردەکانی پارتی بە لیپرسراوەتی حیزبی و نیشتمانی دابنری، بەلکو بەلگەی لاوازیی کەسایەتیان بوە. ئەگەر سەرکردایەتی پارتی ئەوسا ئەم سوکایەتیەی قوبول نەکردایە، خۆی بە بێ بارزانی ملی رێگای خەباتی بگرتایە، یا حیزبێکی پچوکتریش بوایە لەوەی کە هەبو، لەوانە بو رەوتی روداوەکانی کوردستانی عیراق بە باریکی کەدا بڕویشتایە. لەو سەردەمەدا چەند حیزبی تر لە عیراق دا هەبون، بە قەوارە و نفوز و دەسەلات لە پارتی بەهیزتر بون، هەمویشیان کەسایەتی شارستانی رێبەریان ئەکرد نەک شیخی عەشیرەت، لەوانە: محەممەد حسین رەضی (ماموستای سەرەتایی) رێبەری حیزبی شیوعی عیراق و، کامل چادرچی (مهندس) رێبەری حیزبی وەطەنی دیموقراطی و، صدیق شەنشەل (محامی) رێبەری حیزبی ئیستیقلال و، فوئاد ریکابی (مهندس) رێبەری حیزبی بەعس.

مەلا مستەفا لەم کونگرەیەدا وتی: من تەنیا ٣ (مرشح)م هەیە بۆ کومیتەی ناوەندی: ناهیدەی شیخ سەلام، هاشم عەقراوی، ئیسماعیل عارف. هەرسێکیان هەلبژێردران. لەمەش دیسان مەبەستی سوکایەتی بو بە حیزب و کومیتەی ناوەندی.

*

رۆژنامەی «الثورە» بەغدادی کە سەر بە قاسم بو وتاریکی نوسی داوای تواندنەوەی کوردی کرد بو. رۆژنامەی «خەبات» ئەم باسەی زل کرد و ناڕەزاییەکی زۆری لە ناو کوردا خولقاند. مادەی دوەمی «دەستوری کاتی» عیراقی بە بەشی لە نەتەوەی عەرەب دائەنا، خەبات لە وتاریکی دا لەم ماددەیەی کولی بووەوە. نوسی بوی عەرەبی عیراق بەشیکە لە نەتەوەی عەرەب و، کوردی عیراق بەشیکە لە نەتەوەی کورد. لە سەر ئەمە ئیبراهیم ئەحمەد کە سەرنوسەری خەبات بو درا بە دادگا.

*

## تیکچونی قاسم و مەلا مستەفا

مەلا مستەفا لە دوای گەرانەوەیەوە هەولیکی زوری ئەدا قاسم لە خوی رازی بکات و، کاریکی وەها ئەکات دلی بڕەنجی، لە خوپیشاندانیکی گەورەدا کە لە بەردەرکی سەرای سلیمانی بۆ پیشوازی لە هاتنی بارزانی کرا، لە شوینی وتار دانەوە توڕە بو لەو کەسەی وینەی ئەوی بەرز کردبوەوە. بە تورە بونەوە داوای لە کابراکە کرد وینەکەی داگری و، وتی: «من سەربازی زەعیم عەبدولکەریمم». وەکو بەهادین نوری لە یادداشتەکانی دا ئەگیریتەوە لە بونەیەکی تردا بە قاسمی وتوە: «من لەیتانی قوندەرەکانتم!». نیوانخوشیی قاسم و مەلا

مستەفا درێژەی کێشا تا ئەحمەد ئاغای زیباری کوژرا.

عەبدولکەریم قاسم لە کاتی حەرەکاتی بارزان دا لە چلەکان دا سەرپەرشتیکەری چەکدارە بەکرێگیراوەکانی عەشیرەتە کوردەکانی سەر بە حکومەت بوە. کە مەلا مستەفا وەکو قارەمانی نەتەوەیی کورد گەڕایەوە بو عیراق سەردانی قاسمی کرد. قاسم لە ناو ئامۆژگارییەکانی دا بو بارزانی داوای لی کرد بو: «عفاالله عما سلف» واز لە دوژمنایەتی کون بهینی. بە دوای تولەدا نەگەری. سەردانی مالی هەمو ئەو سەروک عەشیرەتانە بکا کە کاتی خوی شەریان لە گەل کردوە. هەمویان ئاشت بکاتەوە و دوستایەتییان لە گەل بکا.

شیخ ئەحمەد خودانی بارزان حەزی نەئەکرد مەلا مستەفا تیکەلاوی سیاسەت بی، بەلام مەلا مستەفا «طموح» ی زل و زوری هەبو. مەلا مستەفا ئەیویست «طموح» ە سیاسیەکانی خوی (گەورەی کورد بی) و «طموح» ە عەشیرەتییەکانی خوی (گەورەی بارزان بی) پیکەوە بگونجینی. بو رازی کردنی شیخ ئەحمەد، مەلا مستەفا چەند بارزانیەکی نارد ئەحمەد ئاغای زیباری یان لە جادەیەکی موسل دا بە ئاشکرا کوشت. ئەمە پیچەوانەی ئامۆژگارییەکانی قاسم بو بو مەلا مستەفا. ئەوەش یەکەمین درزی کردە پیوەندی مەلا مستەفا و قاسمەوە.

شەری تولەسەندنەوەی بارزانییەکان لە گەل عەشیرەتەکانی دراوسییان دەستی پی کرد. شەر لە گەل ریکانی، ئەیرەوەیی، برادۆست، زیباری.. هەلگیرسا. ریکخراوەکانی پارتی پشتیوانیان لە بارزانییەکان ئەکرد. بروسکەی پشتیوانییان بە خەلک ئیمزا ئەکرد. روژنامەی خەبات بلاوی ئەکردەوە. شیوعیەکانیش پشتیوانییان لە بارزانیەکان کرد و، خستیانە چوارچیوەی شەری کونەپەرستی و دەرەبەگیەوە. هەندی لەم عەشیرەتانە بە کومەل پەنایان بو تورکیا و ئیران برد. ئیتر هەلومەرجی کوردستان بەرەو گرژی و دەسپیکردنی شەر ئەرویشت.

*

مەلا مستەفا بو بەشداری لە ئاهەنگەکانی شورشی ئوکتوبەر لە ٦ ی تشرینی دوەمی ١٩٦٠. دا چو بو یەکیتی سوڤیت تا ١٣ی کانونی دوەمی ١٩٦١ مایەوە. هەندی ئەلین بارزانی لەم سەفەرەدا بەلینی پشتیوانی لە سوڤیت وەرگرتوە و، هەندیکیش ئەلین سوڤیت هیچ جورە بەلینیکیان پی نەداوە، بەلکو داوایان لی کردوە کیشەکانی لە گەل قاسم بە ئاشتی چارەسەر بکا.

مەلا مستەفا کە گەڕایەوە عیراق، دوای ماوەیەک بە ناوی سەردانی شیخ ئەحمەدەوە ئیتر بە یەکجاری بەغدادی بە جی هیشت و گەڕایەوە بارزان دانیشت. بە روالەت «گوشەگیری» هەلبژارد بو، بەلام لە راستی دا کەوت بوە پەیوەندییەکی فراوان لە گەل ئاغا و بەگزادەکانی کوردستان. هانی ئەدان خویان چەکدار بکەن و، بە چەکداری لە جادە گشتیەکان دا خویان پیشان بدەن.

*

## وەفدی ئاغاکانی کوردستان

هەراو هوریای شورشی ١٤ ی تەموز نیشت بوەوە. شیوعیەکان دەسەلاتیان کەم بوبوەوە. لە هەندی جی کەوت بونە بەر هیرشی قاسم. ئاغا و بەگزادەکانی کوردستان خەریک بو خویان ئەگرتەوە و، لە ناو خویان دا کەوت بونە هاتوچو و یەکتر بینین.

وەفدێکی گەورەیان پێکەوە نا بۆ سەردانی بەغداد و بینینی مەسئولەکانی حکومەت. مەبەستی سەرەکی ئەم وەفدە دەسکاری قانونی ئیسلاحی زەراعی بو، بەلام ئەو خواستەیان لە ژێر هەندێ خواستی سیاسی وەکو مافی نەتەوایەتی دا داپۆشی بو.

وەفدەکە چوە بەغداد. سەرانی پارتی و ڕۆژنامەی «خەبات» ئەم وەفدە و چالاکیەکانی پشت گوێ خست. ڕۆژنامەی «اتحاد الشعب» ی حشع هێرشی کردە سەریان. ئەمانەیان بە کۆنەپەرست دائەنا. بەلام ڕۆژنامەی عەرەبی - کوردی «صوت الاكراد - دەنگی کورد» ڕۆژانە ناوی ئەندامانی وەفدەکە و چالاکیەکانی بلاو ئەکردەوە. ڕۆژنامەی «دەنگی کورد» عومەر جەلال حەویزی دەری ئەکرد کە پارێزەرێکی کۆیی بو.

وەفدەکە شتێکی بە شت نەکرد و، قاسم ئامادە نەبو بە کۆمەڵ بیانبینی و، گوێ ی لە خواستەکانیشیان نەگرت، چۆن هات بون بەو جۆرە گەڕانەوە بۆ کوردستان. لە ناو ئەوانەدا تەنیا صدیق بەگی میران توانی بە تەنیا دیدەنی قاسم بکا.

*

## هەلگیرسانی شۆڕشی ئەیلول

پیوەندی نێوان مەلا مستەفا و قاسم ساردی و گرژی تێکەوت بو. مەلا مستەفا ئەیویست قاسم ناچار بکا پیوەندی لە گەڵ چاک بکا. سالی ١٩٦٠ لە کۆبونەوەیەکی فراوانی کۆمیتەی ناوەندی و ئیحتیاتەکانی و لجنەی تفتیش و موراقەبەدا.. کە مەلا مستەفایش بەشدار بو. لەم کۆبونەوەیەدا مەلا مستەفا هێرشی کردە سەر قاسم و، داوای لە حیزب کرد خۆیان بۆ بەرەنگاری ئامادە بکەن و، هەندێ کار بکەن، وەکو: بڕینی خەتی تەلەفۆن و کارەبا، تێکدانی ڕێگا و پرد.. بۆ ئەوەی قاسم ناچار بکا خواستەکانیان جێبەجێ بکا. هەندێ لە ئەندامانی م س وت بویان کاری وەها ئەبێتە هۆی هەلگیرسانی شەر بێ ئەوەی ئێمە خۆمان بۆ شۆڕش و بەرەنگاری ئامادە کرد بێ.

*

مەلا مستەفا هەندێ لە کاوانیەکانی ڕاسپارد بۆسەیەکیان بۆ صدیق میران دانا، لە نێوان کۆیێ - شەقلاوەدا کوشتیان. دوای کوشتنی ئەحمەد ئاغای زیباری، ئەمە دوەمین سەرۆکی عەشیرەت بو، بە فەرمانی مەلا مستەفا بکوژرێ. صدیق بەگی میران گەورەی ئاغاکانی خۆشناو و، لە سەردەمی پاشایەتی دا نائیب و، ماوەیەک بو خۆی لە گەڵ قاسم ڕێک خست بوەوە و، دیدەنی کرد بو. لە سەر کوشتنی ئەو فەرمانی گرتنی سکرتێری پارتی ئیبراهیم ئەحمەد دەرچو، بە سەری دا ڕۆژنامەی عەرەبی «خەبات» و حەفتەنامەی کوردی «کوردستان» داخران، چونکە سەرنوسەری یەکەم و، خاوەن ئیمتیازی دوەم بو.

مەلا مستەفا لە پشتی سەرکردایەتی پارتیەوە کەوتە هاندانی سەرۆکی خێلەکان بۆ خۆپیشاندانی چەکدار. ئەمانە خۆیان بە هۆی «قانونی ئیسلاحی زەراعی» و، هەلتەکاندنی ڕژێمی دەرەبەگی لە قاسم و شۆڕشی ١٤ تەموز بە داخ بون. لە زور جێ عەشائیر بە چەکداری کۆبونەوە. وەکو ئەلێن: بارزانی لە «دول» یک و مەکتەبی سیاسی، لەو کاتەدا، لە «دول» یکی تر بو. ئەوان کۆبونەوەی چەکداری خێلەکانی کورد و، هەمو جۆرە پێکدادانێکی چەکداریان پێ کارێکی زیانبەخش بو، نەیشیان ئەزانی ئەم خۆسازدان و خۆپیشاندانە مەلا مستەفای لە پشتەوەیە، ئەوانیش وەکو شیوعیەکان وایان ئەزانی ئەمە پیلانی ئیمپریالیزم و نۆکەرەکانیتی، پیلانی ئێرانە بۆ نانەوەی ئاژاوە.

م س مامجەلالی نارد بۆ هەلسەنگاندنی هەلومەرجی کوردستان و، خاوکردنەوەی گرژی. کە گەیشتە کوردستان و کوبونەوەی چەکداری هوزە کوردیەکانی دی و، چاوی بە نامەی مەلا مستەفا کەوت، کە بو عەباسی مامەند ئاغای ئاکوی نوسی بو، دەربارەی سازدانی خیلەکانی ناوچەکە، ئەویش ئیتر بیروڕای خوی گوری و، پشتیوانی لە داواکەی مەلا مستەفا کرد و، هاتە سەر باوەری ئەوەی ئیتر کاتی دەسپیکردنی شورش هاتوە.

ماوەیەک تی پەری مامجەلال هەوالی نەبو. بە دوای مامجەلال دا، م س عومەر مستەفای نارد، کە تازە لە کاتی گویزانەوەی دا، لە گیراوی هەلات بو. ئەویش کە هەلومەرجی شورشگیرانەی کوردستانی بینی مایەوە و، شوین هەللاکە کەوت.

چەکدار لە هەمو شوینە گرنگەکانی کوردستان کوبوبونەوە، پارتی دەستی لە کوکردنەوە و هاندان و ریکخستنیان دا نەبو. ناریکوپیک و بی سەروبەر بون. مەلا مستەفا هانی دابون. وای ئەزانی ئەمە قاسم ئەترسینی و، سەرەنجام ناچاری ئەکا، بو خاو کردنەوەی هەلومەرجی ئالوزاوی کوردستان داوای یارمەتی لی بکا، ئەوسا ئەویش مەرجەکانی خوی بە سەردا ئەسەپینی.

*

حکومەتی قاسم لە ٩ - ١١ ئەیلولی ٦١ دا فەرمانی دا بە کەرتەکانی جەیش لە جادەکانی دەربەندیخان و دەربەندی بازیانەوە بەرەو سلیمانی بکشین. فروکەی جەنگی یش کەوتە فرین بە سەر خوپیشاندانی چەکداری عەشائیردا. پاش تەقوتوقیکی کەم هیزی عەشائیر کەوتە چولکردنی سەنگەرەکانی و هەلاتنیکی ناریکوپیک. جەیش پیشرەوی کرد و، شوینەکانی گرت. کادر و ئەندامەکانی پارتی یش کە تەجرەبەی شەریان نەبو، بە شیوەیەکی عەسکەری ریک ئەخرا بون، ئەوانیش هیوایان بە هیزی عەشائیر بو. کە عەشائیر شکا ئەوانیش شکان و پەرەوازە بون. ئەندامانی مەکتەبی سیاسی و کومیتەی ناوەندی پارتی وەکو ئاردی ناو دركیان لی هات بو، هەر یەکەیان کەوت بوە شوینیکەوە: ئیبراهیم ئەحمەد و نوری شاوەیس لە بەغداد، مامجەلال لە چەمی ریزان، عومەر مستەفا لە دەوروبەری بیتواتە، مەلا عەولا لە سەفین و، محەممەدی حاجی تاهیر لە لە نزیک ماوەت، حیلمی عەلی شەریف لە دەربەند بیلولە، عەلی حەمدی، عەلی عەسکەری، ئەحمەد عەبدوللا لە بادینان بون. هەندی تاقمی بچوکی تریش بە سەرانسەری کوردستان دا بلاو بوبونەوە.

پارتی شیرازەی لە بەر یەک هەلوەشا. بارەگاکانی داخران و ژمارەیەکی زور لە ئەندام و لایەنگرەکانی گیران و، لە سلیمانی بارەگای حیزبەکەیان کردن بە زیندانی ئەندامەکانی.

*

## کوری روژنامەوانی قاسم

لە ٢٣ ئەیلولی ١٩٦١ دا قاسم لەو کونفرەنسە روژنامەوانیەدا کە بە بونەی هەلگیرسانی شورشی کوردەوە بەستی، وتی: «.. لە زەمانی منەوە بە رولەکانی گەل رابگەیەنن، ئەم بزوتنەوەیە جیابونەوە خوازە، ئینگلیز لە پشتیانەوەیە و ئەمریکاش دوایان کەوتوە. بەلگەی بریندەرومان هەیە ئەوە رون ئەکاتەوە کی لە پشتی ئەم جولانەوەیەوەیە... جولانەوەکە لە ناوبرا، هەندی تاقم و دەستەی راکردو ماون، سەرەکانی ئەوانیش لەناو ئەبەین.. سابیت بو حکومەتی بەریتانی و لایەنی تر لە پشتی ئەم جولانەوەیەوەن..

سفارەتی بەریتانی دایکانەیە و ئەمریکاش هاوبەشیتی...»
قاسم لەو کاتەدا دو کیشەی گەورەی لە گەڵ وڵاتانی رۆژئاوا هەبو: کیشە لە گەڵ کومپانیاکانی نەوت و، کیشە لە گەڵ کویت. دوای کشانەوەی هیزەکانی بەریتانیا قاسم کویتی کردبوە قەزایەکی بەصرە و شیخی کویتیشی بە قائیمقام دانابو، هیزیشی ئامادە کرد بو بو گرتنی. ئەمەش ناکوکیەکی تری لەنیوان قاسم و بەریتانیاو هەمو دەوڵەتانی عەرەبی و دەوڵەتانی ناوچەکە لەوانە ئیران و تورکیا دروست کردبو... قاسم ئەبویست وای دەربخا بزوتنەوەی کورد بە هاندانی ئینگلیز و ئەمریکا لە تولەی ١٤ تەموزو دەرچون لە پەیمانی بەغدا و ناکوکی لەگەڵ کومپانیاکانی نەوت و داواکردنەوەی کویت ... دا دەستی پی کردوە.
لەو سەردەمەدا وا باو بو، بەردیک لە ئاسمان بکەوتایەتە خواری، ئیمپریالیزمی جیهانیان پی تاوانبار ئەکرد. لە بەر ئەوە هەقی بو گومانیان لی بکا. بەلام ئەمریکا قازانجیکی لە دۆستایەتی کوردا نەبو، بگرە دۆستایەتی کورد دلی دو دۆستی گرنگ: ئیران و تورکیای، لی ئەرەنجاند، کە هەردوکیان ئەندامی سنتو و، یەکیکیان بە بالیکی گرنگی ناتو دائەنرا.
ئەمریکا و ئینگلیز زۆر زو قاسمیان بە درۆ خستەوە.

*

هەلویستی سۆڤیتی لە شورشی کورد

کە شورشی ئەیلول دەستی پی کرد. یەکیتی سۆڤیت لەبی بی دەنگ بو، نە هەلویستی دوژمنانەی بەرامبەر بزوتنەوەی کورد دەربری، وە نە پشتیوانی لی کرد. لەم مەسەلەیەدا نە پشتیوانی لە قاسم کرد و نەدژی راوەستا، بەلکو گویی خوی لی خەواند، پەلاماری توندوتیژی کاربەدەستانی عیراق بو دامرکاندنەوەی شورشی کورد و، بو سەرکوتکردنی چالاکیەکانی حشع دەستی پی کرد بو، لەگەڵ ئەوەش دا پسپورەکانی سۆڤیت لە عیراق دا خەریکی کاری خویان بون، پەیوەندی ئاسایی سوڤیتی - عیراقی بەردەوام بو، یەکیتی سۆڤیت بە ناوی بەجیهینانی گفتەکانی خویەوە هەمو چەک و تفاقی جەنگی پیویستی شەری ئەرزی و ئاسمانی دژی کورد بو جەیشی عیراقی دابین ئەکرد، قاسم بە چەکی سۆڤیتی دریژەی بە جەنگی کوردستان ئەدا.

*

شیخ ئەحمەد و شورش

گەورەترین ئاواتی شیخ ئەحمەد ئەوە بو لی ی بگەرین بچیتەوە ناو عەشیرەتەکەی خوی و سەرپەرشتیان بکا، ئەوەیشی بو لوا بو. حکومەت موچەی مانگانەی بو خوی و هەمو دەست و پیوەندەکانی بری بوەوە، لە بارزان خانوی بو کرد بونەوە، بەریزەوە سەیری ئەکردن. ئەگەرچی مەلا مستەفا سەروکی پ د ک بو، بەلام شیخ ئەحمەد نەیئەهیشت نە پ د ک و نە هیچ پارتیەکی تر لە ناو «میللەت» ی بارزان دا چالاکی سیاسی بنوینن و لە هیچ بارزانیەکی قبول نەئەکرد بچیتە هیچ حیزبیکەوە. لەبەرچاوی خەلک نارەزایی خوی لە مەلا مستەفا نەئەشاردەوە، کە ئیەوی سەر لە نوی بارزانی و کورد لە بەلاوە بگلینی، شیخ ئەحمەد هەمیشە دلسوزی و گویرایەلی خوی بو کاربەدەستانی عیراق دەرئەبری.
کە شورشی ئەیلول دەستی پی کرد (١٩٦١) شیخ ئەحمەد لە بارزان دانیشتبو،

بەشداری هیچ خۆ ئامادە کردنێکی نە کرد بو، بەلام هێزی ئاسمانی عێراق بارزانی بۆردومان کرد. لەگەڵ ئەوش دا شێخ ئەحمەد بروسکەیەکی بو عەبدولکەریم قاسم نارد، دلسوزی خوی و عەشیرەتی بارزانی بو ئەوو حکومەتی عێراقی و، ناڕەزایی توندی بەرامبەر مەلا مستەفاو دەسپێکردنی شورش دەربڕی. هەروەها بە دەنگی خوی لە ئیستگەی رادیوی بەغدادەوە داوای لەگەلی کورد کرد: «تالوز پالوز» نەکەن، دوای مەلا مستەفا نەکەون و بگەڕێنەوە ناو «عیل و عەیالی خو» یان. هەولی دا ئەهلی زوورایەتی بارزانیەکان لە جولانەوەکەدا بەشدار بن و، ناوچەی بارزانی لە روی چالاکی و هاتوچوی پێشمەرگەدا داخست بو ئەوەی کاربەدەستانی عێراق رازی بکا. کاتێک عێراق کەوتە دروستکردنی «وحدات غیر نظامیە» لە عەشیرەتە کوردەکان دژی شورشی ئەیلول، شێخ ئەحمەدیش موافەقەتی کرد بارزانیەکان «وەحدە» یەک پێک بهێنن بە سەروکایەتی شێخ محەممەد خالیدی کوری. ئەم «وەحدە» یە لە هەندی شەڕی گرنگ دا بەشداربوون لەوانە گرتنی گەلی عەلی بەگ و چیای کورەک.

شێخ ئەحمەد جوامێرێکی راستگو و سەرراست بو. دلسوزی باوەڕەکانی خوی بو. گوی ی نەئەدایە مالی دنیا، تەنانەت پارەی کاغەزی لە یەکتری جیا نەئەکردەوە، بو «میللەت» ی بارزان بی ئەندازە دلسوز و، لە رەفتار و بڕیارەکانی دادپەروەر بو. لەناو بارزانیەکان دا پایەیەکی پیروزی هەبو، سەرەڕای ئەوەی گەلێک کارەساتی بەسەر هاتبو، توشی گەڕان و سوڕانێکی زور ببو، بەلام پیاوێکی ساویلکە بو، روشنبیریی گشتی نەبو، دەستی وەرنەئەدایە کاروباری سیاسەتی گشتیەوە. دوا سالەکانی تەمەنی خوی بە گوشەگیری لە ناو بارزانیەکان دا بەسەر برد و، لە سەرەتای سالی ۱۹٦۹ دا نەخوشی تینی بو هێنا. حکومەت بە هالیکوپتەر گوێزایەوە بو نەخوشخانەی ئیبن سینا لە بەغداد. روژی ۱۱ ی کانونی دوەمی ٦۹ لە نەخوشخانە کوچی دوایی کرد و حکومەت تەرمەکەی بە هالیکوپتەر هێنایەوە بو بارزان و لەوی ناشتیان.

پانگەوازەکەی شێخ ئەحمەد کارێکی گەورەی لە بارزانیەکان کرد. زوریان وازیان لە مەلا مستەفا هێنا. مەلا مستەفا ناوچەی بارزانی بە جی هێشت. روی کردە چیاکانی بادینان. لەو کاتەدا عەلی حەمدی و ئەحمەد عەبدوللا و عەلی عەسکەری (کە هەرسێکیان ئەندامی کومیتەی ناوەندی بون) لە بادینان بون. لە گەل مەلا مستەفا یەکیان گرتەوە. مەلا مستەفا عەلی حەمدی و عەلی عەسکەری نارد بو تورکیا «مافی پەنابەریی» بو وەربگرن. تورکیا ئامادە نەبو بە پەنابەر وەریان بگری. عەلی حەمدی ئەم رازەی مەلا مستەفای درکاند، لە بەر ئەوە رقی لی هەلگرت، لە یەکەمین هەل دا کوشتی.

شێخ ئەحمەد قەبولی نەئەکرد مەلا مستەفا لە ناوچەی بارزان بی، مەلا مستەفا لە ژێر گوشاری شێخ ئەحمەدی برای و جەیشی عێراق دا بە ناچاری روی کردە ناوچەی بالەکایەتی. دەوری مەخفەری رایات گیرا. پاش ئابلوقەدانێکی درێژ گیرا. ئەمە ناوچەیەکی فراوانی ئازاد کرد.

*

خاموشی بالی بە سەر ناوچەکانی سلیمانی و کەرکوک و هەولێردا کیشا بو. هیچ چالاکیەکی پێشمەرگەیی، سیاسی، رێکخراوەیی گرنگی تی دا نەما بو. مەلا مستەفا ئەم خاموشیەی بە «موئامەرە» یەک دائەنا کە سەرانی پارتی رێکیان خستوە بو ئەوەی جەیش

دەستی بەتال بی بۆ تیکشکاندنی ئەو. ئەحمەد تۆفیق، ڕیبەری حیزبی دیموکراتی کوردستان و هاوڕیکانی، دنەی مەلا مستەفایان ئەدا دژی حیزب. کەوتنە دەرکردنی بلاوکراوەیەک بە ناوی «دیسان بارزانی» ئەم بلاوکراوەیە تەرخان کرا بو بۆ ستایشی سەرکردایەتی بارزانی و، شکاندنی سەرکردایەتی پارتی و، قولکردنەوەی ناکۆکیەکانیان. هەوالی چالاکی پیشمەرگەکانی بادینانی قەپە ئەکرد و، توانج و پلاری لە پارتی ئەگرت. ڕاستیەکەی هۆی ئەم خامۆشیە تیکشکاتی ڕیکخراوەکانی پارتی بو، نەک موئامەرەی سەرکردەکانی.

*

کۆبونەوەی کۆمیتەی ناوەندی

لە مانگی کانونی یەکەمی ۱۹٦۱ دا زۆرایەتی ئەندامانی کومیتەی ناوەندی پاش چەند مانگ لە یەک دابران لە گوندی عەودالان لە نزیک چەمی ڕیزان کۆ بونەوە. لەم کۆبونەوەیەدا بڕیاریان دا:

- جولانەوەکە لە باوش بگرن، ڕیکی بخەنەوە و سەرکردایەتی بکەن.
- دروشمی دیموکراسی بۆ عیراق و ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستان بەرز بکەنەوە.
- بارەگای م س دابنین و، ڕیکوشوینی دەرکردنەوەی خەبات و بلاوکراوەکانی پارتی دابنین.

لەم کۆبونەوەیەدا بڕیاریان دا دەستەیەکی نوینەرایەتی بە سەرۆکایەتی عەلی عەبدوللا بنیرن بۆ لای مەلا مستەفا بۆ تەبەشتنی گلەییەکانی و، پتەو کردنەوەی پەیوەندی نیوان سەرۆک و سەرکردایەتی.

مەلا مستەفا بۆ پاریزگاری عەلی عەبدوللا لە گەڕانەوەیدا تاقمی بارزانی لە گەل ئەنیری. دەمەو بەیانیەک لە ناوچەی برادوست توشی چەند جاشیکی سوفیەکان ئەبن. ئەبی بە تەقوتۆق. عەلی عەبدوللایان لی دائەبڕی دوای دو ڕۆژ ئینجا ئەی دۆزنەوە. مەلا مستەفا لە سەر ئەم ڕوداوە وت بوی: «ئاوا داوا ئەکەن حیزب قیادەی شۆرش بکا؟ کە توشی شەڕ بون لە باتی ئەوەی قیادەی شەڕەکە بکا، خۆی پیس کردوە!»

*

پارتی دوای ئەو کۆبونەوەیەی کۆمیتەی ناوەندی کەوتە خۆڕیکخستنەوە و خۆ سازدانی پیشمەرگەیی و ڕیکخراوەیی و ڕاگەیاندن و، لق و ناوچەکانی ڕیک خستەوە. ڕیکخراوی شارەکانیشی بە نهینی زیندو کردەوە و، لە هەندی شار پیشمەرگەی ناوشاری دامەزراند.

پارتی لە ناو پۆلیسەکانی هەولیر و سلیمانی دا ڕیکخستنی زۆری دامەزراند بو. لە دەوروبەری نەورۆزی ۱۹٦۲ دا بە یارمەتی ئەوان دەیان مەخفەری لە قەزاکانی چوارتا، پینجوین، قەرەداغ ئازاد کرد. سەدان پارچە چەکی دەس کەوت و، دەیان عەریف و سەدان پۆلیس و، چەندین ئەفسەر هاتنە ڕیزی جولانەوەکەوە. ناوچەیەکی فراوان لە هیزەکانی حکومەت ئازاد کرا. ئەمە ئەگەڕیتەوە بۆ ئازایەتی و دلسۆزیی پۆلیسەکان، ئەگینا کەمالی شیخ غەریب لە پینجوین و عەبدولوەهاب ئەتروشی لە چوارتا، کە دوایی بون بە دەسەلاتداری ناوچەکە، ئامادە نەبون بە خۆشی مەخفەرەکان تەسلیمی پیشمەرگە بکەن، بەلکو لە ژیر گوشاری پۆلیسەکان دا تەسلیم بون.

جولانەوەکە تا ئەهات بەهێزتر ئەبو. پارتی لە سەر شێوەی جەیش لە دستە (. ١) پێشمەرگە، پەل (. ٣) پێشمەرگە، لق (. ١٢) پێشمەرگە، ڕیکی خستن و، چەند هێزێکی پێک هێنا: هێزی رزگاری بە سەرکردایەتی مامجەلال لە چەمی ڕیزان، هێزی کاوە بە سەرکردایەتی عومەر مستەفا لە بیتواتە، هێزی خەبات بە سەرکردایەتی عەلی عەسکەری لە چوارتا، کەرتی ٣ و ٤ ی قەرەداخ بە سەرکردایەتی کەمال موفتی، کەوتنە کاری پێشمەرگانە.

مەلا مستەفا لەو کاتەدا بە ناوچەکانی بالەکایەتی، خۆشناوەتی، ئاکۆیەتی.. دا، ئەگەرا. ئەیئەبیشت ئەو جۆرە ڕیکخستنە پێشمەرگەییە بخریتە ناوچەکانی ژێر دەسەلاتی ئەوەوە. خۆی بە هەمو هێزەکەی ئەوت لەشکر و، هەر لەشکرێکی کرد بو بە چەند قولێکەوە، سەرقۆلی بو دانا بون.

*

## نارەزایی مەلا مستەفا لە م س

مەلا مستەفا لە هەمو جێگایەک و لە هەمو کۆر و کۆمەلێک دا بە ئاشکرا دژی مەکتەبی سیاسی، بە تایبەتی دژی ئیبراهیم ئەحمەد، قسەی ئەکرد. ئەمەی لای ڕۆژنامەوانەکانیش باس ئەکرد. زۆر باسی لەم بابەتە لە کتێبی: «گەرانی بە ناو پیاوە ئازاکان دا» ی ڕۆژنامەوانی ئەمەریکی دانا ئادەم شمیت و، کتێبی: «شەری کوردەکان» ی ڕۆژنامەوانی بەریتانی دەیڤید ئادەمسەن دا هەیە. جنێوی ناشیرینی پی ئەدان و تۆهمەی ناڕەوای ئەخلاقیی بە پاڵ ئەدان.

لە ناو جولانەوەکەدا بە کردەوە دو سەرکردایەتی و، دو شێوەی جیاواز لە ڕیکخستن و بەڕێوەبردنی جولانەوەکەدا هەبو:

یەکێکیان، سەرکردایەتی مەلا مستەفا بو، کە شوێنێکی دیاریکراوی نەبو، لە ناوچەکانی بالەکایەتی، خۆشناوەتی، ئاکۆیەتی ئەگەرا و، لەوێوە سەرکردایەتی هەمو هێزەکانی بادینانی ئەکرد.

ئەوی تریان، مەکتەبی سیاسی بو، کە پێک هات بو لە ئیبراهیم ئەحمەد، نوری شاوەیس، عەلی عەبدوللا.. کە بارەگاکەی لە ئەشکەوتی مالومە بو، لەوێوە سەرکردایەتی هەمو ڕیکخستنەکانی پ د ک و پێشمەرگەکانی سلێمانی و کەرکوک و هەولێری ئەکرد. کەوت بوە دەرکردنی «خەبات» و بەیان و بلاو کراوە.

مەلا مستەفا، بەم گەرانە، جگە لە ناوچەکانی بادینان، چۆمان، ڕەواندز، شەقلاوە و تارادەیەک قەلادزە و ڕانیەی هێنا بوە ژێر دەسەلاتی خۆی، لە شوێنێک دائەنیشت ئەمڕۆ لەوێ بو. لە مەش دو مەبەستی هەبو: یەکەمیان، خۆپاراستن لە هێرشی ئاسمانیی عێراق. دومیان، ئەیویست بە شێنەیی و هەنگاو بە هەنگاو تەنگ بە م س هەلبچنی و، ناوچەکانی ژێر دەسەلاتی ئەوانیش بهێنێتە ژێر دەسەلاتی خۆیەوە.

بۆچونی مەلا مستەفا بۆ حیزب، وەکو بۆچونی بو بۆ عەشیرەت. چۆن ئەندامانی عەشیرەت ئەبی بی چەن و چون گوێرایەلی فەرمان و ئامۆژگاری و قسەکانی سەرۆکی عەشیرەت بن، ئەبی ئەندامانی حیزبیش بە هەمان دلسۆزی گوێرایەلی فەرمان و ئامۆژگاری و قسەکانی سەرۆکی حیزب بن. لەوەتی گەرابوەوە بۆ عێراق، لە چەند کۆر و کۆبونەوەدا ئەیوت: «من شای بەریتانیا نیم ڕەمزێکی بی دەسەلات بم، یا سەرۆکی حیزب نابم یا ئەگەر

سەرۆکی حیزب بوم ئەبی سەرۆکیکی راستەقینە بما» لە مەبش مەبەستی ئەوە بو هەمو دەسەلاتەکان لە دەس خوی دا بی و، هیچ کاری بی ئاگاداری و رەزامەندی ئەو نەکری. لە ولاتیکی دواکەوتوی وەک کوردستان دا، هیچ سنوریک نیە بۆ دەسەلاتەکانی «سەرۆکی راستەقینە».

*

م س لەو ماوەیەدا ئەشکەوتی مالومەی کرد بو بە بارەگای خۆی. سەرکردایەتیەکی ناوەندیی سیاسی، پیشمەرگەیی، ریکخراوەیی، راگەیاندنی دامەزراند بو. بە دەزگای بیتەل لە گەل هەمو هیزەکانی پیشمەرگە و لقەکانی پارتی پیوەندی رۆژانەی هەبو. ئیبراهیم ئەحمەد، بە پیچەوانەی مەلا مستەفا، لە شوینی خۆی نەئەجولا، بە دریژایی ئەو ماوەیە سەردانی هیچ ناوچە و هیز و لقیکی نەکرد.

*

رۆژنامەی «الثورە» ی بەغدادی کە سەر بە قاسم بو، ئەمریکا و ئەلمانیای رۆژئاوای تاوانبار کردبو بەوەی ئەیانەوی مسەلەی شورشی کورد لە کوری گشتی نەتەوە یەکگرتوەکان دا باس بکەن. رۆژنامەکە سەفیری ئەمریکی کەلە بەغداد دەرکرابو، ئیتیهام ئەکرد بەوەی لە کونفرەنسی دیپلوماتەکانی ئەمریکا لە ئەثینا خەریکی پەیوەندیە بو ئەم مسەلەیە. سەفیری ئەمەریکی لە حوزەیرانی ٦٢ دا هەوالەکەی بە توندی بە درۆ خستەوە، وتی: «ولاتە یەکگرتوەکان بایەخ بە شورشەکەی مەلا مستەفای بارزانی نادا و هیچ نیازیکی نیە ئەم مسەلەیە بخاتە بەردەمی نەتەوە یەکگرتوەکان»

*

پیوەندی لە گەل ئیران

صالح یوسفی لە بەغداد لە گەل سەفارەتی ئیران پەیوەندی دامەزراند. بە دوای ئەمەدا شەمسەدین موفتی لە خانەقینەوە بە نهینی چوە قەسری شیرین و گەرایەوە بەغداد. زەمینەی دروستکردنی پەیوەندی لە گەل ئیران ساز بو. سالی ۱۹٦۲ عومەر مستەفا و علی عسکەری نامەی مەلا مستەفایان برد بۆ ئیران. ئیران بە نهینی پیوەندی لە گەل م س دامەزراند و، ئەفسەریکیان بۆ پیوەندی ناردە لایان. ئەمانیش ئەورەحمان روتەیان کرد بە بەرپرسی پیوەندییەکانیان. پیوەندییەکانیان زۆر بە نهینی و لە گەل ساواک بو. ئیران چاوپۆشی لی ئەکردن ئازوقە و داوودەرمان و کەرەستەی چاپ لە بازاری ئیران بکرن و، لە سنوریکی تسک و نەزانراودا هاتوچۆی دەرەوە بکەن. بۆ یەکەمین جار کەمال فوئاد لەم ریگایەوە سەردانی کوردستانی کرد.

مەلا مستەفا ئەمەی پی خۆش نەبو، ئەیویست پەیوەندی لە ریگەی خۆیەوە بی.

*

پەیوەندی بەعس و شورش

بەرەی حیزبە قەومیەکانی عەرەب لە عیراق دا لە ژیر دروشمی: «یا اعداء الشیوعیە اتحدوا» ریک کەوت بون عەبدولکەریم قاسم بروخینن. ئەگەرچی بە ئاشکرا لە بەیان و بلاوکراوەکانی خۆیان دا هیرشیان ئەکردە سەر شورشی کورد و، بە یاخیبونیکی کۆنەپەرست و شعوبی دەستکردی قاسمیان دائەنا بۆ دورخستنەوە و لیدانی ئەفسەرە نەتەوەپەرستەکانی عەرەب، بەلام لە هەمان کات دا بە نهینی پەیوەندییان لە گەل دامەزراند

بو. تاهیر یەحیا بە ڕیگەی کەریم قەرەنی لە گەڵ م س پێوەندی کرد بو. پیک هات بون لە سەر ئەوەی: کە بزوتنەوەی نەتەوەپەرستەکانی عەرەب هەر کاریکیان کرد بۆ ڕوخاندنی قاسم، جولانەوەی کورد لە دژیان ڕانەوەستی و، ئەوانیش لە یەکەمین بەیان دا دان بە مافی نەتەوەیی کوردا بنین لە سەر بنچینەی ئوتونومی.

*

## مانگرتنی خویندکارانی زانستگای بەغداد

لە دوا حەفتەکانی ۱۹٦۲ دا هەندی گیروگرفت لە یەکی لە قوتابخانەکانی بەغدادا روی دا بو، بەعسیەکان، کە لەو کاتەدا خەریکی دانانی ریوشوینی ڕوخاندنی قاسم بون، ئەمەیان قۆستەوە بۆ ریکخستنی مانگرتنیکی گەورەتری خویندکارانی زانستگای بەغداد. سەرکردایەتی پارتی لە چوارچیوەی ئەو پەیوەندییەدا کە لە گەڵ بەرەی نەتەوەیی، بە تایبەتی بەعس دایان مەزراند بو، داوایان لە «یەکیتی قوتابیانی کوردستان» کرد: لەو مانگرتنەدا دژی قاسم بە چالاکی هاوکاری لە گەڵ «الاتحاد الوطنی لطلبە العراق» بکا. بەرەی نەتەوەیی عەرەب ئەم یەکیتییەیان بۆ کۆکردنەوەی خویندکارەکانی خۆیان لە ریکخراویکی تایبەتی دا، دژی «اتحاد طلبە العراق» کە لە دەس شیوعیەکان دا بو، دامەزراند بو. حشع دژی ئەم مانگرتنە راوەستا و، خویندکارەکانی لایەنگری، لەو شوینانەی ئەیانتوانی، دریژەیان بە دەوام ئەدا. ئەو کاتە من خویندکاری پۆلی یەکەمی بەشی زانستی سیاسی بوم لە زانستگای بەغداد و، ئەندامی ریکخراوی قوتابیانی پارتی و لیژنەی بەغدای یەکیتی قوتابیان بوم.

مانگرتنەکە تا ڕوخانی قاسم بە ئینقیلابی شوبات دریژەی کیشا.

*

## ئینقیلابی شوبات

لە ۸ ی شوباتی ٦۳ دا قەومییەکانی عەرەب بە ئینقیلابیکی خوێناوی هاتنە سەر کار. عەبدولسەلام عارف بو بە سەرکۆمار و ئەحمەد حەسەن بەکر بە سەرۆوەزیر. بەیانی یەکەمیان خویندەوە، بەلام باسی ئوتونومی تی دا نەبو. لە گەڵ ئەوەیش دا صالح یوسفی لیپرسراوی پارتی لە بەغدا و، ئەندامی م س، بە ناوی پارتیەوە بروسکەیەکی پشتیوانی بۆ سەرانی ئینقیلابەکە لیدا سەرەتاکەی بە: «نتلاحمت ضربات ثورتنا بضربات ثورتکم...» دەس پی کرد بو. لەو کاتەدا سەرانی ئینقیلاب خەریکی پاکتاوکردنی شیوعیەکان بون و، هیشتا چارەنوسی ئینقیلابەکەیان بە لادا نەکەوت بو.

*

ڕوخانی قاسم و هاتنە سەرکاری بەعس لەلایەن هەمو ناحەزانی رژیمی قاسمەوە بە خوشیەکی زورەوە پیشوازی کرا، لەوانە ئەمەریکا. کاربەدەستانی بەعس لە ڕوژی یەکەمی جولانەوەکەیانەوە بانگەوازی کوشتاری شیوعیەکانیان دەرکرد، پەیوەندی نیوان عیراق و یەکیتی سۆڤیەت بە توندی گرژ بو، یەکیتی سۆڤیەت و پارتیە کومونیستەکانی دنیا هیرشیکی پروپاگەندەی فراوانیان دژی کاربەدەستانی ئینقیلابی شوبات دەس پی کرد. سەرکردەکانی ئینقیلاب بەر لە جولانەوەکەیان لەگەڵ سەرکردایەتی بزوتنەوەی کورد ریک کەوتبون لەسەر ئەوەی لە بەیانەکانی یەکەمین جولانەوەدا مافی نەتەوەیی گەلی کورد لەسەر بنچینەی ئوتونومی بسەلمینن بەرامبەر بە پشتیوانی جولانەوەی کورد لە کودەتاکەی ئەوان.

شەر لە نیوان کوردو عیراق دا راوەستا گفتوگوی سیاسی بو دوزینەوەی چارسەری هینانە دەستی پی کرد.

ئەمریکا بە لایەرە گرنگ بو دەسەلاتی بەعس بینی، چونکە سنوری دانا بو نفوزی سوڤیتی لە سیاسەتی دەرەوەی دا لەبەر ئەوەی بزوتنەوەی کورد، یەکیک بو لە هو گرنگەکانی روخانی عەبدولکەریم قاسم و ئەگەر دریژە بکیشی یەکیک ئەبی لە هو گرنگەکانی روخان یا هیچ نەبی لاوازکردنی هەر رژیمیکی لە عیراق دا دەسەلاتدار بی، لەبەر ئەوە وەزیری کاروباری دەرەوەی ئەمریکا دین رسک نامەیەکی ئاراستەی حکومەتی بەعس کرد کە هەول بدەن بگەنە لایەلاکردنی هیمنانە، هەروەها راسپاردەیەکی دەمیشی بو بارزانی نارد کە شەر دەس پی نەکاتەوە، هەول بدا ناکوکیەکانی خوی لەگەل دەسەلاتدارانی بەغدا بە ریگەی دانوستان یەلادا بخات.

*

## گفتوگوی کورد - بەعس دەستی پی کرد.

بە نوینەرایەتی مەلا مستەفا و سەرکردایەتی پارتی مامجەلال چو بو بەغداد. سەرانی ئینقیلابەکەی بینی و، بو بە دەسهینانی پشتیوانی عەرەب چو بو قاهیرە بو بینینی سەروک عەبدولناصر و، بو جەزائیر بو بینینی سەروک ئەحمەد بن بیللا..مەلا مستەفا ئەم سەفەرەی پی خوش نەبو.

روژی ٥ ی مارت وەفدی حکومەت کە پیک هات بو لە: طاهیر یەحیا (سەروکی ئەرکانی جەیش) و فوئاد عارف (وەزیری دەولەت) و عەلی حەیدەر سلیمان (سەفیری عیراق لە واشینتون) چون بو نزیک رانیە بو دیتنی مەلا مستەفا و سەرانی شورش. خواستەکانیان دانی. گەرانەوە بەغداد.

حکومەت ئەمجارە «وەفدی شەعبی» نارد. روژانی ٧ و ٨ ی مارت وەفدە شەعبییەکەی حکومەت لە چوارقورنە لە گەل مەلا مستەفا و سەرانی شورش چەند جاری کوبونەوە. لە سەر هەندی شتی سەرەتایی ریک کەوتن.

بەعس ئەو بەلینەی بە کوردیان دابو سەبارەت بە مافی ئوتونومی بە بیانوی نالەباریی هەلومەرجی سیاسی و، نارازی بونی ناصر و ناصرییەکان نەیهینایە دی. ئەمەش یەکەمین پەیمانشکینی بو. جمال الاتاسی لەو پیشەکیەدا کە بو کتیبەکەی منذر موصلی: «عرب و اکراد» نوسیویتی لە زمانی سەرانی بەعسیەوە، بە تایبەتی عەلی صالح سەعدیەوە، دان بەم پەیمانشکینیەدا ئەنی.

بەعسیەکان، لە ماوەیەکی کورت دا: شیوعیەکانیان پاکتاو کرد و، قەومیەکانی هاوخەباتی خویان لە کار دور خستەوە. ئەیانویست تا بە تەواوی جیگیر ئەبن و هیزەکانی خویان ریک ئەخەنەوە گیچەلی کورد بیلایەن بکەن، بە تایبەتی بە هیوای ئەوە بون لە سوریاش بەعس کاروبار بگریتە دەس.

لە ١٠ ی مارت دا «المجلس الوطنی لقیادە الثورە» بەیانیکی دەرکرد بو لیبوردنی ئەوانەی «.. قاموا بالحرکە المسلحە الکردیە فی المنطقە الشمالیە..» و، روژی ١١ ی مارت بەیانیکی دەربارەی کیشەی کورد بلاو کردەوە، مافی نەتەوەیی کوردی لە سەر بنچینەی «لامەرکەزی» سەلماند «.. یقر الحقوق القومیە للشعب الکردی علی اساس اللامرکزیە، وسوف یدخل هذا المبدا فی الدستور الموقت والدائم عند تشریعهما..».

*

حشع جەزرەبەیەکی کوشندەی بەرکەوت. سکرتێرەکەی و ژمارەیەکی زۆر لە ئەندامانی سەرکردایەتی و کادرە ناسراوەکانی گیران و کوژران. تەنها جێگای کە ئەیانتوانی خۆیانی تێ دا بگرنەوە کوردستان بو. زۆریان رویان کردە کوردستان. لە کوردستان بە دو جۆر پیشوازیان کردن:

- مەلا مستەفا بە خۆشییەوە بەرەو پیریان چو، دالدەی دان و، ماوەی خۆرێکخستنەوەی دان و، پێویستیەکانی دابین کردن.

مەلا لە مەش چەند مەبەستێکی هەبو: یەکەمیان، لە ناکۆکی دا لە گەڵ م س حشع بە لای خۆی دا رایکێشێ. دوەمیان، لەو رێگایەوە پشتیوانی یەکێتی سۆڤیت و حیزبە شیوعیەکان بە دەس بهێنێ.

- م س کەوتە تفەنگ پێ هەلچنین و چەک کردن و گرتنیان و، لە چەند جێگایەک کە بە چەکداری لی ی کو بوبونەوە چوە سەریان.

*

## کونگرە لە کۆیە

مەلا مستەفا ئەیویست دەسەلاتی م س لاواز بکا. بۆ ئەم مەبەستە ژمارەیەک لە سەرانی خێل و کەسایەتی کوردی بانگ کرد بۆ کۆبونەوەیەک لە رۆژانی ١٧ تا ١٩ ی مارت لە کۆیە. هەندی لە سەرکردەکانی پارتی یش بەشدار بون. لەم کۆبونەوەیش دا مەلا مستەفا نارەزایی خۆی لە سەرانی پارتی دەربری. ناکۆکییەکە کە تا ئەوسا شاردراوە بو ئیتر ئاشکرا بو.

لەم کۆبونەوەیەدا خواستەکانی کورد باس کرا و، وەفدێک لە چەند کەسایەتییەکی ناسراوی کورد بە سەرۆکایەتی مامجەلال پێک هێنرا بۆ گفتوگۆ لە گەڵ بەغداد. ئەم وەفدە چونەوە بۆ بەغداد. یادداشتێکیان ئامادە کرد و، مافەکانی کوردیان لە روانگەی کوردەوە رون کردەوە.

چەند جاری لە گەڵ وەفدی حکومەت دانیشتن. باری سەرنجیان جیاواز بو. بەعس پرۆژەی لامەرکەزی ئیداری ئامادە کرد بو، ئەمانیش پرۆژەیەکیان ئامادە کرد بو بە ناوی حوکمی زاتیەوە کە لە راستی دا حوکمی فیدرالی بو. دیار بو ئەم دو لایەنە ناگەنە یەک، بە تایبەتی دوای ئەوەی بەعس لە سوریاش کاروباری گرتە دەست.

بەعس خۆی ئامادە ئەکرد بۆ هێرشێکی فراوان بۆ سەر کوردستان. هەوالەکانی ئەم خۆئامادەکردنە ئەگەیشتەوە سەرکردایەتی شۆرشی کورد. مامجەلال بۆ ئەم مەبەستە سەردانی ئەحمەد حسەن بەکر و طاهیر یەحیا و سەرانی بەعسی کرد بو. لای بەکر بەژارەی خۆی دەربری بو. بەکر ئینکاری کرد بو، بۆ ئەوەی دلنیای بکا بە مامجەلالی وت بو: «اخون عرضي وما اخونكم!»

بەعس خۆی بە حیزبێکی وەحدەوی دائەنا. هەر بەو بیانوشەوە کەوتە دژایەتی قاسم و پیلانگێران و هەولی کوشتنی. دوای ئەوەی کاروباری گرتە دەست باسی وەحدەی عیراق و میصر و سوریا گەرم بو. بۆ ئەو مەبەستە چەند کۆبونەوەیەکی ٣ قۆلی لە قاهیرە کرا. لەو کاتەدا مامجەلالیش لە قاهیرە بو کە گەرایەوە لە گەڵ چەند خوێندکارێکی هاورێم لە بەغدا

چوین بۆ سەردانی مامجەلال. ئەمانویست بزانین رەوتی وەحدەی عەرەبی بە چی گەیشتوە و چارەنوسی کورد لەو وەحدەیەدا چی ئەبی؟ لە مامجەلالمان پرسی. مامجەلال وتی: «نە ئیستا و نە پاشەرۆژی نزیک وەحدەی عەرەبی نابی!» وتمان: «ئەگەر بو؟» ئەو بە دلنیاییەوە سور بو لە سەر ئەوەی نابی.

مامجەلال ئیزنی لە بەعسیەکان وەرگرت بچی بۆ سەردانی عەبدولناصر. ریگەیان دا. مامجەلال ناصری بینی و چوە بیروت کۆنگرەیەکی رۆژنامەوانی گرت. خەریکی گەرانەوە بو بۆ بەغداد. جەنەرال تەیموری بەختیار، سەرۆکی پیشوی ساواک، کە تازە لە شا جیا بوبوەوە لە بیروت ئەبی. مامجەلال هوشیار ئەکاتەوە و، ئاگاداری ئەکا کە نەگەریتەوە بەغداد چونکە بەعس نیازی گرتنی هەیە. دوای ئەم هەواڵە بە چەند رۆژیکی کەم بەعس لە ناکاو پەلاماری کوردستانی دا و هەمو ئەندامەکانی دەستەی نوینەرایەتی کوردی گرت..

ئەم کارەی بەعس لە کاری دەولەت نەئەچو، بەلکو لە کاری باندی مافیا ئەچو. ئەمە بی باوەرییەکی قولی لە لای سیاسیەکانی کورد دروست کرد. وای کرد سەرانی کورد باوەر بە بەلینەکانی بەعس و گفتی سەرکردەکانی نەکەن و، گومان لە هەمو هەنگاو و بریار و ریککەوتنیکیان بکەن.

*

## هەلگیرسانەوەی شەر

بەیانیی ٩ ی حوزەیرانی ١٩٦٣ بە بەیانیکی دریژ «المجلس الوطني لقيادة الثوره» ی بەعس شەری لە گەل کورد راگەیاند. من لەو کاتەدا هیشتا لە بەغداد بوم، لە ترسی گرتن لە گەل هەندی لە هاوریکانم چوم بۆ هەولیر و، لەویوە بۆ بنکەی پیشمەرگە لە پەلکانەی دەشتی هەولیر بەرەو مالومە. هاوریکانم کە لە بەغدا مابونەوە زۆریان گیران، یەکیکیان: محەمەد صدیق عەبدولرەحمان، کە پیکەوە خویندکار و، لە کاروباری ریکخراوەیی پارتی و قوتابیان دا هاوکار بوین، دوای گیرانی بە ئەشکەنجە کوشتیان.

*

کاربەدەستانی بەعس لە بەیانی رۆژی ٩ ی حوزەیران دا لە ناکاو، هیرشی زەمینی و ئاسمانی گەورەیان بو سەر کوردستان دەس پیکرد، لەو کاتەدا هیشتا نوینەرایەتی کورد لە بەغدا بو دانوستان مابونەوە، بەعس نوینەرەکانی گرت، لە باتی گفتوگو بو دوزینەوەی چارەسەری هینانە لەژیر ئەشکەنجە و ئازاردا نامەی پەشیمانی لە بزوتنەوەی کوردو نارەزایی دژی بارزانی بە صالح یوسفی و عەبدولحسەین فەیلی نوسی و، هەندیکیانی بۆ قسە کردن هینایە سەر تەلەفزیون. لە کوردستان پەیرەوی سیاسەتی ئەرزی سوتاوی کرد، بە هەزاران کەسی گرت و بە سەدانی کوشت، چەند گەرەکی کوردنشینی لە ناو شاری کەرکوک تەخت کرد، کویرانە بوردومانی سەدان گوندی کرد، بە کورتی شەریکی هەلگیرساندەوە، کەدەزگاکانی راگەیاندنی سۆڤیتی بە شەری «جینوسابد» یان دا ئەنا. کەچی ئەمریکا نەک گوشاری بو سەر بەعس نەهینا بو راگرتنی شەرو لابەلاکردنی ناکوکیەکانی لەگەل بزوتنەوەی کورد بە ئاشتی، بەلکو پشتیوانی لە حکومەتی بەعس کرد. تورکیا ریگەی دا بە فروکەی عیراقی بچیتە ناو خاکی ئەوانەوە بو راونانی پیشمەرگە.

*

هەڵگیرسانەوەی شەر و، توندوتیژیی هێرشەکانی بەعس ناکۆکییەکانی ناوخۆی کرد بە ژێرەوە. مەلا مستەفا لەو هەلومەرجەدا، کە ناوچەی بارزان کەوت بوە بەر هێرشێکی سەخت، هەر ئەیتوانی بەرگری بکا، نەیئەتوانی شەری بەعس و، لە هەمان کات دا شەری م س بکا.

*

بەعس و سۆڤیت

دەسەلاتی بەعس لە ناوەوە کەوتە قەتلوعامی شیوعیەکان، تەگەرەدان لە کاری پسپور و شارەزاکانی سۆڤیتی و، راگرتنی ریکەوتننە ئابوری، بازرگانی، تەکنیکی، روشنبیریەکانی سۆڤیتی - عیراقی سالانی ١٩٥٩ - .١٩٦ و، هەولدانی کرینی چەک و تفاقی جەنگی لە بەریتانیا و، کردنەوەی دەرگای کار بو کومپانیاکانی بەریتانی، ئەمریکی، ئەلمانی و ژاپونی.

لەدەرەوەش، هێرشێکی فراوانی پروپاگەندەی دژی «ئیستیعماری شیوعی» سوڤیتی و ولاتانی ئەوروپای روژهەلات دەس پی کرد، هەولی دا پەیوەندیەکانی لەگەل ئیران و تورکیا و دەولەتانی ئەوروپایی روژئاوا باش بکات، دانی بە کویت دا نا و، بەینی لەگەل میصر تیکچو.

یەکیتی سۆڤیت خەریک بو هەمو ئەو جیگە پیانەی لە ١٩٥٨ - ١٩٦٣ لە عیراق دا دایمەزراند بو لەدەس بدا، عیراق لە روی هەلویستەوە بەرامبەر سوڤیت بچیتەوە دوخیانی سەردەمی نوری سەعید.

موسکویش کەوتە:

- دەسپیکردنی فراوانترین هێرشی پروپاگەندە دژی رژیمی بەعس.

- کە بەعس جەنگی کوردستانی دەست پی کردەوە، هانی مەنگولیای دا داوا لە ریکخراوی نەتەوە یەککرتوەکان بکا، بو لیدوانی جینوسایدی کورد لە ژیر سایەی رژیمی بەعسی عیراق دا، لە خولی ١٨ کوبونەوەی گشتی دا، بەلام پاش چەن روژی داواکەی خوی کیشایەوە، چونکە میصر بو ئەوەی مسەلەی کورد دورایبەکی ناودەولەتی پەیدا نەکا، داوای لە سۆڤیت کرد بو ئەم داوایە بکیشیتەوە.

- کاتیک سوریا «لیوای یەرموک»ی نارد بو یارمەتیدانی جەیشی عیراق لە دژی کورد، یەکیتی سۆڤیت نوتیکی دا بە سوریا و ئیران و تورکیا دەربارەی گەلەکومەکیی چوار قولی دژی گەلی کورد لە عیراق دا.

- هەروەها مامجەلالی، سەروکی نوینەرایەتی کورد بو دانوسەندن لەگەل رژیمی بەغداد، کە لەو کاتەدا لە ئەوروپا بو بانگ کرد بو گفتوگو بو موسکو. نوینەرایەتی سۆڤیتی لە گفتوگودا لەگەل مامجەلال، پشتیوانی خویان لە خەباتی رەوای کورد لە پیناوی بەدیهینانی عیراقیکی دیموکراتی و کوردستانی ئوتونوم دا دەربری، داوایان لی کرد کورد دریژە بە خەباتی شورشگیرانە بدا، ئەوانیش یارمەتی مادی و مەعنەوی ئەدەن، هەروەها دەستەیەکی نوینەرایەتی پ د ک یان بە سەروکایەتی سکرتیری پارتی ئیبراهیم ئەحمەد بانگ کرد بو سەردانی یەکیتی سۆڤیت، ئاموژگاری بزوتنەوەی کوردیان کرد، کە پەیوەندیەکانی خوی لەگەل دنیا فراوانتر بکا، بەلام پەیوەندی لەگەل ئیسرائیل دروست نەکا، هەروەها داوایان لی کرد یارمەتی حشع بدەن بو ئەوەی لەو کارەساتەی تی ی کەوتوە

دەربیت و سەرلەنوێ خۆی ڕێک بخاتەوە.
وەزیری کاروباری دەرەوەی سۆڤیەتی گرومیکۆ، لەو نوتەدا لە ٩ تەمموزی ١٩٦٣ کە دابوی بە سەفیرەکانی دەوڵەتانی ئێران و تورکیا و سوریا نوسیبوی: «یەکێتی سۆڤیەت ناتوانی دەستەوسان ڕابوەستێ بەرامبەر بەو ڕوداوانەی لە لای خوارەوی سنورییەوە ئەقەومین...»
دەزگاکانی ڕاگەیاندنی سۆڤیەتی و دەوڵەتانی سوسیالیست و حیزبە کومونیستەکانی دنیا لەسەر ئەم ئاوازە هەواڵەکانی جەنگی کوردستانیان بڵاو ئەکردەوە، حیزبی بەعسیان بە جینوساید دژی گەلی کورد تاوانبار ئەکرد، و ئەیانوت جینوساید و پێشێلکردنی مافەکانی مروڤ بەرامبەر گەلی کورد لە عیراق دا ناشی بە مەسەلەی ناوخۆ دابنرێ، چونکە کاربەدەستانی عیراق پەیمانە جیهانیەکانی نەتەوە یەکگرتوەکان و ڕاگەیاندنی جیهانی ی مافی مروڤ و.. شکاندوە.
هاوزەمان لەگەڵ تێکچونی پەیوەندی عیراقی - سۆڤیەتی، پەیوەندی ئێرانی دوای چەندین ساڵ گرژی هەڵبرونگانێکی گرنگی تێکەوت، خاوبونەوەی جەنگی ساردی سۆڤیەتی- ئەمریکی لەسەرەتای شەستەکان دا بە تایبەتی دوای «تەنگوچەڵەمەی ساروخی کوبا» کە ئەمریکاش ساروخەکانی خۆی بەهۆی ڕەزامەندی تورکیا لە تورکیا کێشایەوە - بەرامبەر ساروخەکانی سۆڤیەتی لە کوبا، هاوپەیمانە ڕۆژهەڵاتیەکانی ئەمریکا بە سیاسەتی خۆیان دا چونەوە، شا بە ناوی «سیاسەتی مستقلی ملی» بەوە هەوڵی دا جورێک لە هاوسەنگی لە نێوان پەیوەندیەکانی لەگەڵ ئەمریکاو لەگەڵ یەکێتی سۆڤیەت دروست بکا، وە کەوتە هەوڵدانی دروستکردنی پەیوەندی ئابوری، بازرگانی، تەکنیکی، لەگەڵ یەکێتی سۆڤیەت . لە ٢٧ ژوئیەی ١٩٦٣ دا یەکەمین ڕێکەوتنی ئابوری ئێرانی- سۆڤیەتی ئیمزا کرا بو دروستکردنی بەنداو و، دو ئیستگەی کارەبا و، پروژەیەکی ئاودێری.

*

مامجەلال کە چوبو بو دیتنی ناصر، دوای سەردانی لوبنان و ئەوروپا و یەکێتی سۆڤیەت، بە ڕێگای ئێران دا گەڕایەوە کوردستان.
ژمارەیەک سیناتور و کونگرێسمان لە ئەمریکا داوایان لە کامەران بەدرخان کرد بو کە مەلا مستەفا سەردانێکی ئەمریکا بکا، ئەگەر ئەو نەتوانی کاربەدەستێکی شورشەکە بچی. ئیبراهیم ئەحمەد و سەید عەزیزی شەمزینی بە ڕێگای تەهران دا چونە ئەوروپا. ئیبراهیم ئەحمەد بە نیازی گەشتێکی سیاسی بو لە ئەوروپا و ئەمریکا.
ئیبراهیم ئەحمەد لەم گەشتەدا، بو یەکەمین جار لە گەڵ کاربەدەستانی ئێرانی، بە تایبەتی ساواک، دانیشت. سەردانی مۆسکۆی کرد و، نوێنەرێکی ئیسرائیلی بینی و، هەوڵیکی سەرنەکەوتوی سەردانی ئەمریکای دا.
ئیبراهیم ئەحمەد و سەید عەزیزی شەمزینی، کە ئەوسا ئەندامی م س بو، چون بو یەکێتی سۆڤیەت. نوێنەرانی سوڤیەتی داوایان لی کرد بون، لە گەڵ شیوعییەکان نەرم بن و هاوکاریان بکەن. بەلام ئیبراهیم ئەحمەد بە توندی ڕەخنەی گرت بو لە هەڵویستی حشع بەرامبەر مەسەلەی کورد و، لە پشتیوانی حشع لە قاسم. یەکێتی سۆڤیەت بەڵێنی هەندی یارمەتیان دا بە تایبەتی چەردەیەکی کەم پارە و، ئیستگەیەکی ڕادیو، بەلام سەردانەکە یەکگشتی سەرکەوتنێکی زوری بەدەست نەهێنا، بە تایبەتی چونکە زوری پێ نەچو

هەلومەرجی ناوخۆی عیراق سەرلەنوێ بە قازانجی یەکیتی سۆڤیت گۆرایەوە.

*

## ئینقیلابی عارف

لە ١٨ ی تشرینی یەکەمی ١٩٦٣ دا بەعس روخا. موشیر عەبدولسەلام عارف و تاقمی لە جەنەراڵەکانی جەیش دەستیان بە سەر کاروباری عیراق دا گرت. حکومەتی نوێ ی موشیر عارف هەمو لاوازیی و گیروگرفتەکانی حکومەتی پیشوی بەعسی بە میرات بۆ بە جی مابو، بگرە لاوازتر بو بو. ئینقیلابی یەک لە دوای یەک لە ریزەکانی جەیشی کلۆر کرد بو، جەنگی کوردستـان بوبوە باریکی گران بە سەر ئابوری عـیراقـەوە. لە هەمان کـات دا هەلومەرجی کوردستانیش بە هۆی سیاسەتی ئەرزی سوتێنراوی بەعسەوە خراپ بو، ئابلوقەی ئابوری و رەشبگیر و رەشەکوژی و ویرانکردنی ژمارەیەکی زۆر دیهات و سوتاندنی هەمو خەلە و خەرمانی کوردستان، خەلکی پەریشان کرد بو.

جەیشی عیراق ئەگەرچی شەری رانەگرت بو لە گەل بزوتنەوەی کورد، بەلام بە هۆی ئالوگۆری سـەرکردەکانی و گـیروگرفـتـەکانی ناوخۆیەوە جاری لە هەلومـەرجـیک دا نەبو بە توندوتیـژی جـاران دریژە بە شـەر بدا. پەیوەندی لە نیـوان مـحـافظی سلیـمـانی و مـەلا مـسـتـەفـادا بۆ راگرتنی شەر دەستی پی کـرد. ناصـر ئامـۆژگاری مـوشـیر عـارفی کـرد بۆ کـیشەی کورد بە ئاشتی چارەسەر بکا و، یەکیتی سۆڤیت و ئەمەریکایش، هەر یەکەیان لە لای خۆیەوە، لە هەردولایان راسپارد بو، کیشەکانی نیوانیان بە ئاشتی بە لادا بخەن. لەم کاتەدا ئیبراهیم ئەحمەد و سەید عەزیزی شەمزینی لە گەشتی سیاسی بون لە ئەوروپا. دوای ئەم روداوە ئەوانیش گـەرانەوە کوردستـان. تەنیـا دەولەت، کە ئاشـتی پی ناخۆش بو، ئیران بو.

*

## پیکهاتنی موشیر - بارزانی

لە ١٠ ی شوباتی ١٩٦٤ دا رادیوی بەغداد بەیانیکی موشیر عـارفی خویندەوە و، بەیانیکی پشتیوانی مەلا مستەفایشی بە دودا خوینرایەوە.

بەیانەکەی مشیر عارف ٩ خال بو ئەمە کورتیەکەیەتی:

١. اقرار الحقوق القومیە لاخواننا الاکراد ضمن الشعب العراقی فی وحدە وطنیە واحدە متاخیە وتثبیت ذلک فی الدستور.

٢. بەردانی گیراوەکان و دەرکردنی لیبوردنی گشتی.

٣. گیرانەوەی بەریوەبەرایەتی بۆ ناوچەکانی ژورو.

٤. گیرانەوەی فەرمانبەرەکان.

٥. لابردنی کۆتوپەیوەند لە سەر گویزانەوەی خواردەمەنی.

٦. دەسکردن بە ئاوەدانکردنەوەی ناوچەی ژورو.

٧. بژاردنی زەرەر و زیانی ئەوانەی زەویـیـەکـانـیـان بوە بە ژیر ئـاوی دوکـان و دەربەندیخانەوە.

٨. دانانی ریکخو شوینی گیرانەوەی ئاسایش و ئارامی بۆ ناوچەی ژورو.

٩. وەزارەتە پەیوەندیدارەکان ناوەرۆکی بەیانەکە جیبەجی بکەن.

مەلا مستەفایش لە بەیانەکەی دا نوسی بوی:

«.. بۆ بە جیهینانی ئارەزوی سەرکۆمار... سەبارەت بە پاراستنی یەکیتی ریزی نیشتمانی و، ریگرتن لە رژانی خوینی بی تاوان و، بۆ کۆتایی بە شەری براکوژی و، بە هۆی سابیت بونی پاکی نیازی دەسەلاتی حوکمران، بریارمان دا دەس پیشکەری بکەین بۆ راگرتنی شەر و، داوا لە براکانم بکەم بگەرینەوە سەر جیگاوریگای خۆیان و بکەونەوە سەر کاری ئازاد و سەربەرزانەی پیشویان، بە مەبەش بواری دەسەلاتی نیشتمانی ئەدری دەس پیشکەری بکا بۆ .. گیرانەوەی ژیانی ئاسایی و ئاسایش و ئارام بۆ ناوچەکە و، هەلخستنی هەلی دانانان بە مافە نەتەوەییەکانی هاوولاتیانی کوردا لە ناو گەلی عیراق دا لە یەک پەکگرتنی نیشتمانی دا..»

لەو کاتەدا کە ئەم بەیانانە خویندرانەوە من لە گەل نزیکەی ..١ قوتابی لە چوخماخ لە کۆنگرەی «یەکیتیی قوتابیانی کوردستان» بوم. عەلی حەمدی، لیپرسراوی ئەوسای لقی ٤ ی سلیمانی، لە کردنەوەی کۆنگرەکە و هەندی لە کارەکانی دا بەشدار بو. کە پرسیارمان لی کرد دەربارەی راگرتنی شەر و گفتوگۆی کورد و حکومەت، بی ئاگایی خۆی پیشان دا.

مەلا مستەفا بی ئاگاداری و پرسی م س شەری راگرت بو و، لەم گفتوگۆیەش چەند مەبەستیکی هەبو:

١. ئەیویست دەستی بەتال بی بۆ بە لاداخستنی ناکۆکی لە گەل م س و، یەکلایی کردنەوەی ململانی ی دەسەلات لە ناو بزوتنەوەی کوردا بە قازانجی خۆی.

٢. کوردستان لە چەند مانگی هیرشی بەعسی دا کەوت بوە ژیر گوشاری سەختی ئابلوقەی ئابوریەوە. خواردەمەنی و سوتەمەنی زۆر گران و بە زەحمەت دەس ئەکەوتن. بەعس خەلە و خەرمان و پوش و پاوانی کوردستانی سوتاند بو، زۆر شوینی ویران کرد بو. خەلک بە گشتی لە ژیانیکی سەخت و دژواردا بون. ئەیویست خەلک پشویەکی پیدا بیتەوە. هەلومەرجی ژیان لە بارزان زۆر سەخت بو، لەم روەوە گوشاری شیخ ئەحمەدی لە سەر بو.

مەبەستی سەرەکی مەلا مستەفا لە گفتوگۆ یەکلاییکردنەوەی ململانی ی دەسەلات بو لە گەل سکرتیر و سەرکردایەتی حیزب. مەلا مستەفا وای لە کاربەدەستانی عیراق گەیاند بو، کە ئەو: هیچی ناوی، ئەیەوی ئاسایش بگەریتەوە ولات و، ئەویش بگەریتەوە بەرزان خەریکی شوانی بی، بەلام ئیبراهیم ئەحمەد و ئەوان بە هیچ رازی نابن، ئەگەر ئەم کۆسپە لابەری گیروگرفتەکە چارەسەر ئەکری.

*

مەلا مستەفا بە هەمو شیوەیەک ئەیویست، لە ململانی دا لە گەل م س حکومەت بە لای خۆی دا رابکیشی و، باوەری موشیر عارف بە دەس بهینی. مەلا مستەفا بۆ بە جیهینانی مەبەستەکانی خۆی لە هیچ قسەیەک نەئەسلەمیەوە و، لە هیچ بەلینیک نەئەپونگایەوە. زۆر جار ئەم قسە و بەلینانە لای چاودیریکی بیلایەن بە شتی ئابەجی دائەنران، بەلام هەمیشە هاوکارەکانی بۆیان بە فەلسەفە و حیکمەت و، تاکتیکی زیرەکانە ژماردوە. مەلا مستەفا خۆی تەفسیریکی تری هەبو بۆ ئەم مەسەلەیە، ئەیپرسی: «قسە چیە؟» خۆی وەلامی ئەدایەوە، ئەیوت: «قسە بایە! ئەویان لە قون و ئەمیان لە دەم دەرئەچی!» بەم تیگەیشتنە هیچ دریغی نەئەکرد لە ستایش کردنی موشیر عارف و رازی کردنی دا.

- عارف دژی ژیانی حیزبایەتی بو، بە چاو لیکەری ناصر «الاتحاد الاشتراکی العربی» دامەزراند بو. ئەمیش دژایەتی خۆی بۆ حیزبایەتی راگەیاند.
- عارف ئەیویست داوودەزگای بەریوەبەرایەتی و پۆلیس بگەریتەوە ناوچە ئازاد کراوەکان، ئەویش فەرمانی بۆ فەرماندەکانی پیشمەرگە دەرئەکرد کارئاسانی گەرانەوەیان بکەن.
- عارف ئەیویست پیشمەرگە بلاوەی لی بکەن و بگەرینەوە سەر کارەکانی خۆیان، ئەمیش داوای هەمان شتی لی ئەکردن.
- نوینەرەکانی حکومەت جاریک باسی نەورۆزیان کرد بو کە بیکەن بە جەژنی رەسمی، مەلا مستەفا هەلی دابویە کە پیویست بە نەورۆز ناکا چونکە وەکو بە عەرەبی وت بوی: «ولنا عیدان، عید رمضان و عید قوربان»
- بۆ بەربەرچدانەوەی پروپاگاندەی نەیارەکانی کە: «بارزانی کوردی بە پرتەقال فرۆشتوە» بەیانیکی بە کوردی دەرکرد بو لە چاپخانەی کامەرانی چاپی کرد بو تیی دا نوسیویتی:
«لە کۆبونەوەی یەکەمی بەینی ئیمە و نوینەرانی میری دا کە نوینەرانمان بریتی بون لە نوینەری پارتی و عەشایەر و سەربەخۆکان، حکومەتی عیراق دانی ناوە بە هەقی میللەتی کوردا و لە بەیانی سەرەک کومار سیادەتی مشیر الرکن عبدالسلام محمد عارف دا بلاو کراوەتەوە و بریاری تەواوی حکومەتیش ئەوەیە کە هەقی مەشروعی گەلی کورد وەکو شەعبیک بە تەواوی بدات لە ناو چوارچیوەی کۆماری خۆشەویستی عیراق دا، وە ئیمەش گفتی سیادەتی سەروک کۆمار بە راست ئەزانین و لامان وایە کە هەرگیز لە گفتی خۆی کە داویتی پەشیمان نابیتەوە چونکە هەرگیز پیاویکی پیاو و موسلمانیکی پاک و جی ی بروایە و (المؤمن و مؤمّن) وەک لە حەدیثی شەریف دا فەرمویانە.
.. ئیمەش ئیستا چاوەروانی ئەنجامی ئەم داوایەی خۆمانین و لیشمان رونە کە حکومەتمان نیەتی باشە و دەست دریژ ناکاتە سەر حقوقی مشروعی میللەتی کورد..
لە ئەنجاما بە پیویستی ئەزانم کە پیتان بلیم.. کە کاروبارتان کە سودی گەلی کورد وا بە دەستیکی پاکی ئەمینەوە هەتا هەتایە هەقی میللەتمان نەفروشراوە و نەئەفرۆشری وە لە ری ی ئەو هەقەدا بارزانی لە پیش هەمو کەسیکەوە گیانی لە سەر دەست بوە و هەمیشە خۆی فیدا ئەکات بۆ گەلی کوردی قارەمان.»
بەم قسانە ئەیویست حکومەت لەو ململانییەدا بە لای خۆی دا رایکیشیت.
مەلا مستەفا لە نەخشەکەی دا سەرکەوتو بو: حکومەتی بە لای خۆی دا داشکاند و، خۆی وەکو ئاشتیخواز و، ئیبراهیم ئەحمەد و هاوریکانی وەکو شەرخواز ئەهاتنە بەرچاو.

*

## لیوا عشرین

لە دوای دەس پیکردنی شورشەوە لیوای عشرین بە سەرکردایەتی زەعیم صدیق مستەفا هینرا بوە سلیمانی. ئەم لیوایە لە درندەترین کەرتەکانی جەیشی عیراق بو. زۆر کەسی بە بی تاوان کوشت و زۆر کەسی بەبی تاوان گرت و، چەندین گوند و ئاوایی ویران کرد. لە هەر شەریک دا کە ئەشکا ئەگەرایەوە تۆلەی لە دانیشتوانی سلیمانی ئەکردەوە. ناو بە ناو لە ناو شاردا بلاو ئەبونەوە و کویرانە ئەکەوتنە گرتن و لیدانی خەلک. کە ئەم هیزە

پلاو ئەبوەوە خەلک بۆ ئەوەی لە گیچەل و شەری پاریزراو بی دوکانیان دا ئەخست و ریبوار دەستی ئەکرد بە راکردن. خەلک راهات بون کە ئەمە ئەبو هەرکەس بپرسیایە چیە؟ ئەیانوت: «ئەرز قلیشاوەتەوە». ئەویش دەستی ئەکرد بە راکردن و خۆشاردنەوە لە ناو کۆلانەکان دا.

بەیانی ۹ حوزەیران ئەم لیوایە «منع التجول» ی راگەیاند. زۆر کەس نەیانزانی بو وەکو رۆژانی تر چوبونە بازار، یا لە دیهاتەکانی دەوری سلیمانیەوە هات بون بۆ ناوشار، زۆری ئەمانە کوژران. هەلومەرجی ئەو رۆژانە ئەوەندە سەخت بو کەس نەیئەتوانی کوژراو و مردو بیا بۆ گۆرستان بە ناچاری لە ناو حەوشی مالەکانی خۆیان دا ئەیان شاردەوە.

لە ئەنجامی ئەم مەنعە تەجەولەدا هەرکەسیکیان بەر دەس کەوت گرتیان. چەند هەزار کەسی گیران. زیاتر لە سەد کەسیان کوشتن و هەندیکیشیان زیندە بە چال کردن و، ئەوانی تریشیان لە ناو تەویلەکانی «تاولەی سواری» دا گرت و ٥۲ سەعات نان و ئاویان نەدانی.

سالی ٦٤ ئەم لیوایە گویزرایەوە بۆ شوینیکی دور لە سلیمانی. زەعیم صدیقی فەرماندەی لیواکە بیست بوی لە نزیک عەربەت کەمینیان بۆ داناوە. مەلا مستەفا شەفیقی ئەحمەد ئاغا و چەند پیشمەرگەیەکی لە گەل ناردن بۆ ئەوەی بە سەلامەتی رەتیان بکەن.

*

ئیبراهیم ئەحمەد و سەید عەزیز گەرانەوە کوردستان، لە گەل ئەندامانی تری م س: نوری شاوەیس، عەلی عەبدوللا، عومەر مستەفا، جەلال تالەبانی، چونە رانیە بۆ دیدەنی مەلا مستەفا و گفتوگۆ لە سەر جۆری ریککەوتنی لە گەل حکومەتی عیراق.

م س لە مەلا مستەفایان پرسی کە ئاخۆ جگە لەو دو بەیانە هیچ ریککەوتنیکی نهینی دەربارەی سەلماندنی مافی نەتەوەیی کورد لە بەین دا هەیە؟ مەلا مستەفا پی ی دائەگرت کە جگە لەو دو بەیانە ئاشکرایە، شتیکی تر لە بەین دا نیە.

م س لای وابو کە ئەو بەیانەی عارف خواستەکانی کورد ناهینیتە دی، حکومەتی عارف لە هەلومەرجیکی ناوەکی و دەرەکی لاواز دایە، کورد ئەگەرچی بە هۆی شەری ٥ مانگەی بەعسیەوە وەزعی خراپە، بەلام هیشتا هەلومەرجی ئەم باشترە ئەتوانی گوشار بۆ سەر عیراق بهینی ئوتونومی بسەلمینی. بارزانی پش سور بو لە سەر ئەوەی کە وەزعی خەلک خراپە و ماندون، ناتوانن دریژە بە شەر بدەن، هەروەها ئەمەریکا و روس ئەیانەوی ئەو حکومەتە نەروخی و لە گەلی ریک بکەون.

م س ئەیویست مەلا مستەفا قانیع بکا: یادداشتیک دەربارەی مافی نەتەوەیی کورد ئامادە بکەن و، وەفدیکی خاوەن دەسەلات دروست بکری بۆ گفتوگۆ لە گەل حکومەت. مەلا مستەفا نەچوە ژیر باری ئەم داوایانەوە.

لەو هاتوچۆیانەدا کە نوینەرانی حکومەت ئەیان کرد، ئەندامانی م س محافظی سلیمانی عبدالرزاق محمودیان بینی. بەلام گفتوگۆکەیان بی ئەنجام بو، چونکە بیروڕای مەلا مستەفا لە گەل ئەوان بە تەواوی جیاواز بو. ناچار خۆیان لە ۲ ی مارتی ٦٤ دا یادداشتیکی دریژیان دەربارەی خواستەکانی کورد دا بە حکومەت. مەلا مستەفا ئامادە نەبو ئیمزای بکا، بە وەفدی حکومەتیشی وت کە ئەو لە سەر ئەو یادداشتە موافیق نیە.

*

گفتوگۆکانی بەرزانی - عارف ناریکوپیک و بی سەروبەر بو. هەردولایان

پیویستیان به کات و، به راگرتنی شەر و، هەر لایەکیشیان مەبەستی تایبەتی خۆی هەبو.

م س لە هەلسەنگاندنی بنکەی سیاسی و پیشمەرگەیی و ریکخراوەیی خۆی دا بە هەلەدا چوبو. تا چەند حەفتەیەک لەوەو پیش هەمو بەیان و بلاوکراوەکانیان بەم دیرە کۆتایی پی ئەهینا: «ئیتر بۆ پیشەوە لە ژیر ئالای پارتی مان دا بە سەرۆکایەتی بارزانی» و، لە هەمو شەرەکانی ٦٣ دا بە شانازییەکی زۆرەوە باسی قارەمانیەتی «کاوەی سەدەی بیستەم» یان نوسی بو. لایان وابو چونکە «خۆیان لە سەر هەق» ن و، ئەوە ئیتر بەسە بۆ روتکردنەوەی بارزانی لە دەسەلاتەکانی و، سازدانی خەلک لە دژی.

*

بۆ چارسەرکردنی ناکۆکییەکانی نیوان سەرۆک و سکرتیر، چەند کەسی لە کادرەکانی پارتی کەوت بونە ناوبژی لەوانە: د. مەحمود عەلی عوسمان، حەبیب محەممەد کەریم، د. فوئاد جەلال، جەمال شالی. مەرجی سەرەکی مەلا مستەفا بۆ پیکهاتن لە گەل م س ئەوە بو: ئیبراهیم ئەحمەد لە سکرتیری حیزب لا ببری و، مامجەلال لە جیگای دابنری. لەوانە بو قبولکردنی ئەم داوایەی مەلا مستەفا، ناکۆکییەکانی کەمی خاو بکردایەتەوە و، رووداوەکان بەو ئاقارە خویناوییە دا نەرویشتنایە کە رویشتن. بەلام ئیبراهیم ئەحمەد و، ئەندامانی تری م س بە لاسارییەکی زۆرەوە ئەم پیشنیارەیان بە بیانوی «شەرعییەتی حیزبی» وە رەت کردەوە، لە کاتیک دا زۆر لە مێژ بو خۆیان ریگایان دا بو بە مەلا مستەفا، کاتیک هەمزە و هاوریکانی لە سەرکردایەتی حیزب دەرکرد، ئەم شەرعییەتە بە تفەنگ بشکینی.

## کونفرەنسی ماوەت

م س لە ٤ - ٩ ی نیسانی ٦٤ دا لە ماوەت کۆنفرەنسیکی بەست. نزیکەی ٧٠ کەس لە نوینەرانی لق و ناوچەکانی پارتی و نوینەرانی ریکخراوەکانی قوتابیان و ماموستایان ئامادە بون. فوئادی مەلا مەحمود و من بە نوینەرایەتی یەکیتی قوتابیانی کوردستان بەشدار بوین.

لە فەرماندەکانی پیشمەرگە: مامجەلال، عومەر مستەفا، حیلمی عەلی شەریف، بەشدار نەبون، لە ناو هیزەکانیان دا مابونەوە، چونکە مەترسی هەلگەرانەوە و یاخی بونیان لی ئەکردن. سالح یوسفی و، حسین فەیلی، کە تازە لە زیندان دەر چو بون، ئەوانیش نەهات بون.

ئیبراهیم ئەحمەد، نوری شاوەیس، مەلا عەبدوللا ئیسماعیل، لە «هەلو» کانی ناو کونفرەنس بون. نوری شاوەیس لە وەلامی یەکیک دا کە ئەگەر مەلا مستەفا هیرشی بۆ هینان چی ئەکەن؟ وتی: «لە سەر پردەکەی قەشان رمشاشی دائەبەستم شەریان لە گەل ئەکەم مەگەر بە سەر لاشەکەم دا تی بپەرن.»

هەندی کەس پیشنیاریان کرد وەکو دوا تەقەللا بۆ بەلاداخستنی سیاسی ناکۆکییەکان وەفدیکی کۆنفرەنس بچی بۆ لای مەلا مستەفا، «هەلو» کان بە نابەدلی و لە ژیر گوشاری زۆرایەتی ئەندامانی کونفرەنس دا قبولیان کرد. وەفدەکە کە پیک هات بو لە: ئەسعەد خەیلانی، عەبدوللا زیباری، عەلی سنجاری.. چو و گەرایەوە. هیچ ئەنجامیکی نەبو. مەلا مستەفا لە ناو ئەوانەدا ئیبراهیم ئەحمەدی بە عەقلی تەگبیرکەر دائەنا، ئەیویست لە پیشەوە لەو بدا و، مامجەلال لە جیگای دابنی. هەر بۆ ئەو مەبەستە نامەیەکی بۆ

مامجەلال نوسی بو، داوای لی کرد بو بچی بو لای ئەو، واتە بو لای «حەق» و لە گەل «باطل» نەبی و ئایەتیکی قورئانی بونوسی بو کە نوح لە کاتی توفانەکەدا بە کورەکەی ئەلی: «یا بنی ارکب معنا ولا تکن مع القوم الکافرین».

کونفرەنس بریاری دا مەلا مستەفا لە دەسەلاتەکانی روت بکاتەوە: دەسەلاتی گفتوگو و ریککەوتن لە گەل حکومەتی عیراق، دەسەلاتی لابردنی فەرماندەکانی پیشمەرگە، دەسەلاتی گرتنی کونگرەی پارتی.. بەلام ئەویش بە بروسکەیەک کە تیی دا نوسی بوی: «بەو سیفەتەی رەئیسی حیزب و قائیدی عامی پیشمەرگە و وەکیلی میللەتە» بریاری دا: «عومەر مستەفا لە هیزی کاوە و، عەلی عەسکەری لە هیزی خەبات و، کەمال موفتی لە هیزی قەرەداخ و مامجەلال لە هیزی رزگاری لابیات و، لە جیگای ئەوان کاکی ئەحمەدی، نوری مەعروف، رەشید سندی، نوری مەلا حەکیم.. دابنی.»

وەکو دوایی ئەیان گیرایەوە: ئەوانەی لە ناو پیشمەرگەدا بون، بە تایبەتی مامجەلال و حیلمی و عومەر مستەفا، ئەیانزانی نفوزی مەلا لە ناو پیشمەرگەدا بە هیزە، لە بەر ئەوە نەیان ئەویست پیوەندی پارتی لە گەل مەلا مستەفا تیک بچی، بەلکو لە گەل ئەوە بون هەرچونی بی لە گەلی بسازین.

بریارەکەی کونفرەنس بری نەکرد و، فەرمانەکەی مەلا مستەفا جیبەجی بو.

*

بە دوای کونفرەنسی ماوەت دا م س لە روژی ١٩ ی نیسان دا، بەیانیکی دورودریژی دەرکرد بە ناونیشانی: «اتفاقیه المشیر - بارزانی: اصلح ام استسلام؟»

لەم بەیانەدا بە دریژی ناوەروکی بەیانەکانی مارشال عارف و مەلا مستەفا شی کرا بوەوە و، هەندی نمونەیان لە بروسکەکانی بو فەرماندەکانی پیشمەرگە هینا بوەوە و، هوکانی ناکوکییەکانی خویان لە گەل ئەو بە دریژی رون کرد بوەوە و، هەندیکیشیان لە بریارەکانی کونفرەنس دەربارەی روتکردنەوەی مەلا مستەفا لە دەسەلاتەکانی نوسی بوەوە. هەمو کارەکەیان بە «خوبەدەستەوە دان» دانا بو نەک بە «ریککەوتن»

سەرناوی بەشیکی بەیانەکە ئەم پرسیارە بو: «لماذا لا نتراجع امام البارزانی هذه المره؟» بیانوەکەیشیان بو نەکشانەوەی ئەمجارەیان ئەوە بو: مەلا مستەفا ئەیەوی کوتایی بە شورش بهینی، بەلام ئەوان ئەیانەوی دریژە بە شورش بدەن. هەمو ئەو جارانەی نەشەبو لە بەردەمی مەلا مستەفادا بکشینەوە کشابونەوە، ئەمجارەیان کە ئەبو بکشینەوە نەکشانەوە. ئەمەش هەلەیەکی کوشندە بو کوردیان زەرەری گەورەی دا لە جولانەوەی کورد و لە پاشەروژی خویان.

دوای ئەمەیش بەیانیکی تریان دەرکرد دەربارەی دەستوری تازەی عیراق.

*

عارف لە ٤ ی نیسانی ١٩٦٤ دا دەستوری کاتیی ٢٧ ی تەموزی ١٩٥٨ ی هەلوەشاندەوە و دەستوریکی کاتیی تازەی بلاو کردەوە. لە سەردەمی جمهوری دا ئەمە دوەمین جار بو حکومەتی ئینقیلاب دەستوری کاتی دائەنا و، بی پرسی خەلک و هەلبژاردنی نوینەرانی گەل، پاشە روژی عیراق و مافی کوردی دیاری ئەکرد. دەستورەکەی عارف لە چاو ئەوەی قاسم دا، ئەگەرچی دریژتر بو، بەلام بو دواوە چونیکی گەورە بو، بە تایبەتی لە بواری مافە نەتەوەییەکانی کوردا.

دەربارەی عەرەبایەتی عێراق دەستورەکەی عارف لە ماددەی یەکەمی دا ئەلێ: «... والشعب العراقي جزء من الامة العربية هدفه الوحدة العربية الشاملة وتلتزم الحكومة بالعمل على تحقيقها في اقرب وقت ممكن مبتدئة بالوحدة مع الجمهورية العربية المتحدة» لە کاتێک دا ماددەی دوەمی دەستوری قاسم وت بوی: «العراق جزء من الامة العربية»

دەربارەی مافەکانی کورد ماددەی نوزدەهەمی دەستورەکەی عارف ئەلێ: «العراقيون لدى القانون سواء، وهم متساوون في الحقوق والواجبات العامة لا تمييز في ذلك بسبب الجنس او الاصل او اللغة او الدين ويتعاون المواطنون كافة في الحفاظ على كيان هذا الوطن بما فيهم العرب والاكراد ويقر هذا الدستور حقوقهم ضمن الوحدة العراقية» لە کاتێک دا ماددەی سێهەمی دەستورەکەی قاسم نوسی بوی: «يقوم الكيان العراقي على اساس من التعاون بين المواطنين كافة باحترام حقوقهم وصيانة حرياتهم ويعتبر العرب والاكراد شركاء في هذا الوطن ويقر هذا الدستور حقوقهم القومية ضمن الوحدة العراقية»

*

## هەندێ لە هەڵەکانی م س

م س لە ماوەی چەند ساڵی رابوردودا هەندێ هەڵەی تاکتیکی کرد بو، بۆ چەکدار کردنی هێزەکانی چەکی لە خەڵک سەند و، هەر کەس چەکی هەبوایە لێ ی وەر ئەگرت، ئەمەش تورەبونێکی زۆری خوڵقاند بو، لە هەمو دێهاتەکان دا زەکاتی لە جوتیاران ئەسەند و، تاپونە و پارەتی لە سەر دانا بون. لە هەمو گوندەکان دا داوای لە خەڵک کرد بو «هێزی نزیەدار» پێک بهێنن کە ئەبو ئەرکی پێشمەرگایەتی بە دی بهێنن.

م س لە گەڵ هێزەکانی خۆیشی رەفتاری باش نەبو، بە پێچەوانەی مەلا مستەفاوە کە هەمیشە لە گەڕان دا بو بە ناو خەڵک و پێشمەرگەدا، ئەوان لە ئەشکەوتی ماڵومە و دواییتر لە عەبساوی دایان کوتا بو، فەرمانیان بۆ پێشمەرگە دەرئەکرد، بێ ئەوەی تێکەڵاویان بێن و لە گیروگرفت و سکاڵا و گلەییەکانیان تێ بگەن و هەوڵی چارسەریان بدەن. وەکو پێویست رێزی فەرماندەکانیان نەئەگرت، بە تایبەتی هەندێ لەو ئەفسەرانەی لە ژیانی پێشمەرگایەتی دا لێهاتویی زۆریان نەنواند بو، لە پارەتیدانی پێشمەرگەدا کەموکوری زۆر هەبو، بە چەند مانگ جارێک پارەتییەکی کەم ئەدران.

*

## نەیارەکانی م س

مەلا مستەفا زیرەکانە توانی نارەزایی خەڵک و پێشمەرگە و هەندێ لە ئەندامانی پارتی و، نارەزایی حشع و کاژیک و حیزبی دیموکراتی کوردستان و سەرۆکی عەشیرەتەکان و، ماندو بونی خەڵک لە شەر و ئاڵۆزیەی ئابوری.. بقۆزێتەوە.

سەرکردایەتی ئیبراهیم ئەحمەد جگە لە مەلا مستەفا، لە ناو کوردستانی عێراق دا، چەند دوژمنی تری هەبو:

- نارازییەکانی ناو پێشمەرگە، بە تایبەتی هەندێ لە ئەفسەرەکان کە پێکەوە بە نهێنی «تكتل» یکیان دروست کرد بو.

- حشع. ناکۆکی پارتی و حشع کۆن بو. حشع پارتی بە حیزبێکی بورجوازی نەتەوەیی دائەنا، پارتی پێش چەند جارێ داوای هەڵوەشاندنەوەی لقی کوردستانی حشعی کرد بو. لە دەستپێکردنی شۆرش دا حشع هەڵوێستی سەلبی بو. لایەنگرەکانیان لە هەندێ

شوێنی کوردستان چەکیان بۆ حکومەت لە دژی شۆڕش هەلگرت. کە ئینقیلابی شوبات فەرمانی قەلاچۆ کردنی بۆ دەرکردن، ویستیان لە کوردستان بنکە دابنێن و هێزی چەکدار پێکەوە بنێن. هەڵوێستی مەلا مستەفا و مەکتەبی سیاسی لەم مەسەلەیەدا جیاواز بو: مەلا مستەفا دالدەی دان و، کارئاسانی بۆ کردن، بەلام ئیبراهیم ئەحمەد ڕێگەی نەدان، بنکەکانیان داخستن و چەکدارەکانیان چەک کردن. لە هەندێ شوێن شەر و پێکادان ڕوی داو، لە هەردو لا کوژران.

- کاژیک، لەوەتی دامەزرا بو پارتی بە حیزبێکی ناتەوەیی فەریکە مارکسی و، پارتی یش ئەوانی بە «کوردکوژە» دائەنا. لایان وابو هەلێکی لە بار هاتوتە پێشەوە بۆ زال بونی بالی نەتەوەیی و تێکشکاندنی بالی مارکسی لە جولانەوەی کوردا.

- حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران. ئەحمەد توفیق و کادر و پێشمەرگەکانیان زۆر بە گەرمی پشتیوانییان لە مەلا مستەفا کرد. هەندێ لە نامە و بەیانەکانی مەلا مستەفا ئەمان ئەیاننوسی. لە سەنگەسەر ئەمان بون بە ئێشکگری گیراوە سیاسیەکانی سەر بە ئیبراهیم ئەحمەد.

*

لە عیراقیش دا حکومەت لەو ململانێیەدا پشتیوانی لە بالی نەرمی مەلا مستەفا ئەکرد دژی بالی توندرەوی ئیبراهیم ئەحمەد و، لە ئاستی عەرەبی دا عەبدولناصر و، لە ئاستی جیهانیی دا یەکیتی سۆڤیەت و ئەمەریکاش پشتیوانییان لە چارەسەری ئاشتی ئەکرد و، هەنگاوەکانی بارزانییان پێ باش بو.

*

## هەلوێستی سۆڤیەتی لە ئینقیلابی عارف

دەسەلاتی بەعس تەنیا ۹ مانگ ژیا. لە ۱۸ ی تشرینی دوەمی ۱۹۶۳ دا مارشال عەبدالسلام عارف کە سەرکۆماری عیراق بو لەسەردەمی دەسەلاتی بەعس دا، خۆی ئینقیلابێکی ساز کرد، حیزبی بەعسی دور خستەوە، ڕژێمی نوێ دەستی لە دوژمنایەتی سۆڤیەت هەلگرت، پەیوەندیەکانی عیراقی لەگەل میصر باش کردەوە، هەروەها پەیوەندی عیراقی - سوڤیەتی بردەوە ئاستی سالانی ۱۹۵۹-۱۹۶۳.

ئەو گروکفەی سۆڤیەت بو پشتیوانی بزوتنەوەی کورد لە عیراق دا دەستی پێ کرد بو بە تەواوی نیشتەوە و، ئەو پشتیوانیە ئاشکرایەی لە حشع ی ئەکرد ئەویش سنورێکی بو دانرا. سوڤیەت ئەیویست ڕژێمی نوێ بمێنێ و جێگیر بێ، یەکێک لە گرنگترین گیروگرفتەکانی حوکمی عیراق مەسەلەی کورد بو. سوڤیەت لە بارزانی ڕاسپارد کێشەی خوی لەگەل عیراق بە خوشی لابەلا بکات و، شەر لەگەل عیراق ڕابگرێ، هەروەها لە ڕێگەی ناصرەوە لە موشیر عارفیان ڕاسپارد کە کێشەی کورد بە ئاشتی چارەسەر بکات و شەر لەگەل کورد ڕابگرێ. تەنانەت ئاموژگاری حشع یشیان کرد ڕێکخستنەکانی خوی هەلبوەشێنێتەوە، بچێتە ناو «الاتحاد الاشتراکی العربی» بەوە کە موشیر عارف لە سەر شێوەی میصر خەریکی دروستکردنی بو. کەوتەوە چەکدارکردنی جەیشی عیراقی و، کەوتەوە جێبەجی کردنی ئەو پروژانەی تەواو نەبوبون. جگە لە سوڤیەت، ئەمەریکاش لە بارزانی ڕاسپارد بو شەر لەگەل عیراق بوەستێنێ و کێشەی کورد بە ئاشتی چارەسەر بکا. خروشوف پروسکەیەکی کورتی بو موشیر عارف لێدا سەبارەت بە ڕاگرتنی شەر

لەگەڵ کورد. بو ئەوەی تای تەرازوی ململانێ ی ناوخوی ئەم دو باڵەی ناو یەک جولانەوە بە قازانجی بەرژەوەندیەکانی خوی، واتە جیگیر بونی تارام و ئاسایشی رژێم لە عیراق دا، بەلادا بخات، لەباتی ئەوەی هەوڵی ریکخستنەوەی هەردو باڵ بدا، بە ئاشکرا لە دەزگاکانی راگەیاندنی سوڤیتیەوە پشتیوانی لە کارەکانی بارزانی کردو دژی باڵەکەی تر دوا کە بە قسەی ئەوان: «ئاویان ئەکردە ئاشی ئیمپریالیزمەوە».

پشتیوانی سوڤیتی لە بارزانی دیارە هەر قسە بو، ئەویش بو ئەوە بو پاڵی پیوە بنین بەرەو ریکەوتن لەگەڵ عارف، ئەم پشتیوانیەی بارزانی بە دریژایی ۲۰ ساڵ تەجروبەی کرد بو هیچی لی سەوز نەبو بو، لە هەمان ساڵ دا بارزانی لە بەرامبەر «پارە» و «چەک» دا بە ئیران و ئیسرائیلی فروشت. بارزانی لە سنوریکی دیاریکراودا ریگەی دابو بە بونی سیاسی و چەکداری حشع لە ناوچەکانی ژێر دەسەلاتی خوی دا، لەوەش چەن مەبەستیکی هەبو، یەکیکیان بو ئەوەی بیانکاتە دەسکەلای هەرەشە لە ئیران و ئەمریکا، یەکیکی تریان بو ئەوەی حشع دەنگوباسی پەیوەندیەکانی دەرەوەی بارزانی لەگەڵ ولاتانی ناحەزی سوڤیت بگەیەنێتەوە بە یەکیتی سوڤیت. پەیوەندی بارزانی لەگەڵ ئیران (١٩٦٤) و لەگەڵ ئیسرائیل (١٩٦٥) وە هەوڵدانی ئاشکرای بو دروستکردنی پەیوەندی لەگەڵ ئەمریکا، سوڤیەتی وا لیکرد کە ئیتر بارزانی وەکو ساڵانی ١٩٦١- ١٩٦٤ فەراموش نەکا. بەلکو کەسانیک تەرخان بکا پەیوەندی بەردەوامی لەگەڵ هەبی، جاروبار راسپاردە، نامە، پارە ... بهینی و ببات.

*

## کۆنگرەی شەشەم

مەلا مستەفا بو ئەوەی «شەرعیەت» ی حزبی بە بریارەکانی خوی بدا پیویستی بە پشتیوانی سەرکردایەتیەکی تازە بو، بو ئەو سەرکردایەتیەیش پیویستی بە گرتنی کونگرەی حیزب بو. پەیرەوی ناوخوی پارتی هەمان پەیرەوی کونگرەی ئاشکرای پینجەم بو لە بەغدا، کە تا ئەوسایش کاری پی ئەکرا. لەو پەیرەوەدا دەسەلاتەکانی سەروک، سکرتیر، کومیتەی ناوەندی، کونفرەنس، کونگرە، دیاری کرا بو. بەستنی کونگرە پیویستی بە هەندی دیسیپلین و ریوشوینی نیزامی بو، بەلام مەلا مستەفا ئەیوت: «ئەگەر بلەی ئەحمەدیش بتوانی پەیرەوی ناوخو دابنی، من کە سەروکی حیزبم بوچی ناتوانم بیگورم؟»

مەلا مستەفا بی ئەوەی گوی بداتە مەرجە دیاریکراوەکانی ناو «پەیرەوی ناوخو» بو بەستنی کونگرەی شەشەمی پارتی، لە ٧ ی تەموزی ١٩٦٤ دا قەرەباڵغیەکی تیکەڵ و پیکەڵی ..٤ کەسی لە قەلادزە کو کردەوە. هەندیکیان ئەندامی پارتی بون، بەلام زوریان ئەندام نەبون، یا مەرجەکانی بەشداربونی کونگرەیان تی دا نەبو. لە ناو ئەوانەدا ئەندامی کاژیک و حشع هەبو.

لەم کونگرەیەدا لە ئەندامانی کومیتەی ناوەندی پیشو تەنها: هاشم عەقراوی، صالح یوسفی، عەبدولحسین فەیلی، نوعمان عیسا بارزانی، ئیسماعیل عارف، بەشدار بون. سالح و عەبدولحسین تازە لە زیندان دەرچو بون، مەعلوم نەبو مافی ئەندامەتییان ماوە یا نە. ١٤ کەس لە سەرکردایەتی پیشوی حیزب بە تاوانی خیانەت دەرکران، لەوانە: ئیبراهیم ئەحمەد، نوری شاوەیس، عەلی عەبدوللا، عومەر مستەفا، جەلال تالەبانی، حیلمی عەلی شەریف، مەلا عەبدوللا. سەید عەزیزی شەمزینی و عەلی عەبدوللا کە لەو ناوچەیەدا بون

هەردوکیان دەس بە سەر دانران. سەرکردایەتیەکی تازەی بۆ حیزبەکە دانا لە: حەبیب کەریم، د. مەحمود عەلی عوسمان، صالح یوسفی، ئیسماعیل عارف، عەبدولی سوزان، صدیق ئەمین، عومەر شەریف، شیخ محەممەدی هەرسین، عەزیز عەقراوی، هاشم عەقراوی، د. فوئاد جەلال، عەلی سنجاری، یەدوللای فەیلی..

هەروەها بڕیاریان دا بچنە سەر «ئیمپراتوریەتی ماوەت» وەکو مەلا مستەفا پێ ی ئەوت.

حەبیب محەممەد کەریم، لە نامەیەک دا کە لە ١١ / ٥ / ١٩٦٤ دا بۆ شەمسەدین موفتی دەربارەی هەلومەرجی ئەو ڕۆژانە نوسیویەتی: «فان البارزاني ومن يتبعه من البسطاء والمتاخرين عقليا والانتهازيين في واد والحزب والعناصر المدركة الواعية في واد اخر، وهو بعقليته الفردية العشائرية الاقطاعية متفق على مجموعة من الاجراءات الملتوية مع الحكومة، وان قواته تهاجم مقرات الحزب وفروعه وتحتقل الاعضاء البارزين وتجرد الكوادر من اسلحتهم وبشكل في بعض المناطق لجانا محلية - داود صائغية - وفق خطة تهدف الى تكوين حزب مطيع له طاعة عمياء يكون اداة في يديه يستعملها كما يشاء ويريد...»

حەبیب خۆی بو بە سکرتێری ئەم حیزبە!

دوای ئەم کۆنگرەیە دەسەلاتەکان بە تەواوی کەوتە دەس مەلا مستەفا و، دەزگا سەرکردەییەکانی پارتی، ئەگەر لەوەو پێش وەکو دا ‍دەزگا (مؤسسات) کەمێ دەسەلات و نرخیان هەبوبێ، ئەوا بون بە قەوارەی پوش و کارتونی. مەلا مستەفا بە ئارەزوی خۆی ئەیگۆڕین و، هەلی ئەسوڕاندن و، بۆ گفتوگۆیش ئەوانەی ئەنبردران وەکو نوێنەری مەلا مستەفا ئەدوان، نەک وەکو نوێنەری حیزب یان گەلی کورد.

*

مەلا مستەفا بە درێژایی سالانی ٦٤ - ٦٦ لە گەڕان دا بو. ناوچەکانی ڕانیە، قەلادزە، دوکان، چوارتا، پێنجوین گەڕا. بە ڕۆژ ئەنوست و، بە شەو دائەنیشت بۆ ئەنجامدانی کارەکانی.

خۆی وا پیشان ئەدا پیاوێکی خاوەن باوەری ئیسلامە. ڕێزی زۆری لە مەلا ئەگرت و، لایەنگری ئەوە بو شەڕ و کێشە و ناکۆکی لە سەر بنچینەی «شەرع» چارەسەر بکرێ. لە هەمان کات دا بە دژی خەلکەوە «مەشروبات» یشی ئەخواردەوە.

ناوی هیچکام لە کوڕەکانی، جگە لە دلشاد، کوردی نیە. هاوسەرەکەی ئیدریس دو کوڕی پێکەوە ئەبێ، ئەیانەوی مەلا مستەفا ناویان لێ بنێ. مەلا مستەفا داوا ئەکا ناویان بنێن «ذوالکفل» و «ئیسرافیل». ئیدریس ئەترسێ منالەکانی لە پاشەڕۆژدا بېن بە گالتەجێ منالان. لە تاوا پەنا بۆ یەکێ لە هاوکارە نزیکەکانی مەلا مستەفا ئەبا کە بەلکو تکای لێ بکا ناوێکی تریان بۆ بدۆزێتەوە. دوای ڕجا و تکا ناوەکانیان ئەگۆڕن.

ئەو کاتە هێشتا زۆر کەس نەشارەزای مەلا مستەفا بون. لە کاتی گفتوگودا کە پیانوتایە: «مامۆستا». مەلا مستەفا توڕەبو جنێوی قورسی بە کابرا ئەدا و، ئینجا ئەیوت: «من مامۆستا نیم، عەلی مەردان مامۆستایە، ئیبراهیم ئەحمەد مامۆستایە!» زۆر کەس جنێوی پیسیان خوارد تا فێر بون لە باتی وشەی مامۆستا «ئەزبەنی» یان «ئەز خولام» بە کار بهێنن.

لە دانیشتنەکانی دا هەمیشە چەقۆ و هەسان و داری لە لا بو. بە دەم قسە کردنەوە

خەریکی تاشینی دارەکە ئەبو. دارجگەرەی لێ دروست ئەکرد و، ناو بە ناو ئەم دارجگەرانەی بۆ یادگار بە دیاری ئەدا بەم و بەو.

زۆر شارەزا بو لە ژیانی لادێ و، دڵ و دەرونی دانیشتوانی دێهات و کاروباری عەشیرەتەکان دا. ئەیزانی چییان لە گەڵ باس ئەکا و چۆنیان ئەدوێنێ. خۆیشی زۆر سەرگوزشتە و چیرۆک و قسەی پێشینانی ئەزانی. حەزی لە سواری و، لە راگرتنی ئەسپی رەسەن و مەرداری بو. رەوەی ئەسپ و رانەمەری گەورەی هەبو. خۆشترین رابواردنی راوی بەراز و راوی خەمەگرو بو. خەمە گرو گیانداریکی خشۆکە وەکو قۆزی و بزمژە. لای هەمو بارزانیەکان کوشتنی وەکو ئەرکێکی ئاینی وا بو.

کە پێویستایە ئاغایەک یان پیاوێکی دەسرۆیشتوی ناوچەکە نابوت بکا، هێزێکی گەورەی لە گەڵ خۆی ئەبرد و، بە ناوی دۆستایەتیەوە ئەبو بە میوانی. چەند رۆژی خۆی و هێزەکەی نانی کابرایان ئەخوارد تا نابوتی ئەکرد.

حەزی ئەکرد هاوکارەکانی بشکێنێ و هەمویان کەموکوریان هەبێ و، چاو بەرەو ژێری ئەو بن. کە شکاتیان لە لای ئەو لە یەکێ بکردایە لە سەر دزی، لە باتی ئەوەی بیگۆڕێ، یان بانگی بکا بۆ لێپرسینەوە. ئەیوت: «باشە ئەمەیان بەشی خۆی دزیوە، کەمێ تێر بوە ئیتر کەمتر دزی ئەکا. ئەگەر یەکێکی تازە دابنێم ئەو لە سەرەتاوە دەس پێ ئەکا و زۆرتر ئەدزێ.» زۆر جار ئەوانەی تاوانبار بون بە دزی بانگی ئەکردن بۆ لای خۆی، لە باتی ئەوەی حسابیان لە گەڵ بکا، ئەیوت: «تۆ قسەیەکی وایان بە پاڵ داوی، دیارە موحتاجی!» هەندێ پارەی بە خەلات ئەدایە. ئەوەی پارەی لێ وەرنەگرتایە بەر غەزەبی لە بڕانەوە نەهاتوی ئەکەوت.

گومانی لە هەر کەس هەبوایە کە جاسوسی روس، ئینگلیز یا ئەمریکایە ریزی زیادی ئەکرد و نزیکی ئەخستەوە لە خۆی، بە تەمای ئەوەی راپۆرتی باشی لە سەر بنوسێ.

لە هەمو کۆڕ و کۆمەڵێک دا بە ئاشکرا ئەیوت: «کورد پیاوی تێ دا نیە!». زۆر جار هێرشی ئەکردە سەر قازی محەممەد. بۆ ئەوەی دەسەڵاتی خۆی بنوێنێ، زۆرجار باسی ئازایەتی خۆی و شارەزایی و بلیمەتی لە دانانی پلانی جەنگی دا، بە جۆرێکی پڕ «موبالەغە» ی لە باوەڕ نەهاتو، ئەگێڕایەوە. تەنیا مەبەستیشی لەم موبالەغەیە ئەوە بو کە: بە دانیشتوەکانی بسەلمێنێ لە روی خۆی دا کەس ناوێرێ بڵێ وانیە. لە دانیشتنێکی قەرەبالغ دا ئەڵێ: «تۆپێکمان لە حکومەت گرت بو داوام لە عیزەت کرد مەعسکەرەکەی پێ تۆپباران بکات. تۆپێکی تێ گرت سەری کرد. تۆپێکی تری تێ گرت کورتی کرد. گوللەی تۆپەکان کەم بون. بە عیزەتم وت تۆ لاچۆ خۆم تۆپەکەم دامەزران و گوللەیەکم گرتە مەعسکەرەکە لە ناوەڕاستی مەعسکەرەکەو دا». نوری ئەحمەد طەها لە کۆڕەکە دا نەبێ. مەلا مستەفا روی تێ ئەکا ئەڵێ: «نوری وانیەو؟» کاک نوری ئەڵێ: «بەڵێ ئەزبەنی لەو کاتەدا کە تۆ تۆپەکەت پێوە نان قزعەیان دابەش ئەکرد هەر مەنجەڵ و قاپ و قاچاخ بو ئەچو بە ئاسمان دا». عیزەت عەزیز یەکێ لە ئەفسەرە هەڵکەوتوەکانی جەیشی عیراق بوە و، دەورەی لە بەریتانیا دی بو.

هەندێ جار بە مەعناوە هاوکارەکانی خۆی ئەشکاند. جارێکیان لە دانیشتنێکی گەورەدا رو ئەکاتە کۆڕەکە و ئەڵێ: «من و ئەم پیاوە هەردوکمان ناومان مستەفایە و، بە هەردوکمان بە قەدەر چۆلەکەیەک مێشکمان هەیە!»

گرنگترین پیوانە لای مەلا مستەفا بۆ هەلسەنگاندنی خەلک، رادەی دلسۆزیی ئەو کەسە بو بەرامبەر بە خۆی. ئەوەی دلسۆزیی خۆی بۆ بسەلماندایە ئیتر گوی ی نەئەدایە رەفتار و، هەلسوکەوتی. هەرچیەکی بکردایە لی ی نەئەپرسیەوە.

*

## داهینانی نەریتی دزیو

سالی ١٩٦٤ لە میژوی بزوتنەوەی سیاسی کوردستانی عیراق دا نوقتەی وەرچەرخانیکی شومە، شوینەوارەکانی وەکو رەگی گولی لە جولانەوەی کوردا جیگیر بو. ناکۆکی نیوان سەرۆکی حیزب و سکرتیری حیزب شۆر بوەوە ناو ناخی ریکخراوە سیاسی و پیشمەرگەییەکانی پارتی و، لە ئەنجام دا ناو خەلک و جولانەوەی کورد و، بو بە سەرەتای شەریکی ناوخۆی لە برانەوە نەهاتو.

مەلا مستەفا چەند نەریتیکی دزیوی لە جولانەوەی کوردا داهینا، وەکو: پەنا بردن بۆ چەک بۆ بە لاداخستنی ناکۆکی سیاسی، پەنا بردن بۆ دوژمن بۆ بە بەلاداخستنی ململانی ی دەسەلات لە گەل نەیارەکانی، کوشتنی نەیاری سیاسی، لە باتی گفتوگۆی سیاسی شەرە جنیوی ناشیرین..

١. شەری ناوخۆی لە برانەوە نەهاتو.

مەلا مستەفا هیزیکی گەورەی کۆ کردەوە لە بارزانی و، عەشائیری ناوچەکە و، پیشمەرگەکانی پارتی و، لە مانگی تەموزی ١٩٦٤ دا چوە سەر بارەگای م س لە ماوەت. لوقمانی کوری سەرپەرشتی راستەوخۆی لەشکرکیشییەکەی ئەکرد. دوای تەقوتۆقیکی کەم هیزەکەی م س شکا. کشایەوە ئیران. ئیران چەکی کردن و پیشمەرگەکانی برد لە هەمەدان لە ئوردوگایەکی کردن و، چەند کەسی لە کاربەدەستەکانیش: ئیبراهیم ئەحمەد، عومەر مستەفا، حیلمی عەلی شەریف، جەلال تالەبانی، نوری ئەحمەد طەهای برد بۆ تاران. نوری شاوەیس کە لە سەر پردی قەشان رەشاشی دائەبەست، لەو کاتەدا لە سلیمانی بو. لە ریگای بەغدادەوە بۆ تەداوی چو بۆ ئەوروپا.

٢. پەنا بردن بۆ دوژمن بۆ بەلاداخستنی ململانی ی ناوخۆ.

لەو هیرشەدا کە سەرۆکی پارتی ریکی خست، هیزەکانی بە ئازوقەی حکومەت تیر و، بە تەقەمەنی حکومەت پزشتە کردو، بە ئاگاداری و بە ناو حکومەت دا گواستەوە بۆ سەر ماوەت.

سکرتیری پارتی و هاوریکانیشی کە بەرگەی هیرشەکەیان نەگرت پەنایان بردە بەر ئیران.

پەنابردن بۆ عیراق و پەنا بردن بۆ ئیران، لە نیوان ئەم دو لایەدا دژی یەکتری بو بە نەریتیکی حەلال لە لای هەردوکیان.

٣. تیکچونی بەها بەرز و پیروزەکانی کوردایەتی.

چەند باندی، بە ناوی «لیژنەی پیشمەرگەی ناوشار» لە کانی ماسی دروست کرا، «کانی ماسی» کاریزیکە کەوتوتە خواروی سلیمانی نزیک گوندی قەرەتۆغان. ناوشاری سلیمانی بە ناو لە ژیر دەسەلاتی حکومەتی عارف دا بو، بەلام کانی ماسی شوینیکی ئازاد و لە ژیر دەسەلاتی شورش دا بو.

بەرپرسەکانی ئەم لیژنەیە بریتی بون لە: حەمەرەشی ئەحمە شانە، مەحمودی شا

محەممەد، وەستا گورونی کەبابچی.. ئەمانیش چەند باندیکیان لە سەرسەری هەرە پەناوەکانی سلیمانی دروست کرد، لەوانە: عوسمەی تامە، سالە سپک، حەمە عەلی فەرەج، حسەینی فارس، ئەمەینی فارس، سەلاحی فاتە قەمەر، ئەحمە سی سەر، بەکری خانم، عومەری مارف.. ئامۆژگاری و فەرمانی راستەوخۆیان لە بارەگای بارزانی، یا راستتر لە مەلا مستەفا وەرئەگرت، دەسەلاتیکی بی سنوریان داپونی. ئەرکی سەرەکییان بلاوکردنەوەی ترس و تۆقاندن و سەرکوتکردنی نەیارە سیاسیەکانی بارزانی بو.

چالاکییەکانی ئەم باندانە بریتی بو لە:

- پەلاماردان و پشکنینی سەدان مال، لەوانەی ئەندامی پارتی بون و، گرتن و فراندن و راونانی سەدان ئەندامی پارتی لە لایەنگرانی م س و، کوشتنی هەندیکیان.

- سەرانە سەندن و راوورووت و برینی شەوانەی بە ئاشکرای مالی کەسانی بی دەسەلات.

- پەلامارادانی ئەندامە ناسراوەکانی حشع و گرتن و فراندنی هەندی لە کادر و ئەندامەکانیان و، کوشتنی هەندیکیان بەوپەری درندایەتیەوە لەوانە: ئەورەحمانی سالحی خلە پنجو، کە بە زیندویەتی سوتاند بویان.

- لە مانیش سەیرتر تاشینی برۆی هەندی لەو گەنجانەی قژیان درێژ کرد بو، یا پانتولی جوانیان لە بەر کرد بو، رەنگ کردنی قاچ و ئەژنۆی ئەو کچانەی کراسی کورتیان لە بەر کرد بو.

کارەکانی باندی کاتی ماسی لە هەمو لایەک دەنگی دابوەوە. زۆر کەس هاواریان بۆ مەلا مستەفا برد و شکاتیان لە لا کرد. مەلا مستەفا بۆ پاککردنەوەی خۆی لەم تاوانانە بەهانەیکی دەرکرد بی ئاگایی خۆی دەبری و، بە ناو چەند کەسیکی کەمی لە هەرە پەناوەکانیان دەرکرد. بەهانەکەیان بە شوینە گشتیەکان دا هەلواسی. بەلام بەهانەکە بۆ خاوکردنەوەی توڕەبون و نارەزایی خەلک بو، ئەگینا هیچ کەس لەمانە نە بە راستی لە پیشمەرگایەتی دەرکران و، نە لیکولینەوەیان لە گەل کرا. خۆیشیان بە شانازییەوە ئەیانوت ئەوان جگە لە سەروک بارزانی کەسی کە ناناسن و، کاغەزی کەس ناخوێننەوە.

٤. داهینانی «اغتیال» ی سیاسی

مەلا مستەفا ئەحمەد ئاغای زیباری و صدیق میرانی خۆشناوی بە هۆی ناکۆکی عەشائیریەوە کوشت. لە سالانی شورش دا بە هۆی ناکۆکی سیاسیەوە تاقمیکی لە کادرەکانی پارتی کوشت. عەلی حەمدی، ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی و لیپرسراوی لقی سلیمانی و مەحمودی حاجی توفیق، ئەندامی لقی سلیمانی، دواییتر عوسمان عوزیری و مجید شوانی لە زیندان دا کوشت و، سالەکانی دواییش بە فەرمانی ئەو ئەحمەد عەبدوللا، ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی و، ئەحمەد رەشوانی ئەندامی لیژنەی ناوچە لە ناو شاری هەولیر و، خالیدی حاجی فەرەجی کۆکۆیی لە ناو هەلەبجە دا کوژران..

«ئیغتیال» برینیکی قولی کردە ناو کۆمەلی کوردەوە. سەرەرای ئەوەی دوژمنایەتی لە ناو حیزبەکان دا قولتر ئەکرد، دوژمنایەتی خویناوی لە نیوان هەندی عەشیرەت و بنەمالەدا دروست کرد. لیرەدا دو نمونەیان باس ئەکەم:

- مەلا مستەفا، عوسمان عوزیری کوشت. عوسمان کادری راگەیاندن بو. ئەندامی پارتی بو. لە رادیوی بەغداد کاری کرد بو. شاعیر و نوسەر و روناکبیر بو. چو بوە ریزی

پێشمەرگەوە لە رادیۆی کوردستان بە دڵسۆزی کاری ئەکرد. لە سەر ئەوەی برازای حاجی برایمی چەرمەگا بو گرتیان و لە زیندان دا کوشتیان. ساڵ وەرگەرا پاسکی م س دەستیان بە سەر چەند ناوچەیەک دا گرت و، چەند کەسێکیان لە کادرەکانی پاسکی مەلا مستەفا گرت، لەوانە: سیامەند و ملکۆ کە بارزانی و، عومەر شەریف کەرکوکی بو. ئەمانە لە کرژە لە زیندان دا بون. خزمەکانی عوسمان چونە سەر زیندانەکە و بە زۆر دەریان هێنان و لە تۆڵەی خوێنی عوسمان دا هەرسێکیان کوشتن. مەلا مستەفا ئەم داخەی لە دڵ گرت. دوای ١١ ی ئازار هەمو خێڵی چەرمەگای بۆ میوانی بانگ کرد بۆ پارەگاکەی خۆی لە ناوپردان. لە سلێمانیەوە بە ری کەوتن بچن بۆ لای. لە رێگای خەلەکان بۆسەیەکی بۆ دانان. هەمویان لە ئۆتۆمۆبیل داپەزاند و، لە هەمان شوێن دا هەمویان کوشتن.

- جەزای عەلی کاتب لە هەڵەبجە خالیدی حاجی قەرەجی کوشت. لە تۆڵەی ئەمەدا کۆکۆییەکان لە سلێمانی ئازادی برای جەزایان کوشتەوە.

٥. داهێنانی موهاتەرات لە گفتوگۆی سیاسی و حیزبایەتی دا

مەلا مستەفا پیاوێکی جنێوفرۆش و دەم پیس بو، وشەی «قوندەر» ی لە قسەکانی دا بە زوری بە کار ئەهێنا، لای وا بوە لە ناو کوردا تۆمەتی دزی و داوێن پیسی کاریگەرترە لە تۆمەتی سیاسی، بۆ شکاندنی دوژمنەکانی ئەم رێگایەی بە کار ئەهێنا.

کە باسی ناکۆکییەکانی خۆی ئەکرد لە گەڵ ئیبراهیم ئەحمەد و هاورێکانی لە ناو خەڵک دا تاوانباری ئەکردن بەوەی: «سواری ژنی خەڵک ئەبن، سواری پێشمەرگە ئەبن و، سواری یەکتری ئەبن ...» یان «لە کاتێک دا پێشمەرگە و خێزانەکانیان نان نیە بیخۆن، ئەوان دزییان لە ماڵی میللەت و شۆرش کردوە ...»

ئەم قسانە شیاوی سەرکردەی جوڵانەوەیەک نەبون، هەندێ کەسی نزیکی کە پێ ی ئەڵێن ئەم قسانە نەکا، مەلا مستەفا ئەڵێ: «کورد لەوە تێ ناگات کە بڵێم من ناکۆکی سیاسیم لە گەڵ ئیبراهیم ئەحمەد هەیە، بەڵام لەوە تێ ئەگا کە بڵێم دزییان کردوە و، خەڵکیان گاوە و گانیان داوە.. من دوژمنەکانی خۆم بەم رێگایە ئەشکێنم.»

هەردولا کەوتنە داهێنانی ناوو ناتۆرە لە یەکتری. لە نوسینەکانیان دا یەکترییان بە خیانەت و جاشایەتی تاوانبار ئەکرد. زاراوی «جەلالی» و «مەلایی» و «تاقمەکەی جلە - پلە» و دوایی تر «جاشەکانی شەستوشەش» و «مەلا چۆمبی» بون بە وتەی سەرزار. هەژاری موکریانی، شێخ محەممەدی هەرسین، سەعید ناکام لە داهێنان و خۆشکردنی ئاگری ئەم شەرە جنێوەدا دەوری سەرەکییان هەبو. سەیر ئەوەیە ئەمانە هەرسێکیان بە رێچەڵەک ئێرانین. لە کوردستانی عێراق دا جگە لە خێزانەکانی خۆیان کەسوکاری تر و خزمیان نەبو و دڵیان بۆ کوژرانیان بسوتێ. ئەم نەریتە ناشیرینە بو بە بەشێ لە چالاکی حیزبەکان.

هەردولا کە یەکترییان بە جاشایەتی تاوانبار ئەکرد، هەردوکیان دو حیزبی خاوەن بەرنامە و رێبازی سیاسی و رێکخستن و بنکەی جەماوەری بون. هەر یەکەیان هەزاران رۆشنبیر و جوتیار و کرێکاری لێ کۆ بوبوەوە. هەریەکەیان بەهانە و بیانوی خۆی هەبو. شەری ناوخۆی نێوان ئەم دو باڵەی پارتی وەکو شەری ناوخۆی نێوان دو عەشیرەتی بارزانی و زیباری، یا تەنانەت هەمو جوڵانەوەکە و عەشیرەتە کوردەکانی سەر بە حکومەت نەبو. ئەگەرچی بارزانی و لایەنگرەکانی هەوڵێکی زۆریان داوە بۆ سوک کردنی مەسەلەکە بیخەنە قالبی ناکۆکی شۆرش و جاشی ٦٦ وە و، جاشی ٦٦ یش وەکو هەمو جاشەکانی تری

کوردستانی عیراق لە قەلەم بدەن. بەلام ئەمە شوبهاندنێکی نامەعقول بو، هەر لە لای لایەنگرە کەللە رەقەکانی خۆیان ئەیخوارد.

*

مەلا مستەفا دوای ئەوەی م س ی دەرکرد بۆ ئێران ریگای بۆ تەخت بو. خۆی بە تەنیا بو بە دەسەلاتداری یەکەم لە بریاردانی شەر و ئاشتی دا، لە دامەزراندن و برینی پەیوەندی سیاسی دا، لە دانان و لابردنی کاربەدەستانی شۆرش دا. هەندی داوودەزگای بە ناوی: مەجلیسی قیادەی ثورە، مەکتەبی سیاسی، مەکتەبی تەنفیزی، مەکتەبی عەسکەری، دروست کرد. مەکتەبەکان شتی کارتونی و روالەت بون. دەسەلاتەکان هەمو لە دەس خۆی دا کۆ بوەوە.

حکومەتی عیراق هەندی هەنگاوی هاویشت: گیراوەکانی بەردا، موچەخۆرەکانی گێرایەوە سەر کارەکانیان، خوێندکارەکانی گێرایەوە زانستگا، زەرەر و زیانی هەندی لە زەرەر لی کەوتوەکانی دوکان و دەربەندیخانی بژارد، مەسعود محەممەدی دانا بە وەزیری کاروباری سەرو.. بەلام هیچ هەنگاوێکی لە مەیدانی سەلماندنی مافە نەتەوەییەکانی کوردا نەنا. ئەمەش لە ناو خەلک و سەرکردایەتی تازەدا مقۆمقۆی دروست کرد بو. چەند نامەیەک لە نێوان مەلا مستەفا و حکومەت دا ئالوگۆر کرا. بۆ بە درێژ خستنەوەی رەخنە سیاسیەکانی م س یادداشتێکی دەربارەی مافەکانی کورد دا بە حکومەتی عارف، هیچی کەمتر نەبو لەو یادداشتەی پێشتر م س ئامادەیان کردبو. ئەم یادداشتە صالح یوسفی و شەوکەت عەقراوی و عەگید صدیق بردیان بۆ بەغدا، بەلام مەلا مستەفا بە عەگیدی وت بو: «لە لاوە بە کاربەدەستانی عیراق بلی، مەلا مستەفا باوەری بەو یادداشتە نیە، بەلکو لە ژیر گوشاری دەوروپشتەکەی دا ئیمزای کردوە، بۆ ئەوەی نەلین کوردی فرۆشتوە.»

عەبدولسەلام عەرەبێکی سوننەی نەتەوەپەرستی بەرچاوتەنگ بو، رقی لە کورد و شیعە بو. بە تەمای سەلماندنی هیچ مافێکی کورد نەبو، بەلکو هەروەکو صوبحی عەبدولحەمید، یەکی لە وەزیرە نزیکەکانی لە بیرەوەرییەکانی خۆی دا نوسیویتی: عارف بە هیچ جۆری باوەری بە مافی کورد نەبوە.

*

ریکخراوە سیاسیەکانی پارتی بە زوری لە گەل م س بون. دوای کشانەوەی ئەوان بۆ ئێران، چەند کەسێکی کۆمیتەی ناوەندی کە لە کوردستانی عیراق ما بون، لەوانە: عەلی عەبدوللا، نوری شاوەیس، زەبیحی لە بەغدا مەکتەبی سیاسییان پیک هێنایەوە و، گۆڤارێکیان بە ناوی «پێشرەو» بە کوردی و، لقی بەغدایش بە عەرەبی «باهۆز» ی دەرئەکرد. ئەحمەد عەبدوللا لە بادینان و، محەممەدی حاجی تاهیر لە سلیمانی و، مەلا عەبدوللا ئیسماعیل لە هەولیر.. دریژەیان بە کاری ریکخراوەیی دا. لە کوردستانی عیراق دا دو ریکخراو بە ناوی پارتیەوە کاریان ئەکرد و، هەردوکیان خۆیان بە «شەرعی» ئەزانی.

*

دوای شکاندنی م س، مەلا مستەفا دەستی کرایەوە بۆ دامەزراندنی پەیوەندی لە گەل دنیای دەرەوەدا.

*

## لە گەڵ ئەمەریکا

مەلا مستەفا لای وابو دنیا بە پەنجەی ئەمەریکا و روسیا ئەگەری و، بۆ دابینکردنی سەرکەوتن، ئەبی پشتیوانی یەکی لەم دو زلهیزانە بە دەس بهێنری. لەو کاتەوە کە لە سۆڤیت گەرابوەوە هیچ هیوایەکی بە پشتیوانی سۆڤیەتی نەما بو. هەولی ئەدا پشتیوانی ئەمەریکی بە دەس بهێنی. ئەمەی ئەشارداوە و، هەر لە سەرەتای دەس پی کردنی جولانەوەکەوە هەولی بۆ دابو. لە سەرەتادا ئەحمەد تۆفیقی راسپارد ئەم کارە بە ئەنجام بگەیەنی. ئەحمەد توفیق دوجار، بۆ ئەم مەبەستە، هەولی دا. جاریک چو بۆ بەیروت و جاریک بۆ تاران. هەر ئەمیش بو رۆژنامەوانی ئەمەریکی دانا ئادەم شمیتی هان دا سەردانی کوردستان بکا و، لە گەڵ خۆی هینای.

مەلا مستەفا لە گفتوگۆکانی دا لە گەڵ شمیت (١٩٦٢) چەند جار داوای یارمەتی ئەمەریکی کرد. شمیت لە گەرانەوەی دا بە زنجیرە چەند وتاریکی لە رۆژنامەی «نیویورک تایمس» ی ئەمەریکی دا بلاو کردەوە. نوسی بوی مەلا مستەفا داوای یارمەتی لە ئەمەریکا ئەکا. عیراق ئەمەی کرد بە کەرەسەی پروپاگاندە دژی جولانەوەی کورد و، رۆژنامەکانی بغدا هیرشیان کردە سەری. مەکتەبی سیاسی لە «وخەبات» دا ئەمەیان بە درۆ خستەوە و، گفتوگۆیەکی کورتیان بلاو کردەوە کە گوایە بارزانی لەوە زیاتر هیچی تری نەوتوە و، ئەوی تری هەلبەستراوی رۆژنامەوانەکە خۆیەتی. مەلا مستەفا ئەم بە درۆ خستنەوەیەی پی ناخۆش بو، چونکە خۆی ئەم داوایەی پی شەرم نەبو، حاشایشی لی نەئەکرد.

تا سالانیکی زۆر ئەمەریکا هیچ بایەخیکی بە جولانەوەی کورد و بە مەلا مستەفا نەئەدا و، ئامادە نەبو هیچ جۆرە پەیوەندییەکی لە گەڵ دابمەزرینی. بەلام هەر کۆلی نەدا و، لە ریگای شای ئیران، کاربەدەستانی ئیسرائیل و، شای ئوردونەوە هەولی ئەدا دەرگای ئەمەریکای لی بکریتەوە.

*

## لە گەڵ ئیران

ئیران لە ١٩٦٤ بە دواوە پەیوەندی راستەوخۆیان لە گەڵ مەلا مستەفا، وەکو دەسەلاتی ئەمری واقیع، دامەزراند. دوای ئەمە پەیوەندیەیان تا ئەهات بە هیزتر ئەبو. شەمسەدین موفتی لە تاران بو بە نوینەری مەلا مستەفا. بۆ یەکەمین جار سالی ١٩٦٥ سەرەرای ئەوەی چەند هەزار دانە تفەنگی برنەویان دایە، هەندی چەکی قورسیشیان دایە لە شەرەکانی دا بە کاریان بهینی. ئەمە عیراقی ترساند و، تەنگوچەلەمەیەکی دیپلوماسی لە نیوان هەردو دەولەت دا دروست کرد.

ئیران هەمیشە بۆ جولانەوەی کورد لە عیراق دا گرنگییەکی تایبەتی هەبوە. لەو کاتەدا کە مەلا مستەفا نەیئەتوانی کەلک لە سنورەکانی تورکیا و سوریا وەربگری، ئیران بۆ ئەو وەکو تەنیا دەروازەی دنیا بو. حیزبی دیموکراتی کوردستان کە لە ناکوکی سەرۆک و سکرتیردا پشتیوانی بی چەن و چونیان لە سەرۆک کرد بو، کەوتنە بەر گوشار و تەنگ پی هەلچنین. مەلا مستەفا نەیئەتوانی هاوسەنگی لە نیوان شا و دیموکرات دا رابگری. ئەبو لایەکیان هەلبژیری. دیموکرات بۆ ئەو کەلکیکیان نەما بو، شا و ساواکی هەلبژارد.

*

## لە گەڵ ئیسرائیل

ئیسرائیل لە گەڵ حکومەتەکانی عەرەب لە شەڕدا بو، کوردیش لە عیراق دا لە گەڵ حکومەتێکی عەرەبی دا لە شەڕدا بو. ئیسرائیل ئەیویست ئەو «دوژمنی دوژمنە» بکا بە دۆستی خۆی. یەکەم جار لە گەڵ ئیبراهیم ئەحمەد لە ئەوروپا قسەیان کرد بو، بەڵام نەمانی دەسەڵاتی ئەو لە سەر ئەرزی کوردستان، پەیوەندی لە گەڵ ئەو بی سود کرد بو. ساڵی ١٩٦٥ ئیسرائیل چەند نوێنەرێکی نارد بۆ کوردستان بۆ دیدەنی مەلا مستەفا. ئیتر پەیوەندیەکی هەمیشەییان دامەزراند. مەلا مستەفا لای وابو: جولەکە نفوزێکی گەورەیان هەیە لە هەمو دنیادا، بە تایبەتی لە ئەمەریکا، بە هیوا بو ئیسرائیل دەرگای دۆستایەتی لە گەڵ ئەمەریکا بۆ بکاتەوە.

*

## هەڵگیرسانەوەی شەڕ

ئەو گرەوەی م س کرد بوی لە سەر ئەوەی مەلا مستەفا تاقەتی درێژە پی دانی شۆڕشی نەماوە و، لە گەڵ عارف رێک کەوتوە بۆ ئەوەی کۆتایی بە شۆڕش بهێنی راست دەرنەچو. بگرە مەلا مستەفا کە خۆی لە «دێ» لە دایک و، لە «دێ» گەورە و، لە ناو شاخ و عەشیرەتدا پی گەیشت بو، هەرگیز لەو ژیانە وەڕس نەئەبو کە لە گەڵ سروشت و تێگەیشتن و ئارەزوی ئەو ئەگونجا. ئەگەر هەر باسی وەڕس بون بکرایە «سیاسیەکانی ئەشکەوت» کە رۆژنامەوانی بەریتانی دەیڤید ئادەمسن ناوی لی نا بون، کە هەمو شاری و خوێندەواری ناخۆشی نەدیو بون، لەو ژیانە بیزار بوبون.

ورده پیکادان لەم لاو ئەولا دەستی پی کردەوە و، شەڕی کورد - حکومەتی عیراق لە ١ ی نیسانی ١٩٦٥ دا هەڵگیرسایەوە.

بە هەول و تەقەلای ناوخۆ و، ناوچەی ئیران، مەلا مستەفا لە حوزەیرانی ٦٥ دا رێگەی دا بە لایەنگرانی م س - جگە لە ئیبراهیم ئەحمەد و سەید عەزیزی شەمزینی - هەمویان بگەرێنەوە کوردستانی عیراق. پیشمەرگەکانیان نارد بو مەیدانەکانی شەڕی رەواندز و، سەرکردەکانیان: عومەر مستەفا، حیلمی عەلی شەریف، مامجەلال، عەلی عەسکەری دەس بە سەر نارد بۆ دولە رەقە و، پاش ماوەیەک نوری شاوەیس، عەلی عەبدوللا، نوری ئەحمەد طەها یش، چونە لایان.

*

مەلا مستەفا ئامادە نەبو هیچ نەرمی و لێبوردنێکی راستەقینە بەرامبەر باسکی م س بنوێنی:

- نەی ئەهیشت بە ناوی پارتیەوە کار بکەن.
- نەی ئەهیشت پارتیەکی تازە دابمەزرێنن و درێژە بە کاری سیاسی بدەن.
- لە ناو حزبەکەی خۆی و داوودەزگاکانیشی دا جیگەی نەئەکردنەوە.

ئەمانەی لە دولە رەقە دەس بەسەر بی ئیشوکار دانا بو. رێگەی نەئەدان بی ئیجازە بەم لاو ئەولادا برون. لە پاتی ئەوەی سەر لە نوی لە داوودەزگاکانی شۆڕش دا کار و فەرمانیان پی بسپێری هەولی ئەدا سوک و ریسوایان بکا. شیخ محەمەدی هەرسین لە وتارەکانی دا بە «گەجەر و گوجەر» ناوی ئەبردن. هەڵوێستی مەلا مستەفا لەم دەس بەسەرانە بەم گفتوگۆیەدا دەرئەکەوی:

جەژن دیتە پێشەوە. ئەوڕەحمان ڕوتە، کە دۆستی ئەمان و نزیکی مەلا مستەفا ئەبێ، ئەنێرن بۆ لای مەلا مستەفا ئیجازەیان بۆ وەربگرێ، بە بۆنەی جەژنەوە بچن بۆ بینینی ژنەکانیان. ئەوڕەحمان ئەچێ بۆ لای و بە نائومێدی ئەگەڕێتەوە بۆ لایان. هەر لە دوورەوە کە ڕوتە دەرئەکەوێ، عەلی عەبدوللا لێ ی ئەپرسێ: «ها ڕوتەدا شیریت یان ڕێوی؟» ڕوتە لوت ئەدا بە یەکا و قسە ناکا. سەری ئەکەنە سەر ئەڵێن: «چی وت؟»

ڕوتە ئەڵێ: «وتی ئیجازەیان نادەم.»

ئەڵێن: «نەبوت بۆچی ئیجازەمان نادا؟»

ڕوتە ئەڵێ: «قسەیەکی ناشیرینی کرد بۆ گێڕانەوە ناشێ!»

زۆری لێ ئەکەن ڕوتە ناچار ئەبێ بۆیان بگێڕێتەوە، ئەڵێ: «وتی ئیجازەیان نادەم بۆ ئەوەی ژنەکانیان حیز بن!»

عەلی عەبدوللا لەو کاتەدا پیاسە ئەکا لە بەر خۆیەوە ئەڵێ: «یەکو کە پیاوێکی بێ ئەدەبە!»

نوری شاوەیس یەکسەر هەڵی دایەوە وت بوی: «گەوادە خۆی تەجروبەی هەیە. پانزە ساڵ لە سۆڤیەت بوە!»

ئەو کاتە نوری شاوەیس، عەلی عەبدوللا، عەلی عەسکەری، نوری ئەحمەد طەها ژنیان هەبو، ئەوانی کەیان هێشتا ژنیان نەهێنا بو.

بۆ ئەوەی نوری شاوەیس بشکێنی ناردی لە ناوشاری سلێمانی تەقەیان لە ناهیدەی شێخ سەلام کرد. ناهیدە لە گەڵ دەزگا ئەمنییەکانی حکومەت تێکەڵاوی پەیدا کرد بو. ناهیدە برینداربو نەمرد. بەڵام مەلا مستەفا لە کۆڕە گشتییەکانی خۆی دا ئەیوت: «من ناردومە تەقە لە.. بکەن کەچی بەر قولی کەوتوە».

*

ساڵی ۱۹٦٥ منیش وەکو خوێندکارەکانی تری زانکۆی بەغداد گەڕامەوە بەغداد بۆ ئەوەی درێژە بە خوێندن بدەم. هەمو ئەو خوێندکارانەی چوبونە ڕیزی شۆڕشەوە لە زانکۆ دەرکرا بون. منیش یەکێ بوم لە دەرکراوەکان. مەلا مستەفا لیستەیەکی دابو بە حکومەت، ناوی زیاتر لە ٦٠ خوێندکاری تێ دا بو. هەندێکیان هیچ پەیوەندیەکیان بە پێشمەرگایەتیەوە نەبو، خۆیان لە بەر تەمەڵی یا هۆی تر لە خوێندن بە جێ مابون. کەچی ناوی من و چەند خوێندکارێکی تری، کە لە شۆڕش دا بوین بەڵام لە گەڵ مەلا مستەفا نەبوین، تێ نەخرا بو. ئەو کاتە د. عەبدولعەزیز دووری سەرۆکی زانکۆ بو. هەوڵێکی زۆرمان دا تا وەرگیرایەنەوە.

لە ١٦ ی ئەیلولی ١٩٦٥ دا جەنەراڵ عارف عەبدولرەزاق هەوڵی ئینقیلابی دا بەڵام سەرکەوتو نەبو، بە سواری فڕۆکە هەڵات بۆ میسر. لەو کاتەدا من لە «ئەمنی عام» لە بەغداد گیرا بوم. رەشید موحسین، کە ئەوسا هاوکاری عارف عەبدولرەزاق و، دوایی بو بە یەکێ لە دامەزرێنەرەکانی توع (التجمع الوطنی العراقی) بەڕێوەبەری گشتی «ئەمن» بو. دوای ئەم ڕوداوە موشیر عارف، ئەوڕەحمان بەزازی ڕاسپارد وەزارەت پێک بهێنێ. لە دوای ١٤ ی تەمموزەوە ئەوە یەکەمین جار بو کەسێکی «مەدەنی» ببێ بە سەرۆکی وەزیران. بەزاز مامۆستای قانون و، باوەڕی بە ڕژێمی پارلەمانی هەبو. لای وابو کاتی ئەوە هاتوە دەسەڵاتی سوپایی کۆتایی پێ بهێنرێ.

«ئەمن» مەسەلەکەی حەوالەی «محکمە امن الدولە» کرد بو. لەوانە بو حوکمێکی گرانم بە سەردا بدەن. هاتنی بەزاز بۆ من خەبەری پیرۆز بو، چونکە بە بۆنەی جەژنی ١٨ ی تشرینەوە چەند وەجبەیەک گیراوی سیاسی بەردا، یەکێکیان من بوم کە بە کەفالەتێکی زۆر قورس بەربوم.

*

پەرپونەوەی موشیر عارف

رۆژی ١٣ای نیسانی ٦٦ موشیر عارف لە هالیکۆپتەردا سوتا. جەنەراڵەکانی جەیش کۆبونەوە بۆ دانانی یەکێکی تر لە جێگای ئەو. ئەورەحمانی برایان هەڵبژارد بە سەر کۆمار و، ئەویش ئەورەحمان بەزازی دانایەوە بە سەرۆکی وەزیران.

جولانەوەی کورد سەرەرای گیروگرفتەکانی ناوخۆی بوبو بە فاکتەرێکی گرنگ لە سیاسەتی ناوەکی و دەرەکی عیراق دا. پشتیوانی تەهران لە مەلا مستەفا زیادی کرد بو بە شێوەیەکی ئەوتۆ کە عیراقی ئەترساند و، پروتیستی رەسمیی دابویە. بەزاز لای وابو کە گیروگرفتی کورد بە شەر چارەسەر ناکرێ و، لە کۆنفەرەنسێکی رۆژنامەوانی دا وتی: ئەگەر چل پەنجا کورد بە شاخەوە بمێنن گیروگرفتەکە هەر ئەمێنێ، چەند جار باسی رێگەی گفتوگۆی کرد بۆ چارەسەری کێشەی کورد. لە هەمان کات دا پەیوەندی و ئالوگۆری بیروڕا لە نێوان سەرکردایەتی بارزانی و حکومەتی بەزاز و، لە نێوان مەکتەبی سیاسی و حکومەتی بەزازدا کرا.

*

لە ئاستی لاساری و رەقی مەلا مستەفادا ئەبو تاقمەکەی م س نەرمی بنوێنن و، بۆ ئەوەی مەلا مستەفا لە خۆیان نەوروژێنن و، ناچاری نەکەن لە سەر حسابی مافەکانی کورد (تنازل) بۆ دوژمن بکا، قازانجی خۆیان و جولانەوەکە و کورد لەوەدا بو: چالاکی سیاسی حیزبەکەیان رابگرن. بەلام ئەمانیش ئامادە نەبون مەیدان بۆ مەلا مستەفا چۆل بکەن.

رێکخراوەکانی ئەمان لە شارەکان و لە ناو پێشمەرگەدا درێژەی ئەدا بە کار کردن. مەلا مستەفا گومانی لێ ئەکردن و، بە مەترسی دائەنان، خەمی بو لە گەڵ حکومەت هاوکاری بکەن و دژی ئەم رابوەستن. لە ناو لقەکانی ئەم حیزبەدا ئیستیفتایەک کرا بو کە ئەوانە بەو جۆرە بێ ئازادی و بێ کار بمێننەوە، یان هەڵێن بۆ لای حیزبەکەی خۆیان. زۆرایەتی دەنگی دابو ئەگەر مەترسیان هاتە سەر هەڵێن.

*

مەلا مستەفا رۆژێک مەفرەزەیەکی بارزانی نارد بو بۆ دولەرەقسە بە دوای: مامجەلال، حیلمی، عومەر مستەفا، عەلی عەسکەری دا بۆ ئەوەی بیانگوێزنەوە بۆ لای ئیدریسی کوری. بارزانیەکان لە پێش دا سەردانی عەباس ئاغا ئەکەن و ئاگاداری ئەکەن کە بۆ مەبەستێکی وەها هاتون. عەباس ئاغا تێ ئەگا ئەیانەوێ بۆ کوشتن. مامجەلال و هاورێکانی لە مەبەستی هاتنەکەیان ئاگادار ئەکا. ئەوانیش لە ناو خۆیان دا قسە ئەکەن و، وا رێک ئەکەون جاری ئەوانەی مەترسیان لە سەرە هەڵێن و، ئەوانی تریش لە نزیکترین هەل دا خۆیان دەرباز بکەن. مامجەلال، عومەر، عەلی، حیلمی بە ٤ قولی لە ٢٨ی کانونی دوەمی ٦٦ دا هەڵاتن و، لە پێشەوە لە ناو سلێمانی دا، لە چەند جێگایەک کە بو خۆحەشاردانیان ئامادە کرا بو، خۆیان شاردەوە. پاش ماوەیەک حیلمی بۆ بەغداد و عەلی

بۆ کەرکوک چون.

ئەوانەی لە دۆلە رەقــە مــابونەوە: نوری شــاوەیس، نوری ئەحمـــەد طەها، عــلی عــەبدوللا، لە ژێر مــەترسی ژیان دا نامــەیەکــیــان بۆ مــەلا مــســتــەفــا نوسی، نارەزاییــان لە راکردنی هاورێکانیان دەربری و، ئامادەیی خۆیانیان دەربری بۆ هاوکاری لە گەلیان. نامەکە زۆرتر لە پاکانە ئەچو، لە گەل لیدوانێکی درێژدا لە خەبات دا بلاو کرایەوە.

دوای ئەمــە مەلا مستەفا کەوتە راونان و گرتنی هەمو ئەوانەی گومانی لی ئەکردن. هەندێ لە پێشــمەرگــەکان و فــەرماندەکــانیــان کە ســەر بە مــامجەلال بون و مــەلا مــســتــەفــا فــەرمانی گرتنی بۆ دەرئەکردن، خۆیان نەئەدا بە دەستەوە. یاخی بون لە ناو پێشــمەرگەدا دەستی پی کرد.

راکردوەکانیش کەوتنە چالاکی: سەرکردایەتی هەمو رێکخراوە نهێنیەکانیــان گرتە دەست. دەســتــیــان کــرد بە دەرکــردنی «خــەبات» بە عــەرەبی و، «خــەباتی کــوردســتــان» کــە تورگانی حیزب و «رزگاری» کە گۆڤاری پێشمەرگە و «پێشرەو» کە گۆڤاری تیۆری بو بە کــوردی. لە گــەل حــیــزبە عــەرەبیــە قــەومیــەکــانی عیــراق و، لە گــەل ئەورەحــمــان بەزازی سەرۆوەزیرانی عیراق پەیوەندییان دامەزراند. دوای چەند مــانگی ئیبراهیم ئەحمەد، کە لەو کاتەدا لە تاران بو، گەرایەوە بەغداد.

لە ١٩٦٤ ەوە ئامــانجی یەکــەمی مــەلا مــســتــەفــا لە هەمــو گــفــتــوگــۆکــانی لە گــەل حکومــەتی عیــراق لە ناوبردنی نەیارەکانی بو. ئەمــە بە جۆرێ بە ســەر بیــرکــردنەوەی دا زال بوبو، بەدیهێنانی مافە نەتەوەییەکانی لە لا بوبو بە مەسەلەی دوەم.

چەند جار و لە چەند کۆڕ و کۆمەل دا کە ئامۆژگاری فەرماندەکانی ئەکرد ئەیوت: ئەگــەر کــەوتیــتــە بەر پەلامــاری دوژمن، دە ســەربازی عــیراقی لە لایەکــەوە و، یەک جاشی جەلال لە لایەکی ترەوە هیرشیان بۆ هێنایت، تۆیش تەنیا یەک گوللەت پی بو، ئەگەر بەو گــوللەیە بە مــســۆگــەری بتــوانی هەر دە ســەربازەکــە بکوژی، بەلام بە مــســۆگــەری نەتوانی جاشەکەی جەلال بکوژی، ئەوا ئەیی بێنیٚ ی بە جاشەکەی جەلالەوە.

*

## بەیانی ٢٩ ی حوزەیران

جەیشی عیراق لە ٢ ی مایسی ٦٦ دا پەلاماری چیای هەندرینی دا و گرتی. بەلام لە ١٤ ی هەمــان مــانگ دا هــیــزێکی تیکەلاو لە پێشــمــەرگــەی پارتی و حــشع، هیــرشی پیچەوانەیان بۆ کرد و گرتیانەوە. شیوعیەکان لەم شەرەدا، بۆ یەکەمین جار و دوایین جار، دەوری سەرەکییان هەبو.

لەم کــاتەدا لــە ناو هیــزەکــانی قــەرەداخ، رزگــاری، کــاوەدا هەندێ لە فــەرمــاندەکــانی: کەمــال موفــتی، نەوشیــروانی فــوئاد مــەستی، ئەحــمــەدی حــەمــەدەمین دزەیی و، هەندێ لەو پێشمەرگانەی سەر بە م س بون لە مەلا مستەفا هەلگەرانەوە. مەلا مستەفا ترسیکی زۆری لی نیشت و، ئەمەی بە پیلان دانا.

لە ١٣ ی حــوزەیران دا حــەبیب مــحــەمــەد کــەریم، عــلی عــەبدوللا، ســالح یوســفی، نافــیــذ جەلال حــەویزی بۆ گــفــتــوگــۆ لە گــەل حکومــەتی بەزاز نارد بۆ بەغــداد. لە ٢٩ ی حوزەیرانی ٦٦ دا دو بەیان خوێندرایەوە: یەکیکیان ئەورەحمان بەزاز، سەرۆوەزیرانی عیراق، بە ناوی حکومــەتەوە و، ئەوی تریان حــەبیب مــحەمەد کــەریم، سکرتیــری تازەی پارتی، بۆ

پشتیوانی له بهیانهکهی بهزاز به ناوی مهلا مستهفاوه.
بهیانهکهی بهزاز پیک هات بو له ۱۲ مادده. ئهگهرچی بهیانهکه دان به مافی نهتهوهیی کوردا ئهنێ، بهلام هیچ چوارچیوهیهکی بۆ دیاری نهکرد بو. لهم بهیانه دا باسی چهندین کیشهی گرنگ کرا بو لهوانه: کردنی زمانی کوردی به زمانی رهسمیی خویندن و دائیرهکان و، بهشدار کردنی کورد له پایه بهرزهکانی حکومهت دا. وهرگرتنی قوتابیی کورد بو خویندن له دهرهوه. فهرمانبهران له ناوچهکهدا کورد بن. ههلبژاردنی گشتی و ریگه دان به حیزب و رۆژنامهی سیاسی. لیبوردنی گشتی. گهرانهوهی کریکار و فهرمانبهری دهرکراو بو سهر کارهکانیان. تهرخانکردنی پاره بۆ ئاوهدانکردنهوهی کوردستان. گهرانهوهی جوتیارهکان بۆ شوینهکانی خۆیان.
باسهکانی به شیوهیهکی وهها لاستیکی داریژرا بون، ههر لایه ئهیتوانی بهو جوره لیکی بداتهوه که خۆی ئهیویست.

*

ههندی کهس ئهلین، حکومهتی عیراق له ئهنجامی ئهو شکانهدا ئهم بهیانهی خویندهوه که له ههندرین توشی هات. رهنگه ئهمه جوری له خۆ ههلکیشانی ههندی تاقم بی، به تایبهتی شیوعیهکان، که ههندیکیان لهم شهرهدا بهشدار بون، ئهگینا نه شهری ههندرین و نه هیچ شهریکی تر له میژوی شورشی ئهیلول دا ئهوهنده کاریگهر نهبوه کار له بریاری سیاسی حکومهت بکا، به تایبهتی شهر له شاخیکی سهخت و دور و داپراوی وهکو ههندرین که له ههمو شاریکی گهورهی کوردستان دوره. له دوای ١٤ ی تهموزی ۱۹۵۸ وه، بهزاز یهکهمین سهروهزیرانی مهدهنی بو، تا ئهو کاته ههر له جهنهرالهکانی جهیش ههلئهبژیردران. بهزاز رویهروی ۳ ئهرکی قورس بوبوه: دورخستنهوهی جهیش له ژیانی سیاسی و، گیرانهوهی ولات بۆ ژیانی پارلهمانی و، چارهسهرکردنی تهنگوچهلهمهی ئابوری. ئهمانهیش ههمو بهسترا بون به چارهسهرکردنی کیشهی کوردهوه. بهزاز لای وابو کیشهی کورد ئهبی به گفتوگو چارهسهر بکری و، ئهگهر چهند چهکداری به شاخهوه بمینن کیشهکه ههر ئهمینی، شکانی جهیش له ههندرین پشتیوانی بو له باری سهرنجی ئهو.

*

بهزاز له ژیر گوشاری جهنهرالهکانی جهیش دا له ئابی ٦٦ دا وازی هینا. وهزارهتیکی نوی به سهرۆکایهتی جهنهرال ناجی طالیب دامهزرا. حکومهتی تازه خۆی به بهیانی حوزهیرانهوه نهبهستهوه، بهزازیش وتی ئهوه بهرنامهی حکومهتهکهی ئهو بوه، حکومهتی دوای ئهو ئهتوانی جیبهجی ی بکا و ئهتوانی دهستی لی ههل بگری.

*

عیراق ریگهی دا به پارتی له بهغداد رۆژنامهیهکی عهرهبی به ناوی: «التاخی» دهربکات. ئهمه دوهمین جار بو له سهردهمی جمهوری دا ریگا به پارتی بدری له بهغداد رۆژنامه بلاو بکاتهوه بۆ رونکردنهوهی بیروبۆچونهکانی خۆی بۆ رای گشتی عیراق.
«التاخی» له چاو ههمو رۆژنامه ئاشکراکانی تردا، زۆرتر داوای ژیانی دیموکراتی و، دابین کردنی ئازادی حیزبایهتی، رۆژنامهوانی، دهس پی کردنی ژیانی پارلهمانی ئهکرد. ههروهها بایهخی به میژو و ئهدهب و فهرههنگی کوردی ئهدا. دوای ماوهیهک پاشکویهکی ههفتانهیشی به کوردی بلاو کردهوه.

*

وەزارەتەکان چەند جاری گۆڕان. ئەمەیش نیشانەی ناکۆکی ناو جەنەراڵەکانی جەیش بو لە سەر باسە سیاسیەکانی عیراق. ئەورەحمان عارف، بە پێچەوانەی کاکیەوە کابرایەکی در و توندوتیژ نەبو، زۆری حیزبە سیاسیەکان لە سەردەمی ئەم دا بوژابونەوە و خۆیان ڕێک خست بوەوە. بۆ زۆر کۆبونەوەی گرنگ کسایەتیە جەنگیەکانی ئەو زەمانە، وەکو: ئەحمەد حەسەن بەکر، عەبدولعەزیز عوقەیلی، طاهیر یەحیا، ناجی طالیب.. ی بانگ ئەکرد و، پرسی پی ئەکردن و، ڕەئی وەرئەگرتن. هەندی لە مانە، بە تایبەتی بەعس، بە تەمای ئینقیلاب بون، لە بەر ئەوە حەزیان ئەکرد کیشە و گیروگرفتەکانی جەنەراڵ عارف، لەوانە کیشەی کورد، ئاڵوزتر و زۆرتر بی.

لە ۲۹ ی حوزەیرانی ٦٦ وە، مەلا مستەفا شەڕی لە گەڵ عیراق ڕاگرت بو، بەلام شەڕی لە گەڵ پاسکی م س ڕاگەیاند بو. لە هەر جیگایەکی بۆی بلوایە هیرشی ئەکردە سەر بنکە و بارەگا و هیزەکانیان. حکومەتی عیراق زۆرتر تەماشای ئەم شەڕەی ئەکرد بی ئەوەی ڕیگەی پی بگری. حاڵەتی «نە شەڕ و نە ئاشتی» باڵی بە سەر هەلومەرجی کوردستان دا کیشا بو. مەلا مستەفا لە ڕوی پیشمەرگەیەوە خەریکی خۆ بەهیز کردن و، لە مەیدانی پەیوەندی دەرەکی دا خەریکی دامەزراندنی پەیوەندی تازە بو.

دوای ئەوەی ئیدریس سەردانی بەغدای کرد و، سەرکۆمار و هەندی لە کسایەتیەکانی کورد و عەرەبی بەغدادی بینی، سەرکۆماری عیراق، جەنەراڵ عارف لە ۲٦ ی تشرینی یەکەمی ۱۹٦٦ دا هاتە کوردستان و، چو بۆ سەردانی مەلا مستەفا. لەم کۆبونەوەیش دا چەککردنی جاشەکانی ٦٦ (۱) یەکەم داوای بو.

*

شەڕ و ئاشتی و، کلیلی چارسەرکردنی کیشەی ناوخۆی جولانەوەی کورد لە دەس مەلا مستەفا دا بو، ئەویش بە هیچ شتی ڕازی نەئەبو بە تەسلیم بونی بی قەید و شەرتی ئەمان نەبی، ئەمانیش ئامادە نەبون تەسلیمی بن.

پاسکی م س لە ۸/۲۸ - ٦٦/۹/۲ دا کۆنفرەنسیکی بەست. ڕاکردوەکان بیانوەکانی خۆیان و ناکۆکیەکانیان لە گەڵ مەلا مستەفا ڕون کردەوە. کۆنفرەنس پشتیوانی لە بەیانی ۲۹ ی حوزەیران دەربڕی و، ستایشی حکومەتی کرد. بەلام لە باتی ئەوەی هەوڵی دۆزینەوەی ڕیگەی بە لاداخستنی هیمنانەی ناکۆکیەکان بدا، ناکۆکیەکانی قوڵتر کرد و، بیانوی سیاسی و ئایدیولوجی بۆ ئاشی و، سەرکردایەتی بارزانی بە خیانەت و جاشایەتی ئیران تاوانبار کرد.

لە بەرامبەر ئەمەدا کۆنگرەی حەوتەم لە ۱۵ - ٦٦/۱۱/۲۰ دا بەسترا. ئەم کۆنگرەیەیش لە باتی ئەوەی هەوڵی دۆزینەوەی ڕیگەی بە لاداخستنی هیمنانەی ناکۆکیەکان بدا، ناکۆکیەکانی قوڵتر کرد و، بیانوی سیاسی و ئایدیولوجی بۆ ئاشی و، لایەنەکەی تری بە خیانەت و جاشایەتی عیراق تاوانبار کرد. هەندی لە دەرکراوەکانی کۆنگرەی شەشەم، لەوانە: نوری شاوەیس و عەلی عەبدوللا هەلبژیردرانەوە بە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی و، کرانەوە بە ئەندامی مەکتەبی سیاسی.

*

## کۆنگرەی شەش

باسکی جەلالی خۆی بە حیزبێکی تازە دائەنەنا، بەلکو خۆی بە خاوەنی مێژوویی و شەرعی پارتی دائەنا. لە کۆتایی مارتی ۱۹٦۷ دا کۆنگرەی لە کەلار بەست. وەکو نیشانەی درێژەدان بە کۆنگرەکانی پێشوی ناوی نا کۆنگرەی شەشەم. ئیبراهیم ئەحمەد کە لە کۆنگرەی پێنجەمەوە سکرتێری حیزبەکە بو، هەر بە سکرتێریش مابوەوە، کۆنگرەکەی کردەوە.

ئەم کۆنگرەیە بریارەکانی کونفرەنسی ماوەت، کە ئەو هەمو کێشە و گیروگرفتانەی لە ناو جولانەوەی کوردا خولقاند بو، بە باش نرخاند و، پشتیوانی لە هەڵوێستی سەرکردایەتی ئیبراهیم ئەحمەد و، هەمو هەنگاوەکانی کرد. مەلا مستەفای لە حیزبەکە دەرکرد. بۆ خۆ جیا کردنەوە لە حیزبەکەی مەلا مستەفا پروگرامێکی تازەی دانا، دامەزراندنی سوشیالیزمی لە عیراق دا کرد بە ئامانجی ستراتیجی خۆی.

بە کردەوە دو حیزبی دوژمن بە یەک بە ناوی پارتی دیموکراتی کوردستانەوە کە ئورگانی هەردوکیان «خەبات» بو، لە ناو کوردستانی عیراق دا کاری رێکخراوەیی، سیاسی، پێشمەرگەیی، راگەیاندنیان ئەکرد و، هەر یەکەیان خۆی بە خاوەن و میراتگری مێژوویی حیزبەکە دائەنا.

*

## کورد و جو

لە روژانی جەنگی شەش روژەی عەرەب - ئیسرائیل (حوزەیرانی ۱۹٦۷) دا مەلا مستەفا، بە ئاشکرا، بەیانی دەرکرد بۆ پشتیوانی لە عەرەب و، ئامادەیی دەربری بۆ ناردنی چەند هەزاری پێشمەرگە بۆ بەشداری لەو شەرەدا دژی ئیسرائیل.

دوای شکانی عەرەب بە چەند روژی لە رێگای تارانەوە، بە نهێنی، چو بۆ ئیسرائیل بۆ پیروزبایی لە سەرکەوتنەکەیان. گولدا مائیر و موشی دایان و، چەند کەسی تر لە کاربەدەستە گەورەکانی ئیسرائیل بە گەرمی پێشوازییان کرد. لەو سەردانەدا وت بوی: «کورد و جو ئامۆزان، هەردوکیان نەوەی حەزرەتی ئیبراهیمن، لە بەر ئەوە ئەبی هاوکاری یەکتر بکەن». شوێنی شەرەکانیان لە سینا پیشان دا و، هەندی لەو چەکە روسییانەی لەو شەرانەدا لە چەپەکانی عەرەبیان گرت بو بە دیاری پێشکەش کرد.

*

حالەتی «نە ئاشتی و نە شەر» باڵی بە سەر پەیوەندی کورد - حکومەت دا کێشا. بەڵام شەری کورد و حکومەتی عیراق ئیتر بو بە شەری کورد - کورد، بە تایبەتی دوای جەنگی شەش روژەی عەرەب - ئیسرائیل، کە عیراق ٤٠ هەزار سەربازی نارد بۆ ئوردون.

*

یەکیتی سۆڤیت بایەخی بە جولانەوەی کورد نەئەدا لە هیچ بەشێکی دا جگە لە عیراق، بەلکو خەریکی دامەزراندن و قولکردنەوەی پەیوەندی ئابوری - بازرگانی بو لەگەڵ ئیران و تورکیا و خەریکی قولکردنەوەی پەیوەندی ئابوری- سیاسی بو لەگەڵ عیراق و سوریا.

لە عیراق جگە لە پەیوەندی ئابوری، بازرگانی، روشنبیری .. نزیکەی هەمو چەک و تفاقی جەنگی هێزە چەکدارەکانی عیراق لە یەکیتی سۆڤیت تەئمین ئەکرا، کە هەر بو

جەنگی کوردستان بەکاری ئەهێنا. نەوتی عیراق کە گرنگیەکی جیهانیی هەیە، لە کانونی یەکەمی ۱۹٦۷دا عیراق و سوڤیت ڕێکەوتنێکی سەرەتاییان ئیمزا کرد بو یارمەتیدانی «کومپانیای نەوتی عیراق» بو دەرهێنانی نەوتی پەترولجاری رومەیلە. جەنگی شەش ڕوژەی عەرەب - ئیسرائیل ۱۹٦۷ بو بە هوی برینی پەیوەندی عیراقی - ئەمریکی و عیراق ناچار بو بو خو پرچەک کردن زیاتر پشت بە یەکیتی سوڤیت ببەستی.

لە ئیران، جگە لە ڕیکەوتنی ئابوری ۱۹٦۳، سالی ۱۹٦٦ ئیران و سوڤیت لەسەر دروستکردنی دامەزراوی تواندنەوەی ئاسنی ئەصفەهان و، راکیشانی لولەی گوێزانەوەی گازی سروشتی ئیرانی بو یەکیتی سوڤیت ڕیکەوتن، پاش ٤ سال ئیران کەوتە ناردنی گاز.

لە تورکیاش، ناکوکی یونانی- تورکی لەسەر قوبرس پەیوەندی ئەمریکی - تورکی گرژ کردبو. تورکیا بەرەو چاکردنی پەیوەندی خوی لەگەل یەکیتی سوڤیت ئەچو.

*

سەردانی جەنەرال عارف لە ئیران

پشتیوانی ئیران لە مەلا مستەفا دژی عیراق گەیشت بوە رادەیەکی خەتەرناک. کاربەدەستانی عیراق گەیشت بونە ئەو باوەرەی «کولەکەی روح» ی جولانەوەی کورد لە ئیرانە. سەروکی عیراقی، ئەورەحمان عارف، سەردانی رەسمیی لە ئیران کرد و، شای بینی. عارف، پیشتر سەردانی بارزانی کرد بو، بارزانی پی رازی نەکرا بو، لەم سەردانەدا ویستی ئیران رازی بکا و، ئەو کولەکەیە بشکینی کە روحەکەی تیایە.

هیشتا ئەم سەردانە بە ئەنجام نەگەیشت بو، عارف روخا.

*

ئینقیلابی بەعس ٦٨

حیزبی بەعس بو جاری دوەم لە تەموزی ۱۹٦۸ دا بە ئینقیلابیکی دو قوناغی دەسەلاتی گرتەوە دەست. واتە واتیکی زوریان بە دواوە بو کە بە هاوکاری ئەمریکی - بەریتانی هاتون، بەلام رژیمی بەعس کەلکی لە تەجروبەکانی ۱۹٦۳ وەرگرتبو، لە بەیانی یەکەمی ئینقیلاب دا بەلینی بەهیزکردنی پەیوەندی دابو لەگەل یەکیتی سوڤیت. راستیەکەشی دەسەلاتی بەعس لە سیاسەتی دەرەوەی دا هەولی بەهیزکردنی پەیوەندی ئابوری، سیاسی، دیپلوماسی، جەنگی لەگەل یەکیتی سوڤیت و ولاتانی سوسیالیستی دا، دانی بە جمهوریەتی دانی پەتملانیای دیموکراتی دا ناو «سەرەتای هولشتاین» ی شکاند، دانی بە جمهوریەتی موەقەتی ڤیتنام دا نا، لە ناوەوەش هەولی سەوداکردنی دا لەگەل حشع و قەومیەکانی عەرەب و هەولی چارەسەرکردنی گیروگرفتی کوردی دا.

*

بەعس ویستی هەردو باسکی جولانەوەی کورد: جەلالی و مەلایی، رازی بکا و بە لای خوی دا رایانبکیشی. لە وەزارەتەکەیان دا دو وەزیریان بو مەلایی و، وەزیریکیان بو جەلالی تەرخان کرد بو. وەزیرەکەی لە باتی جەلالی دانرا بو، طەها محیدین بو، راستیەکەی طەها زیاتر لەوەی جەلالی بی، دلسوز و گویرایەلی بەعس بو.

ئەم کارەی بەعس مەلا مستەفای وروژاند. مەرجی پیشەکی مەلا مستەفا چەککردنی جاشی ٦٦ (۱) بو. مەلا مستەفا لە هەر ڕیککەوتنیک دا لە گەل حکومەت، ئەگەر کوژاندنەوەی کسایەتی و حیزبەکانی تری کورد و، ناسینی خوی وەکو پیشەوای

تاقانە داپین نەکردابە، ئامادە نەبو قوبولی بکا. لەو کاتەدا بەعس ئامادە نەبو بچێتە ژێر باری ئەم مەرجانەوە، بە تایبەتی خۆیان لاواز بون و، لە ناو خۆیان دا ململانێ ی دەسەلات لە نێوان باڵەکانی بەعس دا، هێشتا بە لادا نەکەوت بو. بارزانی وەزیرەکانی خۆی کێشایەوە و، پیوەندی لە گەڵ بەعس گرژی تی کەوت و، سەرەنجام گەیشتەوە شەر.

*

بەعس هێشتا بەشێکی گەورەی هێزەکانی لە ئوردون بو، هێشتا خۆی جێگیر نەکرد بو، نەیئەتوانی، یا نەیئەویست هێزەکانی خۆی بە شەری کوردستانەوە خەریک بکا، خۆی تەماشای ئەکرد و، یارمەتی جەلالیی ئەدا بۆ شەری بارزانی. شەری کورد و کورد گەیشت بوە ئەوپەری توندوتیژی.

هێزەکانی مەلا مستەفا لە زۆر جێگا شکان و راونران. یارمەتی ئێران بۆ بارزانی لەم قۆناغەدا زۆر زیادی کرد، تەنانەت گەیشتە ئەوەی هێزەکانی خۆی بە جلی پێشمەرگەوە ئەنارد بۆ مەیدانەکانی شەر. لە گەڵ ئەوەیش دا هەر لە کشانەوەدا بو، هەندی لە هاوکارە نزیکەکانی بارزانی پێشنیاریان کرد بو ماڵ و پارەگاکەی بگوێزێتەوە دیوی ئێران. مەلا مستەفا قوبولی نەکرد بو. تەنیا یەک شت مەلا مستەفای لەم چورتمە رزگار ئەکرد ئەویش راگرتنی شەر و گفتوگۆ و رێککەوتن بو لە گەڵ بەعس.

*

پاسکی م س چارەنوسی خۆی بە بەعسەوە بەست بو، خۆی بە هاوپەیمانی ژیان و مردنی بەعس دائەنا. بەعس لە ململانێی ئەم دو هێزەدا، بە چەک و پارە و هێز، یارمەتی م س ی ئەدا. هەندی پایەی بەڕێوەبەرایەتی بە ئەندامەکانی ئەمان سپارد بو. رێگەی داپون لە بەغداد رۆژنامەی «النور» بە عەرەبی دەربکەن. لە شارەکانی کوردستان دا بنکە و پارەگایان دامەزراند بو، لە هەندی شوێن ئەمانیش لە پاڵ دەزگاکانی حکومەت دا حوکمرانییان ئەکرد. جۆری لە ازدواجیەتی سلطە دروست بوبو. لە بواری مافەکانی کوردا هەندی هەنگاوی نا بو، وەکو: دروستکردنی محافظەی دهۆک لە قەزاکانی دهۆک، زاخۆ، ئامێدی، شێخان. دامەزراندنی زانکۆی سلێمانی و کۆڕی زانیاری کورد و، یەکێتی نوسەرانی کورد. کردنی نەورۆز بە جەژنی رەسمیی. دەرکردنی مانگنامەی بەیان و، حەفتەنامەی هاوکاری.. بەلام ئەم بڕیارانە، کە زۆرتر لایەنی بەڕێوەبەرایەتی و رۆشنبیرییان هەبو، بەس نەبون بۆ رازی کردنی گەلی کورد و چارەسەرکردنی کێشەکەی، کە پێویستی بە چارەسەری سیاسی بو. سەرەرای ئەو هەمو دڵسۆزییەی پاسکی م س بۆ رژێمی تازە لە خۆیان نیشان دابو، بەعس هیچ دەسکەوتێکی سیاسی وای نەدانی، لە بەردەمی گەلی کوردا سەربەرز و قسەیان سوار بێ.

*

## گۆڤاری رزگاری

«مجلس قیادە الثورە» موافەقەتی کرد لە سەر دەرکردنی هەفتەنامەی «رزگاری». ناوەکەی مامجەلال خۆی بژارد بو. من خاوەنی ئیمتیاز و شازاد صائیب سەرنوسەری بو. ئەوسا عەبدوللا سەللوم سامەرائی وەزیری ئیعلام و حەسەن عەلەوی مدیر الصحافە بو.

لەو کاتەدا هیچ گۆڤار یا رۆژنامەیەک لە عێراق دا بە کوردی دەرنەئەچو.

ئەوسا ئەوانەی «رزگاری» مان دەرئەکرد و، لە رزگاری کۆ بوبونەوە، مەبەستێکی دیاریکراومان هەبو. ئەمان ویست «تیار» یکی تازە لە جوڵانەوەی نەتەوەیی کوردستانی

عیراق دا دابهینین جیاواز بی له ریبازی هەردو بالی: جەلالی و مەلایی پارتی و، هەردو بالی قیادەی مەرکەزی و لوجنەی مەرکەزی حیزبی شیوعی. له کارەکەمان دا سەرکەوتو بوین: بیری دامەزراندنی «کۆمەله» مان گەلاله کرد و زەمینەمان بۆ خۆش کرد.

هیچ کەس له ئیمه کادری پیشەیی و موچەخۆری مەکتەبی سیاسی نەبو. مەکتەبی سیاسی نه بۆ ژیانی خۆمان و نه بۆ چاپ و بلاوکردنەوەی رزگاری هیچ یارمەتیەکی ماددییان نەداین. بۆ ژیانی خۆمان و ژیانی گۆڤارەکه پشتمان به خۆمان بەست بو.

چاپخانەی «ژین» ی یادگاری پیرەمیردمان به هەمو دەزگا و کەرەستە کۆنەکانیەوە کریبوەوە، تەنانەت ژمارەی تەلەفۆنەکەیشی کە ژمارە ۱ ی سلیمانی بو. له بەغدادیش دەزگایەکی ئینتەرتایپ مان کری، ئەوسا تازەترین دەزگای دارشتنی رستەی نوسین بو. پارەی کرینی هەمو ئەمانه خۆمان پەیدامان کرد. م س فلسیکی نەدا، بەلام چونکه له ئیمه دلنیا نەبون مولکیەتی رەسمیی چاپخانەکەیان خستە سەر ناوی کاک عومەر مستەفا.

ژمارەیەکی زۆر نوسەری گەنجی لی کۆ بویوەوە، ژمارەیەکیش له نوسەرە ناسراوەکان وتاریان بۆ ئەنوسی، لەوانه: ئیبراهیم ئەحمەد، به زنجیرە «ژانی گەل» و، زەبیحی، هەندی وتار لەوانه: «سوسیالیزم به زمانی سادە» و، شاکیر فەتاح، به زنجیرە چەند بەشیکی له کتیبی یەزیدیەکان بلاو کردەوە. محەممەد مستەفا کوردی، به زنجیرە شیعریکی سالمی لیک دایەوە. ئەحمەد خواجە، هەندی وردە بابەتی بۆ نوسین. محەممەد سالح دیلان، وتاریکی له سەر نیزامی گەنجەوی و، چەند شیعریک و، جەمال شارباژیری، چەند شیعریکی بۆ ناردین.

جگه لەوان ئیمەیش خۆمان بنەمالەی گۆڤارەکه چەندین وتارمان بۆ ئەنوسی.

من به ناوی خۆمەوە و، به ناوی خواستراوەوە زورم باس و بابەت ئەنوسی. یەکی لەو وتارانه: «هەژاری موکریانی شایەری دەرباری بارزانی» بو، که لیکۆلینەوەیەک بو له سەر چاپی یەکەمی دیوانی: «بۆ کوردستان» ی هەژار. هەژار بەم وتارە زۆر نارەحەت بو، وای زانی بو ئیبراهیم ئەحمەد نوسیویتی. له سەر ئەوە چەند شیعریکی «هەجو» ی بۆ داناوە، له سەر پیشەی خۆی شیعرەکانی هەموی جنیوی سوک و قسەی ناشیرینه.

ئیمه لەوانه بوین له سیاسەتی سەرکردایەتی پارتی رازی نەبوین، به تایبەتی شەر له گەل بارزانی و هاوکاریبیان له گەل بەعس، حیزبەکه فەسادی تی کەوت بو، زۆری سەرکردەکانمان به دل نەبو، خۆمان له ناو خۆمان دا جۆری له (تکتل) مان دروست کرد بو. ئەمانویست به ریگای ئوسولی ریکخراوەیی ریبازی حیزبەکه راست بکەینەوە و، سەرکردایەتیەکەی بگۆرین. لەو هەلبژاردنەدا که له کۆنفرەنسە ناوچەییەکان دا کرا، بۆ هەلبژاردنی ئەندامانی لیژنەی ناوچە و، نوینەرانی کۆنگرەی حیزب، ژمارەیەکی زۆریان لەوانه بون، که له تکتل یا تیارەکەی ئیمه بون. م س گومانی لی ئەکردین بەلام هیچ بەلگەیەکیان به دەستەوە نەبو. ئەنجامی هەلبژاردنەکانیان به دل نەبو. به بیانوی جۆراوجۆرەوە کۆنگرەیان دواخست و نەیان هیشت بەستری تا ریککەوتنی ئازاری به سەردا هات.

*

سەرکردایەتی بەعس له ناو خۆیان دا له ململانی ی دەسەلات دا بون. له سەر جۆری رەفتار کردن له گەل جولانەوەی کورد ناکۆک بون. صەددام حسین، تازە خەریک بو له ناو بەعس دا جیگه به هاوریکانی لیژ بکا و دەسەلات بگریتە دەس. ئەیویست کارتی

کورد بۆ بە هێزکردنی شوێنی خۆی بەکار بهێنێ.

بەعس مۆتەمەری بەست. یەکێ لە باسەکانی مۆتەمەر کورد و، جۆری چارەسەرکردنی کێشەکەی بو. داوایان لە پاسکی م س کرد بو پرۆژەیەکیان بە نوسراوی بۆ ئامادە بکا لە سەر بۆچونی خۆیان دەربارەی چارەسەری کێشەی کورد.

لەم پرۆژەیەدا نوسی بوبان چاری بنەرەتی کێشەی کورد بەوە ئەکری دان بە مافی نەتەوەیی کوردا بنێن لە سەر بنچینەی ئازادی بریاردانی چارەنوس، کە لە قۆناغی ئێستادا کورد بە شێوەی ئۆتۆنۆمی بەکاری ئەهێنی.

یەکێ لە بەعسیەکان کە پرۆژەکەی دی بو، وت بوی: «ئەمانە بە چەک و پارە و ئازوقەی ئێمە شەر ئەکەن داوای مافی چارەنوس ئەکەن. ئەگەر سەرچاوەیەکی تری پارمەتیدانیان هەبوایە، ئەبو داوای چیبان بکردایە!»

لەو ماوەیەدا:

- پاسکی جەلالی نەیتوانی بە شەر کێشەکە لە گەڵ سەرکردایەتی بارزانی یەکلایی بکاتەوە، هێزەکانی بارزانی لە مەیدان دا مانەوە و، بەرەنگاری سەختیان کرد.

- ئێران بە ئاشکرا هاتە ناو شەرەکەوە بۆ یارمەتی دانی بارزانی و، سنورەکانی بۆ کردەوە و هێزی دایە و، عیراق توانای روبەروبونەوەی راستەوخۆی ئێرانی نەبو.

- صەددام ئەیویست کارتی کوردی لە دەس ئێران دەربهێنی و، لە ململانێی دەسەلاتی ناو پالە جیاوازەکانی خۆیان و، نێوان بەعس و نەیارەکانی دا بە کاری بهێنی.

مۆتەمەری بەعس بریاری گفتوگۆی دا لە گەڵ سەرکردایەتی بارزانی و، دوای ئەوە بە ماوەیەکی کورت کەوتنە پیوەندی و ئالوگۆری نوێنەر و نێردراو.

*

بەعس بۆ ئەوەی زەمینەی ریککەوتن لە گەڵ مەلا مستەفا خۆش بکات، لە حەوتەمین مۆتەمەری قوطری دا بریاری لی دا و، لە گۆڤاری «الشورە العربیە» ی دا وتاریکیان نوسی بو، هێزە کوردیەکانیان هەلسەنگاند بو، باسی جەلالیبان کرد بو کە لە گەڵ هەمو حکومەتەکان دا هاوکاریان کردوە، باسی بارزانیشیان کرد بو کە هێزی سەرەکیە لە بزوتنەوەی کوردا و، بیانویان بۆ پەیوەندییەکانی لە گەڵ ئێران و ئیسرائیل دۆزی بوەوە. لە رۆژنامەی «الثورە» ی ئۆرگانی بەعس دا سەروتاریکیان بە ناونیشانی: «کیف السبیل الی حل المشکلە الکردیە» دا بلاو کردەوە. ژیر بە ژیریش لە گەڵ مەلا مستەفا کەوتنە پیوەندی و هاتوچۆ.

*

یەکیتی سۆڤیت ئەیویست دەسەلاتی بەعس و بزوتنەوەی کورد و حشع بگەیەنیتە یەک، قورسایی خۆی خستبوە سەر بارزانی. لە کوتایی ۱۹٦۹ و سەرەتای ۱۹۷۰ دا دانوسەندن لە بەینی سەرکردایەتی بەعس و سەرکردایەتی بارزانی دا لە ناوپردانەوە دەستی پی کرد و، گفتوگو برایە بەغداد. دوای هەمو کوبونەوەیەکی گرنگ سەفیری سۆڤیتی ئەندامانی هەردو نوینەرایەتی ئەدی، هەولی ئەدا بیرو بوچونەکانیان لە یەک نزیک بخاتەوە، چارە بو ناکوکیەکان بدوزیتەوە، تەنانەت کاتی کە نوینەرایەتی کورد پیی داگرت لەسەر بەشداربونی نوینەری حشع لە گفتوگودا وە نوینەرایەتی بەعسی ئەمەی رەت کردەوە بە بیانوی ئەوەی حشع حیزبیکی کوردی نیە و حیزبیکی عیراقیە، کاربەدەستانی سۆڤیتی

داوایان له نوێنەرایەتی کورد کرد دەس لەو خواستە هەلبگرن بو ئەوەی نەبیتە کوسپی بو پیشەوە چونی رەوتی دانوستندن.

*

بارزانی پێویستی بە پشوودانی بو بو ئەوەی نەیارەکانی، کە بوبون بە هێزێکی سیاسی و چەکداری گەورە، پاکتاو بکا. ئەمجارەیش لە گفتوگۆدا لە گەل حکومەت چەک کردنی جاشەکانی ٦٦ (!) کەوت بوە پیش سەلماندنی مافەکانی کوردەوە.

دەستەی نوێنەرایەتی بەعس و سەرکردایەتی بارزانی لە بەغداد چەندین کۆبونەوەیان کرد، بو دیاریکردنی مافەکانی کورد لە سەر بنچینەی حوکمی زاتی و، کە رەوتی دانوستان تەگەرەی تی کەوت، صەددام خۆی چو بو سەردانی مەلا مستەفا و، بەوجۆرەی ئەو داوای کرد، داواکانی قوبول و، ئیمزایان کرد.

بەعس هەمو ئەمەی لە پشتی باسکی م س دوە ئەکرد، بگرە بو تەفرەدان و چاوبەستەکی ئەمان، هەمیشە بۆیان دوبارە ئەکردنەوە کە ئەوان هەرگیز دەس لە دۆستەکانیان هەلناگرن و ئەیانوت: «واحنه ما نفرط باصدقائنا وحلفائنا». لە کاتیک دا خەریک بون ئەگەیشتنە یەک تەعلیماتیکان نوسی بو بو جەیش کە گفتوگۆ لە گەل بارزانی سەرنەکەوتوە، خۆیان بو شەر کۆ بکەنەوە. لە هەمان کات دا لە تەلەفزیونی بەغدادەوە کاریکاتیری مەلا مستەفایان بە «رداء العمالة» وە بلاو ئەکردەوە. لە پر دەزگاکانی راگەیاندنی عیراق هەوالی ریککەوتنی بەعس - بارزانییان بلاو کردەوە و، بەیانی ئازاریان خۆیندەوە. مەلا مستەفایان وەکو پیشەوای جولانەوەی کورد و، حیزبەکەیان وەکو هاوپەیمانی خۆیان ناسی و، مافی نەتەوەیی کوردیان لە سەر بنچینەی ئۆتۆنۆمی سەلماند. لەو کۆنگرە رۆژنامەوانییەدا کە بەکر بەستی، لە وەلامی پرسیاریک دا سەبارەت بە چارەنوسی جەماعەتی م س، بەکر وتی: «هەمو هیزە غەیرە ئیزامییەکان هەلئەوشینرینەوە».

ئەمە سەرکەوتنیکی گەورە بو بو مەلا مستەفا، بەلام خیانەتیکی ئاشکرا و غەدریکی گەورە بو لە مامجەلال و حیزبەکەی. ئەمە دوەم جار بو لە پشتەوە خەنجەری غەدری لی بدەن جاری یەکەم: سالی ١٩٦٣ و جاری دوەم: سالی ١٩٧٠. ئەمە کاریکی لە مامجەلال کرد تا هەتایە باوەری بە صەددام حسین و حیزبی بەعس نەمینی و، هەرگیز لییان ئەمین نەبی.

*

کاربەدەستانی عیراق لە بەیانی ئازاری ٧٠ دا مافی نەتەوەیی کوردیان لەسەر بنچینەی ئوتونومی سەلماند. پ د ک لە عیراق گرنگیەکی گەورەی پەیدا کرد و، بە ئاشکرا کەوتە چالاکی، رۆژنامەی «النور» داخراو لە جاتی ئەو «التاخی» کەوتەوە دەرچون، ٥ کورد خرانە وەزارەتەوە و چەن کوردی تر کرانە وەکیلی وەزارەت، چەندین فەرمانبەری گەورە لە ئەندامانی پارتی دانرا لەوانە ٣ محافظی سلیمانی، هەولیر، دهوک. هەروەها ٦ فەوجی «حەرەس حدود» لە پیشمەرگە پیک هینرا. چەندین قوتابی کورد لە کوللیەکانی عەسکەری و شورطە وەرگیران. چەند کەسیک بە سەفیر دانران.

یەکیتی سۆڤیت و هەمو حیزبە کومونیستیەکانی دنیا ئەم هەوالەیان بە خوشیەوە وەرگرت و، هەندیکیان بروسکە یا نامەی پیروزبایییان بو ناردن. سەروکی دەستەی

سەروکایەتی ئەنجومەنی بەرزی سۆڤیەت نیکولای پودگورنی و سەروکی ئەنجومەنی وەزیرانی یەکیتی سۆڤیتی ئەلیکسی کوسیجین لە بروسکەیەک دا کە روژی ١٧ ی ئازاری ١٩٧٠ بو سەرکوماری عیراق یەکریان نارد بو نوسی بویان: «نحن واثقون من ان تنفیذ هذه الاتفاقیه الهامه سیساعد علی تعزیز الوحده الوطنیه والصداقه بین شعبی الجمهوریه العراقیه الشقیقین - العرب والأکراد، علی نجاح تحقیق التحولات الاقتصادیه - الاجتماعیه فی البلاد لصالح الشعب العراقی بأسره ورفع مستوی حیاته ورفاههم»

بەیانی ئازاری ١٩٧٠ تین و تەوژمێکی زوری دا بە بزوتنەوەی کورد لە سەرانسەری کوردستان دا. پاش ئینقیلابی تورکیا(١٩٧١) ژمارەیەکی زور تیکوشەری کوردی تورکیا پەرەوازە بون، یەکیتی سۆڤیت دالدەی نەدان لەبەر ئەوە لە ولاتانی ئەوروپای خورئاوا بونە پەنابەر. یەکیتی سۆڤیت پەیوەندی لەگەڵ پارتی بەهیز کردبو، بەردەوام نوینەرایەتی پ د ک و بارزانییان ئەدی و بانگیان ئەکردن بو کونگرەی پارتیە کومونیستەکان، «زماله» یان ئەدا بە خویندکارەکانیان، سەردانی بارەگای بارزانیان ئەکرد، دەزگاکانی راگەیاندنی سۆڤیتی لە سەر تەجروبەی نوی ی عیراق ئەیانئوسی.

پەیوەندی ئابوری و بازرگانی و روشنبیری لە نیوان عیراق و ولاتانی سوسیالیستی دا لە ژیر سایەی دەسەلاتی بەعس دا لە جاران زیاتر گەشەی کرد. ریکەوتنیک بو هاوکاری راوە ماسی (کانونی دوەمی ١٩٦٩)، ریکەوتنیک بو هاوکاری ئابوری و تەکنیکی (تەموزی ١٩٦٩) بو یارمەتیدانی کومپانیای نیشتیمانی نەوت بو دەرهینانی نەوت و گازی رومەیلە و راکیشانی لولەیەک لە شوینی دەرهیناتیەوە بو سەر میناى فاو، وە چاکردنی میناى فاو بو پیشوازی نەوتکیشی گەورە، پروتوکولیک بو هاوکاری لە بەکارهینانی ئەتوم بو مەبەستی ئاشتیخوازانە، ریکەوتنیک بو هاوکاری لە رادیو و تەلەفزیون (١٩٦٩)، لە نیسانی ١٩٧٠ دا ریکەوتنیکی عیراقی - سوڤیتی نوی ئیمزا کرا بو بو هاوکاری ئابوری و تەکنیکی. ئەو قەرزانەی یەکیتی سۆڤیت دابوی بە عیراق تا نیسانی ١٩٧١ گەیشتە ٤٢٤٫٣ ملیون روبل. هەروەها پەیوەندی بازرگانی عیراق لە گەڵ ئەلمانیای دیموکراتی، پولونیا و ولاتانی تری ئەوروپای روژهەلات پەرەی سەند.

*

بەیانی ئازار دانی بە مافی نەتەوەیی کوردا نا بو، بەلام چەند کەموکوریی بنەرەتی تی دا بو:

زور لە میژ بو پارتی ئوتونومی بو کوردستان و دیموکراسی بو عیراقی کرد بو بە دروشمی سەرەکی خوی. لەم گفتوگویانەدا وەفدی کوردی لە هەردو مەسەلەدا: ئوتونومی و دیموکراسی دا بازی بە سەر چەند سەرەتایەکی بنەرەتی دا دابو.

لە باسی دیموکراسی دا بەعسیەکان بە راشکاوی وت بویان: «ئیمە حیزبیکی شورشگیرین بە شورش هاتوینەتە حوکم. باوەرمان بە دیموکراسی روژئاوایی و دیموکراسی لیبرالی نیە. هەلبژاردنی گشتی واتە تەسلیم کردنی حوکم بە کونەپەرستەکان» وەفدی کوردی بو ئەوەی گفتوگوکەیان لە سەر ئەوە نەپچری وازی لە باسی دیموکراسی و هەلبژاردنی گشتی و ژیانی پارلەمانی هینا بو. بو پاساودانی ئەمەش وت بویان ئیمەش حیزبیکی شورشگیرین باوەرمان بە دیموکراسی لیبرالی نیە.

لە باسی ئوتونومی دا بەعس دانی نابو بە مافی کوردا لە سەر بنچینەی ئوتونومی

بەڵام مەسەلە گرنگەکانی هەلگیرا بون بۆ سالاتی دوایی، لەو گفتوگۆیەدا باسی قانونی ئۆتۆنۆمی و ناوچەی ئۆتۆنۆمی نەکرا بو. دەسەلاتەکانی حکومەتی ئۆتۆنۆم لە کوردستان دا چیە و دەسەلاتەکانی حکومەتی ناوەندی لە ناوچەی ئۆتۆنۆم دا کامانەن؟ کوردستانی عیراق کوێ یە و لە کوێ دا تەواو ئەبێ. دیاریکردنی ناوچەی ئۆتۆنۆم دانرا بۆ یەکەوتە دوای سەرژمێری گشتی تا بەو پێ بە زۆرایەتی هەر جێگایەک کورد بو بخرێتە ناوی. دیاری کردنی چارەنوسی ناوچەکانی کەرکوک، خانەقین، سنجار و زۆر شوێنی تر هەلگیرا بون بۆ دوای دەرکەوتنی ئەنجامی سەرژمێرەکە. کێشەی فەیلیەکان (کە بەعس بە ئێرانی دائەنان) و کێشەی یەزیدیەکان (کە بەعس بە عەرەبی دائەنان) بە چارەسەرنەکراوی هێلرا بوەوە.

مەلا مستەفا لەو کاتەدا تەنگاو بو. پێویستی بە پشودان هەبو. دیموکراسی و ئۆتۆنۆمی و شتی لەو بابەتانە لەو کاتەدا ئەوەیان نەئەهێنا شەڕیان لە سەر بکات، بە تایبەتی چونکە ریککەوتنەکە دوژمنەکانی ئەوی تەواو ئەکرد و، دەسکەوتی زۆری بۆ دابین ئەکرد.

*

## کۆنگرەی هەشتەم

کۆنگرەی هەشتەمی پارتی لە تەموزی ۱۹۷۰ دا بەسترا.

ئەم کۆنگرەیەش وەکو کۆنگرەکانی تر قەرەبالغ و، جۆری لە خۆپیشاندانی سیاسی بو بۆ تازە کردنەوەی گوێرایەلی کوێرانە بۆ سەرۆک. هەلومەرجی سیاسی ئەم کۆنگرەیە لە چاو هەمو کۆنگرەکانی کەدا جیاواز بو. سەرکردایەتی بارزانی و سەرانی پارتی بە هۆی بەیانی ئازار و، پشتیوانی فراوانی ناوەوە و دەرەوە، هەستیان بە سەرکەوتنێکی گەورە ئەکرد و، لە خۆیان بایی بوبون.

نوێنەری زۆر لە حیزبە نەیارەکانی بەعس، لەوانە حشع، بانگ کرا بون، ئەوانە کۆنگرەکەیان کرد بە دوانگە دژی بەعس.

پارتی بۆ ئەوەی پیشانی بەعسی بدا کە هێشتا پشتیوانی ئێرانی ماوە، کامەران بەدرخان کە لە بەغداد پێشوازی رەسمیی لی کرابو و، وەکو میوانێکی بەرێز رەوانەی لای مەلا مستەفا کرا بو، بی ئەوەی سەری بەغداد بداتەوە لە رێگای تارانەوە گەرایەوە ئەوروپا.

ئەم کۆنگرەیە بی باوەری لە نێوان بەعس - بارزانی دا قولتر کرد.

بۆ کۆمیتەی ناوەندی هەندی ئەندامی تازە دانران. کورانی مەلا مستەفا: ئیدریس و مەسعود، بون بە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی و، دارا توفیق کە هەتا چەند رۆژی پێش کۆنگرە ئەندامی پارتی نەبو، لە سەر داوای مەلا مستەفا ئەویش کرا بە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی، چونکە بە جاسوسی سۆڤیەتی ئەزانی، سەرەرای چەند کەسی لە فەرماندەکانی پێشمەرگە کە هەندێکیان نەخوێندەوار بون.

*

بەعس داوایان لە مەلا مستەفا کرد یەکی لە کورەکانی بنێری بۆ بەغداد ببی بە جێگری سەرکۆمار. بۆ ئەم مەبەستە عەزیز شەریفیان نارده لای. مەلا مستەفا بۆ ئەوەی رەتی بکاتەوە وت بوی: «ئەم شەو خودانی بارزان هاتە خەوم وتی نابی هیچ بارزانیەک کاروباری حکومەت وەربگری!» پاش پی داگرتنێکی زۆری حکومەت، پێشنیاری حەبیب محەمەدی کرد. بەعس رەفزی کرد چونکە حەبیب بە رەچەلەک ئێرانی بو. مەلا مستەفا

ئەمەی ئەزانی، بە ئەنقەست ئەوی پێشنیار کرد بو، بۆ ئەوەی رەفزی بکەن.
بەعس جارێکی تر فوئاد عارفی نارد بۆ لای بۆ ئەوەی یەکێکی کە داینی. فوئاد عارف زۆری بۆ وت بو کە دانانی جێگری سەرکۆمار چەند گرنگە. مەلا مستەفا پی ی وت بو: «کەواتە خۆت بیکە! لە تۆ باشترمان دەس ناکەوی».
هەمو رێککەوتنێکی راستەقینە لە گەڵ هەر حکومەتێکی عێراق بوایە، لە ئەنجام دا ئەبو مەلا مستەفا پەیوەندی لە گەڵ دەوڵەتانی دەرەوە بپری و، لەشکرەکەی بڵاوە پی بکا.یا بیخاتە بەر فەرمانی دەزگایەکی حکومەتەوە و، پارە لە هیچ لایەک وەرنەگری و، زیندانی نەبی و هیچ کەس نەگری و نەکوژی و، خۆیشی وەکو هەمو هاوڵاتیەک لە جێگایەک دا دابنیشی.. ئەمانەش لە گەڵ تێگەیشتن و بیرکردنەوە و قازانجی مەلا مستەفا نەئەگونجان. مەلا مستەفا خۆی بە بەرزتر دائەنا لە دەوڵەت و داوودەزگا قانونیەکانی. لە بەر ئەوە لە گەڵ هیچ حکومەتێک، بە راستیی، رێک نەئەکەوت و، هەوڵی ئەدا باروزخی ناتاسایی بەو جۆرەی خۆی ئەیویست بمێنیتەوە.

*

## ئیستیعاب یان تێکەڵاوبونەوە؟

رێککەوتنی ئازاری بەعس - بارزانی سەرکەوتنێکی گەورە بو بۆ بارزانی و بۆ کورد، بەڵام تێشکانێکی سیاسی کوشندە بو بۆ جەلالی. وورەی هێزەکانی دابەزی و لە بەر یەک هەڵوەشا، رێکخراوە سیاسیەکانی مابو ئەویش کەوت بوە ژێر گوشاری مەلایی و خەڵک.
مەلا مستەفا لە بەعس ئەمین نەبو، هەر لە سەرەتاوە بۆ مەبەستی تاکتیکی لە گەڵی پێک هات بو، یەکی لە مەبەستەکانی لە ناوبردنی جەلالی بو، کە ئەترسا لە هەر روبەروبونەوەیەکی تازەدا لە گەڵ بەعس، دیسان ئەمان ببنەوە لایەن. فاخیر میرگەسوری لە سلیمانی پەیوەندی لە گەڵ چەند کەسێکی جەلالی کرد بو، ئارەزوی پێشان دابو بۆ ئاشتبونەوە و یەکگرتنەوە. ئەم پەیوەندیە گەشەی کرد و، گەیشتە ئەوەی مام جەلال خۆی سەردانی مەلا مستەفای کرد.
ئەمان ئەیانویست قەوارەی حیزبەکەیان بپارێزن، ناوەکەی بگۆڕن و لە گەڵ پارتی دۆست و هاوکار بن و، سەرکردایەتی حیزبەکەیان لای مەلا جێگیر بی و، سەرۆکایەتی بارزانی قەبوڵ بکەن. بەڵام بارزانی قەبوڵی نەئەکرد ئەمان وەکو حیزبێکی جیاواز و سەربەخۆ بمێنن، چونکە گومانی ئەکرد جارێکی تریش لی ی هەڵبگەڕێنەوە. لە بەر ئەوە تەنیا یەک رێگەی بو دانان ئەویش تێکەڵاو بونەوە بو بە پارتی.

*

ئەم بیروڕایانە لە ناو ریزەکانی جەلالی دا باس ئەکرا. دو رەئی هەبو: یەکێکیان، لای وابو کە هەوڵی ئاشتبونەوە بدری لە گەڵ بارزانی، بەڵام پارێزگاری سەربەخۆیی حیزبەکە بکری. ئەوی تریان، لای وابو کە هەردو حیزب لە روی بیروباوەر و پێکهاتنی چینایەتی و ریبازی سیاسیەوە لە گەڵ یەک جیاواز نین و، مانەوەی حیزبەکە لە داروژدا ئەبیتەوە بە هۆی شەری ناوخۆ و، پاڵدانەوە بە حکومەتەوە، لە بەر ئەوە هەڵوەشاندنەوەی حیزبەکە و تێکەڵاو بونەوەی بە چاک ئەزانی.
ئەوانەی رەئی دوەمیان هەبو، بە زۆری لەوانە بون کە بە تەمای دامەزراندنی کۆمەڵە

بون، جگە لەوەیش ئەوانە لایان وابو تا ئەم حیزبە بۆشاییەکی سیاسی بە جی نەهێلی، بواری گشە کردنی ڕیکخراوێکی تازە نابی.

*

ئەو کونگرەیەی کە پیش ۱۱ ی ئازاری ۷۰ بە سالێک ئەبو ببەستری و، نەبەسترا بو، ئەمجارە ئەبو کۆ ببیتەوە بۆ لیدوانی چارەنوسی حیزبەکە، چونکە ئیتر گورینی سەرکردایەتی و ڕاستکردنەوەی ڕیبازی سیاسی، هیچ بایەخیکی نەمابو.

کۆنگرە بەسترا، ئەندامەکانی ئەوانە بون کە لە کۆنفرەنسە ناوچەییەکان دا پیش ۱۱ ئازار هەلبژیردرا بون. زۆربان لە نارازییەکانی ناو حیزب و، لایەنگرانی (تیار) ەکەی ئیمە بون. ئیمەیش پیشتر هەمو قسەمان کرد بو بە یەک، کە لە نرخی ئاشتبونەوەدا لە گەل مەلا مستەفا ئەم حیزبە هەلوەشینینەوە و تیکەلاوی حیزبەکەی ئەوی بکەینەوە. کۆنگرە بە زۆرایەتیەکی دیار بریاری: گورینی ناوی حیزبەکە و، هەلوەشاندنەوەی و یەکگرتنەوەی دا لە گەل حیزبەکەی بارزانی.

سەرکردایەتی بارزانی بەلینی دابو بە سەرکردایەتی جەلالی کە سیبەکی ئەندامانی لق و ناوچەکان لە کادرەکانی ئەمان دابنری و، لە هەلیکی نزیک دا کۆنگرەی نۆهەمی پارتی ببەستری و، ئەندامانی سەرکردایەتی کاریان پی بسپیردری. بەلام نە کۆنگرەی نۆهەم بەسترا و، نە ئەندامانی کومیتەی ناوەندی کاریان پی سپیردرا، بەلکو بۆ بی نرخکردنی ئەو هەنگاوە گرنگە، سەرکردایەتی بارزانی ناوی لەم تیکەلاو بونەوەیە نا: «ئیستیعاب». لە زۆر جیگاش لە لیژنەی ناوچە و لقەکان دا جیگەیان نەکردنەوە.

*

یەکی لە مەرجەکانی مەلا مستەفا ئەوە بو، کە ئیبراهیم ئەحمەد و هەندیکی تر لە سەرکردەکانیان لای ئەو جیگیر بن. مانگی شوباتی ۱۹۷۱ ئیبراهیم ئەحمەد، مامجەلال، عومەر مستەفا، عەلی عەسکەری، بە ڕی کەوتن بۆ بارەگای بارزانی. ئەمانە چەند کەسیکی کەیشیان، لەوانەی ئاوانبار بون لای سەرکردایەتی بارزانی، لە گەل خۆیان برد بۆ ئەوی، لەوانە حامید قادر، حەمەی فەرەج، مام طەها خۆشناو، قادر کۆکۆیی، کەمال مەولود.. منیش کە فەرمانی گرتن و حوکمی «محکمە الثورە» ی عیراقم بە دواوە بو لە گەل ئەوان رویشتم. مال و خیزانەکەی مەلا مستەفا لە دیلمان و، شوینی کارکردنی رۆژانەی ئیدریس و مسعود لە قەسر و ماکۆسان بو. ئیمەشیان لە خانویەک دا لە قەسر و ماکۆسان دانا. تا چەند مانگی من لە گەل ئیبراهیم ئەحمەد لە ژوریک دا بوم.

بۆ یەکەم جار کە لە گەل عەلی عەسکەری چوم بو سەردانی ئیدریس. کاک عەلی منی پی ناساند، ئیدریس بە پیکەنینەوە وتی: «ئای چەند هەولمان دا ئیعدام بکری ی بەردەس نەکەوتی!» وتم: «وا بە پی ی خۆم هاتومەتە بەردەمتان»

لە رۆژانی ۱۱ ی ئازاردا شوکری حەدیثی موحافیظی سلیمانی بو. شوکری بەعسی بو، لە سەردەمی حکومەتی عارف دا گیرا بو، بەرگەی ئەشکەنجەی نەگرت بو، هاوریکانی خۆی بە گرت دابو، لە بەر ئەوە لە ناو بەعسیەکان دا بە چاوی سوک سەیریان ئەکرد و خۆیشی ئەوەی لی ببو بە «عقدە». یەکەم گەرای بەعسی لە سلیمانی دا ئەو دای نا و، هەندی کەسی کرد بە بەعسی. ئیمە بە توندی دژی ئەم هەنگاوەی راوەستاین. من ریزم نەئەگرت و نەمئەتوانی لە گەلی ئەبو و، ئەویش حەزی لە چارەی من نەئەکرد و، قینی لە

من بو.

ئەو رۆژەی بەیانی ۱۱ ی ئازار خوێندرایەوە من بۆ ئیشوکاری گۆڤارەکەمان لە بەغداد بوم. پاش ئەوە بە چەند رۆژێ گەرامەوە سلێمانی. لەو ماوەیەدا نارنجۆکێک خرا بوە حەوشی سانەوی کچانی سلێمانیەوە.

لە سەر ئەوە حکومەت کوریکی گرت بو بە ناوی: جەمال ئەحمەد و، فەرمانی گرتنی چەند کەسێکیان دەرکرد بو، یەکێکیان من بوم. جەمال و ئەوانەی فەرمانی گرتنیان بۆ دەرچو بو حەرەسی بارەگای گۆڤاری «رزگاری» بون.

روداوەکە بەم جۆرە بوبو: مالی جەمال بە تەنیشت سانەوی کچانەوە بو. جەمال لەو ئالوگۆرانەی بە هۆی ئازارەوە بوبو، زۆر نارەحەت ئەبی، لە گەل چەند هاورێیەکی دا بۆ سەر گەرم کردن لە داخ و خەفەت دا ئەچن بۆ خواردنەوە. بە سەرخۆشی ئەرواتەوە بۆ مالی خۆیان. لە رێگا توشی تاقمی پولیس ئەبی کە لە بەردەمی سانەوی کچان دا بۆ میبازی راوەستا بون. پولیسەکان مفوض یکیان لە گەل ئەبی بە ناوی جەمال چاوشین برازای بەکری حاجی فەرەج بو، بەکر لیپرسراوی پێشمەرگەکانی پارتی بو لە سلێمانی، کابرایەکی هەلپەرست و خۆ بەرەپێشەوەی سەر بە پارتی بو. جەمال چاوشین و پۆلیسەکان، جەمال ئەحمەد ئەناسن، بۆ ئەوەی سوکایەتی پی بکەن، بانگی ئەکەن بێتە پێشەوە. جەمال ئەحمەد ئەترسی ئازاری بدەن و دەستدرێژی بۆ بکەن. بۆ دیفاع لە خۆی نارنجۆکێکیان لی رائەکێشی. پولیسەکان تی ی ئەوروکێن و نارنجۆکەکەی لە دەس دەرئەهێنن، بۆ ئەوەی بە خۆیان دا نەتەقیتەوە هەلی ئەدەنە ئەو دیو دیوارەکە، کە حەوشی سانەوی کچان بو. کەسی نەکوشت و کەسی بریندار نەکرد بو.

*

هەمان تاقم پۆلیس پێش ئەم بەزمە چوبونە سەر «چاپخانەی ژین» کە گۆڤاری رزگای لی چاپ ئەکرا، هەندی دەزگایان شکاند بو و، هەرچی وردە و پردەیەکیان بەردەس کەوت بو برد بویان لە ناو ئەوانەدا: «کلیشە» ی ئەو رۆژنامانەی لە سەردەمی «پێشکەوتن» وە لەم چاپخانەیەدا چاپ کرا بون. کلیشەکان لە داری گوێز هەلکەنرا بون و، تا ئەوسا وەکو یادگاری چاپخانەکە هەلگیرا بون. هەروەها چوبونە بارەگای گۆڤارەکەش کتێبخانەکە و فایلەکانیان تالان کرد بو. سەدان کتێبی بە نرخ و وتاری دەستخەتی نوسەرانەکانیان برد بو.

*

پۆلیسەکان ئەم روداوەیان بە سەر جەمال ئەحمەدا هێنا. شوکری حەدیثی روداوەکەی قۆستەوە و زلتری کرد. بەعس ئەیویست ئەمە بکا بە موناسەبەتێک بۆ چاوشکاندنی جەلالی و، پارتی ئەیویست بیکا بە موناسەبەتێک بو تۆلە کردنەوە. هەردولایان ئەیانویست روداوەکە بە سەر من دا بهێنن. شوکری حەدیثی تۆلەی لیدانی بەعسیەکانی سلێمانی و پارتی تۆلەی وتارەکانی رزگاری لە من بکەنەوە.

ئەو زەمانە تێگەیشتم نرخی قسەکردن چەند گرانە. ئەم روداوە رەوتی ژیانی لە بنەرەتەوە تێک دام و، بو بە سەرەتای دەربەدەری هەتا هەتایم. لەو ساوە ئیتر نەمتوانی لە پرسەی هیچ خزمێکم و لە شایی هیچ یەکی لە کەسوکارم دا بەشدار بم و، نەمتوانی لە هیچ جەژن و خۆشیەک و، لە هیچ لیقەومان و ناخۆشیەک دا لە گەلیان بم.

جەمال گیرا و، فەرمانی گرتن بۆ ئەوانەیش دەرچو کە ئەو رۆژە لە گەل جەمال

خواردبویانەوە، فەرمانی گرتن بۆ منیش، بە تۆمەتی دروستکردنی «شەبکاتی تخریب» دەرچو. هەمو دراین بە «محکمە الثورە» لە بەغداد.

جەمال حوکمی ئیعدام درا و، هێنایانەوە لە بەر دەرکی سەرای سلێمانی لە سێدارەیان دا و، هاوڕیکانی ئەو و منیشیان بە «غیابی» بە ١٠ ساڵ زیندانی حوکم دا. من خۆمم نەدا بە دەستەوە، لە بەغداد خۆمم شاردەوە.

من لە ژیانی سیاسی و پێشمەرگەیی خۆم دا سەدان کار و کردەوەم دژی حکومەتی عیراق و داوودەزگا سەرکوتکەرەکانی و سەرکردایەتی بارزانی کردوە، لای هەندی بە کاری شۆرشگێرانە و، لای هەندی بە جاشایەتی و، لای حکومەت بە خیانەتی نیشتمانی دائەنرێ. لە بەر ئەوە پێویستم بە پاکانە نیە، بەڵام لە دور و لە نزیکەوە دەستی من لەم مەسەلەیەدا نەبو.

*

## ناکۆکی ناو بنەماڵەی بارزانی

ئەو ماوەیەی ئیمە لە قەسری بوین ناکۆکییەکانی ناو بنەماڵەی بارزانی تەقییەوە چەند روداویان لی قەوما:

- مەلا مستەفا ماوەیەک بو لە ناو کورەکانی دا ئیدریس و مەسعودی پێش خست بو، هەردوکیانی کرد بو بە ئەندامی م س و کاروباری بارەگای بارزانییان رائەپەراند. سەرەرای ئەوش مەسعودی دانا بو بە لێپرسراوی دەزگای پاراستن و ئیدریس بە هی مەکتەبی عەسکەری. عوبید و لوقمان کە بە تەمەن گەورەتر و، لە سەردەمی پاشایەتی دا «حەپس و تبعیدان» و لە سەردەمی شۆرشی ئەیلول دا شەر و ناخۆشییان دی بو، فەرامۆش کرا بون. عوبید دەس بە سەر بو لە گوندی وەلژی لە هەمان ناوچەی باڵەک. لەو ماوەیەدا عوبید هەلات و چوە ناو حکومەت.

ئەمش رەنگدانەوەی ناکۆکی ناو ژنەکانی بو. مەلا مستەفا ٣ ژنی هەبو. دوانیان بارزانی و یەکیکیان زیباری بو. لە ژنی یەکەمی: عوبید و لوقمان و صابیر و، لە ژنی دوەمی: ئیدریس و، لە ژنی سێیەمی، کە کچی مەحمود ئاغای زیباری بو: مەسعود، دلشاد، نیهاد، سیداد، وەجیهی هەبو. ئەم ژنەیان لە لای مەلا مستەفا لە هەمویان لە پێشتر بو. ناکۆکی ناو ژنەکانی کاری لە پاشەرۆژی کورەکانی کرد. لە بەر ئەوەی لە گەڵ ژنی یەکەمی ناریک بو، عوبید و لوقمان و صابیری پشت گوی خست و، لە بەر ئەوەی لە گەڵ ژنە زیبارییەکەی ریک بو، مەسعودی پێش خست.

- شیخ محەممەد خالید و شیخ عوسمان، کە هەردوکیان کوری شیخ ئەحمەد بون، لە ناو خۆیان دا لە سەر ئەوەی کامیان جیگای «خودان» بگریتەوە تیک چو بون. مەلا مستەفا پشتیوانی لە محەممەد خالید ئەکرد و دژی عوسمان بو. حکومەت ویستی دەس بخاتە ناو ئەم ناکۆکییەوە. کەوتنە لەشکرکیشی لە یەکتری. سەرەنجام محەممەد خالید زاڵ بو بە سەر عوسمان دا. عوسمان لێخرا بەڵام خۆی و کورەکانی دایانە پاڵ حکومەت.

- هەر لەو ماوەیەدا بارەگای بارزانی یەکی لە براکانی فاخیر میرگەسوری کوشت. ئەوانیش یەکیکیان لە سەر کوشتەوە. فاخیر گیرا و هەندی لە براکانی هەلاتن بۆ ناو حکومەت. دوای ماوەیەک فاخیر بەر درا. لە گەڵ مامجەلال چوین بۆ سەردانی پەشیمانییەکی زۆری دەربری لەو ناوێژییەی کرد بوی بۆ ئاشتکردنەوەی باسکی م س و مەلا

مستەفا. فاخیر ئەم ناکۆکیەی بە ناکۆکی بارزانی و زیباری لیک ئەدایەوە. لە قسەکانی دا وتی: «من چەند هەلەیەکم کردوە یەکیکیان ئەوە بو مەسعود داوای لی کردم لە گەلی بچم بۆ پیشوازی زوبیر ئاغای خالی و جاشە زیبارییەکان کە ئەیانویست بچن بو سەردانی مەلا مستەفا. من ئەچوم و لومەی مەسعودیشم کرد، کە ئەوانە دوژمنی ئیمەن نابی بچی بە پیشوازییانەوە» وەکو خۆی ئەیوت لە سەر ئەمە مەلا مستەفا غەزەبی لی گرت و ناکۆکیەکانیان لەوەوە دەستی پی کرد بو.

زۆری ئەخایاند ناکۆکی ئەوان فاخیر و بارەگای بارزانی هەلی دایەوە. کۆتاییەکەی بەوە هات هەمویان گرتن و لە ئاشپەتال دا هەمویان کوشتن. فاخیر خالۆزای مەلا مستەفا بو.

*

صەددام لەو (تنازل) ە گەورەیەی بۆ مەلا مستەفای کرد بو بە تەما بو:

١. کارتی کوردی لە دەس شای ئیران و دوژمنەکانی دەربهینی و، بە قازانجی خۆی لە دژی ئیران و، دوژمنانی ناوەوە و دەرەوەی بە کاری بهینی. لەو کاتەدا ناکۆکی ئیران و عیراق لە جاران توندوتیژتر بوبو.

٢. ئەو بزوتنەوە چەکدارەی نزیکەی ١٠ سال بو، شاخ و لادیکانی کوردستانی کرد بو بە مەلبەندی خۆی و، بوبو بە کیشەی سیاسی، ئابوری، سپایی گەورە، چەک دابنی و، بگەریتەوە سەر ژیانی ئاسایی ئاوشار.

صەددام زۆر زو تی گەیشت لە هەردو تەماکەی دا بە هەلە دا چوە. مەلا مستەفا هەر لە سەرەتاوە بۆ جیبەجی کردنی هەندی مەبەستی تایبەتی خۆی لە گەل بەعس پیک هات بو، نەک بۆ ریککەوتنی تەواو و راستەقینە. مەلا مستەفا دەولەتیکی لە ناو دەولەت دا دروست کرد بو، ئامادە نەبو دەستی لی هەلبگری لە بەر ئەوە:

١. مەلا مستەفا نەک هەر پەیوەندی لە گەل ئیران نەبری، بەلکو بەهانی ئازاری وەکو دەسکەوتیکی گرنگ فرۆشتەوە بە ئیران، بۆ بەهیزکردنی پەیوەندییەکانی لە گەل ئیران، ئیسرائیل و ئەمەریکا و، هەمو دوژمنەکانی بەعس.

٢. مەلا مستەفا نەک نیازی بلاوە پی کردنی هیزەکانی و، گەرانەوە بو ژیانی ئاسایی شاری نەبو، بەلکو هیزەکانی بە ژمارە زۆرتر و بە چەک پۆشتەتر کرد. «دەزگای پاراستن» ی زیاتر بەهیز کرد.

صەددام بە ئاشکرا دریژەی بە سیاسەتی دۆستایەتی بارزانی دا، بەلام بە نهینی کەوتە چنینی پیلانی لە ناو بردنی. تاقمی مەلا کە بۆ ناوبژی چو بون بو سەردانی، یەکیکیان ریکۆردەریکی مەلغوم لە سکی قایم کرا بو، لە کاتی دانیشتنەکەدا بە رەموت کۆنترول تەقینرایەوە. چەند کەسی کوژران بەلام مەلا مستەفا بە ریکەوت بەر نەکەوت. مەلاکان، پیش ئەوەی لیکۆلینەوەیان لە گەل بکری، هەمویان لە هەمان شوین دا کوژرانەوە.

*

### دەرکردنی فەیلیەکان

بەعس، بی ئەوەی گوی بداتە نارەزایی سەرکردایەتی بارزانی، ١٨٥ هەزار کوردی فەیلی دەرکرد بۆ ئیران و، مال و دارایی زەوت کردن بە بەهانەی ئەوەی ئەوانە ئیرانین. رۆژنامەی «التاخی» لە سەری نوسین، بەلام پارتی هیچ هەنگاویکی جیددی ئەنا بۆ

ڕیگرتن لەم تاوانە و، ڕیگرتن لە دوبارە بونەوەی.

*

## پڕکردنەوەی بۆشایی خەلیج

پڕکردنەوەی بۆشاییەی کشانەوەی هێزەکانی بەریتانی لە عیراق و ئیران لەسەر پڕکردنەوەی ئەو بۆشاییەی لە ملململانی دا بون. ئەمەریکا ڕۆژهەلاتی سویس، بە تایبەتی لە خەلیج دا دروستی ئەکرد، لە ملململانی دا بون. ئەمەریکا ئیرانی ڕاسپارد بۆ ئەرکی پاراستنی ئاسایشی خەلیج بگرێتە ئەستو، شا بە پەلە ئیرانی پڕ چەک ئەکرد و، پەیوەندیەکانی خۆی لەگەڵ دەوڵەتانی عەرەبی و شیخ نشینەکانی خەلیج باش ئەکرد، هەوڵی ئەدا لە ڕیگەی زیاد کردنی قەوارەی دەسکەوتی ئابوری و بازرگانی سۆڤیتیەوە لە ئیران دا، پشتیوانی یا هیچ نەبی بی لایەنی ئەویش بە دەس بهێنی. عیراقیش ئەیویست دەوری سەرەکی هەبی لە خەلیج دا، بە تایبەتی کە دەوڵەت و شیخ نشینەکانی خەلیج جگە لە ئیران هەمویان عەرەبن، عیراق ترسی لە خۆ چەکدار کردنی بە پەلە و قەبەی ئیران هەبو، بۆ ئەوەی تەرازوی خۆی لەگەڵ ئیرانی پشت ئەستور بە ئەمەریکا ڕاست بکاتەوە، ڕوی کرد بوە یەکیتی سۆڤیت.

*

لە ٩ ی نیسانی ١٩٧٢ دا عیراق و یەکیتی سۆڤیت «پەیمانی دوستایەتی و هاوکاری» یان بۆ ماوەی ١٥ سال ئیمزا کرد. کوسیگین بۆ ئیمزا کردنی هاتە بەغداد. تا ئەو کاتە یەکیتی سۆڤیت پەیمانیکی لەو بابەتەی لە ناو ولاتانی عەرەبی دا تەنیا لەگەڵ میصر بۆ ماوەی ١٥ سال (١٩٧١)، وە لە دنیادا تەنیا لەگەڵ هیند بۆ ماوەی ٢٠ سال (١٩٧١) ئیمزا کرد بو.

یەکیتی سۆڤیت بەرژەوەندی ئابوری، بازرگانی، ستراتیجی گرنگی لە عیراق دا پەیدا کرد بو، دەستی لە پەترولی عیراق گیر کرد بو، کەلکی گەورەی لی وەر ئەگرت، هەروەها نزیکەی هەمو چەک و تفاقی جەنگی عیراق لەو ئەکردرا، ژمارەیەکی زور پڕوژەی ئابوری لە عیراق دا دەس کەوت بو، پاپوڕە جەنگیەکانی سۆڤیتی دەرگای خەلیجیان بۆ کرابوەوە، ئەیانتوانی سەردانی مینای ام القصر بکەن، لەبەر ئەوە پشێوی لە ناو عیراق دا بە قازانجی نەبو، گرژی نیوانی کورد - بەعس بەرژەوەندیەکانی ئەوانیشی ئەخستە مەترسیەوە. حشع و بەعس بەرەو پیکهاتن ئەچون. بەعس ڕیگەی کاری قانونی ئەدان و بەشداری ئەکردن لە وەزارەت و لەو «جەبهە» یەدا کە خەریکی پیکهینانی بو. بەعس ئەیویست پ د ک یش بەشداری جەبهە بی. باری سەرنجی هەردولا لەسەر مافەکانی گەلی کوردو جوری بەریوەبردنی ولات و جوری پیکهینانی جەبهە جیاواز بو، لەبەر ئەوە دور بو پ د ک بەشداری پیکهینانی جەبهە بی.

*

چەند جاری لە نیوان ڕۆژنامەی «التآخی» و ڕۆژنامەکانی بەعس دا: «الثورە» و «الجمهوریە» مشتومڕی توندوتیژ دروست ئەبو. پارتی و بەعس لە دو نامەی ئالوگۆڕ کراودا هەندی لە گازاندەکانی خۆیان لە یەکتری و هەندی لە ناکۆکیەکانیان ڕون کردۆتەوە، ئەو دەم لە کتیبیکی تایبەتی دا بلاو کرایەوە.

بەر لە ئیمزا کردنی پەیمانی ١٩٧٢ نیوانی بەعس - بارزانی گرژ بوبو. هەردولا گومانیان لە یەکتری پەیدا کردبو. یەکیتی سۆڤیت بۆ ئەوەی بارزانی قانع بکا: نیوانی

خوی لەگەڵ عیراق باش بکاتەوە، ناکوکیەکانی چارەسەر بکا، بەشداری جەبهەی خواستراو بی، لەپیش ئیمزا کردنی پەیمانی دوستایەتی و هاوکاری دا نوینەرایەتیەکی بەسەروکایەتی نیچکن، لیپرسراوی کاروباری روژهەلاتی ناوەراست لە وەزارەتی دەرەوەی سوڤیەتی، لەگەڵ هەندی کاربەدەستی سەفارەت لە بەغدا نارده لای بارزانی.

نوینەرایەتی سوڤیەتی بو بارزانیان رون کردەوە کە ئەوان نالین بەعس باشە بەلام ریگەی لە یەک گەیشتن لە گەڵ بەعس باشترە لە ریگەی هاوکاری لەگەڵ تیهران. هەروەها پی یان راگەیاندن کە ئەوان پەیوەندی بە ئاسایی دائەنین چونکە سنوری هاوبەشیان لەگەڵ کوردستانی عیراق هەیە، بەلام زور رویشتن لە پەیوەندی دا باش نیە، هەروەها پەیوەندی لەگەڵ ئیسرائیل و ئەمریکاش بە باش نازانن... نوینەرایەتی سوڤیەتی ئەیویست وا لە بارزانی بکا، کیشەکانی خوی لەگەڵ عیراق بە ئاخافتن چارەسەر بکا و، بەشداری جەبهە بی شان بە شانی حشع.

نوینەرایەتی سوڤیەتی گوشاری بو کورد ئەهینا لەگەڵ بەعس ریک بکەوی، بەلام گوشاری بو بەعس نەئەبرد خواستەکانی کورد بسەلمینی، ئەمەش ئەوەی ئەگەیاند کە ئەبی کورد بە مەرجەکانی بەعس رازی بی، بی ئەوەی بەعس مەرجەکانی کورد بەجی بهینی. بارزانی خوی بە پشت ئەستور ئەزانی بە بەلینەکانی شای ئیران، لەبەر ئەوە گوی ی نەدایە قسەکانی نیچکن.

لە کاتی ئیمزا کردنی پەیمانەکەدا لە بەغداد کاربەدەستانی سەفارەتی سوڤیەتی کە نوینەرانی پارتیەیان دی بو، هەروەها کوسیجین و گریشکو کە وەزیرە کوردەکانیان دی بو، داوایان لی کردبون: پارتی یش بەشداری جەبهە بی و پشتیوانی خوی لە پەیمانەکە دەربری.

*

دوا بە دوای ئیمزا کردنی پەیمانەکەش سەر لە نوی هەندی لە فەرمانبەرانی سەفارەتی سوڤیەتی، لەگەڵ عەزیز شەریف سەردانی بارزانیان کرد لە بارەگاکەی خوی و داوایان لیکرد بروسکەی پشتیوانی بو کاربەدەستانی عیراقی لی بدا. بەلام بارزانی نەک ئامادە نەبو پیروزبایان لی بکا، بەلکو نارەزایی قولی خوی دەربری، چونکە لای وابو سەرەنجام ئەو پەیمانە دژی گەلی کورد بەکار ئەهینی، لە سوڤیەت چەکی پی وەرنەگری و کوردی پی لەناو ئەبات و بوشی دوبارە کردنەوە کە پارتی لە جەبهەدا بەشدار نابی. بارزانی بەلینی لە شا وەرگرت بو، کە پشتیوانی تەواوی بکاو هەولی بەدەسهینانی پشتیوانی ئەمریکاش بدا، بارزانیش ئیمزاکردنی پەیمانەکەی کردە بەهانە بو دوبارە کردنەوەی داوای یارمەتی لە ئەمریکاو بەهیز کردنی شوینی خوی لە لای ئیران و ئەمریکا.

وەکو راپوتی پایک ئەیگیریتەوە: نیکسون و کیسنگەر لەو سەردانەدا کە لە مایسی ۱۹۷۲ دا بۆ تاران یان کرد بەلینیان دا بە شا، لەگەرانەوەدا بە تیجابی لە مسەلەی یارمەتیدانی بارزانی بکولنەوە. لە راستی یش دا کە گەرانەوە بو ئەمریکا لە ئاستیکی بەرزدا بە نهینی لە ۱٦ ی حوزەیرانی ۷۲ بریاری یارمەتیدانی بارزانیان دا بە تایبەتی دوای ئەوەی عیراق لە ۱ ی حوزەیران دا بریاری «تأمیم» ی نەوتی دا بو. یارمەتیەکەش بریتی بو لە تەرخانکردنی ۱٦ ملیون دولار بو کرینی چەک بو بارزانی. جون کونالی یان نارد بو ئەوەی ئەم بریارە بە شا رابگەیەنی. دیارە شایش بە بارزانی راگەیاندوە. لەبەر ئەوە

بارزانی هەستی بە پشتیکی ئەستور ئەکرد لە زورانبازی دا لەگەڵ بەعس، لە هەڵویستەکانی دا نەرمی نەئەنواند.

شـــا هیچ جـــور، دەسکەوتیکی لە ریکەوتنی کـــورد - بەعس دا نەبو، بەڵکو پیویستی بە کورد بو لە ململانی دا لەگەڵ عیراق بو ئەوەی خواستە ئەرزی و سیاسیەکانی خوی بەسەردا بسەپینی. لەبەر ئەوە هەوڵی ئەدا هانی بارزانی و بزوتنەوەی کورد بدا بەگژ بەعـسی دا بچن و، بو ئەوەی زاتی بەرەنگاری یان بخـاتە بەر دریخی نەئەکـرد لە گـفـتی زوری پارمـەتیـدانی «چەک» و «پارە» کـە بە لای بارزانیـەوە لە ریزی پیـشـەوەی پیویستیەکانی دا ئەهاتن.

پەیوەندی کـورد و بەعس تا ئەهات تیـژتر ئەبو، پەیوەندی پارتی و حشع یش تا ئەهات خـراپتـر ئەبو تا گـەیشـتـە رادەی پیکادانی چەکـدار و، پیلەبازیی کـراوەی نیـوان روژنامەکانی «التاخی» و «طریق الشعب».

سالی ۱۹۷۳ نوینەرایەتیەکی سوڤیتی بە سەروکـایەتی رومان سیف سەردانیکی تایبەتی مـەلا مستـەفایان کرد لە بارەگاکـەی خوی، سکرتیری حشع عـزیز محـەمەد و وەزیری دەولـەت عـەزیز شـەریف یشی لەگـەڵ چو بون. رومـان سـیف لەم سـەردانـەدا بە راشکاوی ئاگـاداری بارزانی کرد، کە ئەگەر لەگەڵ بەعس شەر بکاتەوە، یەکیتی سوڤیتی ناتوانی پشتـیوانی لەو بکا چونکە لە گـەڵ عیـراق «پەیمـانی هاوکـاری و دوستـایەتی» ان هەیە، بەڵکو ئەبی پشتـیـوانی لە عـیـراق بکا، لەبەر ئەوە چاکتـر وایە لەگەڵ عـیـراق شـەر نەکاتەوە، بەشداری جەبهـە بی، نیوانی خوی لەگەڵ حشع چاک بکا، ناکـوکیـەکـانی خوی لەگەڵ بەعس بە گفتوگوی هیمنانە چارسەر بکا. بارزانی ئەگەر جارەکانی پیشو بە تەنیا بە گفتی شای ئیران پشت ئەستـور بو، ئەمـجارە بە بەلینی ئەمریکاش زیاتر مـەغـرور بوبو، لەبەر ئەوە قسەکانی رومان سیف ی بە هەند نەگرت.

*

مەلا مستەفا لای نوینەری دەولەتانی جیاواز قسەی جیاوازی ئەکرد. بە ئەمەریکای ئەوت: «ئەگـەر یارمـەتیم بدەن کوردسـتـان ئەکـەم بە ولایەتی پەنجـاو دوی ئـەمـەریکا» و، بە سوڤیتی ئەوت: «ئەگەر یارمـەتیم بدەن کوردستان ئەکـەم بە قـەلای کوموزنیزم». بە ئیرانی ئەوت: «ئیـمـە هەمـومـان لە رەگـەزی ئارین» و، بە عـیـراقی ئەوت: «من عـەبباسـیم». بە عـەرەبی ئەوت: «من موسولمانم ئامادەم پیشمەرگە بنیرم بو شەری جو» و، بە جولەکـەیشی ئەوت: «کورد و جو نەتەوەی حەزرەتی ئیبراهیمن ئەبی پیکەوە هاوکاری بکەن».

گوایە بەم قسانە تەفرەیان ئەدا. سەرەنجام هیچ لایەکیشیانی پی تەفرە نەدرا.

بو بەهیزکردنی پەیوەندیەکانی خوی لە گەڵ ئیران و ئیـسـرائیل و ئەمـەریکا، خوی سەفەری کرد بو تاران بو بینینی شا و، بو تەلئەبیب بو بینینی کاربەدەستـانی ئیـسرائیلی. ئیدریس و د. مەحمودیشی نارد بو واشینتون. نوینەرەکانی بارزانی لە گەڵ ریشارد هیلمز، سەروکی سـیا دانیشتن. لەم دانیشـتنەدا هیلمز بە راشکاوی پی ی وت بون کـە ئەو لە بەر خاتری شای ئیران لە گەلیان کو ئەبیتەوە، ئەگینا ئەمەریکا نایەوی پەیوەندی راستەوخو و ئاشکرایان لە گەڵ دابمەزرینی.

مەلیک حسین کە ئەچی بو ئیران، مەلا مستەفاش ئەچی بو ئەوەی ببینی. داوا لە شا ئەکا کە دیداریکی لە گەڵ مەلیک حسین بو ریک بخا. شا ئەڵی: «چ ئیشیکت بە شا

حسین هەیە سوال لە سوالکەر ناکری!»

مەبەستی ئەوە بوە حسین خۆی هاتوە داوای یارمەتی لە ئیران ئەکا، تۆ ئەچی داوای یارمەتی لی ئەکەی، هیچی نیە بتداتی. مەلا مستەفا ویست بوی حسین بیبنی بۆ ئەوەی داوای لی بکا لای ئەمەریکا قسەی بۆ بکا یارمەتی بدەن.

*

یەکیتی سۆڤیەت لە ململانی ی کوردی - عیراقی دا ئیتر قورسایی خستە پال حکومەتی عیراق و، لە ئازاری ۱۹۷٤ دا کاتیک جەنگی کوردستان هەلگیرسایەوە، پشتیوانی سیاسی و جەنگی ئاشکرای لە حکومەتی عیراق کرد دژی بزوتنەوەی کورد. هەولی دا ناکوکی عیراقی - ئیرانی بە ئاشتی چارسەر بکری، بەتایبەتی سۆڤیەت لەگەل هەردو دەولەت پەیوەندی باشی هەبو، قسەی لە لای هەردو لا ئەرۆیشت، دیارە ریککەوتنی عیراق - ئیران لەو کاتەدا کە بزوتنەوەی کورد گرەویکی چارەنوسیی لەسەر ناکوکیەکەیان کرد بو، جەزرەبەیەکی کوشندەی لی ئەدا.

لەگەرمەی شەرەکانی ۱۹۷٤ ی نیوان جەیشی عیراقی و شۆرشی کورد لەو سەردانەدا کە شای ئیران لە مانگی تشرینی دوەم دا بو موسکوی کرد، یەکیک لە بابەتەکانی گفتوگوی سۆڤیەتی - ئیرانی دا مەسەلەی ناکوکی عیراقی - ئیرانی بو، کە لایەنی سۆڤیەتی هینایە پیشەوە. پودگورنی داوای لە شا کرد بە ئاشتی کیشەکانی لە گەل عیراق چارسەر بکا.

*

لە گەرمەی جەنگی کوردستان دا، حشع کە پەیرەوی بی چەن و چونی لە سیاسەتی سۆڤیەتی ئەکرد هەم بە چەک و هەم بە ریگەی سیاسی و پروپاگەندە بە توندی دژی بزوتنەوەی کورد راوەستا. یەکیتی سۆڤیەت بیش سەرەرای ئەوەی سەرچاوەی چەکی دریژە پیدانی جەنگی بو حکومەتی عیراق دابین کرد، لە دەزگاکانی راگەیاندنی خۆیەوە دژی بزوتنەوەی کورد دوا و پشتیوانی لە حکومەتی عیراق کرد. بەدوی ئەویش دا هەمو دەولەتانی ئەوروپای رۆژهەلات و پارتیە کومونیستەکانی دنیا دژی راوەستان. کە ریکەوتنی ٦ ئازاری جەزائیریش لە نیوان صەددام - شادا بو، ئەگەرچی ئەم ریکەوتنە لە ژیر ناوی لابەلاکردنی کیشەکانی سنوردا بو، بەلام لە راستی دا سەودایەک بو بو لەناوبردنی بزوتنەوەی کوردو مەینەتیەکی نەتەوەیی گەورەی بەسەرهینا، لەگەل ئەوەش دا. یەکیتی سۆڤیەت بە خۆشیەوە وەری گرت و، حشع بەگەرمی پیشوازی لی کردو لە رۆژنامەی «طريق الشعب» دا چەن وتاری بو لیکدانەوەی لایەنە باشەکانی ئەم ریکەوتنە تەرخان کرد.

*

فەسادی مالی و ئیداری لە ناو دەزگاکانی حیزب و پیشمەرگە دا پەرەی سەند. واسیطە و خزمایەتی، نەک توانا و لیوەشاوەیی، گرنگترین پیوانەی دامەزراندن بون لە دائیرەکان دا. بازرگانی قاچاخ لە گەل ئیران بو بە سەرچاوەیەکی گرنگی دەولەمەن بونی کاربەدەستەکانی پیشمەرگە. «قونتەرات» ەکانی وەزارەتی کاروباری سەرو و، قونتەراتەکانی تر کاربەدەستەکانی پارتی و پیشمەرگە ئەیان گرت، پارەکانیان وەرئەگرت پرۆژەکان، کە بۆ ئاوا کردنەوەی کوردستان بو، یا هەر نەئەکران، یا ئەگەر بکرانایە زۆر خراپ و پر کەموکوری بون. زۆر جار خەلک ئەم گلەییانەیان ئەگەیاندە مەلا مستەفا. ئەویش ئەیوت:

«ئەوانە ماندو بون یا کەمی ئیستیفادە بکەن!»

*

مـانگی ئازاری ٧٤ گفتـوگۆی نێوان بەعس - بارزانی چوە کولانێکی داخراوەوە. بیـروبۆچونی هەردولا سـەبارەت بە ناوەرۆک و سنوری ناوچەی ئۆتونۆمی جـیاواز بو. هەر لایەکـیـان پرۆژەیەکی ئامـادە کـرد بو. هیچ لایەکـیـان بە پرۆژەی لایەکـەی تر رازی نەبو. ئیـدریس و دارا تۆفـیـق چون بۆ بەغـداد بۆ ئەوەی قـسـە لە گـەڵ صـەددام بکەن و، بلاوکردنەوەی پرۆژەکە دوا بخا. صەددام سور بو لە سەر ئەوەی لە کاتی دیاریکراودا، وەکو لە بەیانی ئازاری ١٩٧٠ دا نوسـرا بو، پرۆژەکـە بلاو بکریتـەوە. هەرەشـەی لی کـردن کـە ئەگەر شەر بکەنەوە بە شەر دەرەقەتیان نەیەت لە گەڵ شا نەسازی.

مـانگی ئازار دەیان هەزار کـەس چونە ریزی شـۆرشـەکـەوە. دەزگـای پاراستن هانی خەلکیان ئەدا شارەکان بە جێ بهێلن. بەعس ریگای لی نەئەگرتن. لای وابو لیشاوی خەلک ئەبی بە باریکی قورس بە سەر جولانەوەکەوە. ئەویش هەندیکی دەرکرد.

شەر هەلگیرسابوەوە. لیرەدا بە ژمارە لە سەر داوودەزگاکانی شۆرش و تواناکانی، کە لە کاتی خۆی دا بە بارمەتی دەیان کـەسی ئاگادار کۆکـراوەتەوە و، لە پێنجەمین ژمارەی کۆمەلەدا بلاو کراوەتەوە، ئەنوسمەوە:

١. داوودەزگاکانی شورش

- بارەگای بارزانی

پیک هات بو لە مـەلا مـسـتـەفـا خۆی و، ئیـدریـس و مـەسـعـود. سـەرکـردایەتی و سـەرپەرشتی هەمـو کـاروبارەکـانی شورشی ئەکـرد: کـاروباری پێـشـمـەرگـەیی، سـیـاسی، راگەیاندن، پارەو پول، پەیوەندیەکانی دەرەوە، کۆکردنەوەی زانیاری و دەنگوباس..

- پدک

مەلا مستەفا سەرۆک و حەبیب محەمەد کەریم سکرتیر و، سـەرکردایەتی پارتی پیکهات بو لە ٢١ ئەندامی کومیتەی ناوەندی، لەوانە حەوتیان مەکتەبی سیاسی بون: د. مـەحمود، نوری شاوەیس، عـلی عـەبدوللا، سامی سنجاری، صالح یوسفی و، ئیدریس و مەسعود.

لیژنەکـانی لقی ١ ی مـوصل، لقی ٢ ی هەولیـر، لقی ٣ ی کەرکـوک، لقی ٤ ی سلیمانی، لقی ٥ ی بەغدا، لقی ٦ ی ئەوروپا، لقی ٧ ی ریکخستنی ناو پیشمەرگە.

هەر قـەزایەک ١ لیـژنەی ناوچە و، هەر هیـزیک ١ لیژنەی ناوچە و، هەر ناحیـەیەک ١ ریکخراوی تی دا بو.

ریکخـسـتـنی لق و ناوچە و ریکخـراو بە پی ی دابەشـبـونی ئیـداری محـافـظەکـانی عیراق ریکخرا بو.

٧ کارگیری لیـژنەی لق و، ٤٠ کارگیری لیژنەی ناوچە و، سـەدان کارگیری لیژنەی ریکخـراو، کـە بە دەفـتـەر ٤٥ هەزار ئەندامی ریکخـراو و ٧٠ هەزار پالیـوراو و لایەنگری ریکخراوی هەبو.

- سوپای شورشگیری کوردستان (س ش ک)

مەکتەبی عەسکەری (٧ ئەندام) راستەوخۆ بەسترا بو بە بارەگای بارزانیەوە.

س ش ک پیـک هات بو لە ١٨ هیـز. لەوانە: هیـزەکـانی بالەک (هەندرین و

زوزک)، شیخان، زاخۆ، ئاکری، سەفین، دەشتی هەولیر، کەرکوک، خەبات، زمناکو، کاوە، بیتواتە، حەمرین، ئەزمر، هەلگورد، رزگاری.

هەر هیزیک پیک، هات بو لە چەند بەتالیونیک و، هەر بەتالیونیک لە ٣ - ٤ لق، هەر لقیک لە ٣ - ٤ پەل و، هەر پەلیک لە ٣ - ٤ دستە و، هەر دستەیەک لە ٩ - ١٢ پیشمەرگە.

جگە لەو ٤ بەتالیونەی بە ناوی زۆزک کە لە سەر شیوەی جەیشی عیراقی لە سەرباز و ئەفسەر پیک هینرا بو و، جگە لەو چەند قوەتەی کە بە ناوی تەلەعفەر و سنجار و کوسرەت پیکهینرا بو وە لە لق زۆرتر و لە بەتالیون کەمتر بو، لە سەرانسەری کوردستانی عیراق دا ٦٥ بەتالیون هەبو.

سەرەرای پیشمەرگەی دائیمی کە وەکو جەیشیکی نیزامی ریکخرا بو، بۆ پشتیوانی لەم سوپایە «هیزی بەرگری میللی» دامەزرینرا بو.

ژمارەیەکی زۆری فەرماندەی هیزەکان و بەتالیونەکان بەرزانی بون. ژمارەیەکی زۆر لەو فەرماندانە نەخویندەوار یا عەریفی شورطە و جەیش بون.

- دەزگای پاراستن

پاراستن دەزگایەکی جاسوسی بو. کادرەکانی لە لایەن ساواک، موساد، سیاوە مەشق دا درا بون. ئەرکەکانی ئەمیش وەکو ئەرکەکانی هەر دەزگایەکی موخابەرات بو. بەشی جیاجیای هەبو بو کۆکردنەوەی دەنگوباس و هەوالی جۆراوجور و، کوشتن و تیکدان. لیپرسراوی یەکەمی ئەم دەزگایە مەسعود بو.

پاراستن جگە لە خەت و تورە نهینیەکانی، نوینەریکی ئاشکرای بە رەسمی لە بارەگای هەمو هیز، بەتالیون، لق، لیژنەی لق، لیژنەی ناوچە، ئەمانەتیک دا هەبو، کە ئەو چاودیری روداوەکانی دەوروپشتی خۆیان و جموجولی خەلک و پیشمەرگە و لیپرسراوەکان بکەن و، راپۆرتیان لە سەر بنوسن.

پاراستن دەزگایەکی نهینی بو ژمارەی راستەقینەی نازانری.

- ئەمانەتەکان

بەرامبەر بەو مەجلیسە تەنفیزیەی بەعس دروستی کرد بو سەرکردایەتی شورش چەند ئەمانەتیکی دانا بو، وەکو: ئەمانەتی مالیە، کشتوکال، ناوخۆ، اشغال و اسکان، تەندروستی، عەدلیە، اعلام، تربیە.

هەر یەکی لەم ئەمانەتانە سەدان فەرمانبەری هەبو.

## ٢. تواناکانی شۆرش

- توانای مرۆیی

٦٠ هەزار پیشمەرگەی دائیمی
٤٣ هەزار هیزی بەگری میللی
٤٧٠ ئەفسەری جەیش و شورطە بە پلەی جیاواز
٩٨ پزیشک
٧ پزیشکی دان
٧ دەرمانگەر
٢٢٠ مهندس

٦٠. ماموستای زانکو
٢١٢. ماموستای سەرەتایی و سانەوی
٧٠٠. خوێندکاری زانکۆ و مەعهەد
٤٥٠٠. قوتابی ناوەندی و دواناوەندی
هەزاران عەریف و بەرپێچ و کارمەندی حکومەتی
- دارایی
سەرچاوەکانی دارایی شۆڕشەکە بریتی بو لە:
١. یارمەتی ئیرانی و ئەمریکی و ئیسرائیلی و هەندی دەولەتی تر.
٢. ئابونەی ئەندامان. ئەو پارەیەی لە سەرانسەری کوردستان دا بە ناوی مانگانەوە لە هەمو کەس وەرئەگیرا.
٣. داهاتی فرۆشگاکانی شۆرش.
چەک و تفاقی شەر و داوودەرمان لە دەرەوە ئەهات و بە پارە نەئەکردرا.
بودجەی شورش لە ١٩٧٠ - ١٩٧٥ نزیکەی ٤٨ ملیون دیناری عیراقی بو. لە کاتی ئاشبەتال دا ٢٥ ملیون دینار لە خەزینەی بارەگای بارزانی دا مابو.
- راگەیاندن
دەزگایەکی ٨ کیلوواتی رادیو لە مەمی خەلان بو، دو دەزگای پەخشکردنی لە خانەقین و سەرسەنگ دانرا بو. بەرنامەکانی بە کوردی، عەرەبی، تورکمانی، ئینگلیزی و فەرەنسی و جاروبار بە هەندی زمانی تریش بلاو ئەکردەوە.
بارەگای هەمو لق و بەتالیون و هیزەکانی پیشمەرگە دەزگایەکی بیتەلی هەبو بو پەیوەندی راستەوخۆ لە گەل دەزگاکانی سەرو خۆی.
دەزگای چاپی ئینتەر تایپ و هایدلبێرگ و، دەزگای چنینی تیپ و، سەدان تایپ و رۆنیو. سەدان نوسەر و رۆژنامەوان لە دەزگای راگەیاندن دا کاریان ئەکرد و، دەیان رۆژنامە و گوڤار و چاپکراو دەرئەچو.
- چەک
جگە لەو تفەنگانەی بە دەس پیشمەرگە و بەرگری میللیەوە بو دەیان هەزار برنەو و کلاشینکوف و ١٥ ملیون فیشەک و ٥ هەزار گوللە تۆپی ئیحتیات لە دەبو دا بو.
بە سەدان هاوەنی گسری ٢، ٨٢ ملم، ١٢٠ ملم و، تۆپی ٢٥ رەتل، ١٢٢ ملم، ١٣٢ ملم، ١٧٥ ملم.
بە سەدان ١٤٥ ملم، ٣٠ ملم، ٣٣ ملم، ٥٧ ملم ی دژی فرۆکە.
بە سەدان رەشاشی دۆشکا، برنەو، گرینوف و دیکتاریوف.
بە سەدان ساروخی ستریللای دژی فرۆکە و ساگەری دژی تانک.
بە هەزاران ئاربی جی ٢ و ٧ و لوغمی جۆراوجور.
*
لە دوانزە مانگی شەردا (ئازاری ١٩٧٤ - ئازاری ١٩٧٥) مەلا مستەفا ئەم داوودەزگا و هیز و توانایەی لە بەر دەس دا بو. ریککەوتنی شا - صەددام لە جەزائیر کۆتایی بە شەرەکە هینا. مەلا مستەفا ئەیتوانی یەکی لەم ریگایانە هەلبژیری:
- دریژە بە شورش بدا.

- واز لە سەرکردایەتی شۆڕش بهێنێ بۆ یەکێ لە کوڕەکانی یا بۆ کەسێکی تر لە سەرکردایەتی پارتی. خۆی بچێتە ئەوروپا یا ئەمەریکا دابنیشێ.

جێگەی داخە مەلا مستەفا هیچ کام لەم دوو ڕێگایەی نەگرت، ڕێگەیەکی تری هەڵبژارد کە خەڵک ناویان لێ نا ئاشبەتاڵ. ڕێگەی بە هیچ کەسێکیش نەدا درێژە بە شۆڕش بدا و، هەرەشەی لێدانی لێ کردن. ئاشبەتاڵ مەینەتییەکی نەتەوەیی بە سەر کورد هێنا. سەرەتا نزیکەی ۱۷۰ هەزار کەس چوونە ئێران. مەلا مستەفا حەزی ئەکرد هەموو کوردی عێراق لە گەڵی بچن بۆ ئێران، چونکە وای ئەزانی ئێران و ئەمەریکا ناچار ئەبن شتێکی وەکوو بانگلادێش لە کوردستان دووبارە بکەنەوە. ئەوە جاری چوارەم بوو مەلا مستەفا کوردستانی عێراق بە جێ بهێڵێ.

ئێران بنەماڵەی بارزانی و هەندێ لە هاوکارە نزیکەکانی مەلا مستەفای لە عەظیمییەی کەرەج لە نزیک تاران نیشتەجێ کرد. ئەوانی تری بە ناو ئێران دا بڵاوکردەوە. هەندێکیشیان چوونە وڵاتانی ئەوروپی و ئەمەریکی بوونە پەنابەری سیاسی. بەشێکیشیان گەڕانەوە عێراق و بە ناوچەکانی جنوب دا بڵاو کرانەوە.

مەلا مستەفا لای ئەمیری طاهیری سەرنووسەری کەیهانی تارانی و، لای محەممەد حەسەنەین هەیکەل وتی: ئیتر دەوری ئەو لە ناو جوڵانەوەی کوردا تەواو بوە و بە تەمای سەرکردایەتی جوڵانەوەی کورد نەماوە. بەڵام ئەم قسەیەی نەبردە سەر. گوایە ئەمەی بۆ تەفرەدانی شا بوو. دوای دامەزراندنی یەکیتیی نیشتمانیی کوردستان، ئەویش کەوتەوە جوڵان. بە موافەقەتی ساواک ئیدریس و مەسعود قیادە موەقەتەیان پێک هێنایەوە. مەلا مستەفا بە سەرۆکی مایەوە. سامی چوە ئەوروپا کەوتە گەڕان بە وڵاتانی ئەوروپی دا بۆ دامەزراندنەوەی ڕێکخراوەکانی پارتی و، ئیدریس لە ئێران کەوتەوە چالاکی و ناردنی کادرەکانیان بۆ تورکیا، مەلا مستەفا و مەسعودیش چوونە ئەمەریکا. مەلا مستەفا نەخۆشی سەرەتانی گرت بوو لە واشینتۆن جێگیر بوو.

ق م لە پێش دا وایان ئیدیعا ئەکرد کە مەلا مستەفا ئیتر دەوری لە سەرۆکایەتی پارتی دا نەماوە، سەرکردایەتی بە کۆمەڵ حیزبەکە بەڕێوە ئەبات و، ئەو ئیتر ڕەمزێکی نەتەوەیی کورد ئەبێ. بەڵام زۆری نەخایاند بە ناوی سەرۆکی پارتیەوە لە ئەمەریکا دەستی کردەوە بە چالاکی و، بە توندی کەوتە دوژمنایەتی یەکیتی، بە تایبەتی مامجەلال. ڕاپۆرتی پایک و نامەکانی مەلا مستەفا بۆ سەرۆک کارتەر و سیناتۆرەکان، نهێنی زۆر گرنگیان لە پەیوەندی ژێر بە ژێری کورد و ئەمەریکادا ئاشکرا کرد، کە تا ئەوسا کەس نەیئەزانی.

مەلا مستەفا وای ئەزانی یەکیتی جێگە بوو و بە بنەماڵەکەی لێژ ئەکا و بۆ دوژمنایەتی ئەو دامەزراوە. لە بەر ئەوە تا خۆی زیندوو بوو نەیهێشت هیچ جۆرە ڕێککەوتنێکی سیاسی یا مەیدانی لە گەڵ یەکیتی سەر بگرێ. ئەو ڕێککەوتنە مەیدانییەی لە شام لە نێوان مامجەلال و مەسعودا بە شایەتی سوورییەکان ئیمزا کرا بوو هەڵوەشاندەوە و، لە ڕۆژانی کارەساتی هەکاری دا فەرمانی دا بە سەرانی قیادە موەققەتە، عەلی عەسکەری و خالید سەعید و شێخ حسێن، بە گەورەترین چەک بکوژێن. جەنگی لە ناوبردنی یەکیتی بە میرات بۆ کوڕەکانی بە جێ هێشت.

*

ئیستا کە بە رابوردودا ئەچمەوە پیم وایە، ئەو ئەوسا ئیمە: سەرکردایەتی یەکیتی، هەڵویستیکی ترمان هەبوایە. سەرەرای هەمو دوژمنایەتییەکی لە گەڵ یەکیتی و، سەرەرای هەمو کارە خراپەکانی، مەلا مستەفا بە گەورەترین سەرکردەی کورد دائەنرا. ئەو ئیمەش لەو رۆژەدا لە باتی ئەوەی هیرشی بکەینە سەر، پەیامی پرسە و سەرەخۆشی مان بۆ بنەماڵەی بارزانی و ئەندام و لایەنگرەکانی پارتی بناردایە و، ئەگەرچی بە دەنگمانەوە نەئەهاتن، بەلام ئیمە ئەومان بکردایە بە بۆنەیەک داوایان لی بکەین لاپەرەیەکی تازە بۆ پەیوەندی یەکیتی و پارتی بکەنەوە و، بانگیان بکەین بۆ «ئاشتبونەوەی نەتەوەیی». بەلام ئیمە ئەمەمان نەکرد چونکە هیشتا لە ژیر تەئسیری روداوەکانی هەکاری دا کاس و تاسا بوین، بیرمان لە هیچ نەئەکردەوە «تۆڵە» نەبی. لە ناو ئیمەدا هەبون ئەم مردنەیان لەو کاتەدا بە «انتقامی الهی» دائەنا.

*

# نیوەی دووەمی ١٩٧٩

### خۆدزینەوە

کێشی کۆمەڵایەتی پەیوەندییەکانی ناو خۆمانم بە دڵ نەبوو. ململانێی لەگەڵ حسک، پارەکانی دوێنێ مان و نەیارەکانی تازەمان. سەرەڕای ئەوەش، ململانێ ی ناو ریزەکانی کۆمەڵە و، لە خۆیایی بوونی هەندێ لە سەرکردەکانی، تا ئەهات توندتر ئەبوو. بە تەواوی وەڕس بوبووم. هەستم ئەکرد خەریکە ئەپووکێم، بە تایبەتی ٣ ساڵ زیاتر بوو بە بێ وچان و پشوودان بە شاخەوە بووم و، هەموو کات و ژیانم بۆ مەسەلەکە تەرخان کرد بوو. ویستم ماوەیەک لەو کێشە ناسازە سیاسییە دوور بکەومەوە. بڕیارم دا سەفەرێکی درێژی دەرەوە بکەم. ئیزنم لە مامجەلال و هاوڕێکانم خواست.

### تاران

لە گەڵ ئازاد حەمە غەریب بەرێ کەوتین بەرەو تاران. ناو ئێران هێشتا شلەژا بوو، ململانێ ی دەسەلات لە نێوان ناوەندەکانی هێز دا لە نێوان باڵی مەزهەبی و باڵی نەدینیی و، لە ناو دامەزراوی دینیی دا هێشتا بە لادا نەکەوت بوو. سەدان رێکخراوی سیاسی گەورە و پچووکی جۆراوجۆر دامەزرا بوو، بە سەدان رۆژنامە و هەفتەنامە دەر ئەچوو. ئەو رۆژەی ئیمە گەیشتینە تاران سەرەتای مانگی ئایار بوو، تازە «موطەهەری» کوژرا بوو. موطەهەری یەکێ لە نزیکەکانی ئیمام خومەینی و، بیرکەرەوە و نووسەرێکی بە توانای بیری شیعە بوو. تاران بۆنی خوێنی لێ ئەهات، سەدان هەزار ئاینپەرستی تەنگەتیلکە رژا بوونە سەر جادەکان، هوتافیان دژی ئەمەریکا، ئیسرائیل، شورەوی، کۆمونیزم.. ئەکێشا.

هێشتا یەکێتی لە تاران «نوێنەر» و «دەفتەر» ی نەبوو. مامجەلال هەندێ نامەی نووسی بوو بۆ فەلەستینییەکان و سورییەکان. دوای سەرکەوتنی شۆڕشی ئێران، سەفارەتی ئیسرائیل لە تاران کرا بوو بە سەفارەتی رێکخراوی رزگاری فەلەستین. هانی الحسن نوێنەری فەلەستین بوو. من سەری سەفارەتی سوری و سەفارەتی فەلەستینم دا. هەلومەرجی کوردستان و عیراقم بۆ باس کردن و، هەلوێستی یەکێتی م بۆ روون کردنەوە لە رووداوەکانی ئێران. ئاسیاوەکانی «سازمان انقلابی» م بینی، پشتیوانییەکی بێ ئەندازەیان لە رژێمی تازە، بە تایبەتی لە رێبازی خومەینی، ئەکرد، بەلام هێزێکی پچووک و نەناسراو و بێ دەسەلات بوون.

*

### کوچەی عەرەب

کوردە فەیلییەکانی عیراق لە بنچینەدا لە پشتکۆ وە هاتوون. خانەقین و مەندەلی و بەدرە و جەسسان کەوتوونەتە دامێنی چیاکانی پشتکۆ و، لە کۆنەوە ئەم ناوچانە لە رووی جوگرافیای بەشەری و تەبیعییەوە بە یەکەوە بەستراون، بەلام رێککەوتنی زەهاو ناوچەکەی دابەش کردوە و، کردویەتی بە سنووری عوسمانی و ئێرانی.

لەو کاتەوە کە بەغداد ئاوەدان کراوەتەوە و، بۆتە پایتەخت، دانیشتوانی لورستان،

به تایبەتی کوردە فەیلییەکان، بۆ زیارەتی پیرۆزگاکانی شیعە، بۆ بازرگانی و، کریکاری.. هاتوچۆیان کردوە و، لی ی جیگیر بون. تەنانەت جاریکیان دەستیان بە سەر بەغدادا گرتوە.

بەعس کوردە فەیلیەکانی بە دوژمن دائەنا و، خست بونیە خانەی «تهدیدات الامن الداخلی» یەوە، لە بەر ئەوەی:

- لە روی دینیەوە، مەزهەبی دەسەلاتی سیاسی لە عیراق دا سوننە بو، ئەوان شیعە بون.

- لە روی سیاسیەوە، گومانیان لی ئەکردن، کە دلسۆزییان بۆ ئیران بەهیزتر بی وەک لە دلسۆزییان بۆ عیراق، بە تایبەتی چونکە هەندیکیان بۆ ئەوەی نەچن بۆ سەربازی، جنسیەی ئیرانییان مابو.

- لە روی ئابوریەوە، دەستیان گرت بو بە سەر «شورجە» دا کە گرنگترین بازاری بەغداد بو. بەعسیەکان ئەیانویست ئەم بازارە پر قازانجە بدەن بە پیاوەکانی خۆیان.

بەعس بە چەند وەجبە فەیلی لە عیراق دەر کرد. وەجبەی یەکەمیان لە کانونی دوەمی ١٩٧١ دا دوای ریککەوتنی ئازار دەرکرا بون. ئەم دەرکردنە دریژەی هەبو تا سالانی دوایی بە تایبەتی دوای هەلگیرسانی جەنگی عیراق - ئیران. لە تاران و ئیلام و کرماشان.. نیشتەجی بوبون. ژمارەیان لە ٣٠٠.. هەزار کەس تی ئەپەری.

بەعس بۆ راستکردنەوەی هاوسەنگی «تەرازوی مەزهەبی شیعە - سوننە» فەیلیەکانی بە بیانوی «ئیرانی بون» ەوە دەرکرد، بەلام زورایەتی فەیلیەکان هیچ پەیوەندییەکیان بە ئیرانەوە نەبو، خۆیان و چەند پشتیان لە عیراق لە دایک بوبون.

فەیلیەکان بە راستی لیقەوماو بون. حکومەتی عیراق هەمو مال و دارایی و کەلوپەلی زەوت و، بە سەلتی و روتوقوتی دەری کرد بون بۆ سەر سنوری ئیران، ئیرانیش وەکو هاوولاتی خۆی تەماشای نەئەکردن، ناوی نا بون «موعاوەدین» وەکو عیراقی رەفتاری لە گەل ئەکردن. لە تاران لە گەرەکیک کوبوبونەوە ناویان نا بو: «کوچەی عەرەب».

لە ناو دەستەی دامەزرینەری یەکیتی دا دو فەیلی تی دا بو: عەبدولرەزاق میرزا، عادل موراد. عادل زیز بو رویشتە تاران. شەری سەری سالی ٧٤ ئۆتۆمۆبیلیکی «ئەمن» لە باوکی دابو کوشت بوی. کەسوکاری لە بەغداد دەرکرا بون، دایکی لە تاران ئەژیا.

بۆ ئاشتکردنەوەی لە تاران چوم بۆ مالەکەیان. عادل، وەکو خۆی ئەیوت دلی لە مامجەلال و د. فوئاد رەنجا بو، ژیانیشی لە ناوزەنگ پی خۆش نەبو. چەندی لە گەلی خەریک بوم سودی نەبو. چوە بیروت ماوەیەک تەرجومەی عەرەبی - فارسی بۆ رۆژنامەی «السفیر» ی بیروتی ئەکرد. لە مایسی ٧٩ دا لە یەکەمین کۆنگرەی حسک دا هەلبژیردرا بە ئەندامی کومیتەی ناوەندی و، بو بە نوینەریان لە لوبنان و سوریا.

*

تەقویمی ئیرانی

ئیرانیەکان تەقویمیکیان داهیناوە، ئەگەرچی خۆیان بە هیجری دائەنین، بەلام نە لە میلادی باو ئەچی، نە لە هیجری باو.

- تەقویمی میلادی بە گویرەی خولانەوەی ئەرز بە دەوری خۆردا دانراوە و، تەقویمی هیجری بە گویرەی خولانەوەی مانگ بە دەوری ئەرزدا دانراوە.

– تەقویمی میلادی لە دایکبونی مەسیح و، تەقویمی هیجری کۆچی محەممەدی لە مەککەوە بۆ مەدینە کردوە بە سەرەتای دەس پێ کردنی.

ئێرانییەکان هەردوکیان تێکەڵاو کردوە. خولانەوەی ئەرزیان بە دەوری خۆر دا کردوە بە بنچینەی تەقویمەکەیان، بەڵام بۆ تەقویمەکەیان لە باتی سالی لە دایکبونی مەسیح، سالی کۆچی محەممەدیان کردوە بە سەرەتای دەس پێ کردنی و، لە باتی رۆژی کۆچی محەممەد رۆژی نەورۆزیان کردوە بە سەرەتای نوێ بونەوەی سال. ٦ مانگی یەکەم هەموی ٣١ رۆژ و، ٦ مانگی دوەم هەموی ٣٠ رۆژە، لە بەر ئەوە بە تەقویمەکەی خۆیان ئەلێن: «هیجری شەمسی یا هیجری خورشیدی» و بەوی کە «هیجری قەمەری».

محەممەد رەزا شا تەقویمی میلادی و هیجری هەلوەشانەوە و، تەقویمێکی کەی دانا، جلوسی کورشی گەورەی کرد بو بە سالی دەس پێ کردن. لە کاتی «قیام» دا دیسان کردیەوە بە «هیجری خورشیدی».

ئەم تەقویمە جیاوازانە، بۆ یەکێ کە شارەزا نەبێ، ئەبێتە هۆی سەر لێ تێکچون.

*

سەفارەتی سوری «پاسپورت» یکی نوێ یان دامێ بۆ ئەوەی سەفەری پێ بکەم، بەڵام لە بەر ئەوەی نەمتوانی «دخولیە» ی ئێرانی بخەمە سەر نەمتوانی بە کاری بهێنم و سەفەری پێ بکەم. گەرامەوە بۆ سنە لەوێ چاوەری بکەم تا چارێ بۆ کێشەکەم ئەدوزمەوە، لەوێ نامەی یەکێ لە هاوڕێکانم پێ گەیشت داوای لێ کرد بوم بگەرێمەوە بۆ کوردستان، چونکە نێوانی مامجەلال لە گەل سەرکردایەتی کومەلە تێکچوە و، پەیوەندییەکان خەریکە لە یەک ئەترازێن. بێگومان ئەمە هەوالێکی ناخۆش بو. زۆر نەبو بزوتنەوە لە یەکیتی جیا بوبوەوە، ئەمەشی بە سەرا بێ، یەکیتی ئەکەویتە مەترسیەکی گەورەوە.

گەرامەوە بۆ بارەگاکانی سەرکردایەتی لە توژەلە. هاوڕێکانی خۆم و، مامجەلال و سەرانی بزوتنەوە – ئەوانەی لە گەل یەکیتی ما بون – بینی. کێشەکە لە سەر جوری دروستکردنەوەی مەکتەبی سیاسی بو. ئەوانەی پێشنیار کرا بون بۆ ئەندامەتی م س لە کۆمەلە: سالار و فاضیل، لە هێلی گشتی: د. فوئاد مەعصوم و د. کمال خۆشناو، لە بزوتنەوەش: جەمال ئاغا و عەلی حەویز.. نوێنەرەکانی کومەلە وت بویان: «ئێمە عەلی حەویز ناناسین. تازە هاتوتە دەرەوە. لە بەر ئەوە قەبول ناکەین دابنرێ بە ئەندامی م س». مامجەلالیش بۆی باس کرد بون کە ئەوە تێکۆشەرێکی دێرینە و، لێپرسراوی رێکخراوەکانی بزوتنەوە بوە لە کۆیە و.. هەولێکی زوری دابو بۆ ئەوەی بە خوشی قانعیان بکا کە عەلی قەبول بکەن. نوێنەرەکانی کۆمەلە سور بون لە سەر هەلویستی خۆیان. کۆتاییەکەی بەوە هات بو کۆبونەوەکە تێک چو بو، مامجەلال سوێندی خوارد بو کە ئەگەر عەلی نەکرێ بە ئەندامی م س، ئەو لە ناو یەکیتی دا نامێنێ و، کوردستان بە جێ ئەهێلێ و، بەیانێکیان لە سەر دەرئەکا. کۆبونەوەکە تێک ئەچێ و بلاوەی لێ ئەکەن. مامجەلال بە هەمان ناوەروک و، بە توڕەبونەوە، نامەیەکی بو سەرکردایەتی کۆمەلە نوسی بو.

هەولێکی زورم دا گرێیەکە خاو بکەمەوە. لە گەل سەرکردایەتی کۆمەلە کۆبومەوە. لە سەر کێشەکە زۆر دواین. هەولمان دا چارەیەکی ناوەنجی بدوزینەوە. مامجەلال بە هیچ جوری ئامادە نەبو لە بڕیارەکەی خوی بکشێتەوە. لە ئەنجام دا کەوتینە هەلسەنگاندنی ئەوەی مامجەلال بۆ یەکیتی پێویستە و مەرجە نارەواکەی لە پێناوی پاراستنی ریزەکانی یەکیتی

دا قوبول بکەین، یان مەرجەکەی قوبول نەکەین و پەیوەندی خومانی لە گەل تیک بدەین؟ مامجەلال گرووەکەی بردەوە: مەرجەکەی قوبول کرا.

*

## بوردومان

ئیمە لە ناوزەنگەوە گواستبومانەوە بو تەختاییەکی روت لە نزیک تووژەلە. چادریکمان هەل دا بو لە ژیری دا دانیشت بوین و، هەندی لە پیشمەرگەکان خەریکی دارهینان و چیشت لینان بون، دو فروکەی عیراقی بە بەرزی بە ئاسمانی ناوچەکەدا چەند جاری هاتن. دیار بو فروکەی نورین (استطلاع) بون.

بو روژی دوەم ٤ ی حوزەیرانی ٧٩ ئیمە بە ریگاوە بوین بە لای کانی زەردا ئەچوین بو مالیموس لە دەمەو نیوەرووژدا پولی فروکە پەیدا بون، لە بەرزاییەکەوە چاومان لی بو چەند بومبایەکی بەردایەوە و دوکەل بەرز بووەوە.

ئەنجامی بوردومانەکە چەند مالیکی لە گوندی گورشیر ویران کرد بو. چەند کسیکی کوشت بو. هەندی داری گەورەیشی لە کانی زەرد شکاندبو.

کاتی خوی هەندی نوسین و کاغەز و بەلگەی گرنگم دابو بە ئەبو شەهاب لە جیگایەکی ئەمین دا بوم هەلبگری، ئەبو شەهاب ئەوکاتە لیپرسراوی لقی یەکیتی بو، بنکەکەی لە زەلی بو. ئەبو شەهاب کاغەزەکانی لە گورشیر هەلگرت بو. لە گەل بوردومانەکەدا ئەو مالەش بە تەواوی ویران بوبو. شتەکانی منیش تی دا چو. یەکیکیان باسیکی دریژ بو لە سەر عەشیرەتەکانی کورد لە سوریاوە دەستم کرد بو بە نوسینی. زانیاری زوری مەیدانیم کو کرد بووەوە لە سەر عەشیرەتە کوردەکانی سوریا و، لە سەر عەشیرەتەکانی کوردستانی عیراق بە تایبەتی: برادوست، هەرکی، سورچی، گەردی، بالەک، ئاکو، مەنگور، مامش.. لە زمانی پیاوەکانی ئەم عەشیرەتانەوە.

مەبەستی عیراق لەم بوردومانە ترساندنی ئاواییەکانی ئیران بو، کە تیبان بگەیەنی هەرکوییەک دالدەی پیشمەرگەی کوردستانی عیراق بدا بەر هیرش ئەکەوی.

*

## ریگای حەشیشە

ئەو ماوەیە نەجو (نەجمەدین بیوک قەیا) گەیشتە ناوزەنگ. وەجبەیەک چەکی بە ناو تورکیادا هینا بو بو گوندیکی سەر سنور لە ورمی. لەویشەوە گەیاندیانە کوردستانی عیراق.

نەجو ئەگەرایەوە تورکیا، پیکەوە بەری کەوتین بەرەو ورمی و لەویوە بو شاپور و چوینە ناوچەی شکاک. نەجو لە گەل هەندیکیان ناسیاوی پەیدا کرد بو. سەری گوندەکەی سەناری مامەدی مان دا، خوی لە مال نەبو، کورەکەی لەوی بو، گوندەکە قەرەباڵغییەکی زوری لی بو، بە ریکەوت توشی «بیجان جندی» بوم. ویستم خومی لی هەلە بکەم، بەلام بیجان منی ناسیبوەوە، بە گەرمی چاک و چونی مان کرد. پیم وت: «لیرە کەس من ناناسی، ناشمەوی کەس بمناسی، توش باسی مەکە!». وتی: «باشە». تا ناوچەکەمان بە جی هیشت کەس نەیزانی. لیم پرسی: «چی ئەکەی لیرە؟». وتی: «من خەلکی ئیرەم، وەختی خوی بو کوردایەتی شوین بارزانی کەوتم بو سوڤیت و، لە گەل ئەویش گەرامەوە بو عیراق، ئیستا هاتومەتەوە ناو کەسوکاری خوم».

چوینە گوندێکی نزیک سنوری تورکیا، لە ماڵی کابرایەک بوین بە میوان ناوی حاجی زنار بو. دەوڵەمەن و دەسەڵاتدار بو. وەیەکی مەلا مستەفاشی هەڵواسی بو. ئەوان ئەیانزانی بە سیاسی نەیئەناسی، بە قاچاخچی چەکیان ئەزانی. ئەجۆ پێشتر جارێکی تریش میوانی حاجی زنار بوبو. حاجی کابرایەکی چاو و دڵ فراوان بو. بەرخێکی بۆ سەربڕین. تا ڕێگاکەیان تاڵی کردەوە ٣ ڕۆژی پێ چو. هەر ٣ ڕۆژ میوانی ئەو بوین خزمەتی زۆریان کردین.

حاجی زنار ئێمەی بە باندێکی گرنگی قاچاخچیتی، تێکەڵاو لە عێراقی و تورکی و ئێرانی، ئەزانی. زۆرمان هەوڵ دا قانیعی بکەین هاوکاریمان بکا بۆ گوێزانەوەی چەک لە دیوی تورکیاوە بۆ گوندەکەی خۆیان. شوێنەکەیان زۆر لەبار بو. حاجی زنار ملی نەدا، بە پێچەوانەوە ئەو ئەیویست ئێمە قانیع بکا بازرگانی حەشیشەی لەگەڵ بکەین. زۆرمان لەگەڵ وت و تەماعی زۆرمان خستە بەردەمی. کەڵکی نەبو، وتی: «ئێوە ئەچن لە لوبنانەوە بە قاچاخ تفەنگ ئەهێنن بۆ سوریا و، بە قاچاخ بە ناو سوریادا ئەیهێنن بۆ ناو تورکیا و، لە تورکیاوە بە قاچاخ بۆ ئێرەو، لێرەشەوە بۆ عێراق، چەندی لێ قازانج ئەکەن؟ ئەو پارەیە ئەم هەمو زەحمەت و ترسە ئەهێنێ؟ ئێوە ١٠٠ تفەنگ ئەهێنن. ئەبێ بۆ هەر ١٠ تفەنگ ولاخێک تەرخان بکەن. کاروانەکەتان ئەبێ بە ١٠ ولاخ و ئەبێ ١٠ کەسیش بیپارێزێ. ئەگەر کارەکە بە سەلامەتی بڕوا، لە کۆتایی دا لە هەر تفەنگێ چەند سەد تمەنێ قازانج ئەکەن. ئەگەر بشگیرێن، ئەڵێن چەکیان بۆ شۆڕش ئەوێ و ئێعدامتان ئەکەن! لە باتی ئەوە بۆ نایەن لەگەڵ من هاوکاری بکەن هەمو جار بارێ یەک ولاخ دەرباز ئەکەین و، هەریەکەی چەند ملیۆنێکمان پێ ئەبڕێ، ئەگەر بشگیرێین، چەند ساڵێکمان حوکم ئەدەن!»

ئەو ناوچەیە یەکێ لە شا ڕێگاکانی تێپەڕاندنی حەشیشە بو بۆ ئەوروپا. لە ئەفغانستان و پاکستان و ئێرانەوە، حەشیشەیان لەم ناوچەیەوە ئەگوێزایەوە بۆ تورکیا و، لەوێشەوە بۆ ئەوروپا و سەرانسەری دنیا. لەم ناوچەیەش دا حەشیشەیان ئەڕواند. ڕۆژێکیان بردینی بۆ سەیری یەکێ لە کێڵگا گەورەکانی خۆیان. تازە گوڵی کرد بو، دیمەنێکی یەکجار جوانی هەبو.

گوندەکەمان بە ڕۆژ بە جێ هێشت و شارەزا پێشمان کەوت لە سنور پەڕینەوە بو ناو تورکیا. چوینە گوندێک ئۆتۆمبێلێکمان بە کرێ گرت بۆ باشقەڵا. شەو لە ئوتێلێک دابەزین. بۆ ڕۆژی دوایی ڕۆیشتین بۆ دیاربەکر و لەوێوە بۆ «سیوەرەک». ماڵی باوکی ئەجۆ لە سیوەرەک بو. دۆستێکمان لە «جیلانپنار» هەبو ناوی ڕەمەزان گاوان بو. لە نێوان سوریا و تورکیادا قاچاخچیتی ئەکرد و شارەزای ڕێگاکانیان بو. چومە لای ئەو. بە شەو تێپەڕینی سنوری بە پارە بۆ تەگبیر کردم. پاسەوانەکانی سنور خۆیان منیان پەڕاندەوە. لە دیوی سوریا چومە شاری سەری کانی «راس العین». هەمان شەو بە ڕێ کەوتم بەرەو حەلەب بۆ دیمەشق. ئەو کاتە لە سوریا شەماڵ کاروباری یەکێتی ئەکرد.

هەندێ لە سەرکردەکانی حشع لە دیمەشق بون. چەند جارێ کەریم ئەحمەدم بینی. حازم ئەندامی قیادەی قەومی حیزبی بەعس و سکرتێری قطری عێراق بو. تورع پارەکاکەی مابو.

الحرکة العربیة الاشتراکیة لە سەر پارە لە ناو خۆیان دا تێک چوبون. ئەبو شەوقی و ئەبو عومەر بە دو قۆڵی، عەبدولئیلاه نەصراوییان دەرکرد بو. هەر بە هاندانی ئەمان

سوریەکان ویست بویان بیگرن، هەلات بو بو لوبنان. عومەر مستەفا فلاتەکەی لی بە کری گرت بو، سودی لە کری کەی وەرنەگرت و، بویشی ئەپاراست.

*

## سەفەری مامجەلال بو تاران

مامجەلال بە دەعوەتی ئیران سەفەری تارانی کرد. سەفەرەکەی ۲۲ روژ، لە ۷/۲۳ - ۷۹/۸/۱٦ ی خایاند. لەم سەفەرەدا ئیمام خومەینی، حەسەنعەلی مونتەظیری و، کاربەدەستانی حکومەت: مستەفا چەمران، ئەبولحەسەنی بەنی صەدر، صادقی قوطبزادە، داریوشی فروهەر، موحسینی رەفیقدوست.. ی بینی.

مامجەلال لە گفتوگوکانی دا داوای ئەم شتانەی لی کرد بون: پشتیوانی لە خەباتی گەلی کورد و، یارمەتی دانی یەکیتی بە: چەک و، پارە و تازوقە. ریگە دانی بو هینانی چەک و تفاقی جەنگ لە سوریا و لیبیاوە. ریگە دانی لە بازارەکانی ئیران پیویستیەکانی خوی بکری. کارئاسانی بو ئەندام و دۆستەکانی بکری لە ناو ئیرانەوە هاتوچو بکەن. بریندارەکانی لە نەخوشخانەکانی ئیران دا تیمار بکرین.

لە نیوان یەکیتی و ئیرانی ئیسلامی دا چەند جیاوازی بنەوەتی هەبو: ئیران دەولەتیکی دینیی بو، لە سەر بنچینەی ئیسلامی سیاسی: شیعەی جەعفەری، دامەزرا بو. فرە حیزبایەتی و، فرە روژنامەیی و فرە نەتەوایەتی لە ژیانی دیموکراسی دا، بە دژی ئیسلام و، بە مایەی فیتنە و ئاشوب دائەنا. کورتیەکەی: ئەوان دینیی و یەکیتی نەدینیی، ئەوان شیعە و یەکیتیی سوننی، ئەوان عەجەم و یەکیتی کورد.. کاریکی ئاسان نەبو لە یەک بگەن. گیروگرفتی کوردەکانی ئیرانیش بوبو بە سەرباری.

کیشەی کورد خەریک بو ئەبو بە کیشەیەکی ئالوزاوی ئیران، دەنگوباسی هاوکاری پیشمەرگەکانی یەکیتی لە گەل حدکا و سازکایان پی ئەگەیشتەوە. نوینەرانی حیزبەکانی تر، بو ئەوەی دلی کاربەدەستانی ئیران لە یەکیتی رەش بکەن، ئەم هەوالانەیان بە قەبە کراوی پی ئەگەیاندن. یەکی لە باسەکانی ئەو کوبونەوانە ئەم گلەییانە بو.

لەو کاتەدا بو پشتیوانی لە جولانەوەی کوردی عیراق، دو مەسەلە گرنگی ژیانییان هەبو، ئەیانتوانی کار لە روداوەکانی ناو عیراق بکەن: یەکەمیان یەکخستنی جولانەوەی کورد، بە ئاشتکردنەوەیان یان بە زال کردنی لایەکیان دا بە سەر لاکانی تردا. دوەمیان تیر کردنی لە چەک و تفاقی جەنگ و پیویستیەکانی تری.

سەفەرەکەی مامجەلال هەندی ئەنجامی روالەتی بە دەستەوە دا، وەکو مانەوەی نوینەریکی یەکیتی بو پەیوەندی لە تاران و، ریگەدان بە هاتوچو کردن لە سنوریکی دیاریکراودا، بەلام هیچ پشتیوانیەکی کاریگەریان لی نەکرد و، هیچ یارمەتیەکی راستەقینەیان نەدا. نە خویان چەک و تفاقی جەنگیان دایە و، نە هیشتیان لە سوریا و لیبیاوە هیچ بگاتە کوردستان. بەلکو ناراستەوخو هاتی پارچە پارچە بونی بزوتنەوەکەیان ئەدا: جیگەی هەمو ریکخراوە کوردیەکانی عیراقیان وەکو یەک کردەوە و، کارئاسانیان بو ئەکردن و، لە سنوریکی دیاریکراودا بە چەک و تازوقە یارمەتییان ئەدان. خویشیان کەوتنە هەولی دروستکردن و داتاشینی ریکخراوی تازە بو کوردەکانی عیراق.

*

## هاتنی صەددام

١٦ ی تەمموزی ٧٩ ئەحمەد حەسەن بەکر وازی هینا، صەددام حسین لە جیگەی ئەو بو بە سەرکۆمار، فەرماندەی گشتی هیزە چەکدارەکانی عیراق، سەرۆکی م ق ث و، ئەمین سری قیادەی قطری عیراق..

لەو کاتەدا من لە شام بووم. حازم هەواڵەکەی بۆ باس کردم.

١٧ ی تەمموزی ٧٩ بۆ یەکەمین جار صەددام لە رادیو و تەلەفزیونی عیراقەوە بە ناوی سەرکۆمار وتاری دا.

صەددام سەرەتای حوکمی بە رشتنی خوینی تاقمی لە هاوریکانی دەس پی کرد. رۆژی ٢٢ ی تەمموز لە هۆلی خولد لە بەغداد لە کۆبوونەوەیەکی فراوانی سەرکردایەتی بەعس و کادرەکانی دا صەددام پەنجەی تاوانبار کردنی بۆ محی حسین مەشهەدی و چەند کەسیکی تر لە هاوریکانی دریژ کرد. تاوانباری کردن بە پیلانگیران و، لیژنەیەکی لیکولینەوەیان بۆ پیک هینان. دران بە دادگایەک کە لە سەرانی بەعس پیک هات بو.

لە ٧ ی ئاب دا حوکمی ئیعدامی محی مەشهەدی و، غانم عەبدولجەلیل، عەدنان حەمدانی، محەممەد عایش و، پۆلیک کادری پیشکەوتووی بەعس لە رادیوی بەغداوە خویندرایەوە. لە سەر شیوەی کۆنی عەرەب، بۆ ئەوەی هەموویان بەشدار بن لە خوینی کوژراوەکان دا، صەددام نوینەرانی هەمو شوعبە و فیرقەکانی حیزبی بەعسی بانگ کرد و، پیکەوە تەقەیان لە حوکمدراوەکان کرد. وەلید مەحمود سیرەت کە قائیدی فەیلەقی یەک بو، ئەویشیان لە گەڵ ئیعدام کرا.

وەکو ئەیانوت ئەم پیلانەی دژی صەددام چنرا بو بەمجورە ئاشکرا بوە:

بەعسییەکانی عیراق، هەندی لە بەعسییەکانی ولاتانی عەرەبی تریان لە عیراق کو کرد بووەوە و، کاری گرنگیشیان بە هەندیکیان سپارد بو لەوانە: عبدالکریم کراسنە کە خەلکی ئوردون و ئەندامی قیادەی قەومیی حیزبی بەعس بو.

عبدالکریم کراسنە، حکومەتی عیراق کرد بوی بە سەفیری خوی لە مەغریب، ئاگاداری هەولی ئەم بەعسییانەی عیراق ئەبی بۆ گۆرینی صەددام. کابرای سەفیر، ئەگەرچی بەعسی و مووچەخوری عیراق ئەبی، بەلام پیوەندی لە گەڵ مەلیک حسین ئەبی. هەواڵەکە ئەگەیەنی بە مەلیک. مەلیک، صەددام دەعوەت ئەکا بۆ ئوردون. صەددام بە فرۆکە ئەچی بۆ عەممان. مەلیک حسین باسەکەی بۆ ئەگیریتەوە. صەددام ئیتر لە باتی فرۆکە بە ئۆتۆمۆبیل ئەگەریتەوە بۆ بەغداد. کۆبوونەوەیەک ساز ئەکاو، پیلانگیرەکانی بەو دەردە برد.

بەلام هەندی سەرچاوەی تر ئەیانوت: هیچ پیلانیک لە گۆری نەبوە. ئەم شانۆگەرییە صەددام خۆی ریکی خست بو بۆ ئەوەی هاوری نارازییەکانی پاکتاو بکا، چونکە ئەوانە لە لاچونی بەکر و هاتنی صەددام رازی نەبون. صەددام ئەیویست هەمو دەنگیکی نارەزایی لە ناو حیزبەکەی دا بیدەنگ بکا.

*

## «وەحدە» ی سوریا و عیراق

چەند مانگی بو گفتوگۆیەکی ژیر بە ژیر لە نیوان نوینەرانی سوریا و عیراق دا، بۆ یەکخستنی حیزب و جەیش و دەولەت، دەستی پی کرد بو. نوینەرانی هەردولا چەندین جار لە دیمەشق و بەغدا دانیشتن و، بەکر و صەددام و ئەسەد و خەددامیش لە بەشیکی ئەم

کۆبونەوانەدا بەشدار بون. وەکو سەرەتا پێک هاتن لە سەر ئەوەی: حیزبی بەعس و، داوودەزگاکانی جەیش و دەولەت، یەک بخەن. بەلام لە سەر هەندێ مەسەلە ڕێک نەکەوتن، یەکێکیان: جۆری پێکهێنانی دەستەی سەرۆکایەتی دەولەتی یەکگرتو بو. سوریەکان ڕەئیان وابو دو کەس بێ، پێک بێ لە سەرکۆماری عێراق و سەرکۆماری سوریا. لایەنی عێراقی ڕەئی وا بو، کە ئەبێ لە ٣ کەس پێک بێ، دوانی عێراق و یەکێکی سوری. لە مەیش دیارە مەبەست ئەوە بو: جگە لە بەکر، صەددام حسێن بەشی تێ دا بێ. سوریەکان ئەمەیان قوبول نەکرد، لە بەر ئەوە عێراق تەگەرەیەکی تری تێ خست. سوریەکان ڕەئیان وابو، کە دەرامەتی هەردولا تێکەلاو بکرێ و، بودجەیەکی هاوبەش دابنرێ. لایەنی عێراقی لە بەرامبەر قوبول نەکردنی سەرۆکایەتی ٣ قۆلی دا ئەمەی قوبول نەکرد، داوای کرد دەولەتی یەکگرتو بودجەیەکی هاوبەشی هەبێ، بەلام هەر دەولەتێش بودجەی جیاوازی خۆی هەبێ. لەو کاتەدا موعارەضەی عێراقی لە سوریا و موعارەضەی سوری لە عێراق بون، کەچی ئەم گفتوگۆیانە لە پشتی سەری ئەوانەوە ئەکرا.

هەردو دەولەت خۆیان لێ ی بێدەنگ بون، بەلام حەفتەنامەی «الوطن العربی» سەر بە عێراق کە لە پاریس دەرئەچو، کورتەیەکی ئەم گفتوگۆیانەی ئاشکرا کرد و، هەندێ ڕۆژنامەی عەرەبی باسیان کرد. نوسەری ئەمەریکی، بە ڕەچەلەک عێراقی، مەجید خەددوری گفتوگۆکان و، بیروبۆچونەکانی هەردولای بە درێژی لە کتێبە ئینگلیزیەکەی دا دەربارەی ناکۆکی ئێران - عێراق، نوسیوە.

گفتوگۆکان بەردەوام بو، تا بەکر کشایەوە و صەددام جێگەی گرتەوە، ئەوسا صەددام گفتوگۆکانی بڕی بە بیانوی ئەوەی سوریا بەشدار بوە لەو پیلانەدا کە بۆ لابردنی ئەم کراوە. هەولەکانی وەحدە تێک چو، زەمینەی ئاشتبونەوە گۆڕا بە دوژمنایەتیەکی لە جاران توندوتیژتر. لە وەلامی پرسیارێک دا کە بۆچی ئەم گفتوگۆیانە سەری نەگرت؟ طاریق عەزیز بو پاساودانی وتی: «تەمەنی جیابونەوەی ئەم دو حیزبە درێژترە لە تەمەنی یەک بونیان»

*

## کەلکی باریکی

دوای ڕوخانی شا و، نەمانی پاسگا و پادگانەکانی ئێران لە ناوچەی شنۆ هەندێ لە چەکدارەکان ق م لە تورکیاوە گواستیانەوە ناو دێهاتەکانی کوردستانی ئێران. گیراوەکانی ئیمەیش: ئازاد هەورامی، مەحمود عەبدولڕەحمان (شێخ عەلی)، عەلی ئەحمەد (عەلی شیمە)، حامیدی حاجی غالی، کە لە ڕۆژانی کارەساتی هەکاریەوە بە گیراوی لە لایان مابونەوە و، تا ئەوسا لە ناو دێهاتەکانی تورکیا شارد بویانەوە، هێنا بویانن بۆ ناوچەی شنۆ، لە ژورێک دا لە دێیەک حەپسیان کرد بون. ژورەکە دەلاقەیەکی تێ دا ئەبێ دوانیانی پێ دا ئەچێ و، دوانیانی پێ دا ناچێ. لە بەر ئەوەی ناتوانن هەر چواریان هەلێن، وا ڕێک ئەکەون ئەوانەی بە دەلاقەکەدا ئەچن خۆیان دەرباز بکەن. ئازاد و مەحمود باریکتر بون لە حامید و عەلی، هەلدێن و، ئەچن بۆ مالی سەید عەزیزی شەمزینی لە گوندی شێخان. سەید عەزیز کەسایەتیەکی دەسەلاتدار و ناسراوی ناوچەکە و، دۆستی مامجەلال بو. هەردوکیانی بە سەلامەتی ناردەوە بو ناوزەنگ.

پاش ماوەیەک خەلکی سەردەشت تاقمی چەکداری ق م یان گرت و، بە گیراوی

تسلیمی ئیمەیان کردن. لە دزلی پش چەند کەسیکیان لی گیرا. ق م رازی بو بە گورینەوەیان لە گەل حامید و عەلی و، گیراوەکان گوردرانەوە. حامید و عەلی پاش پانزە مانگ ئینجا ئازاد کران.

## شەری ۳ مانگە لە کوردستانی ئیران *

لە ناو کاربەدەستانی تازەی تیهران دا زۆر کەسی تی دا بو، باوەریان بە کیشەی نەتەوایەتی نەبو. هەمو جۆرە خواستیکی نەتەوەییان بە فیتی ئیمپریالیزم و دوژمنانی ئیسلام دائەنا. ئەمانە هەندیکیان لە روانگەی دینیی و هەندیکیان لە روانگەی نەتەوەییەوە دژی خواستەکانی گەلانی ئیران ئەوەستان و، ئەیانویست بە لولەی تفەنگ بیدەنگیان بکەن. دەسەلاتی ناوەندیی دەولەت لە زۆر شوینی کوردستان ترازا بو. سەرانی ئینقیلاب ئەیانویست ئەم دەسەلاتە بە چەکداری سپای پاسداران دابمەزریننەوە. چەکدارەکانیشیان لە شوینە دورەکانی ئیرانەوە ئەهینا. کەسیان ئاشنای زمانی کوردی و، خو و رەوشتی دانیشتوانی ناوچەکە نەبون. سەرەرای ئەوەش هەمویان شیعەی توندرەو بون. بە ناوی ئیسلامەتیەوە بە زۆر ئەیانویست خەلک بهیننە ژیر رکیفی خویانەوە. دانیشتوانی کوردستان چەکیان کەوت بوە دەس. لە زۆر جیگا بەرەنگاریان ئەکرد و، شەر و پیکادان لە نیوان ریکخراوە سیاسیەکانی کورد و، سپای پاسداران دا ئەقەوما. تا ماوەیەک ئەرتەش خوی لەم روداوانە دورەپەریز گرت بو.

روداویکی لەم بابەتە لە پاوە قەوما. مستەفا چەمران، وەزیری دیفاعی ئەوسای ئیران خوی چو بو پاوە. لەوی دەوری گیرا. توندرەوەکانی دەوروبەری ئیمام خومەینی ئەمەیان بە هەل زانی، بو ئەوەی ئەویش تیکەلاوی ئەم کیشەیە بکەن و، هەمو داوودەزگا دینی و دەولەتیەکانی ئیران بکەن بە گژ کوردا. ئیمام خومەینی ئەم فەرمانەی دەرکرد: *

بسم الله الرحمن الرحیم

از اطراف ایران گروههای مختلف ارتش و پاسداران و مردان غیرتمند تقاضا کردەاند که من دستور دهم بسوی پاوه رفته و غائلەرا ختم کنند، من از آنان تشکر میکنم و به دولت، ارتش و ژاندارمری اخطار میکنم اگر با توپها و قوای مجهز تا ٢٤ ساعت دیگر حرکت بسوی پاوه نشود من همەرا مسول میدانم. من بعنوان ریاست کل قوا به رئیس ستاد ارتش و ژاندارمری دستور میدهم که فورا با تجهیز کامل عازم منطقه شوند و بتمام پادگانهای ارتش و ژاندارمری دستور میدهم که بی انتظار دستور دیگر و بدون فوت وقت با تمام تجهیزات بسوی پاوه حرکت کنند و به دولت دستور میدهم وسائل حرکت پاسداران را فورا فراهم کند تا دستور ثانوی من مسول این کشتار وحشیانەرا قوای انتظامی میدانم و در صورتی که تخلف از این دستور نمایند با آنان عمل انقلابی میکنم مکررا از منطقه اطلاع میدهند که دولت و ارتش کاری انجام ندادەاست من اگر تا ٢٤ ساعت دیگر عمل مثبت انجام نگیرد سران ارتش و ژاندارمری را مسول میدانم. والسلام

*

خومەینی فەرمانی دا بە هەمو هیزە چەکدارەکانی ئیران بەرەو کوردستان بجەین. شەر لە سەرانسەری کوردستانی ئیران دا گەرم بو. ١٨ ی ئابی ٧٩ هیزەکانی ئیران شاری

پاوەیان گرت. مستەفا چەمران لە ئاپلۆقە رزگاری بوو. قاسملو داوای یارمەتی لە هەموو حیزبەکانی کوردستانی عێراق کرد یارمەتی حدکا بدەن لەو شەڕەدا. چەند جاری لە بنوخەلیف لە گەڵ مامجەلال و نوێنەرانی حشع و حسک دانیشت. قاسملو داوای لە پارتی پێش کرد کە یارمەتییان بدەن و، بۆ ئەو مەبەستە خۆی چوو بۆ سەردانیان. لەو کاتەدا مەسعود لە تاران نەبوو، سامی سنجاری و جەوهەر نامیق ئەیهێنی، بە قاسملو ئەڵێن کە ناتوانن هیچ یارمەتییەکی بدەن و ناتوانن لە هیچ کۆبوونەوەیەکی چەند قۆڵی دا بەشدار بن، پارودوخی ئەوان، بە هۆی ئەوەی ژمارەیەکی زۆر خێزانیان لە کەرەج و شارەکانی تری ئێرانە، زۆر ناسکە. لە ناکۆکی نێوان حکومەتی ئێران و کوردا ئەوان بێلایەن ئەوەستن.

لەم شەڕانەدا هێزی حشع، حسک، یەکێتی چوون بۆ پشتیوانی حدکا و، پێکەوە لە ٤ ی ئەیلولی ٧٩ دا راگەیاندنێکی هاوبەشیان دەرکرد و، بە ئاشکرا لایەنگیرییان لە حدکا و، دژایەتییان لە هێرشەکانی ئێران کرد. هێزەکانی قم، وەکو سامی بەڵێنی دابوو، بێلایەن رانەوەستان بەڵکو هاوبەشی هێزەکانی ئێران بوون لە پەلاماردانی شارەکانی کوردستان و هێزەکانی حدکا دا، بە تایبەتی لە پاوە، مەریوان، شنۆ..

هێزەکانی ئێران هەموو شارەکانی کوردستانی ئێرانیان گرتەوە و، هێزەکانی حدکا و رێکخراوەکانی تر کە تەجروبەی جەنگییان کەم و، بێ دیسیپلین و ناڕێکوپێک بوون بەرگەی هێرشەکەیان نەگرت. چونی پێشمەرگەکانی عێراقیش شتێکی ئەوتۆی لە رەوتی شەڕ نەگۆڕی. هەندێ لەم هێزانە بۆ شەڕەفرۆشی و حەوانەوە چووبوون، نەک بۆ شەڕ. هێزەکانی حدکا و سازکا شکان و، سەرکردەکانیان کشانەوە بەرەو ناوچەکانی نزیک بارەگاکانی سەرکردایەتی یەکێتی لە تۆژەڵە - شێنێ.

مەلا شێخ عیززەدین دەفتەری لە شێنێ و، حدکا دەفتەری سیاسی لە پێش دا لە تۆژەڵە و، دواتر لە ئاشی پشکاوی لە نێوان شێنێ و گۆزەشێردا دانا.

*

## دادگاکانی خاڵخاڵی

صادقی خاڵخاڵی یەکێ بوو لە ئاخوندە شیعەکانی نزیک ئیمام خومەینی. سەروکایەتی هەندێ لە «دادگاکانی ئینقیلاب» ی ئەکرد. زۆری ئەوانەی ئەبرانە دادگاکەی ئەم حوکمی ئیعدام ئەدران و هەمان رۆژ یان هەمان شەو گوللەباران ئەکران. لە کاتی شەڕی ٣ مانگەدا بۆ چاوترساندنی خەڵک ئەمیان ناردە کوردستان. خاڵخاڵی لە چەند جێگایەک دادگای دانا و ژمارەیەک لە دانیشتوانی کوردستانی ئیعدام کرد. وەکو ئەیان گێڕایەوە جارێکیان لە مەهاباد یەکێکی حوکمی ئیعدام دابوو. کابرای حوکمدراو وت بووی: «تۆ منت بە ئیعدام مەحکوم کردوە، بەڵام بە راستی من بێ تاوانم». قازی خاڵخاڵی لە وەڵام دا وت بووی: «ئەگەر تاوانبار بی ئەوا سزای خۆتت وەرگرتوە، خۆ ئەگەر بێ تاوانیش بی، چ باشتر، ئەوە ئەچیتە بەهەشت!»

ئەو کاتە کاربەدەستانی ئێران ئەیان هێشت رۆژنامەوانەکان وێنەی دیمەنی جێبەجێ کردنی حوکمی ئیعدام بگرن. ئەمەیان بۆ چاوترساندنی خەڵک بوو، یان هێشتا فێری شاردنەوەی تاوانەکانی پێشێل کردنی مافی مرۆڤ نەببوون، ئەوە باسێکی ترە. وێنەی دوو دیمەنی «ئیعدامی بە کۆمەڵ» بڵاو بوەوە، لە دنیادا دەنگیان دایەوە. یەکێکیان ئیعدامی کۆمەڵی گەنج لە سنە و، ئەوی تریان هی کۆمەڵێکی تر لە پاوە. دیمەنی حوکمدراوەکان بە

راوستاوی و چاو و دەس بەستراوی و، ئینجا گوللەباران و، دواییتر بە کەوتویی، لە دڵ و دەروون دا هەستێکی قوڵی مەزلومیی ئەبزواند.

*

حکومەتی بەعس هەر لە سەرەتاوە کەوتە دوژمنایەتی رژێمی تازەی ئێران. ئەم رژێمەی بە مەترسی دائەنا بۆ سەر خۆی و ناوچەکە. ئەترسا شەپۆلی ئیسلامی سیاسی عێراق لە گەڵ خۆی رابماڵێ و، شیعە کاروباری بەغدادیش بگرێتە دەس. کاربەدەستانی عێراق باوەشیان کردەوە بۆ هەلاتووەکانی ئێران و کەوتنە یارمەتی دانی دوژمنانی رژێمی نوێ. لە ناو دوژمنەکانی رژێمی نوێ دا، کوردستان یەکێ بو لە مەلبەندە هەرە گرنگەکانی. کاربەدەستانی عێراق، لەو کاتەدا دەوڵەمەن بون. «دۆلاری پەترۆل» ی مشە و، چەک و جبەخانەی زۆری هەبو. جگە لە حدکا یارمەتی: پارە، چەک، کارئاسانی.. پێشکەش بەم تاقم و کەسانەش کرد:

- دەفتەری مەلا شێخ عیززەدین، کە بوبو بە هێزێکی سیاسی و، لە چەند جێگا بارەگای هەبو.

- بنەماڵەی شێخ عوسمانی نەقشبەندی، لە ناوچەکانی هەورامان و مەریوان، «سوپای رزگاری» ان پێک هێنا.

- بنەماڵەی داود بەگی جاف، کە براییەکیان لە تاران ئیعدام کرا بو، ئەمانیش هێزێکی چەکداریان لە ناوچەکانی جوانرۆ و رەوانسەر دامەزران.

- مەلا شێخ جەلال، لە ناوچەی بانە، کە دواتر «سازمانی خەبات» ی پێک هێنا.

- سمکۆ عەلیار، لە ناوچەی بۆکان.

- عەلی قازی، کوڕی قازی محەممەد، لە ناوچەی سەردەشت - مەهاباد.

عێراق هەزاران پارچە چەکی جۆراوجۆر و، پارەی زۆری پێ دان، هاتوچوکردنی ئاسان کردن.

سازکا هێشتا هیچ پەیوەندییەکی لە گەڵ حکومەتی عێراق دانەمەزراند بو.

*

## ناوبژی مامجەلال

مامجەلال دلێری سەید مەجید و موشیر حەمە غەریبی نارد بۆ تاران. چەند نامەیەکی نوسی بو بۆ چەند کەسی لە پێشەواکانی ئێران، لەوانە: ئیمام خومەینی و حسێنی نەوەی، ئایەتوللای حسێن عەلی مونتەظیری و محەممەدی کوڕی، داریوشی فروهەر، داوای لێ کرد بون کە شەر لە کوردستان دا رابگرن و، بە رێگای گفتوگۆ کێشەکان چارسەر بکەن. ئامادەیی خۆی دەربڕی بو بۆ ناوبژی.

مامجەلال لە رۆژانی ٦ - ٧ ی تشرینی یەکەمی ٧٩ لە نێشکولان دەستەیەکی ئێرانی بە سەرۆکایەتی فروهەر دی بو. پێش ئەوەی ئەمان ببینێ، د. قاسملو و هەندێ لە سەرانی حدکا و، مەلا شێخ عیززەدین و، سەرانی کۆمەلەی دی بو.

لەم کۆبونەوەیەدا دو مەسەلە باس کرا بو: جۆری چارسەری کێشەی کورد لە ئێران دا و، جۆری یارمەتیدانی کوردی عێراق لە خەبات دا دژی رژێمی بەعس.

فروهەر حدکای تاوانبار کرد بو بە نانەوەی ئاژاوە و شەر لە کوردستان دا، وەرگرتنی چەک و پارە لە عێراق و، ناردنی خێزانەکانیان بۆ عێراق. بۆ ئەوەی حکومەتی ئێران شەر

رابگری داوای کرد بو مەلا شیخ عیززەدین بەیانیک دەربکا داوای راگرتنی شەر بکا لە پیشمەرگەکانی کوردستان و، بە هیچ جوری هیرش بۆ سەر ئیمام خومەینی نەکەن، وای دەرخست بو کە ئیران ئامادەیە کیشەی کورد بە گفتوگو (موزاکەرات) چارسەر بکا، لە سەر بنچینەی سلماندنی مافەکانیان، بەلام بە ناویکی جیاواز لە ناوی خودموختاری.

دەربارەی یەکیتی یش ئامادەیی ئیرانی دەربری بو بۆ یارمەتی دانی.

مامجەلال دیفاعی لە حدکا کرد بو، هۆی ئالوزانی هەلومەرجی کوردستانی داپوە پال رەفتاری پاسداران و، کوشتنی بە کومەلی خەلک وەکو رووداوەکەی قارنە و، دادگاکانی خالخالی و، بووردومانی دیهات و... بۆی رون کرد بووە کە: حدکا، هیزی سەرەکیە و ئەتوانی شەر رابگری، نەک شیخ عیززەدین و، چارسەرکردنی کیشەی کورد لە ئیران دا ئەبیتە هۆی بەهیز کردنی خەباتی کوردی عیراق و، خواستەکانی حدکا بریتیە لە:

- ریگەدانی قانونیی چالاکی سیاسی حیزب.
- بەردانی گیراو و دیلەکانی هەردولا.
- کیشانەوەی پاسدار و، گیرانەوەی هیمنی بۆ کوردستان.

دەربارەی یارمەتیدانی یەکیتی یش، داوای لی کرد بو ریگەی بدەن:

- لە تاران «مەکتەب» بکاتەوە.
- ئازوقەو پیویستیەکانی لە بازارەکانی ئیران بکری.
- نەخوش و بریندارەکانی لە نەخوشخانەکانی ئیران دا تەداوی بکرین.
- سەفارەتەکانیان فیزای هاتوچوی ئیران بە ئەندام و دوستەکانی یەکیتی بدەن.
- ریگەی یەکیتی بدەن لە سوریاو لیبیاوە بە ناو ئیران دا چەک بگویزیتەوە بۆ کوردستان.
- هەندی لەو چەکانەی لە کاتی ئاشبەتال دا لە کوردی عیراقیان سەندوە بیدەنەوە بە یەکیتی.

لە کاتی هەلگیرسانی شەری ٣ مانگەدا من لە شام خەریکی گەرانەوە بوم بۆ کوردستان. کە گەیشتمە تاران دلیری سەید مەجید، کە نامەکانی مامجەلالی هینا بو بۆ کاربەدەستانی ئیرانی، هیشتا لە تاران بو. لە تاران گیر نەبوم لە گەل حەمە سەعید چوینە مەهاباد، لەوی جیبیکمان بە کری گرت بۆ سەردەشت. نەمانزانی لە سەردەشت شەرە. ملمان پیوە نا رویشتین. پیش ئەوەی بگەینە ناو شار لە پادگانەکەوە بە تەقە دایان گرتینەوە. چەند گوللەیەک لە جیبەکەمانی دا. کەسمان بەر نەکەوتین. بە پەلە دابەزین و خومان لە چالی کەنار جادەکەدا قایم کرد. هالیکوپتەریش بە ئاسمانەوە ئەفری. شوفیرەکەمان ئیزن دا و، خومان بە لاری دا کەوتینە ری بۆ ئیواری گەیشتینە گوندی زیوە. زیوە گوندیکی خوش و بە سیوە لاسورە بە ناوبانگ بو. لامان دایە مالیک جیگایان کردینەوە تا بەیانی. بەیانی بەری کەوتین بۆ ناوزەنگ.

*

پۆستەری شەهیدان.

دوای روخانی شا ئیتر ئیران بۆ ئیمە کرابوە. هیشتا حکومەت دەسەلاتی پەیدا نەکرد بووە. هەندی لە کادرەکانی ئیمە چونە شارەکانی ئیران. چاپخانەکان هیچ سانسوریکیان لە سەر نەبو. هەمو شتیکیان چاپ ئەکرد. حەمە سەعید چو بۆ ئیران.

جیگاو ریگای پەیدا کرد و، بلاوکراوەکانی یەکیتی لەوی چاپ نەکرد. هاوری و کەسوکاری شەهیدەکان بە هەلیان زانی بو، هەر کەسە وینەیەکی دەس کەوت بو پوستەریکیان بو کرد بو. پوستەری سەدان شەهید چاپ کرا بو. زور لەم پوستەرانە تەهرانەوە بو دیهاتەکانی کوردستانی عیراق هەلئەواسران.

من کە لە سەفەر گەرامەوە سەیرم کرد دیواری ژورەکانی بارەگاکەمان بە سەدان پوستەری پیوەیە. زوریشیان هی ئەو شەهیدانە بون کە لە گەل خوزمان پیشمەرگە بون یا ناسیاو بون. دیمەنیکی سامناکی هەبو. بە پیشمەرگەکانم وت: «راستە ئەمە بو ریز لینان لە شەهیدەکان پیویستە، بەلام هەرچی بیتە ئەم ژورەوە، وینەی ئەم هەمو کوژراوە ببینی، یەکسەر وورەی ئەروخی».

*

من تازە گەیشت بومەوە ناوزەنگ، بەفریکی ئەستور باری بو، روژی ١٨ ی تشرینی یەکەمی ٧٩ جاریکی تر دەستەی نوینەرایەتی ئیران هاتنەوە بو کوردستان. نامەیەکی پەلەی مامجەلالم پی گەیشت، داوای لی کرد بوم دەسبەجی بچم بو بنوخەلەف، بو ئەوەی لە گەل دەستەی نوینەرایەتی ئیران بگەریمەوە بو تاران، بو سەرپەرشتی گویزانەوەی چەک لە دیمەشقەوە بو تاران. لە ناو هاوریکانی ئەوی دا هاتوچوکردن بو من ئاسانتر بو چونکە پاسپورتم هەبو و، بە قانونی هات بومە ئیرانەوە. مژدەی دابومی کە ئیران موافەقەتی کردوە چەکەکان بە فروکە بگویزینەوە.

دەسبەجی بەرەو بنو خەلەف بە ری کەوتم. هیشتا نوینەرانی هەردولا لە گەرمەی گفتوگودا بون.

نوینەرانی ئیران: داریوشی فروهەر، وەزیری کار. سەرتیپ دانشوەر، فەرماندەی ژاندارمەری. سەرتیپ ئازەری فەروغ، فەرماندەی نیروی زەمینی. کوریکیش بە ناوی کەریمخانی سکرتیری فروهەر بو.

نوینەرانی کورد: مەلا شیخ عیزەدینی حوسەینی. فاتیحی شیخولئیسلامی. صەلاحەدینی موهتەدی. ئیبراهیمی عەلی زادە، نوینەری سازکا و، کوریک بە ناوی حەمەمین نوینەری چریک بو. لە حدکا کەس نەهات بو.

منیش چومە ژورەکە لە نزیک شیخ عیزەدین دانیشتم. دەمەقالییەکی زور گەرم بو لە نیوان صەلاحەدینی موهتەدی و داریوشی فروهەر دا، هەرلایەکیان ئەوی تری تاوانبار ئەکرد. گفتوگوکەیان هی شەر بو نەک هی ئاشتبونەوە. مەلا شیخ عیزەدین لی ی پرسیم: «هیچ فارسی ئەزانی؟»

وتم: «بەلی!»

وتی: «ئەمە بخوینەرەوە بزانم نەزەرت چیە؟»

کاغەزیکی دایە دەستم یادداشتیک بو بە ناوی مەلا شیخ عیززەدینەوە بو ئیمام خومەینی و کاربەدەستانی ئیرانی نوسرا بو. خواستەکانی کوردیان تی دا نوسی بو. دوای ئەوەی خویندمەوە شیخ عیزەدین پرسی: «نەزەرت چیە؟»

وتم: «ماموستا ئەم یادداشتە هی شەرە، کە لایەنیکی سەرکەوتو نوسیبیتی، ئەمە ری خوش ناکا بو ئاشتی. زور توندە. تو مەلای و سەرانی شورشی ئیران مەلان، پیویستە بە بەسمەلە دەس پی بکا و، داواکان بە هەندی ئایەتی قورئانی پتەو بکەی و، زەمانی

یادداشتەکەیش خاو بکرێتەوە!»

هەندێ قسەی تریشم کرد. ئەویش یادداشتەکەی بە دڵ نەبو، بەڵام تا ئەو کاتە نەیویست بو قسە بکا، بۆ ئەوەی نوێنەرەکانی سازکا و چریک بە «سازشکار» ی دانەنێن. ئیتر ئەویش کەوتە رونکردنەوەی باری سەرنجی خوی. کۆبونەوەکە بە ئەنجامێکی باش نەگەیشت.

دستەی نوێنەرایەتی ئێران گەرانەوە. فەوزی راوی و، حەمە سەعید و منیش لە گەڵیان رۆیشتین. پێش ئەوەی بگەینە سەردەشت لە رێگا تاقمی پاسدار هەندێ تەقەیان لێ کردین. پێ ئەچو ئەوان گفتوگوی ئاشتیان پێ باش نەبێ. لە سەردەشت چوینە پادگان. لەوێوە بە هالیکوپتەر رۆیشتینە سنە و لە سنە فرۆکەیەکی پچکۆلەیان ئامادە کرد بو ئەوە چوینە تاران.

ململانی ی دەسەلات لە ناو سەرانی شۆڕش و سەرانی حکومەت دا بە لادا نەکەوت بو. باڵی دینیی ئەیویست کاروبار بگرێتە دەست و باڵی نەدینیی ئەیویست شوێنەکانی خوی لە دەس نەدات. نزیکیی لە باڵێکیان، باڵەکەی تری ئەکرد بە دوژمنی. سەبارەت بە گفتوگو لە گەڵ سەرانی کورد و، جوری چارەسەری کێشەی کورد ناکوک بون. هەندێ لە سەرانی باڵی دینیی ئەیانویست کێشەی کورد بە سەرکوتکردن چارەسەر بکەن و، هەندێک لەوانەی باڵی نەدینیی ئەیانویست بە گفتوگو چارەیەکی بۆ بدۆزنەوە. بەڵام هیچ لایەکیان پرۆژە یا بۆچونێکی دیاریکراویان نەبو بۆ رەفتار لە گەڵ مەسەلەی کورد.

فروهەر لە سەفەرەکەی دا سەرکەوتنی بە دەس نەهێنا بو، کەوتە بەر هێرشی رەخنەی نەیار و ناحەزەکانی. هەندێ لە رۆژنامەکانی ئەو رۆژانە ناکوکییەکانی بە ئاشکرا باس ئەکرد. منیش لە ئوتێلی پارس کەوت بوم، بارەگای حیزبەکەی فروهەر: «حیزبی میللەتی ئیران» بە تەنیشت ئوتێلەکەوە بو. چاروبار ئەچوم بۆ بارەگاکەیان. چەند جاری فرهەرم بینی و بیرم ئەخستەوە کە من بوچی هاتوم. رۆژێکیان وتی سەرێکی دانشوەر بدە. دانشوەر فەرماندەی ژاندارمەری بو، ئەو زەمانە دەستی زور ئەرۆیشت. چەک و ئازوقە و پارەی لە بەر دەس دا بو. پارتی لە گەڵ ئەم پێوەندییان دامەزراند بو، ئەم یارمەتی ئەدان.

سەری سەرتیپ دانشوەرم دا. فەوزی دانیشوەری ناو نا بو: «الاعضب» چونکە یەکدەستی هەبو، باڵێکی لە شەڕی عەشائیردا قرتا بو. بیروراکانی خوی بۆ رون ئەکردمەوە. خزی بە «پان ئیرانیست» و، کوردی بە ئیرانیی رەسەن و خوێنپاک دائەنا. قینی خزی لە عەرەب نەئەشاردەوە. ئەیوت: «وەسیەتم کردوە کە مردم ئێسک و پروسکم لە کەناری فورات دا بنێژن چونکە فورات سنوری سروشتیی ئیرانە!»

وتم: «تیمسار من لە گەڵ ئێوە هاتم بۆ ئەوەی کارئاسانیم بۆ بکەن ئەو چەکانەی لە سوریا هەمانە لە رێگای ئیرانەوە بیگوێزمەوە بۆ کوردستان، ئەوە چەند رۆژێکە من لێرە دانیشتوم کەسێ لە من ناپرسێتەوە و، وەڵامێکم نادەنەوە. تکام وایە رێگایەکم پیشان بدە، بگەرێمەوە بۆ لای خومان یان بمێنمەوە؟ ئەگەر بمێنمەوە چی بکەم؟»

دانشوەر وتی: «ئێوە لە ناوچەکانی سنوردان. حدکا و دوژمنەکانی ئێمە لەو سنورەوە چەکیان لە عیراقەوە بۆ دێ. تا ئێوە سنورەکان لە روی دوژمنەکانی ئێمەدا دانەخەن ئێمە یارمەتیتان نادەین. ئەگەر بەڵێن بدەن کە سنورەکان دابخەن و، وەکو گروهی بارزانی ئێوەش شەڕیان بکەن، من لەو چەکانە زور زیاترتان ئەدەمێ کە ئێوە بە تەمان لە سوریاوە

بیهێنا»

وتم: «تیمسار من بە پێ ی بەلێنی خوتان کە بە ئاغای تالەبانیتان دابو هاتوم بۆ گوێزانەوەی چەک نەک بۆ گفتوگوی سیاسی. ئێران چوارسەد هەزار سەربازی هەیە سنورەکانی خوی پێ لەو تاقمانە ناگیری، ئێمە هێزێکی پارتیزانیی پچوک چون ئەو کارەمان پێ ئەنجام ئەدری؟»

تێگەیشتم مانەوەم بێ کەلکە، بەلێنەکەیان هیچی لێ سەوز نابێ، منیش گەرامەوە، وەکو مامە شیخ رەزا ئەلێ: «ئەمما بە عاجزی».

ئەگەرچی د. قاسملو بە گەرمی لایەنگری گفتوگو بو، بەلام لە سەرەتاوە حەزی نەئەکرد، مامجەلال ناوبژیکەر بێ. ئەو دانیشتنانەی مامجەلال رێکی خست بۆ گفتوگوی ئێرانی - کوردی، نە خوی بەشداری کرد و، نە نوینەرێکی دەسەلاتداری نارد، بەلکو ژێر بە ژێر هەولی ئەدا ئەوی لێ دەربهێنی و، خوی و حیزبەکەی بێن بە هێزی سەرەکی گوی لێ گیراو. حدکا لە بیروت داوای لە یاسر عەرەفات کرد بو، کە داوا لە ئیمام خومەینی بکا، شەری کوردستان رابگری و، کێشەی کورد بە ئاشتی چارسەر بکا. هەروەها کاربەدەستێکی ئێرانیشیان لە مەهاباد قەراند بو، دوای ماوەیەک بەریان دابو بە ویش دا هەوالیان بۆ کاربەدەستانی ئێران نارد بو کە حدکا ئامادەیە بۆ موزاکەرات.

*

«هەیئەتی نومایندەگی خەلکی کورد»

روژی ۲۹ ی تشرینی یەکەمی ۷۹ رادیوی تاران راگرتنی شەری کوردستانی راگەیاند. هەمو رێکخراوەکان ئەمیان بە هەل زانی کادر و پێشمەرگە و ئەندامەکانی خویان ناردەوە شارەکان. بارەگای دەفتەری سیاسی حدکا تا ئەو کاتەیش هەر لە ئاشی پشکاوی بو لە نێوان گوندی شینی ی عیراق و گوندی گورشێری ئێران دا.

روژی ۱ ی تشرینی دوەم کوبونەوەیەکی ۳ قولی: یەکیتی، حشع، حدکا لە زەلی کرا. مامجەلال و د. قاسملو لەم کوبونەوەیەدا بەشدار بون. مامجەلال هەولێکی زوری لە گەل نوینەرانی حدکا دابو بۆ ئەوەی بە دەستەیەکی یەکگرتو و، خواستی یەکگرتوەوە بچنە موزاکەراتەوە لە گەل نوینەرانی حکومەتی ئێران.

روژی ۱۷ ی تشرینی دوەم، ئیمام خومەینی ئەم پەیامەی بو کورد نارد.

*

بسم الله الرحمن الرحیم

سلام بر خواهران و برادران کرد که با وفاداری خود به اسلام و جمهوری اسلامی از توطئه خائنین به کشور جلوگیری کردید. گزارشات هیأت ویژه همانطور بود که متوقع از برادران و خواهران کرد بود، که هرگز خودرا از اسلام و ایران جدا نمی دانند و آنچه بدخواهان به آنان نسبت می دهند چیزی جز افساد و توطئه‌گری نیست. اکنون من باید به شما برادران و خواهران کرد و سایر برادران مطالبی را تذکر دهم:

۱. در این موقع حساس که ملت ما با چپاولگران که در رأس آنها آمریکا مواجه هست و برای احقاق حق خود و به دست آوردن ذخائر هنگفتی که محمد رضا پهلوی به غارت برده و به محاکمه کشیدن این جانی قیام نموده و همه قشرهای ملت با هم در این امر حیاتی متحد و همصدا شده اند و برادران و خواهران کرد ما هرجا هستند باید به طور

اولویت در این امر شرکت کنند و با سایر خواهران و برادران هماهنگ شوند و لازم است از اختلافاتیکه بدخواهان ایجاد می کنند به طور قاطع جلوگیری کنند.

برادران منا امروز هر اختلافی به نفع آمریکا و دیگر أجانب است. آنان هستن که از اختلافات ما بهره گیری می کنند و مارا می خواهند به أسارت بکشند. بپاخیزید و توطئه‌گران را نصیحت کنید و در صورت عدم قبول از خود برانید و از مناطق خود بیرون کنید یا آنانرا گرفته تسلیم مقامات دولتی کنید.

۲. اینجانب و همه ملت از ستمهائیکه به شما برادران کرد در طول حکومت استبدادی شده‌است و از تبعیض هائی که بر خلاف اسلام بر شما روا داشته‌اند، مطلع هستیم. لیکن باید بدانید که این شما براداران نبودید که مورد ستم و ظلم واقع شدید. سایر برادران ترک و لر و عرب و بلوچ و فارس و ترکمن هم با شما شریک بوده‌اند و همه محروم بودند از آنچه محروم بودید. شما اگر به زاغه‌نشینان و گودنشینان تهران توجه نمائید خواهید دید آنان از همه محروم ترند. اینجانب می دانم که در حکومت موقت هم آنطور که خواست شما و ملت است، رسیدگی نشده، لیکن باید بدانید باز در این امر همه برادران شما شریک می باشند و دولت موقت با کمال جدیت اشتغال به کار سامان دادن بود، لیکن آشفتگیها به قدری زیاد است، که اصلاح محتاج به زمان است. -

و من امیدوارم که برای همه‌ی ملت و برای شما برادران کرد وسائل رفاه حاصل شود. شما برادران می دانید که نوسازی و عمران در محیطی که آشفته است و مردم در امان نیستند، مشکل یا غیر ممکن است. شما برادران غرب کوشش کنید و آرامش خودرا حفظ کنید و بدانید که با ارامش کارها اصلاح می شود و به صلاح شما و به صلاح اسلام و مسلمین است.

۳. از هیأت ویژه می خواهم که به مذاکرات خود با کمال حسن نیت ادامه دهند، و با شخصیتهای مذهبی و سیاسی و ملی و سایر قشرها تماس بگیرند، تا تامین خواستههای آنان که خواست ما نیز هست، به طور دلخواه بشود و آرامش و امن که از بزرگترین نعمتهای الهی است در منطقه برقرار گردد، و شما برادران کرد در کنار سایر برادران به طور رفاه و آسایش زندگی نموده و طمع اجانب برای همیشه از کشورمان قطع شود.

٤. اسلام بزرگ تمام تبعیض هارا محکوم نموده و برای هیچ گروهی ویژگی خاصی قرار نداده و تقوا و تعهد اسلام تنها کرامت انسانها است، و در پناه اسلام و جمهوری اسلامی حق اداره‌ی امور داخلی و محلی و رفع هرگونه تبعیض فرهنگی و اقتصادی و سیاسی متعلق به تمام قشرهای ملت است منجمله برادران کرد، که دولت جمهوری اسلامی موظف و متعهد به تامین آن در اسرع وقت می باشد و مقررات و قوانین مربوط به آن به زودی انشاءالله تعالی تدوین می شود.

۵. اخیرا باز نظر شریف علماء اعلام و مشایخ عظام و روشنفکران و سایر برادران عزیز در سراسر ایران را به موضع حساس امروز ایران و جبهه‌گیریهای دشمنان میهن و اسلام و در مقابل ملت عزیز و تشبثات همه جانبه‌ی آنان برای سرکوبی نهضت اسلامی و ملت معظم و برای اعاده‌ی همه جانبه بر کشور اسلامی ما جلب می کنیم، آیا در این موقع تقاضای متواضعانه‌ی این خدمتگزار که روزهای آخر عمرش را می گذراند، به جا

نیست؟

٦. خواهران و رادران هم میهن در سراسر کشور، من دست خودرا به پیش شما دراز می کنم، و از شما به خاطر خدا و اسلام و کشور عاجزانه می خواهم که تمام توان خودرا برای نجات کشورتان به کار برید، و اسلحه‌های سرد و گرم یعنی قلم و بیان و مسلسل را از نشانه‌گیری به روی یکدیگر منحرف و به سوی دشمنهای انسانیت که در راس آن امریکا است نشانه روید. باری الهی من ماموریت خودرا که نصیحت به ملت است به قدر توان ضعیف خود انجام دادم، و تو ای خدای بزرگ با قدرت لایزال خود قلوب ملت مارا پیوند برادرانه عطا نمود، انک قریب مجیب. سلام گرم من به ملت عزیز و برادران کرد و رحمت خداوند بر همه.　　　روح الله الموسوی الخمینی

٢٦ آبان ٥٨ - ٢٦ ذیحجه ٩٩

*

قسەکانی ئیمام خومەینی وەکو قسەی هیچ یەکی لە کاربەدەستانی ئیران نەبو. قسەکانی ئەم بە حوکمی شەرعی دائەنرا، کەس نەیئەتوانی بە ئاشکرا دژی راوەستی. ئەم پەیامەی پیشەوای ئینقیلاب زۆر گرنگ و، مسەلەی زۆر گرنگی تی دا بو، لەوانە:

١. سەلماندنی زۆرلیکراوی و چەوساوەیی کورد.

٢. سەلماندنی مافی کورد بۆ بەریوەبردنی خۆی لە ناوچەکانی خۆی دا.

١. راگرتنی شەری راگەیاندن و شەری تفەنگ.

٢. گفتوگۆی سیاسی لە گەل کەسایەتی دینی و نەتەوەیی و سیاسی کورد بۆ چارەسەرکردنی کیشەکەی.

*

چەند رۆژی دوای ئەوە، د. قاسملو لە ئاشتی پشکاوی وە چوەوە مەهاباد، لە خۆپیشاندانیکی گەورەدا پشتیوانی لە پەیامەکەی ئیمام کرد و، لە قسەکانی دا وتی: «ما به پیام امام لبیک میگوئیم..» و، ئیتر خۆیان ئامادە کرد بۆ گفتوگۆ.

*

حدکا، لە گەل شیخ عیززەدین و سازکا و چریک ریک کەوتبو دەستەیەکی هاوبەشی نوینەرایەتی بە ناوی: «هەیئەتی نومایندەگی خەلقی کورد» پیک بهینن. لە سەرەتاوە دیاربو گفتوگۆی کورد و ئیران بە ئەنجام ناگات. هیچ لایەکیان باوەری بەوی تر نەبو. چریک، شاخەی کوردستانی دامەزراند بو، چارەسەرکردنی کیشەی کوردی بە لاوە گرنگ نەبو، بەلکو ئەیویست کەلک لە کوردستان وەربگری وەکو بنکەیەک بۆ چالاکییەکانی خۆی و، کەلک لە کیشەی کورد وەربگری وەکو گوشاریک بۆ سەر داوودەزگای ناوەندی لە تاران. سازکاش، باوەریان بەوە نەبو، بە گفتوگۆ لە گەل داوودەزگای دینیی ئیران بگەنە هیچ جورە چارەسەریکی ئاشتی کیشەی کورد، بەلکو خۆیان ئەیانوت، لەم گفتوگۆیانەدا بەشداری ئەکەن بۆ «ئیفشاگەری»، واتە بۆ ریسواکردنی رژیم! حدکا توشی چەند هیزیکی توندرەو بوبو، هەمو نەرمییەکی ئەمیان بە «سازشکاری» لە قەلەم ئەدا و، ئەیانکرد بە کەرستەی پروپاگاندە دژی.

سەرەنجام هەیئەتی نومایندەگی خەلکی کورد لە: ٤ ئەندامی حدکا، ٢ ئەندامی سازکا، ٢ ئەندامی چریک، بە سەروکایەتی مەلا شیخ عیززەدین پیک هات. ئەندامیکی

حدکا، قسەکەری رەسمیی «سخنگۆ» بو.

ئەم هەیئەتە پروژەیەکی ۲٦ ماددەییان ئامادە کرد کە ببی بە بنچینەی گفتوگۆ لە گەل نوینەرانی دەولەت.

*

## خواستەکانی کورد

خواستەکانی بزوتنەوەی نەتەوەیی کورد لە ئیران دا، لە پایەتی ئەو خواستانە بو کە چەند ساڵ بو کورد لە عیراق دا داوای ئەکرد. بە کورتی ئەمانە بو:

۱. سەلماندنی مافی نەتەوەیی کورد لە سەر بنچینەی ئوتونومی (خودموختاری).

۲. دیاریکردنی سنوری کوردستانی ئیران لە سەر بنچینەی زورایەتی دانیشتوانی ناوچەکە.

۳. هەلبژاردنی «شورا» ی ئوتونومی کوردستان بە دەنگدانی نهینی و راستەوخو، ئەویش بۆ راپەراندنی کاروباری بەریوەبەرایەتی، ئابوری، روشنبیری، کومەلایەتی، ئاسایشی ناوخو.. «هەیئەتی ئیجرائی» دابمەزرینی.

٤. کوردی ببیتە زمانی رەسمیی خویندن و بەریوەبەرایەتی.

ئەمە ناوەروکی خواستە نەتەوەییەکانیان بو، جا هەندی جار بە پروژەی ۸ مادەیی و هەندی جار بە ٦ مادەیی و، هەندی جاری تر بە پروژەی ۲٦ مادەیی دەربان ئەبری.

*

«هەیئەتی حوسنی نیەت» کە نوینەری دەولەت بو بۆ گفتوگۆ لە گەل سەرانی کورد لە دواحەفتەی مانگی کانونی یەکەمی ۱۹۷۹ دا «طرح خودگردانی» لە روژنامەکانی تاران دا بلاو کردەوە. کوردەکانی ئیران هەرزو ناویان لی نا «طرح سرگردانی». ئەم پروژەیە خواستەکانی کوردی بە دی نەئەهینا، بەلام لە چاو تیگەیشتنی سیاسی حوکمرانەکانی ئیران دا هەنگاویک بو بۆ پیشەوە، ئەوە جاری یەکەم بو «دەسەلاتی ناوەندی» لە تاران ئامادە بی هەندی لە دەسەلاتەکانی خوی بە ئوستانەکان ببەخشی و، جوری، یا کەم و کورتیش بی، لە «نەناوەندیتی» بسەلمینی.

گەورەترین کەموکوری ئەم پروژەیە لەوەدا بو داپەشبونی بەریوەبەرایەتی ناوچە کوردنشینەکانی وەکو خوی هیشت بوەوە، هەمویانی یەک نەخست بو لە یەک ناوچەی بەریوەبەرایەتی دا. بەلام بە گویرەی ئەم پروژەیە ئەکرا زمانی کوردی لە پال زمانی فارسی دا بۆ کاروباری حکومەتی بەکار بهینری و، روژنامە و بەرنامەی رادیو و تەلەفزیونی پی ئامادە بکری و، ئاسایشی ناوخۆ بە دەزگای ناوچەیی سپیردرا بو.

لە گەل دەسپیکردنەوەی شەردا لە کوردستان ئەم پروژەیەش مرد.

*

ئیران ولاتیکی فرە نەتەوەیە، کاربەدەستەکانی لە کونەوە ترسیکی زوریان لە پارچە پارچە بونی هەیە و، ئەم ترسەیان کردوە بە بیانوی سەرکوتکردنی بزوتنەوەی نەتەوەکانی ئیران و، خواستە نەتەوەییەکانیان سەبارەت بە بە کارهینانی زمانی نەتەوەیی. لە ئیران دا چەندین نەتەوە و رەگەزی جیاواز هەیە: فارس، ئازەری، کورد، بلوچی، تورکومان، عەرەب.. سەرەرای ئەمانیش هەندی قەوم هەن خویان بە هیچ کام لەم نەتەوانە نازانن وەکو لور، گیلەکی.. لە ناو ئەم نەتەوانەدا ئازەری بە ژمارە لە هەمویان زورترن، ئەگەرچی لە

دوای دوهمین جەنگی جیهانی جمهوریەتی ئازەربایجانیان دروست کرد و، دوای سەرکەوتنی شۆرشی ئێران، هەم حیزبی توده فیرقەی دیموکراتی ئازەربایجانی دروست کردەوە و، هەم حدکا و نەتەوەپەرستەکانی حیزبێکی تایبەتییان بە ئازەربایجان دروست کرد، بەڵام بزوتنەوەی نەتەوەیی ئازەری، وا بە هێز و تەوژم نەبو وەکو بزوتنەوەی نەتەوەیی کورد، ئەمەش ئەگەرێتەوە بۆ چەند هۆیەک:

١. ئەگەرچی ئێران بە ناو بە دەوڵەتی فارس ناسراوە، بەڵام لە کۆنەوە زنجیرەی ئازەرییەکان حوکمی ئێرانیان کردوە: صەفەوی، ئەفشار، قاجار.. کە چەند سەدە حوکمرانی ئێران بون هەموویان ئازەری بون، لە ناو ئەواندا دوجار حوکمرانی لە دەس زنجیرەی ئازەری دەرهاتوە: جارێکیان سەردەمی زنجیرەی زەند، کە بە ڕەچەڵەک کورد بون، جارێکی تر سەردەمی پەهلەوی، کە بە ڕەچەڵەک خەڵکی شیمالی ئێران بون.

فارس زورتر لەوەی نەتەوەی حوکمران بێ، زمانەکەی زمانی ئەدەب و فەرهەنگ و حوکم بوە.

٢. ئازەرییەکان، هەمیشە و بە درێژایی زەمان، لە دەزگای حوکمرانی دا دەسەڵاتدار و زاڵ بون، ژمارەیەکی زوری وەزیر، ئوستاندار، ئەفسەرانی ئەرتەش، ژاندارمری، ساواک ئازەری بون. بەشێکی گرنگی بازار و بازرگانی و پیشەسازی سەرانسەری ئێران بە دەس ئەوانەوە بوە. لە دامەزراوی شیعەدا ئازەرییەکان هەمیشە دەسەڵاتدار و خاوەن نفوز بون.

ئەم هویانە وایان کردوە، ئازەری هەست بە چەوسانەوەی نەتەوەیی بەرامبەر بە دەوڵەتی ئێران و، بە چەوسانەوەی مەزهەبی بەرامبەر دامەزراوی دینیی شیعە نەکەن.

لە بەرامبەر ئەمەدا نەتەوە پچوکەکانی تر: کورد، بلوچ، تورکومان، عەرەب.. لە ئێران دا، بە مەزهەب سوننی بون و، لە داودەزگای حوکمرانی دا بی بەش بون و، لە بازار و بازرگانی دا دەورێکیان نەبوە.

دوای سەرکەوتنی شورش، هەروەکو کورد داوای مافی نەتەوەیی ئەکرد، بزوتنەوەی نەتەوەیی لە بلوچستان، گومبەدسەحرا، گومبەدکاوس، خوزستان تەقییەوە و، هاودەنگ لە گەڵ کورد ئەوانیش داوای مافەکانی خویان ئەکرد. بەڵام جوڵانەوەکانی ئەوان زوتر لە هی کورد دامرکێنرایەوە، چونکە:

١. ئەو پێشینە مێژوییە درێژەی جوڵانەوەی کورد هەیبو، ئەوان نەیان بو.

٢. بە ژمارە لە کورد کەمتر بون.

٣. هەلکەوتی جوگرافی شوێنەکانیان، لە چاو هی کوردستانی ئێران دا، خراپتر بو.

## پێکهێنانی حسک

دوای جیابونەوەیان: «بزوتنەوە» و «کومیتەی ئامادە کردن» تا مانگی ئاب، بە کردەوە یەکیان نەگرت بو، کومیتەیەکی هاوبەشیان دروست کرد بو سەرپەرشتی کاروبارەکانی ئەکرد. لە روژانی ٣ - ٦ ی ئابی ٧٩ کوبونەوەیەکی فراوانیان بە کادرەکانی بزوتنەوە و کومیتەی ئامادە کردن کرد و پاسوکیشیان بانگ کرد. لەم کۆبونەوەیەدا ناوی ڕێکخراوەکەیان نا: «حیزبی سوسیالیستی یەکگرتوی کوردستان: حسبک» و، سەرکردایەتی حیزبەکەیان دیاری کرد.

ئەمانە لە ناو خۆیان دا ناتەبا بون، کاغەزی یەکتریان نەئەخوێندەوە، کەسیان خۆی

لەوی تریان بە کەمتر نەئەزانی، زۆرجار لە پاشملە گاڵتەیان بە یەکتری ئەکرد. هەر لە بەر ئەوە کە نامەیان بۆ حیزبێکی تر ئەنووسی ٣ کەس ئیمزای ئەکرد و، کە ئەچوون بۆ کۆبوونەوەیەکی هاوبەش لە گەڵ حیزبێکی کەدا زۆریان ئەچوون. د. مەحموود و رەسوڵ مامەند هەر کەسەیان خۆی بە شایستەی ئەوە ئەزانی کەسی یەکەمی حیزب بێ. بەلام هێزی راستەقینە هی رەسوڵ بوو. د. مەحموود هێزێکی ئەوتۆی نەخستبووە سەر هێزەکەی رەسوڵ.

*

جیابوونەوەی چەکدارەکانی بزووتنەوە، لەشکرێکی تری لە کوردستان زیاد کرد و، بیری یەکخستنی چەکداری هەموو حیزبەکان، لە «یەک لەشکری یەکگرتوو» دا، کە لە سەرەتای دامەزراندنی یەکێتییەوە باس ئەکرا و، ئەمانویست هەموو لایەنەکان بەم بیرە قانیع بکەین، بە یەکجاری داروخا. لەوە بە دواوە کوردستان بەرەو «فرە - لەشکری» رۆیشت. جگە لە یەک کە هەر لە سەرەتاوە لەشکری خۆی هەبوو، حیزبەکانی تریش: حسک، پاسۆک، حشع و، دوایی تریش هێزەکانی سەر بە ئێران و، گەل.. هەر یەکەیان میلیشیای تایبەتی خۆی دروست کرد. فرە - لەشکری، هۆی سەرەکی شەری ناوخۆ بوو. راستە ناکۆکییەکان هەمیشە لە سەرچاوەی سیاسییەوە هەلئەقوڵین، بەلام ئەگەر ئەم حیزبانە لەشکری تایبەتی خۆیانیان نەبوایە، نەیانئەتوانی پەنا بەرنە بەر شەری چەکدار بۆ بەلاداخستنی ناکۆکییەکانیان، کە زۆرجار سیاسی نەبوون.

*

- لەشکرەکەی حسک، کە دوای لەشکرەکەی یەکێتی، لە چاو هەموو لەشکرەکانی ترا بە ژمارە زۆرتر بوو، تەنیا بۆ ئەوەی زۆر بن و بالادەستی پەیدا بکەن، جیگەی هەموو جۆرە کەسێکیان لە ریزەکانی خۆیان دا ئەکردەوە، بێ ئەوەی گوێ بدەنە رابوردوی و، مەبەستی راستەقینەی لە هاتنی بۆ پێشمەرگایەتی.
- لەشکرەکەی حسک بوو بە پەناگای دالدەدانی هەموو ئەوانەی لە دەس لێپرسینەوەی حیزبی، لە ناو حیزبەکانی ترەوە، رایان ئەکرد.
- سەرکردایەتی حیزبەکە توانای دارایی ژیاندنی لەشکرەکەی نەبوو، چاوپۆشی لێ ئەکردن بۆ دابینکردنی ژیانی خۆیان و پێویستییەکانیان، بە ناوی جیا جیاوە، بە زۆر پارە لە خەلک بسێنن و، راووروت بکەن.
- فەرماندە و پێشمەرگەکانی لەشکرەکە گوێیان لە فەرمان و ئامۆژگاری سەرکردایەتییەکەیان نەئەگرت، ناوی حسکیان وەکو چەترێکی سیاسی بە کار ئەهێنا بۆ ئەوەی بە ئازادی و بێ ترسی لێپرسینەوە، چییان ئەوێ بیکەن. سەرکردایەتی حیزبەکەیش دەستی بە سەر لەشکرەکەی دا نەئەرۆیشت و، بۆ ئەوەی لە ژێر چەترەکەی دا بمیننەوە چاوپۆشی لە خراپەکانیان ئەکرد.

*

حسک لەو شوێنانەی جۆری لە بالادەستی هەبوو هێزەکانی یەکێتی دەرئەکرد. سەید کاکە لەم رووەوە لە هەمویان زیاتر توندوتیژ بوو. لە چەند جیگای وەکو بیدەلان لە ناوچەی سەرکردایەتی، خۆشناوەتی، دەشتی هەولێر، بناری کۆسرەت.. هێزەکانی یەکێتی دەرکرد و، لە چەند جیگایەک چەکی ئەکردن و، لێ ی ئەکوشتن. هێزە راونراوەکان، هەندێکیان بە چەک کراوی، ئەهاتنەوە بۆ ناوزەنگ.

* له پەراوێزی ئەو کۆبونەوانەدا کە لە سەر داوای حدکا ئەکراو، پنک و حشع و حسک بەشداریـیان تێ دا ئەکرد، نوێنەرانی پنک: عەلی حەویز و فاضیل کەریم و، نوێنەری حسک: حاجی حاجی برایم رۆژی ٤ ی ئەیلولی ٧٩ لە پێنوخەلەف کۆبونەوە. هەردولایان ڕێککەوت بون لە سەر ئەوەی لەمەولا زۆ زو یەکتری ببینن، هەوڵ بدەن باوەڕکردن بە یەکتری بینا بکەنەوە، هاوکاری یەکتری بکەن، ناکۆکیەکان بە گفتوگۆی براپانە چارەسەر بکەن و، هەڵوێستیان بەرامبەر ڕژێم یەک بخەن. بڕیاریان دابو هەردولا بڵاوکراوەی ناوخۆ بۆ ڕێکخستن و پێشمەرگەکانیان بڵاو بکەنەوە بۆ ئەوەی بەم گیانە کار بکەن.

* شەفیق زاهیر و سەرباز ئەحمەد هەردوکیان کۆیی و هەردوکیان ئەندامی بزوتنەوە بون. لە سەر کێشەیەکی خێزانی لە ناو خۆیان دا ناکۆک بون بە دوای یەکتری دا ئەگەران بۆ کوشتن. لە جیابونەوەی بزوتنەوەدا ئەوانیش لە یەکێتی جیا بوبونەوە. هەردوکیان فەرماندەی کەرت بون. پاش ماوەیەک شەفیق گەڕایەوە ناو یەکێتی. شەفیق و سەرباز لە گوندی شۆرشکە لە بناری کۆسرەت توشی یەک ئەبن و ئەبێ بە شەڕیان. چەند کەسێکیان لە یەکتری کوشت و بریندار کرد. ئەم ڕوداوە هیچ پەیوەندیەکی بە کێشەی سیاسی یەکێتی و حسکەوە نەبو. سەید کاکە کردی بە بیانو و لەشکری کۆ کردەوە چو بۆ دۆڵی جافەتی. لە باخسەمەر ڕۆژی ١١ ی ئابی ٧٩ هەڵی کوتایە سەر هێزێکی یەکێتی پێشمەرگەیەکی کوشت و چەند کەسێکی تریشی بریندار کرد. یەکێتی لەو ناوچەیەدا بەهێز بو بە سەید کاکە چار نەئەکرا. لە بەر ئەوە هەر زو لەو ناوچەیە کشایەوە بۆ بەری کۆسرەت و خۆشناوەتی.

دوای جیابونەوەی بزوتنەوە، یەکێتی لە دەشتی هەولێر و خۆشناوەتی لاواز بوبو. سەرانی حسک ئەیانویست هەولێر بۆ خۆیان پاوان بکەن و، کادر و پێشمەرگەکانی یەکێتی لێ دەربکەن. شەڕیان بە مەفرەزەکانی یەکێتی ئەفرۆشت. چەکیان ئەکردن و لە ناوچەکە دەریان ئەکردن. چەند جاری ئەم ڕوداوانە دوبارە ئەبونەوە. بۆ ئەوەی یەکێتی لەو ناوچەیەدا هەڵبستێتەوە و، حسک زات نەکا پەلاماریان بدا. کادر و پێشمەرگەکانی هەولێر کۆ کرانەوە و سەید مەجید کرا بە لێپرسراویان. سەلاح چاوشین و هێزێکیشیان بۆ پشتیوانی لە گەڵ ناردن. ئەم هێزە تێکەڵاو و بێ سەروبەر بو. فەرماندەکانیان کەسیان بە قسەی ئەوی تریانی نەئەکرد بو. هەندێکیان تازە هات بونە شاخ تەجروبەی پێشمەرگایەتیان نەبو. بە کۆمەڵ لە نازەنین پالیان لێ دابوەوە. سەید کاکە هەمو هێزەکانی خۆیانی لە سەر کۆ کردنەوە و، شەوی ٥ ی ئەیلولی ٧٩ لە ناکاو لە نازەنین چوە سەریان. هێزەکەی یەکێتی پەرموازە کرد. هەندێکیان گیران و هەندێکیان دەرباز بون. دو ڕۆژ دوای ئەوە مەفرەزەیەکی یەکێتی لە ئاوەگرد خۆی قایم کرد بو چوە سەر ئەوانیش. هەندێکی لێ کوشتن و هەندێکی لێ بریندار کردن. ئەمە جەزرەبەیەکی کاریگەر بو حسک لە یەکێتی سرەواند. ئەیویست دەس بە سەر ناوچەکەدا بگرێ.

* حەمەی حاجی مەحمود، ئەوسا فەرماندەی هەرێمی ١ ی شارەزور و هەورامانی

یەکێتی بو، هەلی دەستدرێژییەکانی سەید کاکەی بە دەرفەت زانی، ئەویش لە ٢٣ ی ئەیلول دا هەلی کوتایە سەر بارەگای عوسمانی قالە منووەر لە پلەکی لە ناوچەی بانە. بارەگاکەی گرت و، چەکدارەکانی هەمو چەک کرد. تەنیا عوسمان و یەک پێشمەرگە دەرباز بون. حەمە ئەم کارەی لە خۆیەوە کرد بو، سەرکردایەتی یەکێتی ئاگادار نەبون. گوایە ئەمەی لە تولەی کارەکانی سەید کاکەدا کرد بو، رەنگە بیانوەکەی راست بوبی، بەلام راستیەکەی ئەوە بو: تەماعی کرد بوە چەکەکانی هێزەکەی عوسمان.

*

هەر لەو ماوەیەدا پەیوەندیشیان لە گەل حکومەت دامەزراند بۆ دەسپێکردنی گفتوگۆ. رۆژی ٣٠ ی ئەیلولی ٧٩ وەفدیان بە ری کەوت بۆ بەغداد.

بە کردەوە ئەو رێکەوتنەی لە گەل حاجی لە پێنجەلەف کرا بو، هیچ نرخیکی نەما.

*

## گفتوگوی حسک – بەعس

سەرەتای مانگی تشرینی یەکەمی ٧٩ دەستەی نوینەرایەتی حسک کە پێک هات بو لە د. مەحمود و عەدنان موفتی لە قەلادزەوە بران بۆ کەرکوک و، لەوێشەوە بۆ بەغداد. لەم چونەدا سەعدون شاکیر، وەزیری کاروباری ناوەوە و، د. فاضیل بەرراک، بەرێوەبەری گشتی ئاسایش و، دوای ئەوانیش صەددام حسینیان بینی بو. چەند مانگی بو صەددام بوبو بە سەروکی کومار.

پی ناچی هیچ لایەکیان پرۆژەیەکی دیاریکراوی هەبوبی بۆ چارەسەری کیشەی کورد، چونکە هیچ لایەکیان شتیکی نوسراوی بلاو نەکردەوە، تەنیا قسە و باسی گشتییان کرد بو. صەددام داوای لی کرد بون دەس هەلبگرن لە خەباتی چەکدار و بگەرینەوە ژیر بالی حکومەت. بەلام بەلینی هیچ دەسکەوتیکی سیاسی پی نەدا بون.

یەکیتی و حشع لەم کارەی حسک پەشۆکان. بە جوتە یادداشتیکیان لە ١ ی تشرینی دوەمی ٧٩ دا دا بە حسک، یادداشتەکە توند و، بە زمانیکی رەق نوسرا بو، پەشۆکان و تورەیی هەردو حیزب لە ناوەروکی یادداشتەکەدا ئەخوینریتەوە. داوایان لە حسک کرد بو دەس لە گفتوگوی یەکلایەنی هەلبگری و، ناکوکییەکانی لە گەل یەکیتی بە ریگای گفتوگو چارەسەر بکا و، شان بە شانی ئەوان خەبات بکا بۆ روخاندنی رژیمی دیکتاتوری عیراق.

د. مەحمود لە دوای گەرانەوەی مامجەلالی لە شینێ دی. د. مەحمود ویست بوی مامجەلال ئیقناع بکا، یەکیتی بش لە گفتوگوکەدا بەشدار بی، مامجەلالیش ویست بوی د. مەحمود ئیقناع بکا واز لە گفتوگو بهینی. جەلالی حاجی حسین، نوینەری پاسوک، لەم دانیشتنەدا بەشدار بوبو.

د. مەحمود هەوالەکانی ئەم سەفەرەی بۆ فەوزی راوی، نوینەری بەعسی سەر بە سوریا و، بۆ نوینەرانی حشع، بە جیا گیرابوەوە، لای هەریەکیکیان جۆری لە بەهانەی هینا بوەوە بۆ گفتوگوی بە تەنیای خۆیان لە گەل بەعس و، بەلام ترسی خۆیانی لە یەکیتی کرد بو بە بیانوی سەرەکی.

دوای ئەم سەفەرە، ئیتر د. مەحمود نەچوەوە بۆ بەغداد بەلام پەیوەندیبان هەر نەبری

بو. لە بەعس نائومێد نەبوبون و، پروپاگاندەیان بۆ کەلکی ڕێککەوتن ئەکرد. هەندێ لە پێشمەرگەکانیان، بەم هیوایە، پشتیان لێ کرد بوەوە بێ ترس لە هێرشی بەعس ئەگەڕان. ڕۆژی ۲۰ ی کانونی یەکەمی ۷۹ جەیش لە دۆڵی سماقولی پەلاماری دان. سەید سەلیم، فەرماندەی هەرێمەکە و، شێبەی بولی، یەکێ لە فەرماندەی کەرتەکانیان و، چەند پێشمەرگەیەکی کە کوژران. ئیتر ئەمە هیچ هیوایەکی بە گفتوگۆ نەهێشتن.

دواتر حسک بە بەیانێکی درێژ سەرنەگرتنی گفتوگۆکەیانی ڕاگەیاند. ئەو هیوایەی هەیان بو بە چارەسەری سیاسی نەهاتە دی و، ئەو واهیمەیەی کە لە سەرەتاوە هەیان بو، دەربارەی ئامادەیی بەعس بۆ چارەسەری سیاسی هێمنانەی کێشەی کورد و، نائامادەیی یەکێتی بۆ بە دەنگەوەچونی، لە تاقیکردنەوەی خۆیان دا ناڕاست دەرچو. هەرچەندە ئەوان ئەیانوت: «لەم گفتوگۆیەدا ئەگەر هەمومان، بە تایبەتی حسک و یەکێتی، پێکەوە بوینایە، بەعس ئەهاتە پێشەوە». بەلام ئەمە بەهانە بو بۆ پاساودانی سەرنەگرتنی گفتوگۆکە.

سەرنەگرتنی ئەم گفتوگۆیە هەر لە سەرەتاوە چاوەڕوان ئەکرا. لەو کاتەدا عیراق بە هێز و جولانەوەی کورد لاواز بو. تەرازوی هێزی سیاسی و چەکدار نابەرامبەرێکی گەورەی تێ دا بو. جولانەوەی کورد لە ناو خۆی دا ناکۆک و ناتەبا بو. پشتیوان و یاریدەدەری نەبو. حسک یش هێزێکی سیاسی چەکداری پچوک بو، نەیئەتوانی نوێنەرایەتی هەمو جولانەوەی کورد بکا. بەعسیش ئامادە نەبو، هیچ دەسکەوتێکی سیاسی ڕاستەقینە بە کورد بدا.

*

شەفیق و قورە بەرازە

ڕۆژی ۱۱ ی ئابی ۱۹۷۹ هێزێکی گەورەی حکومەت هێرشێکی گەورەی ئەرزی و ئاسمانییان کرد بۆ سەر تاقمی لە پێشمەرگەکانی یەکێتی لە گوندی قورە بەرازە لە دەشتی کۆیە. لەم شەڕەدا ۱٤ پێشمەرگە کوژران و ٥ یان بە دیل گیران. لە ناو کوژراوەکان دا: شەفیق زاهیر، مەولود شینە، مارف، محەممەد قادر، ئاودێر عومەر، ئازاد ڕەفیق نانەوا، حەویز ئیبراهیم، ئەنوەر نازەنینی، فوئاد فەتحوللا، جەعفەر سەعید عەباس، سەعید تەقتەقی، عومەر ڕەفیق و، دو پێشمەرگەی سلێمانی ناویان ئەحمەد و شاکیر بو.

ئەمە جەزرەبەیەکی کاریگەر بو لە یەکێتی لە ناوچەی کۆیە، بە تایبەتی لەو کاتەدا کە بە هۆی جیابونەوەی حسکەوە، هەرێمەکانی پێشمەرگە پەشێوانی تێ کەوت بو. لە ناو ئەم پۆلە تێکۆشەرەدا تاقمی کادری پێشمەرگەیی و ڕێکخراوەییان تێ دا بو. شەفیق فەرماندەی پێشمەرگەکانی کۆیە و، ئاودێر کادری ڕێکخراوەیی کۆمەلە و حەویز کادری ڕێکخراوەیی بزوتنەوە بو.

شەفیق چوارەمین کەسی خێزانەکەیان بو لەم ڕێ یەدا سەر دابنێ. زاهیری باوکی و، تۆفیقی برای لە شەڕدا کوژرا بون و، ڕەفیقی برای بەعس لە سێدارەی دا بو.

شەڕەکە بە ڕێکەوت ڕۆژی پێش دەرچونی «عەفوی عام» بو. کاربەدەستانی ئیستیخبارات ئاگادار بون «عەفو» بە ڕێگاوەیە. بۆ ئەوەی دیلەکان بەر عەفو نەکەون، لە ناو سەربازگەکەی کۆیەدا هەر پێنجیان گوللە باران کرد بون.

*

## کیتلەی سیجن

صەددام بە بۆنەی ئەوەوە کە تازە بوبو بە سەرکۆماری عیراق لە ئابی ١٩٧٩ دا چەند «عەفو» یەکی دەرکرد. یەکێکیان «عەفوی عام» بو لە گیراوەکان. هاورێکانی ئێمە کە لە زیندانی ئەبو غرێب بون لە بەغداد و، هەندی لەو کەسانەی لە «رەدهەی ئیعدام» ی زیندانی موسل دا بون، بە تایبەتی دیلەکانی پێشمەرگە، ئازاد کران. بۆ ئێمە ئەمە هەوالێکی زۆر خۆش بو. کۆمەڵی کادری ژیر و تێگەیشتوی تێکۆشەر لە زیندان بەربون، تین و تاوێکی تازەیان ئەدا بە رێکخراوەکە و جولانەوەکە.

رۆژێکیان لە بن دیواری بە وشکە کەلەک هەڵچنراوی پارەگاکەمان دا لە بەر بەرۆژکە خۆم هەڵخست بو، لە پڕ یەکی سەلامی کرد، هیچ شتێکی تایبەتی نەبو سەرنجی من رابکێشی، بە جورێکی ئاسایی وەلامم دایەوە. ئەو چاوەروانی پێشوازییەکی گەرمتر بو، وتی: «کوری پاش ئەلی ی ناماناسیتەوە؟» سەرم هەڵبری و پاش لی ی ورد بومەوە، سەیرم کرد عومەری سەید عەلی بو. هەستام باوەشم پیا کرد و ئەملاو ئەولای یەکتریمان ماچ کرد. سەید عومەر باسی کرد کە هاورێیانی تریش بە رێگاوەن و، بۆ ئەوەی هەمویان بە سەلامەتی بگەن هەر یەکەیان بە رێگایەک دا هاتوە.

هاورێیانی زیندان، کە دوایی‌تر پێیان ئەوتن: «کیتلەی سیجن» یەک یەک و دو دو ئەگەیشتن. فەرەیدون عەبدولقادر و پاکیزەی هاوسەری و، دارای شێخ نوری و نەرمینی هاوسەری و روناکی دەزگیرانی مەلا بەختیار و، ئاوات عەبدولغەفور و پرشنگی هاوسەری و، ئەرسەلان و پەخشانی دەزگیرانی، ئەوانەش کە سەڵت بون وەکو: عەلی پچکوڵ، جەبار فەرمان، ئەنوەر حەسەن بە تەنیا، گەیشتن. ئەوانە خێزانەکانیان، لە ترسی گرتن، لە گەڵ خۆیان هینا بو. ئەمەیش یەکەمجار بو ئافرەت بێتە ناوچەی سەرکردایەتی. تا ئەو کاتە ناوزەنگ کۆمەڵێکی داخراو بو بۆ پیاوان، ئیتر ئافرەتیشی تێکەوت.

بلاوکراوەکانی کۆمەڵە تا ژمارەی چوارەمی و، لە بلاوکراوەکانی یەکێتی یش «هەوالنامە» تا ژمارەی چوارەمی من سەرپەرشتیم کرد بو. تا خۆم لەوی بوم ئەمنەهیشت لە روی ناوەروکەوە وتاری بی پێز و، لە روی نوسینەوە وتاری خواروخێچی تی دا بلاو بکرێتەوە. هەندی لە هاورێیانی کۆمەڵە ئەمەیان زۆر پی ناخۆش بو، ئەیانویست کۆمەڵە و هەوالنامە وەکو «نشرەی جیدار» ی قوتابخانەکان بکەین بە مەیدانی خۆ فێرکردنی ئەوان.

ئەو ماوەیەی من سەفەرم کرد بۆ دەرەوە فرسەتیان هینا بو، بە ئارەزوی خۆیان لە هەردوکیان دا ئەوەی بە بیر و بە قەلەمەکانیان دا هات بو نوسی بویان.

مەلا بەختیار بە ناوی «باوکی ئاوارە» وە، وتارێکی درێژی لە ژیر سەرناوی: «چەند تیشکی، بە سەر هەندی، لایەنی خەباتی کۆمەڵەدا» لە ژمارەی شەشەمی «کۆمەڵە» دا نوسی بو، باسی بیروەرییەکانی خۆی گیرا بوەوە سەبارەت بە رێکخستنەوەی کۆمەڵە و، دەس پی کردنەوەی خەباتی چەکدار. هیرشێکی ناوەختی کرد بوە سەر سەرکردایەتی پێشوی کۆمەڵە، کە دواتیان لە سێدارە درا بون و، ئەوانی تریشیان تازە بە تازە لە زیندان ئازاد کرا بون.

هاورێیانی تازە - ئازاد کە هاتنە شاخ و، وتارەکەی مەلا بەختیاریان خوێندەوە، زۆر دلگیر بون و، بە کۆمەڵ و تاک هاتنە لام بۆ گلەیی. ئەرسەلانیش لە گەڵ گەیشتنی دا، سالار چو بو بە گژی دا. ئەمانە چاوەروانی پێشوازییەکی گەرمتر بون، راستییەکەی

هەندێ لەو برادەرانە وەکو حەزیان لە چارەی پەرپووەکان نەبوو، حەزیشیان نەئەکرد لە ناو کۆمەڵە و پێشمەرگەدا بیانبینن، لایان وابوو جێگەیان پێ لێژ ئەکەن. بۆ چارەکردنی ئەمە، لەو ڕووەوە گلەییم لە سالار کرد و، لە ژمارەی حەوتەمی «کۆمەڵە» یش دا ڕوونکردنەوەیەکمان نووسی: کە ئەو وتارەی مەلا بەختیار بیروڕای تایبەتی خۆیەتی و هی سەرکردایەتی کۆمەڵە نییە.

لە کۆبوونەوە فراوانەکانی پێشوودا بڕیارمان دا بوو: ئەو ئەندامانەی سەرکردایەتی کە لە زیندان دان، لە بەر ئەوەی بە هۆی خەباتی سیاسییەوە گیراون، هەرکاتێ ئازاد کران بێنەوە ناو سەرکردایەتی. کۆبوونەوەی سەرکردایەتی کۆمەڵەمان کرد هەموو ئەم برادەرانەمان بانگ کرد، کە لە کاتی خۆی دا ئەندامی سەرکردایەتی کۆمەڵە بوون: فەرەیدوون، عومەر، عەلی، ئاوات و، هەر یەکەیان کارێکی پێ سپێردرا. تا ئەو کاتە من خۆم سەرپەرشتی ڕێکخراوە نهێنییەکانم ئەکرد، هەموویم بەرەو ڕووی سەید عومەر کردەوە. سەید عومەر ئەم کارە گرنگەی پێ کارێکی پچووک بوو، بە ناپەدڵی قبووڵی کرد.

ئەوانەی کۆمیتەی هەرێمەکانیان پێک هێنا بوو، حەزیان لە چارەی هاوڕێیانی زیندان نەئەکرد، دوای گیرانیشیان بڵاوکراوەیەکی ناوخۆیان لە سەر دەر کرد بوون. ئێستاش کە هات بوونە ناو شۆڕشەوە بە لالووتەوە بە خێرهاتنیان کرد بوون.

ئەوانەی لە زیندانیش ئازاد کرا بوون، حەزیان لە چارەی ئەندامانی کۆمیتەی هەرێمەکان نەئەکرد، لایان وابوو، لە کاتێک دا ئەمان ملیان لە ژێر چەقۆی بەعس دا بووە، ئەوان کاریان بۆ شکاندنی ئەمان کردووە.

بە کردەوە ئەم دوو تاقمە بوون بە دوو دەستە:

ئەوانەی لە کۆمیتەی هەرێمەکان بوون، خۆیان بە «خەتی شەهید ئارام» دائەنا و، وایان ئیدیعا ئەکرد درێژە بە خەتی ئەو ئەدەن.

ئەوانەیش لە سەرکردایەتی پێشووی کۆمەڵە بوون، خۆیان بە «خەتی شەهید شەهاب» دائەنا و، وایان ئیدیعا ئەکرد درێژە بە خەتی ئەو ئەدەن.

ڕاستییەکەیشی ئەوە بوو هیچکامیان خەتێکی وای دا نەڕشت بوو ئەمانە شەڕی لە سەر بکەن، ئەو دوو شەهیدە کە دوو کەسایەتی بەڕێز و خۆشەویستی ناو کۆمەڵە بوون، ئەمان ناوەکانیان بۆ مەبەستی خۆیان لە مڵملانێ ی ناوخۆدا بە کار ئەهێنان.

من کە نە لە کۆمیتەی هەرێمەکان و نە لە کێتلەی سیجن بووم و، لە ناکۆکییەکانی ئەوان دا بەشدار نەبووم، هەوڵێکی زۆرم دا بۆ ئەوەی ئەم لە یەک نەگەیشتنەیان چاک بکەم، کەڵکی نەبوو، تا ئەهات ناکۆکییەکانیان، کە زۆرتر شەخسی بوو نەک ئایدیۆلۆجی یا سیاسی، قووڵتر ئەبوو. بە کردەوە بوبوون بە دوو دەستەی جیاواز.

*

بۆ کۆبوونەوەکانی سەرکردایەتی کۆمەڵە هەموو ئەوانەمان بانگ ئەکرد کە پێش گیرانیان ئەندامی سەرکردایەتی کۆمەڵە بوون. دوای ماوەیەک هەموویان کاروبارێان پێ سپێردرا. کەسیان بەو کارە ڕازی نەبوو کە پێ ی سپێردرا بوو، هەندێکیان بە تەمای ئەندامەتی م س و، هەندێکیان م ع و، هەندێکیان بە تەمای ئەندامەتی سەرکردایەتی یەکێتی بوون، بەشەکەی ئێمە لە سەرکردایەتی یەکێتی دا بە هەمووی ٧ جێگا بوو، جێگای ئەو هەموەی تێ دا نەئەبووەوە.

## کۆنگرەی نۆهەمی پارتی*

دوای ئاشبەتال سامی سنجاری بە موافەقەتی مەلا مستەفا، پارتی لە ژێر ناوی قیادە موەقەتە دا ڕێک خستەوە. بۆ ئەو مەبەستە سەفەری ئەورووپای کرد. پاشان گوێزاپەوە تورکیا. ئەگەرچی هەمویان لە ژێر سێبەری مەلا مستەفادا کۆبوبونەوە بەلام بە گوێرەی زروف و زەمانی ئەوسا باسی ڕێکخستنەوەی پارتییان ئەکرد لە سەر بنچینەی مارکسی و، سەرەتا ڕێکخراوەییەکانی: ناوەندیتی دیموکراتی، سەرکردایەتی بە کۆمەڵ و، ڕەخنە و ڕەخنە لە خۆ گرتن.

تا ئەو کاتە بە هۆی هەلومەرجی سیاسی ئێران و، دوریی خۆیانەوە لە کوردستان، بنەماڵەی بارزانی نەیان توانی بو ڕاستەوخۆ سەرپەرشتی کاروباری حیزبەکە و، دانان و لابردنی کادرەکانی بکەن. زۆری ئەندامانی سەرکردایەتی لایەنگری مەسعود و، هەندی لە کادرە ناوچەییەکان لایەنگری ئیدریس بون. دوای ڕوخانی شا کە ئیتر بە ئاشکرا و بە کۆمەڵ هاتنەوە ناو مەیدانی کاری سیاسییەوە، پێویستیان بەوە هەبو، هەندی گۆڕین بە سەر حیزبەکەیان دا بهێنن، لە گەڵ قوناغی تازەدا بگونجێ، سەر لە نوێ دەسەڵاتی بنەماڵەی بارزانی لە ناو حیزبەکەدا قایم بکاتەوە. بۆ ئەمەش پێویستیان بەوە بو کۆنگرە ببەستن.

لە ڕۆژانی ٤ -١١ تشرینی دوەمی ٧٩ لە ئوردوگای زیوەی سەر بە ئوستانی ئازەربایجانی غەربی لە ئێران، بە ئامادە بونی ٣٢٥ کەس، کۆنگرەی نوهەمی گرت. لە دوای ئازاری ١٩٧٠ وە ئەوە یەکەمین کۆنگرەی بو.

لەم کۆنگرەیەدا مەسعود «ڕاپۆرتی سیاسی و عەسکەری و تەنزیمی» خوێندەوە. باسی ڕوداوەکانی دوای ئازاری کرد، بە تایبەتی ئاشبەتال، بەلام باوکی و بنەماڵەکەی خۆیانی لە هەمو ئوبالێک پەڕاندەوە و، ئوبالی ئاشبەتال و ئەو کارەساتەی بە سەر کورد هات بو، خستە ئەستوی دەستوپێوەندەکانی مەلا مستەفا و، شا و ئەمەریکا. لە ڕاپۆرتەکەدا ئەلێ:

«پاش ١٩٧٠ یەعنی پاش ڕێککەوتنەکەی ١١ ی ئازار.. هەمومان توشی غرور بوین و ڕوژ بە ڕوژ ڕوحی شۆڕشگێڕایەتیمان لە دەست دا. لە جیاتی ئەوەی سود لەو سەرکەوتنە وەربگرین و ڕێکخستنی پارتی بچەسپێنین لە ناو جەماوەر، دەرگای بەرەڵلایی و فەوزا کرابوەوە، وە شتی ئەساسی کە بۆ هەر شۆڕشێک پێویستە لە بیر چو بو. لە سەر نیطاقی پەیوەندی دەرەوە دیسان زۆر ئیشتیباهات کرا چ لە ژێر ضغطی ڕوداو وە چ لە نەزانین، بە تایبەتی لە سالی ١٩٧٣ - ١٩٧٤..

«پاش نەکسەی ١٩٧٥ زۆر کەس ڕایان کرد لە مەیدان. پێش ئەو کاتە بە هەمو شت ڕازی بون. بەشدار بون لە هەمو بڕیارەکان باش یا خراپ وە دەوری بالایان هەبو.. بەلام پاش نەکسە.. بە هەمو جورێک هەولیان دا مەسئولیەت بخەنە سەر شانی ئەو و بەس.. ئەبی بۆ تاریخ بلێین کە بارزانی پاش سالی ١٩٧٠ مەسئول نەبوە لە زۆر ئەخطائی کە کراو زۆر شتیش ئێمومانان کە لە دەوری ئەو بوین لی ی مەسئولین.. بەلکو هەمو قیادە مەسئول بوە و ئەمە واقیع و حەقیقەتە..»

«ئەسبابی نەکسە نە تەنها پیلانی جەزائیر بو. هەرچەندە ئەم پیلانە هۆیەکی سەرەکی بو، بەلام ئەسبابی ناوخۆ دیسان دەورێکی زوری هەبو کە پیلانی جزائیر

سەربکریت. بێگومان مەبەستی ئیمپریالیستی ئەمریکا و نۆکەرانی لە ناوچە، وە بە تایبەتی رژێمی دیکتاتوری شاهی روخاو و رژێمی فاشیستی بەغدا ئەوە بو کە ناوی کورد بە رابەرایەتی بارزانی و پارتی سەر هەلنەداتەوە.

«هەر یەکێک لە ئێوە مەسئولە لە پاراستنی تراثی بارزانی.. ئێمەش وەک یەکێک لە ئێوە مەسئولین لە تراثی ئەو، وە رویشتن لە سەر ریگەی بۆی داناوین، ئەو ریگەیەی کە لە هیچ زەمانیک دا مساوەمەی نەکرد لە سەر مافی کورد...»

چەند مانگی بو واتەواتی لابردنی سامی هەبو. بنەمالەی بارزانی لی ی ناقایل بون. لە کاتی هەلبژاردنی کومیتەی ناوەندی دا، بنەمالەی بارزانی لیستەیەکیان ریک خست بو، بە ناوی ئەوانەی خۆیان ئەیانویست. زۆری ئەوانەی قیادە موقەتەی تی دا نەبو. سامی نەیویست، بۆ ئەوەی جیگەی لە ناو کومیتەی ناوەندی دا بە تەواوی لیژ نەبی، ئەو دوانزە کەسەی لە سەردەمی قیادەی موقەتەدا لە گەلی بون، لە کومیتەی ناوەندی تازەدا هەلبژیردرینەوە. بنەمالەی بارزانی ئەم مەرجەیان لی قبول نەکرد و، ئەوەیان کرد بە بیانو بو لادانی ئەو و هەمو ئەوانەی گومانیان لە دلسوزییان ئەکرد. کومیتەیەکی ناوەندی هەلبژیردرایەوە جیگەی رەزامەندی خۆیان بو. هوشیار زیباری، کە خال و جیگای متمانەی مسعود بو، یەکیکیان بو.

لەم کۆنگرەیەدا:

- کومیتەیەکی ناوەندی هەلبژیردرا دلسوزی بی چەن و چونی بنەمالەی بارزانی و، گویرایەلی تەواوی فەرمانەکانی بو.

- هەلبژاردنی مەسعود و ئیدریس و، ئەو لیستەیەی ئەمان دیارییان کرد بو بۆ سەرکردایەتی حیزب و، هەلبژاردنی مەسعود بە سەرۆکی حیزب لە جیگای باوکی، ئەو نەریتەی بە تەواوی چەسپاند کە ئەم حیزبە هی بنەمالەی بارزانییە.

- سەرکردایەتی حیزب «تراثی بارزانی» کرد بە چرای ریبازەکەی. بە پی ی ئەو «تراثە» ش هەمو کاری حەلال بو بۆ خۆبەهیز کردن و دەسگرتن بە سەر مەیدانی کوردایەتی دا. بۆ ئەوەش لە باتی ئەوەی چارەی سیاسی بۆ ئەو دوکیشەیە بدۆزیتەوە کە توشی ببو: کیشەی حدکا و، کیشەی یەکیتی. لە کوردستانی ئیران شەری حدکای کرد تا پشتیوانی ئیران بە دەس بهینی، لە دوژمنایەتی یەکیتی دا یارمەتی بدا. شەری یەکیتی کرد بۆ ئەوەی ئەو ملۆزمە لە کوردستانی عیراق نەهیلی.

پارتی بە یارمەتی ئیران، سەرلەنوی هەمو لق و ناوچە و ریکخراو و، هیز و بەتالیونەکانی، لە ناو شارەکانی ئیران و لە ناوچە سنورییەکان دا دروست کردەوە. بارەگای مەکتەبی سیاسی و، دەزگا سەرکردەییەکانی و، ئیستگای رادیوکەی، لە گوندی راژان لە نزیک ورمی دانا. بە ئاشکرا هاوکاری لە گەل ئیران ئەکرد دژی کوردەکان.

ئەندامانی پیشوی قیادە موقەتە هەمو چون بۆ ئەوروپا و، سامی بش ماوەیەک لە ئیران گیرا، دوای بەربونی ئەویش چو بۆ بەریتانیا. خۆی لە ناو کۆرە تایبەتیەکانی دا، وای پیشان ئەدا لە بەر ئەوەی لە سیاسەتی بنەمالەی بارزانی، بە تایبەتی بەرامبەر بە کوردەکانی ئیران، رازی نەبوە بۆیە وازی لی هیناون. راستیەکەی ئەوە بو: ئەوسا بنەمالەی بارزانی، چارەی سامی نەئەویست.

*

## دەیڤید هیرست لە ناوزەنگ

رۆژنامەوانی بەریتانی دەیڤید هیرست پەیامنێری رۆژنامەی «گاردیان» لەندەنی لە رۆژهەلاتی ناوەراست، کە لە بیروت دائەنیشت، سەردانێکی کوردستانی کرد و، بە سەر هەمو لایەنە کوردیەکان دا گەرا بو. دەیڤید پێشتریش هات بو بۆ کوردستان و، زەمانی عەرەبی ئەزانی. چو بو بۆ ورمێ بۆ بینینی سەرانی پارتی سامی دی بو، لەو کاتەدا خەریکی کۆنگرەی نۆیەم بون. دوای ئەوی چو بو بۆ دولە تو بۆ بینینی سەرانی حسک د. مەحمودی دی بو.

دەیڤید هات بۆ ناوزەنگ بۆ بینینی سەرانی یەکیتی. بە ریکەوت مامجەلال لەوی نەبو، چو بو بۆ بینینی قاسملو، لە بەر ئەوە من بینیم. عەبدولرەزاق فەیلی یش لەوی بو. سەردانی بارەگای حشع یشی کرد. لەو ناوە توشی دو پێشمەرگەی یەکیتی بوبو. هەندێ پرسیاری لێ کرد بون دەربارەی چالاکی پێشمەرگە لە ناو شارەکان دا، هەردوکیان باسی ئەوەیان بۆ کرد بو، کە تازە خۆیان لە چالاکیەکی ناوشاری سلێمانی گەراونەتەوە. راستی ئەم هەوالەی لە د. مەحمود پرسی بو، یەکسەر بە درۆی خستبونەوە. شەو لە لای ئێمە مایەوە. زۆری پرسیار کرد و، منیش پرسیاری زۆرم لێ کرد. ئەوی سەرلێجی دەیڤیدی راکیشا بو، ئەوە بو: هەمو ئەم حیزبانە دژی یەکتری دوا بون. سامی دژی یەکیتی و حسک، د. مەحمود دژی یەکیتی و پارتی، منیش دژی پارتی و حسک. پرسیاری سەرەکیی دەربارەی هۆکانی ناکوکیی ناو حیزبە کوردیەکان بو. چەندێ هەولم دا بۆی رون بکەمەوە عەقلی نەیبری.

دەیڤید زنجیرەیەک وتاری لە گاردیان دا لە سەر جولانەوەی کورد و، لە سەر گەرانەکەی، بلاو کردەوە.

*

## کاری بەرەیی

هەولی یەکخستنی موعارەضەی عیراقی کۆنە. سەرەتای حەفتاکان توع (التجمع الوطني العراقي) دامەزرا بو. بەلام ئەمیش وەکو هیزێکی دەرەوەی ولات لە سەر ئەرز دەورێکی نەبو. کە یەکیتی بو بە ئەندامی توع، توع تین و تاوێکی تێ گەرایەوە و، بە تما بون شۆرشەکەی کوردستان، لە روی سەرکردایەتی و پێکهاتنی هێز و مەیدانی کارەوە، بیکەن بە شۆرشێکی عیراقی. رادیوکەی یەکیتی ناوی نرا بو: «دەنگی شۆرشی عیراق» و، چالاکیەکانی پێشمەرگەکانی یەکیتی وەکو چالاکی توع بلاو ئەکرایەوە. سەرکردایەتی توع، سەرکردایەتیەکی مەیدانی بۆ جولانەوەکە دانا، ئەگەرچی ئەبو شەوقی (جواد الدوش) و، ئەبو عومەر (عوني قلمچي) لە «الحركة العربية الاشتراكية» و، حازم (عبدالجبار الكبيسي)، صەفاء (فەوزي راوي) و، ئەبو صەلاح (مهدي عليوى) و، هەندێکی تر لە سەرانی بەعس ماوەیەک لە ناوزەنگ بارەگایان دانا، بەلام راستیەکەی ئەمە شتی روکەش و روالەت بو، هیچ کات شۆرشەکە بە کردەوە لە هیچ رویەکەوە نەبو بە شۆرشی گەلی عیراق.

دوای لبنانی حشع، زۆر لە سەرکردەکانی رویان کردە ئەوروپای رۆژهەلات و، سوریا و لوبنان. پاش ئەوەی نائومید بون لە پیکهاتنەوە لە گەل بەعس و گەرانەوە بۆ

بەغداد، لە کۆبوونەوەیەکی کۆمیتەی ناوەندی دا دروشمی ڕوخاندنی ڕژێمیان هەڵگرت و، کەوتنە داوای پێکهێنانی «بەرەی فراوانی هێزە عیراقیەکان». حشع خۆی بە تەنها لاواز بو، لە بەر ئەوە پروپاگاندەیەکی زۆری بۆ ئەم بیرە نەکرد و، لە هەمو کۆبوونەوە و دانیشتنێک دا ئەیان وتەوە. کاربەدەستانی سوریا و یەمەن و سەرانی فەلەستینیەکانیشیان تێ گەیاند بو. هەندێ لە هێزە نەتەوەپەرستەکانی عیراق، بە تایبەتی بەعسیەکانی عیراقی سەر بە سوریا لەوانە حازم (عبدالجبار الكبيسي)، حەزیان لە چارەی شیوعیەکان نەئەکرد. ئەمانە لە بنچینەدا بە بیروباوەری «دژایەتی کۆمونیستی» پەروەردە کرا بون. هاوکاری ئەوان و کاربەدەستانی عیراقیشی هات بوە بان.

*

## کۆمیتەی ٤ قوڵی

هەوڵەکانی حشع لە سوریا سەری نەگرت بو. سەرانی حشع لە کوردستانیش بەردەوام بون لە سەر هەمان هەوڵ و تەقەلا. لە هەمو کۆبوونەوە دوقوڵیەکانیان دا لە گەڵ یەکێتی ئەم باسەیان دوبارە ئەکردەوە. سەرەنجام لە ناوەڕاستی مانگی کانونی یەکەمی ١٩٧٩ یەکەمین کۆبوونەوەی چوار قوڵی: یەکێتی، حشع، الحركة الاشتراكية العربية (حاع)، حزب البعث العربي الاشتراكي - قيادة قطر العراق (سەر بە سوریا) کرا و، ڕاگەیاندنێکی هاوبەشیان دەرکرد. بڕیاریان دا لە دیمەشق کۆبوونەوەیەکی تر بکرێ. بە نوێنەرایەتی یەکێتی من دانرام کە بچم بۆ بەشداری لە کۆبوونەوەکەی شام دا.

بە کۆمەڵ بە ڕێ کەوتین بۆ تاران بۆ ئەوەی لەوێوە بچین بۆ سوریا. لە حشع: مەلا ئەحمەدی بانیخێلانی. لە بەعس: ئەبو سەلاح. لە حاع: ئەبو شەوقی و ئەبو عومەر. لە یەکێتی: من.

لە شام بیروڕای حازم جیا بو لە گەڵ بیروڕای هاوڕێکانی لە کوردستان. کۆبوونەوەکە نەکرا و، کۆمیتەکە کۆ نەبوەوە و، کارەکە سەری نەگرت. لە شام چەند جارێ کەریم ئەحمەدم بینی. هەروەها حازم.

سەری لوبنانم دا. بیروت لەو کاتەدا بە کردەوە لە ژێر دەسەلاتی فەلەستینیەکان دا بو. نایف حەواتمە، سەرکردەی «الجبهه الشعبیه» و، جورج حەبەش سەرکردەی «الجبهه الدیمقراطیه» م بینی. بیروڕاکانی یەکێتی م بۆ باسکردن دەربارەی هەلومەرجی ناو عیراق و، هەڵوێستی یەکێتی لە ڕوداوەکانی ئێران. مامجەلال نامەی بۆ هەردوکیان نوسی بو، من نامەکانم بۆ برد بون. کەچی هەردوکیان زۆر بە ئاشکرا وایان دەرخست کە باوەڕیان بە مامجەلال نیە. قسە کۆنەکەم بیر کەوتەوە کە ئەڵێ: «بۆ بۆرەپیاو خۆت بە کوشت بدەی، ئەڵێ: بە دەردی خوا مرد!». پێم سەیر بو مامجەلال ئەو هەمو چاکەیەی لە گەڵ کرد بون کەچی ئەوان بەو جۆرە سەیریان ئەکرد و چاکەیان ئەدایەوە. جیاوازیەکی ئەوتۆیان لە نێوان یەکێتی و پارتی دا نەئەدی.

*

هەر لەم سەفەرەدا جارێکی تر سەردانی نەمسام کردەوە. لە کۆنگرەیەک دا بەشدار بوم کە خوێندکارانی کورد لە نەمسا ئەیانگرت.

*

بەغداد، لە کۆبونەوەیەکی کومیتەی ناوەندی دا دروشمی روخاندنی رژیمیان هەلگرت و، کەوتنە داوای پێکهێنانی «بەرەی فراوانی هێزە عیراقیەکان». حشع خۆی بە تەنیا لاواز بو، لە بەر ئەوە پروپاگاندەیەکی زوری بو ئەم بیرە ئەکرد و، لە هەمو کوبونەوە و دانیشتنێک دا ئەیان وتەوە. کاربەدەستانی سوریا و یەمەن و سەرانی فەلەستینیەکانیشیان تێ گەیاند بو. هەندی لە هێزە نەتەوەپەرستەکانی عیراق، بە تایبەتی بەعسیەکانی عیراقی سەر بە سوریا لەوانە حازم (عبدالجبار الكبیسی)، حەزیان لە چارەی شیوعیەکان نەئەکرد. ئەمانە لە بنچینەدا بە بیروباوەری «ئەنتی کومونیستی» پەروەردە کرا بون، هاوکاری ئەوان و کاربەدەستانی عیراقیشی هات بوە بان.

*

کومیتەی ٤ قولی

هەولەکانی حشع لە سوریا سەری نەگرت بو. سەرانی حشع لە کوردستانیش بەردەوام بون لە سەر هەمان هەول و تەقەلا. لە هەمو کوبونەوە دوقولیەکانیان دا لە گەل یەکێتی ئەم باسەیان دوبارە ئەکردەوە. سەرەنجام لە ناوەراستی مانگی کانونی یەکەمی ١٩٧٩ یەکەمین کوبونەوەی چوار قولی: یەکێتی، حشع، الحركە الاشتراكیە العربیە (حاع)، حزب البعث العربی الاشتراكی - قیادە قطر العراق (سەر بە سوریا) کرا و، راگەیاندنێکی هاوبەشیان دەرکرد. بریاریان دا لە دیمەشق کوبونەوەیەکی تر بکری. بە نوێنەرایەتی یەکێتی من دانرام کە بچم بو بەشداری لە کوبونەوەکەی شام دا.

بە کومەل بە رێ کەوتین بو تاران بو ئەوەی لەوێوە بچین بو سوریا. لە حشع: مەلا ئەحمەدی بانیخیلانی. لە بەعس: ئەبو صەلاح. لە حاع: ئەبو شەوقی و ئەبو عومەر. لە یەکێتی: من.

لە شام بیروڕای حازم جیا بو لە گەل بیروڕای هاورێکانی لە کوردستان. کوبونەوەکە نەکرا و، کومیتەکە کو نەبوەوە و، کارەکە سەری نەگرت. لە شام چەند جارێ کەریم ئەحمەدم بینی، هەروەها حازم.

سەری لوبنانم دا. بیروت لەو کاتەدا بە کردەوە لە ژێر دەسەلاتی فەلەستینیەکان دا بو. نایف حەواتمە، سەرکردەی «الجبهە الشعبیە» و، جورج حەبەش سەرکردەی «الجبهە الدیمقراطیە» م بینی. بیروراکانی یەکێتی م بو باسکردن دەربارەی هەلومەرجی ناو عیراق و، هەلویستی یەکێتی لە روداوەکانی ئێران. مامجەلال نامەی بو هەردوکیان نوسی بو، من نامەکانم بو برد بون، کەچی هەردوکیان زور بە ئاشکرا وایان دەرخست کە باوەریان بە مامجەلال نیە. قسە کونەکەم بیر کەوتەوە کە ئەلێ: «بو بوزەپیاو خوت بە کوشت بدەی، ئەلێ: بە دەردی خوا مردا». پێم سەیر بو مامجەلال ئەو هەمو چاکەیەی لە گەل کرد بون کەچی ئەوان بەو جورە سەیریان ئەکرد و چاکەیان نەدایەوە، جیاوازیەکی ئەوتویان لە نێوان یەکێتی و پارتی دا نەئەدی.

*

هەر لەم سەفەرەدا جارێکی تر سەردانی نەمسام کردەوە. لە کونگرەیەک دا بەشدار بوم کە خوێندکارانی کورد لە نەمسا ئەیانگرت.

*

# سالی ١٩٨٠

**له تیرمینالی فرۆکەوە بۆ چاپری ستور**

رۆژی ١٣ ی شوباتی ١٩٨٠ له گەڵ عومەری حاجی عەبدوللا، شازاد گەیشتینە فرۆکەخانەی میهرآباد له تاران. عومەر شیخموس و هاوسەرەکەیشی هاوزەمان گەیشتن. ئەمان کیشەیان نەبو تی پەرین و، ئیمەش کەلوپەلەکانی خۆمان بەوان دا نارد. ئیمە چونکە ڤیزای ئیراقمان نەبو ریگەیان نەداین برۆین. گلیان داینەوە خەریک بو سواری فرۆکەیەکی ترمان بکەن و رەوانەی سوریامان بکەنەوە. د. فوئاد مەعصوم ئەو کاتە نوینەری یەکیتی بو لای حکومەتی ئیران. بەلینیان دابویە ڤیزاکەمان لای کاربەدەستانی فرۆکەخانە بۆ دابنین، بەلینەکەیان بە جی نەهینا بو. گیچەلی زۆریان پی کردین. بۆ ئەوەی خۆمان گیر بکەین تا کارەکەمان بۆ جیبەجی ئەبو ناچار بوین سەرو بلیتی تازە بکرین. پاش چەند سەعاتی چاوەروانی ریگەیان داین بچینە ناو تارانەوە.

*

له ریگای مەهابادەوە چوینە گوندی بیوران. ئەو کاتە لە نیوان بیوران و سنوری عیراق دا هینان و بردنی کەلوپەل لە برەودا بو. لە بیوران و ناوزەنگ دو تیرمینالی گەورەی ولاخی لی بو، هەر یەکەیان بە سەدان ئیستری تی دا راگیرا بو.

ئەوی لیرەدا من بە «تیرمینالی ولاخ» ناوم بردوە، لە کوردی کۆن دا پییان وتوە: «چاپری ستور». نالی لە شیعرنامە بە ناوبانگەکەی دا ئەپرسی:

سەیریکی خۆش لە چیمەنی ناو خانەقا بکە!

ئایا رەبیعی تاوە، یا «چاپری ستور»؟

ئەم دو وشەیە ئیستا لە ناو ولاخدار و کاروانچیەکان دا بە کار ناهینرین. چاپر: تەویلە، بەهاربەند، کە ولاخی تی دا راگیراوە. ستور: چوارپی، ئیستا هەر لە وشەی «سەگ و ستور» دا بە کار ئەهینری کە بۆ سوکایەتی پی کردن ئەوتری.

*

ولاخی بارهەر: ئەسپ، ئیستر، کەر، گا.. لە کوردەواری دا لە زۆر کۆنەوە گرنگییەکی ژیانیی هەبوە. بۆ ئیمەیش کە هەمو کات لە ناوچە شاخاویە سەختەکان دا ئەژیاین و هاتوچۆمان ئەکرد، بو بو بە بەشیکی زەروری لە پیویستیەکانی ژیانی رۆژانە و راپەراندنی کارەکانمان. لە بەر ئەوە منیش لە گەڵ ولاخ بو بوم بە ئاشنا و، شارەزای هەلسوکەوت و، راگرتن و، پیویستیەکانی بوبوم.

«ولاخ» لە «ئولاغ» ی مەغولی وەرگیراوە. بەم بۆنەیەوە هەندی وشەی مەغولی هاتۆتە ناو زمانی کوردییەوە، لەوانە: یاسا، قۆناغ، چۆک و بە چۆک دا هاتن، تامغە، تەغار، تمن، نۆکەر، قەیتول، ئوردو، ئیل، .. ئەمە هیچ عەیبیکی تیا نیە. هەمو زمانە زیندوەکانی دنیا وشەی بیگانەیان وەرگرتوە و، لە زمانەکەیان دا تواندویانەتەوە. وەرگرتنی وشە: یان یەکیکی ناسراو لە نوسینەکانی دا وەری ئەگری، یان خەلک لە ئەنجامی زۆر بە

کار هینان دا لایان ئەبی بە باو. لە هەردو حالەت دا ئەچیتە فەرهەنگی زمانەوە و، ئەبی بە مولکی ئەو زمانە.

*

ئەسپ

ئەسپ نێر و مایین می، هەمیشە نرخێکی تایبەتی و ریزێکی تایبەتی هەبوە و، هەبونی نیشانەی پایەی کۆمەلایەتی خاوەنەکەی بوە. بە زۆری بۆ سوار بون بە کار هێنراوە. کە کراوە بە هێ بارېردن ئیتر پێیان وتوە: «بارگیر»، یان «بارگین» و، کە خەساندویانە پێیان وتوە: «یەختە» یا «یەرمغە».

ئەسپی رەسەن، کە دایک و باوکی ناسراو بێ، لە ئەسپی تر کە دایک و باوکی نەناسراو بێ پەسندترە. رەگەزی عەرەبی لە هەمویان پەسندترە. بە گوێرەی رەنگەکانی بە شێ، کوێت، کەحیلە، موحەننەک ناو ئەبرێن.

مایین «جوانو» ی ئەبی و، کە بو بە دو ساڵ پێ ی ئەلێن «نوما». تا ٣ ساڵ هەر بە خێو ئەکرێ، لە بەر ئەوەی ئێسقانی برېرەی پشتی بەرگەی هەلگرتنی قورسایی ناگرێ، نە باری لێ ئەنێن و نە سواری ئەبن. لە ساڵی چوارەم دا ئەڵێن: «پشتی گرتوە»، ئیتر خەریکی راهێنانی ئەبن بۆ سواری. راهێنانی زانین و شارەزایی و حەوسەلەی درێژی ئەوێ.

ئەسپ «رەوت» و «نەرمە غار» و «غار» و «لۆقە» ئەکا.

ئەسپ ولاخێکی «یەک سم» ە، ئەبی سمی «نال» بکرێ، ئەگینا ژێر سمی بریندار ئەبێ.

ئەسپ «زین» ی لێ ئەکرێ. زین لە چەرم و تەختە و لباد دروست ئەکرێ. کاتێ خۆی بە خشلی زێر و زیو رازاندویانەتەوە. بۆ زەوت کردنی لە سوار بون دا «لغاو» ئەکرێتە دەمی.

ئەسپ لە «تەوێلە» دا ئەبەسترێتەوە و، لە «ئاخور» دا «ئالیک» ئەدرێ. پێشینان وتویانە: «لە ئەسپی نەبو، ئاخور هەلئەبەستی!» لە بەهاران دا کە بە کۆمەل لە لەوەرگادا بەرەڵلا ئەکرێن، پێ ی ئەڵێن: «رەوە» و، ئەوی خزمەتیان ئەکا «مەیتەر».

لە ئەفسانەی کوردی دا، ئەسپەکەی رۆستەم ناوی «رەخش» و، هی خەسرەوی پەرویز «شەودیز» و، هی ئیمامی عەلی «دولدول» بوە. لە چاو ئەسپی ئاسایی دا هەریەکەیان هونەرێکی هەبوە.

پێشینان وتویانە: «سواری ئەسپی خەڵک بێ هەر پیادەی».
سالم لە باسی خۆی و ئەسپەکەی دا ئەڵێ:
خانە خوێم میوان نەوازە، وەرنە سەیری پیاوەتی
دۆشەکی خۆم خاک و خۆڵ و، سەر راخەری ئەسپم سەما
شیشی سور بێنن وەرن خالیکمان داخ کەن بە جوت
چونکە ژانمان کرد: من و ئەسپم، لە بەر سەردی هەوا
ئەمن و بارگیری کوێت هەردو بنوێن بەشکم بە خەو
من ببینم روی خۆراک و، ئەو ببینی روی کا

*

## کەر

نێرەکەر و ماکەر، یان وەکو پێ یشی ئەلێن: گوێدرێژ، ئەمیش بۆ بارکردن و سواری بەکار هێنراوە، بەلام نەسپ لە ئێستر و، ئێستر لە کەر بەرێزتر بوە. پێشینان وتویانە: «لە ئێستر دابەزی سواری کەر بو». عەرەب پێیان وتوە: «مرکب الصالحین» چونکە بۆ سوار بون و دابەزین ئاسانە و هیچ هونەرێکی ناوێ.

کەر وڵاخێکی «یەک سم» ە، سمی «نال» ئەکرێ. پەندێکی پێشینان ئەلێ: «سم سمی کەرە و، چنگ چنگی مەیماسیێ، یاران لەم کارە سەرم ئەماسیێ!»

بە بەچکەی کەر و ئێستر ئەلێن: «جاش». راستیەکەی زولمێکی گەورەیان لێ کردوە چونکە ئەم ناوەیان لە خانینانی جولانەوەی کورد ناوە، لە کاتێک دا جاشی کەر و جاشی ئێستر بە درێژایی مێژو خزمەتی کوردیان کردوە و، کەچی ئەوان زەرەریان لێ داوە.

کەری لای ئێمە چەند رەسەنێکی هەبوە بە ناوبانگترینیان: حەساوی، بەغدایی، قوبروسی، لە گەورەیی قەلافەتیان دا جیاوازن.

کەر بە ئالێکی کەم دائەکەوێ و، بەرگەی ماندوبەتی و برسیێتی ئەگرێ.

کەر «جل» و، ئەگەر خۆشەویست بێ «کورتان» ی لێ ئەکرێ. پێشینان وتویانە: «کەرەکە مەمرە بەهارە، کورتانت بۆ دێ لە شارە!» جل لە کۆنە لباد و بەرە و، کورتان لە بەرە و پوش، دروست ئەکرێ.

کەر لە گەڵ مانگا و ئێستر ئەکرێتە «گەوڕ» ەوە.

لە گەڵ ئەوەی کەر، لە لای کورد، بە نمونەی دەبەنگی دائەنرێ، کەچی لە پەندی پێشینان دا جێگەیەکی تایبەتی هەیە. بۆ گەوجێتی ئەلێن: «کەرێکە بە چوار پێ ئەروا» و، بۆ هەلپەرستی و بێ باری ئەلێن: «کەری ناو جزگایە، قەپاڵ لە هەردو بەر ئەدا». بۆ پەلکەی پشت گوێ خران ئەلێن: «کەس لێ ی ناپرسێ: کەرت بە چەند؟»

پێشینان وتویانە: «کەرێکم دا بە کەرێ، سندان لە بنا گوێ ی دەرێ»، هەروەها: «کەر لە کوێ کەوتوە و، کوندە لە کوێ دڕاوە؟»، هەروەها: «کەر بارەکەی تفەنگ بێ گورگ هەر نەیخوا!»، هەروەها: «کەر بە کاروان قەڵەو نابێ»، هەروەها: «کەرێ بە پارەی پەفر بکردرێ، لە ئاوا ئەخنکێ»، هەروەها: «بە کەر ناوێرێ بە کورتان شێرە» هەروەها: «کەر نۆ بەرێ دەش ئەبا»، هەروەها: «بە بۆنی کەبابەوە چو، کەریان داخ ئەکرد»، هەروەها: «کەری خزمە و گوێ ی ناڵ ئەکەم».

نالی لە باسی کەرەکەی دا ئەلێ:

هەی کەرێکم بو، چ پەیکەر! تەیکەری هەوراز و لێژ
سینە پان و، موچە کورت و، شانە بەرز و، گوێ درێژ

لە دوا بەیتی دا ئەلێ:

چەندە پێم خۆش بو زوبانی حاڵی دەیوت «نالیا»
هەردو حەیوانین، ئەتۆ گوێ کورت و ئەمنیش گوێ درێژ

*

## ئێستر

ئێستر، یاوەکو پێ یشی ئەلێن: «قاتر»، ئەزوکە زاووزێ ناکا. لە ئەنجامی «چاکردن» ی ماین دا لە نێرەکەر، پەیدا ئەبێ، بۆیە پێشینان وتویانە: «لە ئێستریان

پرسی: پاوکت کی بە؟ وتی: خالم ئەسپە». مەراسیمی ئەم چاکردنە بەزمێکی خۆشە شتێکی لە شایی کەمترە.

جاشی ئێستر ئەبێ ٣ ساڵ لە سەری بوەستێ تا «پشت ئەگری». ئەوسا لە گەڵی خەریک ئەبن بۆ ئەوەی فێری بار هەڵگرتن بێ. ئێستر لە ئەسپ و لە کەر بەهێزترە و، بۆ ناوچەی شاخاوی ئازا و بە کارە و، زیاتر بەرگەی بار و هەوراز و ماندوێتی ئەگری.

ئێستر ولاخێکی «یەک سم» ە، ئەبێ سمی «نال» بکری.

هەندێ ئێستر دوای ڕاهێنانیش لە کاتی بارکردن و سوار بون دا بە ئاسانی مل نادا و هەڵەتیزێنی، «لەقە» و «جوتە» و «لوشکە» ئەهاوێژی. بەمانە ئەوترێ: «چەمووش» و، لە هەندێ ناوچە «شەموس». ئێستری پەسند ئەوەیە: هێمن بێ، گونە لوتەکانی فش و سنگی پان و، قاچەکانی لە یەک دور بێ بۆ ئەوەی لە ڕۆیشتن دا لە یەک نەدەن. ئەو ئێسترانەی قاچیان لە یەک ئەدەن پێیان ئەڵێن: «پەیزەن» و پەسند نین.

بۆ زانینی جوانی و پیری ئێستر سەیری دەمودانی ئەکەن، ئەگەر دانی کەوت بێ، یان سەر «خری» کانی لوس بوبێ، نیشانەی پیر بونە، ئەڵێن: «شێلە» ی پێ نەماوە، ئەگەر دانەکانی تیژ و زبر بێ و گرێچییەکانی سەر دانی مابێ، نیشانەی جوانییە ئەڵێن: «شێلە» ی پێ ماوە. هەر لە بەر ئەمەیە پێشینان وتویانە: «ئەسپی خەڵاتی تەماشای دەم و دانی ناکرێ».

بەرگی ئێستر «کورتان» ە. کورتان بەرەیەکە لە پوش ئەئاخنرێ، بۆ سواری و بۆ بار لێ ی ئەنێن. کورتان بە «بەرۆک» لە پێشەوەی لە سنگ و، بە «پاڵو» لە پشتەوەی لە بن کلکی و، بە «سەر پاڵو» لە خوارووی مورەغەی پشتی و، بە «تەنگە» لە بن ورگی قایم ئەکرێ. «قەیاسە» یش کورتانەکەی پێ توند ئەکرێ. بەرۆک، پاڵو، سەرپاڵو، تەنگە و قەیاسە، لە چەرمی نەرمی پانی وەکو پشتێن یان «کەژو» دروست ئەکرێ.

بۆ زەوتکردن و بەستنەوە و ڕاکێشانی «ڕەشمە» یا «هەوسار» ئەکەنە ملی.

ئەگێڕنەوە: یەکێ لە شێخەکانی بەرزنجە پاندێکی جەردەی هەبوە دەروێشەکانی خۆی پێ ڕوت کردۆتەوە. دەروێشەکان، نەیانوێراوە بە ئاشکرا بە شێخ بڵێن، لە حەلقەی زیکردا، بەم بونەیەوە، وتویانە: «ماینەکەت بردم، ڕەشمەکەم بەرۆ! دەروێشی خوتم ڕوتم مەکەرۆ!»

تورەکەیەک ئەکەن بە کورتانەکەی دا کا و جۆی تێ ئەکەن، لە کاتی برسیتی دا ئەیکەنە ملی سەری تێ ئەخا و ئەلەوەڕی، پێ ی ئەڵێن: «جورک».

بۆ جوانی «سەرکەللە» ی بۆ ئەکەن کە بە «کوژدکە» و «مورو» و «گوڵنکە» ئەیڕازێننەوە. «زەنگوڵە» ئەکەنە ملی. زەنگوڵە سەرەرای ئەوەی دەنگێکی خۆش بۆ ولاخەکە دابین ئەکا، لە کاتی ون بونی دا لە دەشتودەر یارمەتی خاوەنەکەی ئەدا بۆ دۆزینەوەی.

بە «سندم» «پێوەند» ی ئەکەن و، بە «مێخ زنجیر» ئەیبەستنەوە.

زۆرجار لە ئەنجامی بار هەڵگرتنی زۆر دا، یان لە ئەنجامی گوێ پێ نەدانی خاوەنەکەی دا، سەر بڕبڕاگەی پشتی ئێستر برینداز ئەبێ و، برینەکەی قوڵ ئەبێ، ئەڵێن «ناوکەرێژ» بوە. ڕەگێکی ئەستور لە ناو لوتی دا پەیدا ئەبێ ئەڵێن: «کەرسمە» ی دەرکردوە. ناتوانێ باش هەناسە بدا. بە چەقۆیەکی تیژ ئەیبڕن و چاک ئەبێتەوە.

سێ، گەنە، کەوەڵە و کرنو، جۆرجانەوەری تر بە پێستی ئێستر دا ئەنوسێ و، تەپوتۆزی زۆری لێ ئەنیشێ، بە «ڕنەک» کە جۆرێکە لە شانەی لە ئاسن دروستکراو

ئەیکرێنن و، ئەیخورێنن، جانەوەرەکانی لێ ئەکەنەوە.

پێشینان وتویانە: «کەر چو بۆ بەغدا بو بە ئێستر»

شێخ رەزا لە پاسی ئێسترەکەی دا ئەڵێ:

مێهر بە سەد مننەت هەناردی ئێسترێکی روت و قوت

دەست و پا سست و سەقەت، ئەندامی هەروەک عەنکەبوت

لە بەیتێکی تری دا ئەڵێ:

شێخ فەتاحی مێتەرم رۆژێک بە حوججەت لێ ی ئەوی

کلکی دەرهێنا لە بن ئینجا بە ئاستەم گوێ ی بزوت

*

## گا

گا بۆ نێر و مانگا، یا چێڵ بۆ مێ. یەکێ لە ولاخە بە نرخەکانی ژیانی مرۆڤ بوە. بۆ جوت و گێرە و باربردن، بە کاریان هێناوە. کە پیریش بوە کوشتویانەتەوە گۆشتەکەیان خواردوە. ئەو سەردەمەی جاف رەوەند بوە، بە زۆری گای لە باتی کەر و ئێستر بۆ بار هەڵگرتن بە کار هێناوە.

گا وەکو مەر و بزن «دو سم» ە، «کاوێژ» ئەکا.

گویرەکە، یا گۆلک، پاش لە شیر برانەوەی نێرەکەی ئەبی بە «نۆوەن» و مێیەکەی بە «نێون» و، ئەوەن لە سالی سێیەم دا ئەبی بە «پارین» و، ئینجا «جوانەگا». گۆلک تا پی ئەگات چاودێری و ماندوبونێکی زۆری ئەوێ. پێشینان وتویانە: «تا گویرەکە بە گا ئەکەی، خوێنی خۆت بە ئاو ئەکەی». گا رۆژانە بە کۆمەڵ ئەبری بۆ لەوەر، پێ ی ئەڵێن: گاگەڵ، یا گاران. پێشینان وتویانە: «گا لە گاگەڵ بە جێ بمێنێ، شاخی خوێ ئەشکێنێ»، هەروەها: «گای لە گاگەڵ دا نیە و، پێ ی بەفر بردویەتی»، هەروەها: «دو گا لە دولێکا ئەگەر رەنگی یەک نەگرن، خوی یەکتری ئەگرن». ئەوی چاودێری گاران ئەکا پێ ی ئەڵێن: «گاوان».

بۆ بی ئاگایی ئەڵێن: «لە گوێ ی گادا نوستوە» و، بۆ نەزانی و نەشارەزایی ئەڵێن: «گا بە گونا ئەناسی» و، بۆ تێکچونی کاروباری ولات بە هۆی خراپیی گەورەی ولاتەوە ئەڵێن: «خەتای گای بنەیە!»

*

حەیوان لە سالێک دا ماوەیەکی دیاریکراو ئارەزوی «جوت گرتن» ی هەیە، لەو ماوەیەدا:

ماین و ماکەر بە «تەڵەب و فاڵ» و، مانگا بە «کەڵ» و، دێڵە سەگ بە «با» و، پشیلە بە «رشمە» و، مەر بە «بەران» و، بزن بە «تەگە» ئەبی.

بۆ ئەو گیانداراە «ئاوس» انەی یەک یا دو بەچکەیان ئەبی «زاین» و، بۆ ئەو گیاندارانەی لە دو بەچکە زیاتریان ئەبێ «ترەکین»، بە کار ئەهێنری. بۆ نمونە:

ماین، مانگا، مەر، بزن.. ئەزێ. پێشینان وتویانە: «مانگا بە دزی کەڵ ئەگرێ و بە ئاشکرا ئەزێ».

سەگ، بەراز، پشیلە.. ئەترەکێ.

بۆ مرۆڤ «مردن» و، بۆ ئەو گیاندارانەی گۆشتیان ئەخوری «مردار» و، بۆ ئەوانەی

گزشتیان ناخوری «تزپین» به کار ئەهێنری.
پیاو ئەمری. پیشینان وتویانە: «مردن مردنە، لنگە فرتێ چیە؟»
مانگا، مەر، بزن، مریشک.. مردار ئەبێتەوە. پیشینان وتویانە: «بۆ جگەری مەڕێ مردار ئەکاتەوە».
کەر، سەگ.. ئەتۆپێ. پیشینان وتویانە: «کەری دێز تۆپینی خۆی و زەرەری ساحیبی ئەوی»، هەروەها: «لە کەری تۆپیو ئەگەرێ نالی پکێنشێتەوە»، هەروەها: «سەگ لە قسابخانە نەتۆپێ عومری بە زایع ئەچێ».
ئەسپ ئەحیلێنێ، کەر ئەزەرێنێ، ئێستر ئەپرمێنێ، گا ئەبۆرێنێ.

*

## کونگرەی چوارەمی حدکا

بە هۆی هەلومەرجی نالەباری ئێرانەوە حدکا لە دامەزراندنیەوە تا سەرکەوتنی شورشی ئێران ۳ جار کۆنگرەی گرت بو:
کونگرەی یەکەم لە ۱۹٤٥ دا.
کونگرەی دوەم لە ۱۹٦٥ دا لە گوندی سونی لە پشدەر (کوردستانی عیراق) کە ئەوسا لە ژێر دەسەلاتی بارزانی دا بو. ئەم کونگرەیە لە باتی ئەوەی ریزەکانی حیزب یەک بخا و، ببێتە دەزگایەکی یەکگرتوی خەبات لە کوردستانی ئێران دا، ناکوکیەکانی ناو ریزەکانی تەقاندنەوە و، پارچە پارچەی کردن.
کونگرەی سێهەم لە ۱۹۷٤ دا لە شاری بەغداد. سەرەرای ناکوکی شەخسی و سیاسی و ریکخراوەیی، ئەم کونگرەیە ریزەکانی دیموکراتی تا رادەیەک یەکخستەوە، کومیتەیەکی ناوەندی یەکگرتوی هەلبژارد و، ئورگانی ناوەندی حیزبی بلاو کردەوە و، پەیوەندی لە گەل رژیمی بەعس دا ریکخست...
کونگرەی چوارەم لە ۱۹ی شوباتی ۱۹۸۰ دا لە مەهاباد گیرا.
هەلومەرجی بەستنی کونگرەی چوارەم لە گەل هی هەمو کونگرەکانی تر جیاواز بو.
- شورشی ئیسلامی رژیمی شاهەتی روخاند بو، بەلام هیشتا بە تەواوی دەسەلاتی خوی نەچسپاند بو، بو یەکەمین جار ئێران ئازادییەکی بی وینەی بە خویەوە دی بو.
- کادرەکانی حدکا، دوای دەیان سال دور ولاتی و دەربەدەری، گەرابونەوە کوردستانی ئێران و، بو بون بە هیزیکی دەسەلاتداری گەورەی سیاسی، ریکخراوەیی، چەکدار لە کوردستان دا.
۳۱۰ ئەندام بەشداری کونگرە بون، کە نوینەرایەتی ۳۰ هەزار ئەندامی حیزبی ئەکرد. بەر لە شورش، هەمو کادر و ئەندامەکانی حیزب لە عیراق نیشتەجی‌بوبنە ۱۰۰ کەس و، لە ئەوروپا بە پەنجەی دەست ئەژمیردران و، لە ناو ئێران دا لەوەش زور کەمتر بون. ژمارەی ئەندامانی حیزب لە ئەنجامی روخانی رژیمی شا و، دروستبونی بوشایی دەسەلات لە کوردستانی ئێران دا، کتوپر و لە چەند مانگیکی کەم دا، وا زیادی کرد بو.
حیزب بو ئەوەی لە ململانی ی دەسەلات دا لە گەل کومەلە و ریکخراوەکانی تر، ببیتە هیزی هەرە گەورە و زالی کوردستان، هەمو جورە کەسیکی، بی گوی دانە رابوردوی سیاسی لە وپەری چەپەوە بو ئەو پەری راست، لە ریزەکانی خوی دا کو کرد بوەوە.
کونگرە بە راپورتیکی دریژی سکرتیری گشتی حیزب، د. ئەورەحمانی قاسملو،

دەستی پێ کرد. چەند ڕۆژێ درێژەی کێشا. هەلومەرجی ئالۆزاوی کوردستان و ئێران و کێشەکانی، لە ناو بیروڕای دانیشتوانی کوردستان و ئەندامانی حدکایش دا ڕەنگی دابوەوە. ناکۆکی لە ڕیزەکانی دا لە سەر کێشەی تایبەتی و، جیاوازی بیروڕا لە شۆڕشی ئیسلامی و، حیزبی تودە و، جۆری بەڕێوەبردنی حیزب و، جولانەوەی کورد.. لە ناو ئەندامەکانی دا ئاشکرا بو. هیچ ڕێکخراوێکی کوردستانی عیراق، بۆ ئەم کونگرەیە، بانگ نەکرا بو، بەلکو لە ڕاپۆرتەکەدا تاوانبار کرا بون بە دەسوەردانە کاروباری ناوخۆی کوردستانی ئێران. کومیتەی ناوەندی هەلبژێردرایەوە، کە تێکەلاو بو لە کەسانی جوراوجوری خاوەن بیروباوەر و هەلویستی جیاواز.

*

لە ڕۆژانی شەڕی کورد و پاسدار دا، یەکێ لە تاقمە چەپەکان جارێکیان ویستبویان پردێکی ڕێگای مەهاباد - سەردەشت خراپ بکەن، وەکو بەشێ لە هەولی دواخستنی لەشکرکێشی هێزەکانی ئێران. پێشمەرگەکانی حدکا ڕێگەیان نەدا بون و، دەریان کرد بون. ئەوانیش وت بویان: «ئێوە خۆتان داوای دیموکراسی ناکەن، ئەم کارەی ئێوە دژی دیموکراسیە». ئەوانیش وت بویان: «ئێمە دیموکراسی مان بۆ ئێران داوا کردوە، بۆ ئێرە خودموختاری!».

د. قاسملو زور جار ئەم نوکتەیەی بە پێکەنینەوە ئەگێڕایەوە. ئەگەرچی خۆی بە هەلگری بیروباوەری دیموکراسی دائەنا و، زوری باس ئەکرد، زورجار ئەیوت: «خراپترین دیموکراسی لە باشترین دیکتاتوری باشترە!»، بەلام زور لە هاورێکانی لە ناو دەفتەری سیاسی و کومیتەی ناوەندی دا تاوانی ناکرۆی و سەپاندنی بیروراکانی خۆیان بە پال ئەدا و، توبالی هەندێ لەم جیابونەوە و وازهێنانانەیان ئەخستە گەردنی ئەو.

*

کۆبونەوەی سەرکردایەتی یەکیتی

لە ڕۆژانی ۲ - ۱۸ ی مارتی ۱۹۸۰، کۆبونەوەی کۆمیتەی سەرکردایەتی و، کادرە پێشکەوتوەکانی یەکیتی کرا. ئەم کۆبونەوانە چەند خەلەلێکی گرنگیان لە یەکیتی دا ئاشکرا کرد کە لایەنی ڕێکخراوەیی و سیاسی و ئایدیولوجییان هەبو:

- کەسی یەکەم و، جۆری بەڕێوە بردنی یەکیتی و دەزگا سەرکردەییەکانی.
- جۆری ڕاگرتنی تەبایی سیاسی و ئایدیولوجی لە ناو بالەکانی دا.
- جۆری ڕاگرتنی هاوسەنگی لە نێوان بالەکانی دا.

یەکیتی لە سەرەتای دامەزراندنی دا «دەستەی دامەزرێنەر» ی هەبو کە پێک هات بو لە ۷ کەس لە دەرەوەی ولات. ئەم ۷ کەسە نوێنەرایەتی هیچ ڕێکخراوێکیان نەئەکرد، بەلکو لە سەر بنچینەی لێوەشاوەیی خۆیان دەس پێشکەرییان کرد بو بۆ دامەزراندنی یەکیتی و، لە ناوەوەی ولاتیش داوا لە چەند کەسێک کرا بو دەستەی دامەزرێنەری یەکیتی پێک بهێنن. ئەوانیش تا لە شار بون نەیانتوانی بو کۆ ببنەوە، دەستەی دامەزرێنەری ولات دابمەزرێنن و، ڕێوشوێنێکی سیاسی، ڕێکخراوەیی، پێشمەرگەیی یەکگرتو بۆ کارکردن لە چوارچێوەی یەکیتی دا دابنێن. وەکو دو ڕێکخراوی جیاواز و داپراو لە یەکتری کاریان کرد بو تا هات بونە شاخ. لە شاخیش نەیانتوانی بو ڕێوشوێنێکی یەکگرتو دابنێن، هەر لایەکیان بۆ خۆی کاری کرد بو، بۆ ئەوەی ناکۆکییەکان دوابخەن سەرکردایەتییەکی

دوانه‌یان بۆ کاروباری سیاسی و پێشمەرگەیی دامەزراند بو، بە تەمای گەڕانەوەی مامجەلال و، بە لاداخستنی ئەو گیروگرفتانە.
تا کۆبونەوەی پرادوست یەکێتی و شۆرشەکە سەرکردایەتییەکی یەکگرتوی نەبو. لە پیرەوی ناوخۆیش دا باسی جۆری دروستکردنی و دەسەلاتەکانی نەکرا بو، بە جێ هێلرا بو بۆ گەشەکردنی یەکێتی و روداوەکانی کوردستان. لە کۆبونەوەی پرادۆست دا، کە بە ئامادەبونی نوێنەرانی بزوتنەوە و کۆمەلە و مامجەلال کرا، بریار درا سەرکردایەتی یەکێتی پەیک بخری و، سکرتێر هەلبژێردری و مەکتەبی سیاسی لە ۲ نوێنەری بزوتنەوە و ۲ نوێنەری کۆمەلە، پێک بهێنری. لەم کۆبونەوەیش دا دەسەلاتەکانی ئەو دەزگایانە دیاری نەکرا و، پیرەوی ناوخو وەکو جاران بی دەسکاری مایەوە. بە دوای ئەوەدا زنجیرەیەک روداو قەومان، سەرکردایەتی یەکێتی لە بەر ئەوەی هەمو رەنج و تەقەلای خۆی بۆ هەلساندنەوەی یەکێتی و شۆرشەکە تەرخان کرد بو، نەیتوانی بو لایەنە (فنی) یەکی جۆری پیوەندییەکانی نیوان بالەکانی یەکێتی و، دەزگا سەرکردەییەکانی: سکرتێر، مەکتەبی سیاسی، کۆمیتەی سەرکردایەتی، لقەکان، بە جۆرێکی گونجاو لە گەل پیویستییەکانی شۆرش و بۆچونی سەرکردایەتی بالەکانی یەکێتی رێک بخاتەوە.
ئەم کۆبونەوانە ئەو کێشەو گیروگرفتانەیان تەقاندەوە.
کۆبونەوەکان بی سەر و بەر بون. رۆژانە درێژەیان پی ئەدرا بی ئەوەی ئەنجامی باشی هەبی. مامجەلال راپورتێکی درێژی نوسی بو، زوری کاتی کۆبونەوەکە بە خوێندنەوە و لێدوانی ئەم راپۆرتەوە کوژرا. زور لە ئەندامانی سەرکردایەتی وەرس بوبون، لە کۆبونەوەدا خەویان ئەهات.

*

عومەرەکان

بە رێکەوت چەند کەسی لەوانەی لە دەزگا سەرکردەییەکانی یەکێتی دا کاریان ئەکرد، ناویان عومەر بو: عومەر مستەفا و عومەر عەزیز لە بزوتنەوە، عومەر عەبدوللا و عومەری سەید عەلی لە کۆمەلە و، عومەر شێخموس لە خەتی گشتی. بۆ ئەوەی ئەم ناوانە لە یەکتری جیا بکرێنەوە، عومەرمستەفا بە کاکی کاکان و کاک عومەر و، عومەر عەزیز بە حاکم عومەر و، عومەری حاجی عەبدوللا بە ملازم عومەر و، عومەری سەید عەلی بە سەید عومەر و، عومەرشێخموس بە هۆمەر ناو ئەبران.
ئەم ناوە لە یەکچوانە هەندی جار «ئیشکال» و نوکتەی دروست ئەکرد. وەکو ئەیانگێرایەوە:
جارێکیان، ۳ عومەر پێکەوە چوبون بۆ لیبیا، یەکی لە لیبییەکان کە بە ریز ناوی چەند عومەری بە دوای یەکا دی بو، وت بوی: بە ۳ عومەر ۱ عەلییان دەس نەکەوتوە لە گەل خۆیانی بهێنن.
جارێکی تر، ۳ عومەر پێکەوە سەردانی سەفارەتی ئیرانییان کرد بو لە شام. ئەو کاتە نیوانی ئیران و یەکێتی ناخۆش بو، ئەمان چو بون خۆشی بکەنەوە. یەکی لە ئیرانییەکان کە ناوەکانی دی بون ۳ عومەر بە دوای یەکا ریز بون، وت بوی: ئەمانەیان ناردوە بۆ باشکردنی پەیوەندی یان بۆ هێرشکردن؟

*

نوینەرانی کۆمەڵە لە مەکتەبی سیاسی دا، وەکو خۆی، سالار و جەعفەر مانەوە. عومەرشیخموس و کەمال خۆشناو لە باتی خەتی گشتی، جەمال حەکیم و عەلی حەویز لە باتی بزوتنەوە دانران. ئەندامانی مەکتەبی سیاسی لە ناو خۆیان دا نەگونجاو بون. مەکتەبی سیاسی زورتر شتێکی روالەت بو، هەمو کۆبونەوەیەکی مەکتەبی سیاسی هەمو ئێچندامێکی سەرکردایەتی بەشداری تی دا ئەکرد کە لەوی بوایە.

نەمانتوانی ناکۆکییەکان چارەسەر بکەین. ناکۆکی لە گەڵ رەسوڵ و بزوتنەوە قوڵتر بو، بە تایبەتی دەرگای کوردستانی ئێرانیان بۆ کرا بوەوە، ناکۆکییەکانی ناو کۆمەڵەیش تا ئەهات ناخۆشتر ئەبو.

*

روخانی شا بۆ ئێمە مزگێنیەکی یەکجار خۆش بو: لەو تاپلوقەیە دەرچوین کە تی ی کەوت بوین و، قوڵاییەکی ستراتیجی مان بۆ دروست بو کە ئەمان توانی هاتوچوی پی دا بکەین و، پێویستیەکانی جولانەوەکەی لی دابین بکەین.

*

یەکیتی ریکخراویکی فیدرالی بو لە کاروباری سیاسی و پیشمەرگەیی و دارایی و راگەیاندن دا یەکگرتو بو، بەلام لە کاروباری ریکخراوەیی دا، هەر ٣ ریکخستن سەرکردایەتی و ریکخستنی تایبەتی و داخراوی خۆی هەبو، هەر ریکخستنە سەربەخۆ بو.

تا ئەم کۆبونەوانە تەنیا کۆمەڵە و بزوتنەوە ریکخراویان لە ناو ولات دا هەبو، لە دەرەوەیش هەر یەکیتی ریکخراوی هەبو، ریکخستنی کۆمەڵە و بزوتنەوە لە دەرەوە کەم و پچوک و تازە لە سەرەتای دامەزراندن دا بون. لەم کۆبونەوانەدا مامجەلال هەولی دا سەرانسەری دەزگا و ریکخراوەکانی یەکیتی بکاتە دەزگای ٣ قلیچقانە: خەتی گشتی، بزوتنەوە، کومەڵە و، لە هەمو دەزگاکان دا ئەم ٣ سەربیە خۆی بنوینی:

مەکتەبی سیاسی پیک بی لە ٦ ئەندام: ٢ خەتی گشتی، ٢ بزوتنەوە، ٢ کۆمەڵە.

کومیتەی سەرکردایەتی پیک بی لە ٢١ ئەندام: ٧ خەتی گشتی، ٧ بزوتنەوە، ٧ کۆمەڵە.

لقەکان پیک بی لە ٣ ئەندام: ١ خەتی گشتی، ١ بزوتنەوە، ١ کۆمەڵە.

لە پیکهینانی دەزگاکانی راگەیاندن، پیشمەرگەیی، ریکخستن، دارایی دا و، لە پیکهینانی هەریمەکانی پیشمەرگەیش دا هەمان شیوە پیرەوی بکری.

بیگومان نواندنەوەی ٣ ریکخراوەیی لە مەکتەبی سیاسی و کومیتەی سەرکردایەتی دا شتیکی پیویست بو، بەلام لە خوار ئەوێوە: دەزگا، لق، هەریم، تەنانەت ناوچە و کەرتەکان، گیروگرفت و کیشەی زوری دروست ئەکرد و، لە مەیدانی کار پی کردن دا ئەنجامی خراپی ئەبو:

١. لە پی سپاردنی کاردا سەرەتای لیوەشاپی فەرامۆش ئەکراو، سەرەتای دلسوزیی حیزبایەتی، یان راستتر تاقمگەری، ئەبو بە پیوانە.

٢. لە بەر ئەوەی ئەم ٣ ریکخراوە لە هەمو ناوچەکان دا وەکو یەک کادریان نەبو، بواری بۆ کەسانی هەلپەرست هەلئەخست، خۆی بە یەکی لەم ریکخراوانەدا هەلبواسی و، ریکخراوەکەیش بۆ قەبەکردنی خۆی بیگریتە خۆی و، بە هەق و بە ناهەق لە سەری هەل بداتی.

٣. مونافسەیەکی ناراستی لە نیوان پالەکان دا دروست ئەکرد بۆ راکیشانی ئەندام و دوست و، بۆ زمان دان لە یەکتری لای سکرتیری گشتی.

٤. یەکیتی ویست و کاری لە دەزگاکان دا ئەشعیشت و تەگەرەی لە خیرایی راپەراندنی کارەکان ئەدا.

ریکخستنی جۆری پیوەندی سکرتیر لە گەل مەکتەبی سیاسی و دەزگا سەرکردەییەکان و، هەر ٣ ریکخراوە جیاوازەکە، یەکی لە کیشە قولە چارەسەر نەکراوەکان بو. بیگومان یەکیتی پیویستی بەوە هەبو، کەسی یەکەمی هەبی، کەسی یەکەم بی هیچ مونافسەیەک مامجەلال بو، هەمو لایەنەکان هەلیان بژارد بو، رازی بون ئەو بی.

لیرەدا چەند مەسەلەیەک ئەهاتە پیشەوە لەوانە:

ئەگەر مامجەلال بە تەنیا خۆی بە خاوەنی ریکخراوی خەتی گشتی ئەزانی، ئەوا ئەویش وەکو سکرتیرەکانی بزوتنەوە و کومەلەی لی دی، خۆ ئەگەر سکرتیری گشتی یەکیتیە، نابی ئیتر خۆی بە خاوەنی خەتی گشتی بزانی.

مامجەلال سکرتیری گشتی بی، دەسەلاتەکانی چیە و، چۆن پەیوەندییەکانی خۆی لە گەل پالەکانی یەکیتی ریک ئەخا؟

مرۆڤی رۆژهەلاتیی لە دەرونی خۆی دا حەزی لە تاکرەوی و ئیستیبدادە، ئیمەی کوردی ئەو زەمانەیش ئەو نمونانەی شارەزای بون، هەمویان لەم بابەتە بون:

- نمونەی کوردی: مەلا مستەفای بارزانی.
- نمونەی عەرەبی: جەمال عەبدولناصر، عەبدولکەریم قاسم، حافظ ئەسەد، ئەحمەد حەسەن بەکر، صەددام حسین.
- نمونەی جیهانی: ستالین، ماوتسیتونگ، تیتۆ، کاسترۆ...

مام جەلال چاوی لە مان، بە زوری چاوی لە نمونە کوردییەکە ئەکرد. ئەوانەی لە ناو یەکیتی دا کۆبوبونەوە بە هیوای دامەزراندنی شیوەیەکی نوی بون لە دارشتنی پیوەندییەکانی ناوخۆ دا، بە تایبەتی ئەو جۆرە پیوەندییەی مەلا مستەفا لە گەل سەرانی پارتی دایمەزراند بو، بە لای ئەمانەوە، یەکی بو لە هۆ سەرەکییەکانی لاواز کردنی پارتی و دەسەلاتەکانی و، لە ئەنجام دا ئاشبەتالی پارتی و شورش. ئەم دو جۆرە ئیشکردنە جیاوازە زوری کاتی ناو سەرکردایەتی بە شتی بیهودەوە ئەکوشت. ئەمانویست شیوەیەکی گونجاو بدوزینەوە.

مەکتەبی سیاسی و، دەزگا سەرکردەییەکانی ریکخستن، پیشمەرگەیی، راگەیاندن، دارایی، پەیوەندییەکان.. هەبون و بە ئەندامانی ٣ ریکخراوەکەی کومەلە، بزوتنەوە، خەتی گشتی، پر کرا بونەوە.

من هەمیشە پەیوەندیم لە گەل مامجەلال باش بوە. هەمیشە ریزی زۆری بیر و بۆچونەکانی منی ئەگرت، بە دریژایی تەمەنی دریژی برایەتیمان لە هیچ بۆنە و کات و شوینیک دا بە گژ من دا نەهات بو. زۆر جار بیر و بوچونەکانمان دژی بیر و بۆچونی یەکتری بوە بەلام هەرگیز دەمان لە یەک نەگیراوە. لە یەکتری عاجز ئەبوین، زو پیک ئەهاتینەوە.

ئەندامانی سەرکردایەتی هەر هەمویان لە پاشملە گلەییان لە مامجەلال ئەکرد و، رەخنەیان لی ئەگرت، بەلام زوری گلەییەکانیان لە سەر شتی بچوک و تایبەتی خۆیان بو،

وەکو: ڕێزی نەگرتون، لە بەر چاوی خەلک لێیان تورە بوە و شکاندونی، حورمەتی ڕەئی نەگرتون و چزتەوە بە ئۆبان دا.. سەرانی کۆمەلە چەند جاری لە کۆبونەوەی تایبەتی خۆیان دا ئەم باسەیان ئەکردەوە و، داوایان لە من ئەکرد لە گەلی باس بکەم و، چارەیەکی بۆ بدۆزینەوە. زۆریان ئەیانوت: «ئەرکی قورسی شۆڕشەکە لە سەر شانی ئێمەیە، لە هەمو لایەنەکانی کە زیاتر قوربانی ئەدەین، بە ژمارەی کادر و پێشمەرگە لە هەمویان زۆرترین.. بۆچی ئەمە لە مامجەلال قوبول بکەین؟» کەچی هەمو جاری کە باسەکەم ئەکردەوە و لە گەلی ئەبو بە ناخۆشیمان، خاوەنی گلەیی و ڕەخنە لە باتی ئەوەی پشتیوانی لە من بکەن، ئەبون بە ناوبژیکەر لە بەینی من و مامجەلال دا.

من زۆرم بیر لی کرد بوەوە، لە گەل زۆر لە هاوڕێکانم گفتوگۆم کرد بۆ چارەیەک بۆ ئەم کێشەیە بدۆزینەوە، تەنانەت ئەوانەی خەتی گشتی بش، وەکو عومەر شێخموس و د. فوئاد مەعصوم، هەمان ڕەئیان هەبو. چەند جاری لە گەل مامجەلال قسەم کرد کە جۆری سکرتاریەتەکەی بگۆڕین بە یەکی لەم دو شێوە حوکمڕانییەی لە دنیادا هەیە: شێوەی سەرۆکایەتی وەکو لە ئەمریکا هەیە، یان شێوەی پارلەمانی وەکو لە ئەوروپای ڕۆژئاوادا هەیە.

شێوەی سەرۆکایەتی، سەرۆک یارمەتیدەرەکانی خۆی بۆ کاروباری پێشمەرگە، ڕاگەیاندن، دارایی، کاروباری پیوەندی دەرەوە... هەلئەبژێری. ئەمانە کۆبونەوەی دەورییان نیە بۆ بڕیاردان لە سەر کاروبار بەلکو سەرۆک هەلیانئەبژێری و سەرۆک ئەرکەکانیان دیاری ئەکا و، هەر لە بەردەمی ئەویش دا لێپرسراو ئەبن. لە باتی مەکتەبی سیاسی دەزگایەکی لەو بابەتە بۆ خۆی هەلبژێری و، لە هەمان کات دا، لە باتی کۆنگرێس، کۆمیتەی سەرکردایەتی ئەبی، تێکەلاو لە هەر ٣ ڕێکخراو، کە ناو بەناو کۆبونەوە ئەکا بۆ دانانی سیاسەتی گشتی و لێپرسینەوەی کارەکانی سەرۆک.

شێوەی پارلەمانی، سەرۆکی وەزیران دوای پرس و ڕا لە گەل هاوڕێکانی ئەندامانی ئەنجومەنی وەزیران هەلئەبژێری و، ئەیانخاتە بەردەمی پارلەمان بۆ وەرگرتنی باوەڕ. ئەنجومەنی وەزیران کۆبونەوەی بەردەوام ئەکەن، بڕیارەکان بە زۆرایەتی ئەدری. بە تاک و بە کۆمەل لە بەردەمی پارلەمان دا لێپرسراون. مامجەلال سەرۆوەزیر و، مەکتەبی سیاسی ئەنجومەنی وەزیران و، کومیتەی سەرکردایەتی پارلەمان، بی.

مامجەلال پێشنیارەکانی پی ناخۆش بو، هیچیانی قوبول نەبو، ئەیویست وەکو خۆی بمێنێتەوە. وەکو خۆیشی مایەوە چونکە ئەندامانی م س و سەرکردایەتی نەیانئەویست توشی بەرەنگاری بین لە گەلی. عەبدولڕەزاق فەیلی ئەیوت: «پارتی حیزبێکی عەشایرییە بەلام بە ئوسلوبی عەسری ئیش ئەکا. یەکیتی حیزبێکی عەسرییە بەلام بە ئوسلوبی عەشائیری ئیش ئەکا».

*

یەکیتی و حدکا

نێوانی مامجەلال و قاسملو و، یەکیتی و حدکا، لە سەرەتاوە بە ڕوالەت باش و خۆش بو، بەلام ڕاستیەکەی بی باوەڕی و گومان لەم پەیوەندییەدا هەبو. حدکا عیراقی بە پشتیوانێکی گرنگ دائەنا بۆ خۆی، نەیئەویست لە بەر خاتری یەکیتی یان هیچ ڕێکخراوێکی تری عیراقی، دۆستایەتی بەعس لە دەس بدا. هەر بەم هۆیەوە، هەمو ئەو

کۆبوونەوانەی لە ئەورووپا لە ساڵانی ڕابوردوودا لە نێوان نوێنەرانی یەکێتی و حدکا و، ڕێکخراوە کوردییەکانی تورکیا و سووریا دا کرا بۆ دامەزراندنی «بەرەیەکی هاوبەشی کوردستانی» سەری نەگرت، زۆر جار نوێنەری حدکا تەگەرەی لەم کۆبوونەوانە ئەدا و، بە بیانوی جیاواز نەیئەهێشت بۆ پێشەوە بچی.

دوای سەرکەوتنی شۆڕشی ئێران، حدکا یەکێتی یان تاوانبار ئەکرد بەوەی دەستی وەرداوەتە ناو کاروباری کوردستانی ئێرانەوە. لە شارەکان دا ڕێکخستنی دروست کردوە و، بە هاندان و یارمەتی یەکێتی بو دوژمنایەتی حدکا، سازکا دامەزراوە. بێگومان ئەمە ڕاست نەبو خۆیشیان ئەیانزانی ڕاست نیە بەڵام کرد بویان بە بیانو و، بە بنیشتە خۆشەی ژێر دانیان، هەر ئەیانوت و ئەیانوتەوە. سازکا لە لایەن یەکێتییەوە دانەمەزرێنرا بو، گوێ ی لە ئامۆژگاری و قسەکانی یەکێتی یش نەئەگرت، بەڵکو یەکێتییان بە ڕێکخراوێکی نەتەوەیی نامارکسی و، هەندێ جار بە «پۆپولیست» دائەنا. بەڵام یەکێتی پەیوەندی باش و دوستانەی لە گەڵ سازکا و سەرکردەکانی و، مەلا شێخ عیزەدین و، هەمو ڕێکخراو و پیاوە ناسراوەکانی کوردستانی ئێران دامەزراند بو. هەروەها لە تارانیش پەیوەندی باشی لە گەڵ هەندێ لە سەرکردەکانی شۆڕش و پیاوە ناسراوەکانی ئێران دامەزراند بو.

ڕاستییەکەی یەکێتی هەوڵی زوری دا پەیوەندی باش و دوستانە لە گەڵ حدکا دابمەزرێنی، ئەمەش بێگومان ئەبو بە هۆی دوراندنی دوستایەتی حکومەتی ئێران و، تا ڕادەیەکیش سوریا، کە پێویستییەکی ژیانیی بۆ یەکێتی هەبو. یەکێتی لە ناو بازنەی ئابلوقەیەکی بە هێزدا بو. سنوری تورکیای لی گیرا بو، لە سنوری عیراقەوە نەیئەتوانی هاتوچۆ بکا، ڕوخانی شا یەکێتی لەم گەمارۆیە دەرهێنا و، دەرگای جیهانی بۆ کردەوە. دوستایەتی لە گەڵ حدکا ئەبو بە هۆی داخستنەوەی ئەم دەرگایە، بەڵام لە ڕوانگەی قازانجی نەتەوەییەوە لامان وابو، کە لەو سەردەمەدا کێشەی کورد لە ئێران دا، گرنگییەکی کاریگەری پەیدا کردوە، ئەبی هەمو کورد یارمەتییان بدا بۆ ئەوەی ئەو هەلەیان لە دەس نەچی و، مافەکانی خۆیان بە دەس بهێنن.

حدکا هەڵوێستیان بەرامبەر یەکێتی دوستانە نەبو، کادر و پێشمەرگەکانیان ڕاسپارد بو، کارئاسانی بۆ یەکێتی نەکەن:

- لە کۆڕ و کۆبوونەوەکانی خۆیان دا و، لە لای حیزب و ڕێکخراوەکانی کە، دژی یەکێتی ئەدوان.
- لە هەر جێگایەکی دەستیان بڕویشتایە تەنگیان بە پێشمەرگەکانی یەکێتی هەڵئەچنی و، لە هاتوچودا ڕێگەیان پی ئەگرتن و، چەند جاری بۆ سوکایەتی پی کردن چەکیان کردن.
- لە هەندی جێگا نوقتەی گومرگیان بەرامبەر نوقتەی گومرگەکانی یەکێتی دانا و، ئاگاداری نوقتەکانی یەکێتییان کرد کە نابی لە خاکی ئێران دا بنکە دابنێن. لەو کاتەدا گومرگ تەنیا سەرچاوەی دەرامەت و ژیانی یەکێتی بو.
- کارئاسانییان بۆ قەم ئەکرد لە ئەرزی کوردستانی ئێران دا بنکەی چەکدار دابنێن و، چەکدار کۆ بکەنەوە و، بە ئازادی هاتوچۆ بکەن.
- ڕەسول مامەند و بزوتنەوە و، د. مەحمودیان هان دا بۆ جیابونەوە لە یەکێتی و، بە چەک و پارە و کارئاسانی یارمەتییان دان.

چەند جاری مامجەلال نامەی بو د. قاسملو نوسی و، نوینەرانی یەکیتی سەردانیان کرد و، مامجەلال خۆیشی چو بو دیدەنیان، ئەمانە پیوەندی دوقولی باشتر نەکرد، هەتا جەنگی ۳ مانگە دەستی پی کرد و، هیزەکانی ئیران، هیزەکانی حدکا و ریکخراوەکانی تریان لە زوری ناوچەکانی کوردستان راونا بەرەو سنوری عیراق، بو نزیک بارەگاکانی یەکیتی.

*

بو چاککردنی پیوەندی دوقولی یەکیتی دەستەیەکی نوینەرایەتی پیک هینا لە: عومەر شیخموس، عومەری حاجی عەبدوللا، جەمال حەکیم، شازاد صائیب و من. لە مانگی نیسانی ۱۹۸۰ دا بە کومەل بە ری کەوتین بو سەردەشت. هەر لە سەردەشتەوە ئیتر خۆمان کرد بە میوانی حدکا. دوای ئەوەی شەویک لە سەردەشت ماینەوە بو روژی دوایی بەری کەوتین بو مەهاباد. لە مەهاباد کوشکیکی شاهانە لە نزیک بەنداوی مەهاباد هەبو لەوی دایان بەزاندین.

گفتوگوکانمان دەستی پی کرد. لە لایەن حدکاوە: د. قاسملو، مەلا عەبدوللای حەباکی، مستەفا شەلماشی و چەند کەسیکی کە بەشداری کۆبونەوەکان ئەبون.

ئیمە لە قسەکانمان دا ویستمان چەند مسەلەیەکیان بو رون بکەینەوە:

«ئیمە هیچ هۆیەکی راستەقینە نابینین بو ئەو ساردییەی لە پیوەندی دوقولی یەکیتی و حدکا دا هەیە و، هاتوین بو ئەوەی هۆکانی بنبر بکەین و، قوناغیکی تازەی دوستایەتی و هاوکاری دەس پی بکەین و، لە لای ئیمەوە سنوریک بو ئەو دۆستایەتیە نیە بە جی ی ئەهیلین ئیوە دیاری بکەن»

وتمان: «ئیستا کورد لە ئیران دا هەلیکی میژویی بو هەلکەوتوە، ناوبانگی حکومەتی ئیران بە تایبەتی دوای داگیر کردنی سەفارەتی ئەمەریکی لە دنیادا زور خراپ بوە. حکومەتی ئیران دابراوە لە دنیا. زوری ناوچەکانی کوردستانی ئیران و شارە گرنگەکانی ئازادن و، دەسەلاتی حکومەتی تارانیان تی دا نەماوە، عیراق زور بە توندی دژی رژیمی تازەی ئیرانە، ئەتوانری کەلکی لی وەربگیری، کورد ئەگەر حکومەتیکی کاتیی تایبەت بە خوی دابمەزرینی و، هەلبژاردنیکی گشتی بکا بو پیکهینانی ئەنجومەنی کوردستان و، داوودەزگای راگەیاندن (دەزگای رادیو، تەلەفزیون، روژنامە) و جەنگی (لەشکری نیزامی) دابمەزرینی، ئیمە ئامادەین شورش لە کوردستانی عیراق رابگرین و، هەمو توانای خۆمان هی پیشمەرگەیی و سیاسی و ریکخراوەیی و راگەیاندن، ئەوی لە شاخ و ئەوی لە شار هەمانە، تەرخان بکەین بو خزمەتی ئەو هەنگاوە، بی ئەوەی چاوەروانی هیچ پاداش و دەسکەوتیک بین.»

د. قاسملو زور جار باوەری جیددی خۆی لە قالبی گالتەدا دەرئەبری، بە پیکەنینەوە وتی: «دیارە ئەتانەوی کیشە و گیروگرفتەکانی خوتان لە کوردستانی عیراقەوە بهیننە ناو کوردستانی ئیرانەوە!»

ئەم پیشنیارەیان پسند نەکرد، گیانی «ئیرانی بون» لە بیری سەرانی حدکا دا بەهیزتر بو لە گیانی «کورد بون». حدکا خۆیان بە تاکە پیشرەوی بزوتنەوەی کورد دائەنا لە کوردستانی ئیران دا، ئەیانویست ئیمەش ئەوەیان بو بسەلمینین.

چوینە سەر باسەکانی تر. هەولیکی زورمان دا بەدگومانیەکانیان دەربارەی

پارمەتیدانی سازکا دژی ئەوان و دەس وەردانە کاروباری کوردستانی ئیران بەرەوپێنەوە. بۆ هاوکاری دوقولی چەند سەرەتایەکمان دانا کە ئیتر سالانی دوایی لە سەری رویشتین.

*

سەفەری مامجەلال بۆ دەرەوە.

مامجەلال لە مایسی ۱۹۸۰ دا چو بۆ تاران. زیاتر لە مانگی مایەوە. لەو ماوەیەدا گەورە کاربەدەستانی ئیرانی بینی. هەر لە تارانەوە ئاگاداری کردین کە هەندی کاری پێویست هاتونەتە پێشەوە، ئەبی بچی بۆ شام بەلام زۆری پێ ناچی ئەگەرێتەوە. لەو ماوەیەدا کاربەدەستانی سپای پاسداران بیروڕایان بەرامبەر مامجەلال خراپ بو. مامجەلال سیانزە مانگ لە شام گیری خوارد نەیتوانی بگەرێتەوە.

*

ناوپژی

هەرێمی ۷ ی بالەک یەکی لە هەرێمە چالاکەکانی یەکێتی بو. ناوچەکەیان بە تەواوی راگویزرا بو، هیچ ئاوەدانییەکی تێ دا نەبو. زۆر لە پێشمەرگەکان بو حەسانەوە یا تەداوی یا کاروباری پێویستی خۆیان ئەچون بۆ کوردستانی ئیران.

ئەحمەد سوراو، فەرماندەی گەرتی گەلالەی هەرێمی ۷ چو بو بۆ ئیران. چەکدارەکانی پارتی کە لە ناوچەی خانە بارەگایان هەبو، لە گەل کورەکەی دا، گرت بویان. ئەحمەد هیچ خراپەیەکی بەرامبەر پارتی نەکردبو، هیچ تاوانبکیشی نەبو، جگە لەوەی پێشمەرگەی یەکێتی بو. لە ریگای ئەمرئەوەوە هەولیان دابو، بەری بدەن، سودی نەبو. پێشمەرگەکانی هەرێمەکە بە موافقەتی ئیمە چونە سەر هێزێکی پارتی لە نزیک سریشمە لە ناوچەی گەلالە ۲٤ کەسیان لی گرتن. هەرلەوی هەندیکیان بەردا بون و، ۱۵ کەسیان لی گل دابونەوە و، بە گیراوی رەوانەی لای ئیمەیان کردن لە ناوزەنگ. پارتی بارەیان لی هەستا و، گلەییان گەیاند بوە لای حشع. هەر لەو ماوەیەدا لە دزلی یش لە لای مەریوان شەرێک لە نێوان حدکا و پارتی دا بو، چەند پارتییەک گیرا بون. ئەم دو روداوە هیچ پەیوەندییەکیان لە گەل یەک نەبو. لە دو ناوچەی دور لە یەکتری و، لە گەل دو هێزی جیاواز بو.

حشع کەوتە بەینەوە. لەو لاوە لە گەل حدکا و، لەم لاوە لە گەل ئیمە.

پاش گفتوگۆیەکی زۆر لە سەر ئەوە ریک کەوتین: ئیمە گیراوەکانی پارتی بەر بدەین. پارتی یش گیراوەکانی یەکێتی بەر بدەن. گیراوەکانی پارتی ۱۵ کەس بون، گیراوەکانی یەکێتی ۳ کەس بون. ئەحمەد سوراو و کورەکەی و، عەبدولواحید باجەلان کە ئەویش هەر لە ناو ئیران دا گیرا بو.

رۆژی ۲۹ ی حوزەیرانی ۱۹۸۰ ئیمە هەمو گیراوەکانمان نارد بو لای حشع، تا ئەوان رەوانەی لای سەرکردایەتی پارتییان بکەن و، گیراوەکانی ئیمەش وەربگرنەوە و رەوانەی لای ئیمەی بکەن.

گیراوەکانی پارتی گەیشتنەوە لای سەرکردایەتی خۆیان، بەلام گیراوەکانی ئیمە هەرگیز نەگەیشتنەوە لای یەکێتی. ئەحمەد و کورەکەیان پاش چەند حەفتە بینەوبەرە بەر دابو، بەو مەرجەی تەسلیمی عیراق ببیتەوە، ئەوی تریشیان بەر نەدا بە تۆهمەیەکی درۆ کە

گوایە ویستویەتی سەرۆکی پارتی بکوژێ. حشع، ئەم پەیمانشکێنییەی پارتی بە «روحی ریاضی» وەرگرت، بە سوکایەتی دانەنا بۆ هەولەکەی و، هیچ نارەزاییەکی لە سەر دەرنەبری.
ئەمە نمونەیەک بو لەو ناوێژییانەی حشع لە نێوان یەکێتی و پارتی دا ئەنجامی ئەدا.

*

«علاقاتی امی»

یەکی لە رەخنەکانی عومەری سەید عەلی و، هاوریکانی تری کە تازە لە زیندان ئازاد بوبون، لە هەمو کۆبونەوەیەک دا دوپارەیان ئەکردەوە، ئەوە بو کەوا: ئیمە علاقاتی امی مان فەراموش کردوە و، هیچ هەولیکمان نەداوە بۆ دروست کردنی پەیوەندی لە گەل حیزبە شیوعیەکانی دنیا، بە تایبەتی حیزبی شیوعی سۆڤیەتی و، چینی کریکارانی ولاتانی سەرمایەداری و، خەباتی رزگاریخوازی گەلانی دنیای سێیەم. لەم بارەیەوە زۆر ئەدوایەن. باسی هەولە سەرنەکەوتوەکانی خۆمان و، گۆرانی دنیامان ئەکرد.
سەید عومەر ئەو ماوەیەی لە زیندان بو، دەنگوباسی جولانەوەکانی ئەفەریقای بە وردی چاودیری کرد بو. ناوی زۆر لە سەرکردە و ریکخراوەکانی لە بەر بو. زۆرجار بەخیلیم پی ئەبرد و، هەندی جار لە قسەکانی من تورە ئەبو، بە تایبەتی کە بە.گالتەوە باسی «۳ جۆرگاکە» م لی ئەپرسی. لە سەر دامەزراندنی «علاقاتی امی» زۆریان پی داگرت. بۆ ئەو مەبەستە خۆیان هەندی لە سەرانی حشع یان بینی و، منیش بۆ ئەو مەبەستە سەردانم کردن و، دواتر لە حوزەیرانی ۸۰ دا نامەیەکی رەسمییمان بو پارتی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی نوسی و، بە ریگای حشع دا بۆمان ناردن. بەلام نە لە حیزبی شیوعی سۆڤیەتی و نە لە هی عیراقی هەرگیز وەلامان وەرنەگرتەوە.
هەندی لە برادەرانی دەرەوە جیگایەکیان دۆزی بوەوە «زەمالەی سۆڤیەتی» یان بە پارە لی ئەکری. سەید عومەر و هاوریکانی هیوایەکی ئەوتۆیان بە «علاقاتی امی» نەما.

**

کتیبەکەی سەید عەزیز

سەید عەزیزی شەمزینی نەوەی شیخ عوبەیدوللای نەهری یەکی بو لەوانەی لە یەکیتی سۆڤیت خویند بوی. ئەگەرچی لە (کلیەی عسکری) عیراق دەرچو بو، بەلام بنەمالەکەیان لە ئیران دائەنیشتن. لە ناکۆکییەکانی ۱۹٦٤ دا سەید عەزیز ئەندامی م س بو. مەلا مستەفا ماوەیەک دەسبەسەر داینا و، دوایی تەسلیمی ئیرانی کرد. ئیران وازیان لی هینا لە گوندی شیخان لە نزیک شنۆ دائەنیشت. سەید عەزیز دۆستی مامجەلال بو. زۆر جار نامەی بۆ ئەنارد. یەکەمین جەنەرەیتەری کارەبا کە رادیۆکەمانی پی خرایە کار ئەم بۆی کرین و بە دیاری بۆی ناردبن.
سەید عەزیز لە یەکیتی سۆڤیت دکتورای تەواو کرد بو، نامەی دکتوراکەی لە سەر جولانەوەی رزگاریخوازانەی گەلی کورد نوسی بو. کتیبەکەی کردە عەرەبی و بەشی زۆری لە سەرەتای شەستەکان دا بە زنجیرە لە خەبات دا بلاو کردوە. کتیبەکەی بە پی ی پرۆگرامی مارکسی نوسرا بو. پر بو لە زانیاری تازە دەربارەی ریکخراوە کوردییەکان و شورشەکانی کورد و لیکولینەوەی باش و بەنرخی تی دا بو دەربارەی میژوی نوی ی کورد.
لە یەکی لەو سەفەرانەدا کە بۆ لەندەنی کرد بو ئەسلی روسی کتیبەکە و مسودەکانی بە

عەرەبی هینا بۆ داپۆی بە شازاد لە بەیروت یا لە هەر جێگایەکی تر چاپی بکا. کتێبەکە لە بەیروت مایەوە و چاپ نەکرا. لە یەکێ لەو سەفەرانەدا کە بۆ بەیروتم کرد. کۆپییەکی کتێبەکەم لە گەڵ خۆم هێنایەوە کوردستان. دەزگای راگەیاندن بە عەرەبی چاپی کرد و، فەرید ئەسەسەرد کردی بە کوردی و، بە کوردیش چاپ کرا.

بۆ شارەزایی مێژوی کورد ئەندامانی کۆمەڵە ئەبو ئەم کتێبەی د. عەزیز شەمزینی و «کورد و کوردستان» ەکەی د. ئەورەحمانی قاسملو و، هەندێ لە کتێبەکانی د. کەمال مەزهەر بە تایبەتی «کوردستان لە سالانی شەری یەکەم» دا بخوێننەوە.

*

## دامەزراندنی رادیۆ

دەزگایەکی رادیۆمان هەبو لە برادۆستەوە لە گەڵ خۆمان بۆ نۆکان و لەوێوە بۆ قەندیل و لە قەندیلەوە هینا بۆمانەوە ناوزەنگ. باری ئیستریک بو. لە گەڵ خۆمان ئەمان گیرا بی ئەوەی بتوانین بە گەری بخەین. بە کار خستنی پێویستی: بە جیگایەکی ئەمین هەبو، دەزگاکە و ئاریبەلێ و ماتۆر و ستودیوی تۆمارکردنی قسەی لی دابنرێ. هەروەها پیویستی بە تەکنیکار هەبو بۆ کار پی کردنی.

طلعەت گلی، ئەندازیارێکی کەرکوکی و، ئەندامی یەکیتی لە کوێت کاری ئەکرد. کاتێ خۆی ئەو دەزگای رادیۆکەی هەلبژارد بو. لە کوێتەوە بە نهێنی هاتە ناوزەنگ. دوای گەران بە ناوچەکەدا شوێنێکی هەلبژارد پێیان ئەوت «گردی کوپان» بۆ دانانی داوودەزگای رادیۆ. دارستان گردەکەی داپۆشی بو، کانیەکیشی لی بو.

شێرکۆ حسێن کرا بە فەرماندەی کەرتی پاراستنی رادیۆ و، لە شوێنی دیاریکراو خانوی دروست کرد. هیمن سەراوی و مام عەلی بارمەتیان ئەدا. بارەگایەکی رێکوپێکیان دامەزراند. چەند رۆژی بۆ تاقیکردنەوە کاری پی کرا و، دەرکەوت باش کار ئەکا.

وەکو نیشانەی بایەخدان بە ئیستگای رادیۆ بەرێوەبەر و کادری نوسین و تەکنیکیی، بە جیا لە دەزگای راگەیاندن، بۆ تەرخان کرا. فەرەیدون عەبدولقادر کرا بە لێپرسراوی و، ئەرسەلان بایز بە یاریدەدەری. وتاری کردنەوەی رادیۆ بە عەرەبی فەرەیدون نوسی و، خۆی خوێندیەوە. دوای ئەمە بە چەند رۆژی فەرەیدون سەفەری کرد بۆ شام. ئیستگەکە درایە دەس ئەرسەلان سەرپەرشتی بکا.

تاقمی رادیو تا ئەهات قەرەبالغ ئەبو. زۆری ئەوانەی خۆیان بە نوسەر و شاعیر و ئەدیب ئەزانی، کە ئەهاتنە ریزی پێشمەرگایەتی، لە دەزگای رادیو کۆ ئەبونەوە.

لەو کاتەدا فاضیل ئەندامی م س یەکیتی و، لێپرسراوی دەزگای راگەیاندن بو. ئەمەی بە کەمکردنەوەی دەسەلاتی خۆی دائەنا. بەلام پێشتر جارێک رادیۆکە لە سەرەتای نیسانی ٧٩ دا خرا بوە کار، دوای چەند حەفتەیەک لە بەرێوەبردنی دا سەرکەوتو نەبو بو لە بەر ئەوە دای خست بو. جگە لەوەش فەرەیدون و ئەرسەلان کەسیان ئامادە نەبون لە بەردەستی فاضیل دا کار بکەن. خۆیان لەو بەزلتر و شایستەتر دائەنا.

*

## نەخۆشخانە

تەنیا پزیشکی لە ناو هێزەکەمان دا بو، د.خدر مەعصوم بو. ئەویش چوبو بۆ خۆشناوەتی خەریکی کاروباری سیاسی بو. هاوینی ٧٨ د. جەعفەری شەفیعی هات بۆ

قەندیل. خێوەتێکی کرد بە تیمارگا. نەخۆشی تێ دا ئەدی. لە پاییزدا د. خدریش هاتەوە لای ئێمە و، کە چوینە ناوزەنگ چاوگە خانویەکیان تەرخان کرد بۆ نەخۆشخانە. بەلام د. خدر زۆرتر کاری ڕێکخراوەیی ئەکرد وەک لە پزیشکی چونکە لێپرسراوی لقی یەکیتی بو. بەر لە ڕوخانی شا د. جەعفەر بۆ کاری سیاسی گەڕابوەوە بۆ ئێران. هەر لەو ماوەیەدا د. بەختیار خالید هاتە ڕیزی پێشمەرگایەتیەوە. لە بەری قەرەداخ بو بە پێشمەرگە. بەختیار گەنجێکی تازە پێگەیشتو بو لە موسڵ دەرچو بو، ئەندامی کۆمەڵە و، لە دەستەی بەڕێوەبەری یەکێتی خوێندکارانی کوردستان بو. زورتر لەوەی پزیشکی بکا ئەویش خەریکی پێشمەرگایەتی بو لە چونەوەیەک دا بۆ سلێمانی لە بەیانیی ٧٩/١/٣١ دا کەوتە بۆسەوە کوژرا.

ڕوخانی شا بۆ ئێمە بو بە خێر. نەخۆش و بریندارەکانمان ئەنارد بۆ ئێران. هەندێکیان لە لای پزیشکە کوردەکانی ئێران تەداوی ئەکران و، هەندێکیان ئەچونە «بیمارستان» ە حکومەتیەکانی تەوریز و تاران.

چالاکی پێشمەرگە و، شەر لە گەڵ هێزەکانی حکومەت دا زۆر بویو. لە ئەنجامی ئەوەش دا بریندارمان زۆر بو ئەبو جێگایەکیان بۆ تەرخان بکری. د. شادمان مستی لە یۆگۆسلاڤیاوە هاتەوە. شادمان هەمو کاتی خۆی بۆ نەخۆشخانە تەرخان کرد. هاوینی ٨٠ لە تۆژەڵە نەخۆشخانەیەکی هاوینەی لە خێوەتێکی گەورەدا دامەزراند. هەروەها ڕێوشوێنی دروستکردنی نەخۆشخانەیەکی گەورەمان لە تەختاییەکی قولی نێوان شەنی و زەڵی لە سەر کانیەکی خۆش و لە ناو ڕەز و باخ دا دانا. شوێنەکە ناوی «قولە هەرمی» و نەخۆشخانەکە ناو نرا «نەخۆشخانەی شەهید د. بەختیار». زۆری پزیشک و زۆری کەوتنی نەخۆش و، دەرمانگا و، زۆری ئەشیعە و زۆری نەشتەرکاریمان تێ دا دروست کرد. شادمان نەخۆشخانەکەی بەڕێوە ئەبرد. لە گەڵ هەڵگیرسانی شەڕدا لە گەڵ ئێران هەندێ پزیشکی کە هاتنە دەرەوە. هەندێکیان ماوەیەکی کورت ئەمانەوە، ئەڕۆیشتن بۆ ئێران و، لەوێوە ئەچون بۆ ئەوروپا.

نەخۆشخانەکە دوای ئەوەی ڕێگەی ئێرانمان لێ بەسترا بو بە ناوەندێکی گرنگی تەداوی زاماری پێشمەرگە بەردەوام ١٠ برینداری تێ دا بو.

*

ناوچەکە زۆر لەرمبالغ بویو. بە سەدان کادر و پێشمەرگە و خوێندەوار لە تۆژەڵە و ناوزەنگ و نۆکان .. کۆبوبونەوە. د. شادمان هەندێ جار قسەی خۆشی ئەکرد. وتی: «هەمو ئەو تەنگوچەڵەمانەی لە پایتەختی وڵاتە پیشەسازییە پیشکەوتوەکان دا هەیە لێرەش هەیە. لەوێ تەنگوچەڵەمەی بێکاری هەیە، لێرەش هەیە. لەوێ تەنگوچەڵەمەی خانو هەیە، لێرەش هەیە. لەوێ تەنگوچەڵەمەی گرانی و ئاوسانی دراو هەیە، لێرەش هەیە...»

ڕاستی ئەکرد هەموی هەبو، بەلام هی ئێمە لە جۆرێکی تر بون.

*

بوردومان

پێش نیوەڕوی ٩ ی تەموزی ٨٠ لە تۆژەڵە لە ژێر سێبەری دارگوێزێکی گەورەدا لە گەڵ عومەر شێخموس، جەمال ئاغا، سالار، عومەر دانیشت بوین کاروباری ڕۆژانەمان ئەنجام ئەدا لە پڕ پۆلێ فڕۆکەی عیراقی پەیدا بون چەند بۆمبایەکی گەورەیان بەردایەوە. ناوچەکە

پڕ بوو لە دوکەڵی ڕەش و تەپوتۆز و بۆگەنی باروت. بە دوای ئەوەیش دا چەند فڕۆکەیەک کەوتنە پەلامار تەقەیان لە خێوەت و بن بەرد و نوای بن شاخەکە ئەکرد.

لە دامێنی ناوزەنگ دا بازاڕێکی گەورەی لێ بوو کەلوپەلی عێراق و ئێرانی تێ دا ئەفرۆشرا بە زۆری لە کەپردا بوون، ئاگر درا بوو سوتا. بە سەدان مافور و ڕادیۆ و تەلەفزیۆن سوتا. بایی چەندین ملیۆن دینار زەرەر لە دوکاندارەکان کەوت.

دەزگای ڕاگەیاندنی یەکێتی لە دامێنی توژەڵە دا بوو بە تەواوی خاپوور بوو، هەموو دەزگاکانیان شکا و سوتا و، یەکێ لە کادرەکانیان: بورهانی شێخ مستەفای قەرەداخی، کوژرا و، چەند کەسێکیان بریندار بوو.

لە سەرچاوەی توژەڵەیش کە بنکەکانی ئێمەی لێ بوو، کادرێکی سکرتاریەتی مامجەلال: محەممەد ئەبوبەکر، کوژرا و چەند کەسی بریندار بوون، لەوانە: سەید مەجید ئەندامی م ع و، میران فوئاد مستی ئەندامی دەزگای دارایی و، پێشڕەو سەید ئیبراهیم لە سکرتاریەت، حەمە سەعید و هاوڕێ جەبار لە بنکەکەی من.

پێشمەرگەکانی دەزگای ڕاگەیاندن هاواریان لێ هەستا بوو داوای یارمەتییان ئەکرد. هەر کە هێرشەکە کەمێ خاو بووەوە چووین بۆ بارەگای ڕاگەیاندن. ساغەکان چووبوونە شاخ و، کوژراو و هەندێ لە بریندارەکان لەو ناوەدا بوون. تێکڕا ٩ کەس بریندار بوو بۆ تەداوی هەموومان ڕەوانەی سەردەشت کردن.

چەند مەفرەزەیەک بنکەیان لە توژەڵە بوو بۆ پاراستنی مامجەلال سەر بە سکرتاریەت بوون، فەرماندەکانیان: بەکر پیرۆزت، مەلا وسوی خەندەکە، شێخەکۆل، بوو. بۆ ئێوارە تەرمی هەردوو پێشمەرگەی یەکێتی: بورهان و محەممەدمان لە سەرچاوەی توژەڵە بە خاک سپارد، مەلا وسوم بانگ کرد تەلقینیان دا بدا. مەلا وسو وتی: «تەلقین نازانم». وتم: «تۆ چۆن مەلایەکی تەلقین نازانی؟» وتی: «بە منالی وەهایان ناو ناوم ئەگینا من مەلا نیما». حشع بارەگاکانیان لە توژەڵە بوو، بەڵام بە ڕێکەوت زەرەر لەوان نەکەوت بوو. ئەوانیش لە شاردنەوەیان دا بەشدار بوون.

ئەو ڕۆژەی ئەم ڕوداوەی تێ دا قەوما ڕیپۆرتەرێکی تەلەفزیۆنی فەرەنسی لە ناوچەکە بوو. بەر لە بۆردومانەکە وێنەی بازاڕ و بنکەکان و ئاوایییەکانی زەڵێ، شینێ، سونێ و، کاتی بۆردومانەکەش وێنەی فڕۆکەکان و، دوای بۆردومانەکەش وێنەی بازاڕی سوتاو و ئاوایی وێرانی گرت بوو. بەرنامەیەکی ڕێکوپێکی لێ دروست کرد بوو بۆ تەلەفزیۆن و، لە پاریس پیشانیان دابوو. کەندال، کە دوایی بوو بە سەرۆکی ئینستیتوتی کورد لە پاریس، لەو کاتەدا بە پێی ڕاسپاردەی د. قاسملو، نوێنەرایەتی حدکای لە فەرەنسا ئەکرد. نامەیەکی درێژی بوو تەلەفزیۆنی فەرەنسی نوسی بوو، ڕاپۆرتەکەی کابرای بە درۆ خستبووەوە و، نوسی بوی کە ئەو ڕوداوە هەموی لە کوردستانی ئێران دا بووەوە و، پەیامنێرەکەی ئەوان بە درۆ باسی کوردستانی عێراق ئەکا.

سەیرەکە لەوەدا بوو: کەندال خۆی کوردی تورکیا بوو، نوێنەرایەتی کوردی ئێرانی ئەکرد و، دژی کوردی عێراق کاری ئەکرد!

*

پاش چەند ڕۆژێ کەسوکاری محەممەد لە کۆیەوە و، کەسوکاری بورهان لە سلێمانییەوە هاتن بۆ گوێزانەوەی تەرمەکان. فەهمی شێخ ئەنوەری قەرەداخی هات بوو بۆ

بردنەوەی بورهان. فەهمی ناسیاوی گەرەک و سەردەمی خوێندنم بو، ئەویش وەکو من زانستی سیاسی لە زانکۆی بەغداد خوێند بو. ئەندامی کۆمەڵە و تێکۆشەرێکی ناوشار بو. زۆر لە مێژ بو نەمبینی بو. دوای ئەم سەفەرەی بە ماوەیەک بەعس گرتی و، تا ئێستاش بی سەر و شوێنە.

*

## زیندان

سەردەمێک جێگەیەکی ئەمینمان نەبو گیراوی تێ دا گل بدەینەوە، لە بەر ئەوە ئەوانەی ئەگیران، ئەوەی تاوانی جاسوسیی لە سەر ساغ بوایەتەوە ئەکوژرا و، دیلەکان، وەکو دوایی لە بلاوکراوەکان دا بو بو بە باو دوای ئەوەی «ربەبازی شورشیان بۆ رون ئەکرایەوە!» بەر ئەدران.

لە گەڵ زیاد بونی چالاکییەکانی پێشمەرگەدا، تا ئەهات ژمارەی گیراوەکان زۆر ئەبون. ئەبو شوێنێکیان بۆ تەرخان بکرێ و، تاقمێکیان لێ بکرێ بە مەسئول. ئەمانویست زیندان بکەین بە دەزگایەکی شارستانی و، جوری رەفتاری ئێمە لە گەڵ هی بەعس جیاواز بێ. ئەو مافانەی راگەیاندنی جیهانیی مافی مرۆڤ و، یاسا ناودەوڵەتییەکان بۆ گیراویان سەلماندوە، ئێمەش جێبەجێیان بکەین.

عەلی شامار، کادری کۆمەڵە، کە لە پێشمەرگەکانی مەفرەزەکانی سەرەتا بو، هەڵبژێردرا بە لێپرسراوی زیندان و، کەرتێکی پێشمەرگەی بۆ تەرخان کرا. عەلی لە دامێنی دۆڵەکەدا خانویەکی بۆ بارەگای پێشمەرگەکانی و، خانویەکیشی بۆ زیندان دروست کرد.

گیراوەکان دو جۆر بون: جۆرێکیان دیل وەکو، سەرباز، جەیشی شەعبی، بەعسی، جاش، ئەمن و ئیستیخبارات.. کە لە شەرو بۆسەدا ئەگیران. ئەوانی تر لە سەر تاوانی ناسیاسی وەکو کوشتن، دزی.. گیرا بون.

لێدان و سوکایەتی پێ کردن بە توندی قەدەغە بو، هەر پێشمەرگەیەک کارێکی لەو بابەتەی بکردایە بە توندی سزا ئەدرا.

خواردنیان وەکو خواردنی هەمو بارەگاکانی پێشمەرگە بو.

لە نەخۆشی و ناساغی دا، وەکو پێشمەرگە، لە نەخۆشخانەی شورش دا تیمار ئەکران.

کەسوکاریان بۆیان هەبو هەر کاتێکی بیانویستایە بە ئازادی سەردانیان بکەن، خواردن و کەلوپەلیان بۆ بهێنن یا بۆ بنێرن.

بۆیان هەبو داوا و سکالا و شکات بۆ دەزگا سەرکردەییەکانی یەکێتی بنوسن. کەسانی شارەزا و قانونی لێکۆڵینەوەیان لە گەڵ ئەکردن و، دادگایەک کە پێک هات بو لە ٣ کەس: دو ئەندامی م س و، یەکێکی حقوقی، حوکمی ئەدان و، مەکتەبی سیاسی لە کۆبونەوەی خۆی دا دوا بڕیاری لە سەر حوکمەکە ئەدا.

حکومەتی بەعس، هیچ کاتی ئامادە نەبو، گیراو هەر پلەو پایەیەکی لە بەعس یا لە جەیش یا لە دائیرەکانی دەوڵەت دا هەبوایە، بگۆڕێتەوە. لە بەر ئەوە زۆر لە گیراوەکان بە تایبەتی سەرباز، مانەوەیان کەلکێکی ئەوتۆی نەبو، زو بەر ئەدران. هەزاران کەسی عەرەب، سەر بە داوودەزگای جیا جیا، گیراون و بە بێ هیچ بەرامبەرێک ئازاد کراون.

*

## دروستکردنی خانوی تازه

هاوریـیـانی زیندان، کـه زوریان هاوسـهرهکـانیـان لـه گـهل خـزیـان هینا بو، ههروهها کاری سیاسی، ریکخراوهیی، راگهیاندنیان پی سپیردرا بو، ئهو ئهوانیش جیگه بو خویان خوش بکهن. له شینی، قـوله ههرمی، زهلی، ناوزهنـگ، توژهله.. چهندین خـانوی نوی یان بو دهزگـاکـانی پیـشمـهرگه، راگـهیاندن، دارایی، ناوهندی کـومـهله، ریکخـسـتنی بزوتنهوه دروست کرد. ناوچهکه ئاوهدان بوهوه، نزیکهی ۱۰۷۰ کسی لی ئهژیا.

ناوهندی کومهله ریزه خانویهکی خوشی دروست کرد. دهزگای ریکخستن و دهزگای راگهیاندنی تی دا بو، شوینیک بو کتیبخـانه تهرخان کرا بو، هولیکیش به ناوی «هولی شههید شههاب» دروست کرا جیگهی کوبونهوهی ۳۰۰ کسی تی دا ئهبوهوه.

بو هاوینـهکـهی، منیش له سـهرو ههمـان خـانوی کـه زسـتـانی رابوردو لی ی بوم، به چهند مهتریک لـه پال تاشـه بهردیکی گـهورهدا خـانویهکی ٤ ژوریم دروست کرد. ئهگـهرچی بهنایهکی خهلکی داوداوامـان هینا بو دیوارهکانی بو داتهنابن، بهلام کریکاریـیهکـهی خوّمـان ئهمان کرد. خانوهکهی من خوشتر بو له زوری خانوهکان، حهمام و شوینی چیشت لی نانی تی دا بو. دوایـیتر بهردهمهکهیم تهخت کرد و، حهوزیکی گـورهی جوانم تی دا دروستکرد و، چوار دهورهکهیم کرد به گول و رهز و باخ.

بهختیاری برام و حهمه جهزایش چهند خانویهکیان له نزیک خانوهکهی من بو ژیانی خویان دروست کرد.

جگه له بارهگـای داوودهزگـاکـانی یهکیتی، حشع، پاسوک، مـهفـرهزهیهکی بهعـسی سهر به سوریا، ههندی ریکخراوی عهرهبی – عیراقی و، ئیرانی لهو ناوهدا خانویان کرد.

لهم کـارانهدا ئهوهی سـهرنجی راتهکیـشا دوزینهوهی ههندی کـهرسـتـهی کـون بو، کـه دهریان ئهخست ئهم ناوچهیه له کونهوه ئاوهدان بوه له ناو دوزراوهکان دا:

– له زینی سـور له کـاتی ههلکهندنی بناغـهی خـانوهکـان دا چهند گـوریکیـان دوزیـیـهوه. گـورهکـان هی مـوسـولمان نهبون، چونکه روهو قـیـبله نهنیـژرا بون و، ملوانکه و متومورو یان له گهل خرا بوه چال. ئیسکهکانیان تیکهلاوی گل ببو پوا بو.

– له ناوزهنـگ له شـوینی هولی شـههاب، دا دو گـوزهی گـهوره و سـاغ و، له توژهلهیش لهو شوینهی کـه ناوی: «گردی کوپان» بو ئیستگـهی رادیوی لی بو، له نیـوان توژهله و ناوزهنگ دا، چهندین گـوزه و، چهند دراویکی سـهردهمی ئهسکهندهری گـهوره دوزرایهوه.

گوزه بو چهند مهبهست به کار هاتوه: یهکیکیان وهکو تابوت بو ههلگرتنی ئیسک و پروسکی مردو. ئهوی تریان بو ههلگرتن و شاردنهوهی دانهویله و خواردهمهنی و، گهنجینه له چاوی دوژمن.

زهردهشتیـهکان کـه یهکیکیـان لی مردوه، تهرمـهکهیان بردوته شوینیکی بهرز دایان ناوه، تا قـهل و دال گوشتـهکـهی خواردوه و، تیشکی خور ئیـسکهکانی خـاوین کردوتهوه، ئهوسـا ئیـسـقـانهکـانیـان کو کـردوتهوه و خـسـتـویانـهته گوزهیهکـهوه، گـوزهکـهیان له ئهرزدا ناشتوه.

ئهبی کوردستان چهندی لهم شوینهواره دیرینه به نرخانه تی دا بویی، کـه رابوردوی

ناوچەکە و کوردیان ڕوون ئەکردەوە، بەلام بەمجۆرە فەوتا بێ.

*

## گرتنی بیگانە

شـــورشی ئەیلول هەر لە ســـەرەتاوە لە دنیـــادا دەنگی دایەوە و، ڕۆژنامـــەوانی بە ناوبانگی دنیـــا ســـەردانیـــان کـــرد و، وتار و لیـــدوان و کـــتـــیـــبـــیـــان لە ســـەر نوسی. شـــورشی حوزەیران، لە بەر چەند هۆیەک، لەم ئیمتیازە گرنگە بی بەش بو:

١. عیراق «تعتیم اعلامی» خست بوە سەر چالاکیەکانی شورش. بە هیچ جۆری لە دەزگـاکـانی ڕاگـەیاندنی خـوی دا: ڕۆژنامـــە، ڕادیو، تەلەفـــزیون.. باسی نەئەکـــرد و، نەیئەهیشت دەنگی بۆ دنیا دەرچی.

٢. پیوەندی عیراق لە گەل دەولەتانی دەرەوە باش و، داهاتی نەوت گەشانەوەیەکی زۆری دابو بە پیوەندی ئابوری و بازرگـانی عـیراق و دەولەتانی تر و، زۆر لەم دەولەتانە لە ناو خۆیان دا پیشبەرکییان بو کامیان باشترین سەودای بازرگانی لە گەل عیراق بە دەس بهینی. لە بەر ئەوە گیروگرفتی ناوخۆی عیراقیـان پشت گوی ئەخست، بە تایبەتی کە عیراق لە گەل ئیران کەوتە شەرەوە.

٣. شیوەی چەوتی ڕاگەیاندنی یەکیتی.

یەکی لەو تاکتیکە تازانەی لەم شورشەدا داهینرا، بۆ ئەوەی لە ئابلوقەی ئیـعلامی دەربچی و دەنگی بە دنیـا بگات، گـرتنی کـارکـەرانی بیگانە بو. گـرتنی ئەمـانە لە لایەن دەزگاکانی ڕاگەیاندنی ئەو ولاتانەوە باس ئەکرا و، لە دنیادا دەنگی ئەدایەوە و، بەم ڕیگایە ســـەرنجیـــان ڕائەکـــیـــشـــرا بۆ هەبونی جـولانەوەیەکی ســـیـــاســـی - چەکـــدار دژی بەعس لە کوردستانی عیراق دا.

سەرەتا چەند کارکەریکی فەرەنسی گیرا لە قەندیل کاریان ئەکرد. بە دوای ئەوان دا پۆلۆنی و، ئەلمانی و، یوگوسلاڤی و ڕوس..

ئەم کـــارە لە لایەن دەولەتانی ئەوروپیـــەوە بە کـــاری تیـــرۆریـــســـتی دائەنرا و، ئەنجامەکەی:

- عیراق گوی ی نەئەدایە و، خۆی نە ئەکرد بە خاوەنی. بە هیچ جۆری ئامادە نەبو گفتوگۆی لە سەر بکا بۆ گۆڕینەوەیان بە گیراو و دیلەکانی ئیمە و، بە هیچ جۆری ئامادە نەبو پارە بدا بۆ بەردانیان.

- دەولەتەکـانی خـۆیشـیـان دو جۆر بون: ئەوانەی ئەوروپای ڕۆژهەلات، یەکـیـتی سۆڤیت، پولونیـا، یوگـوسلاڤیـا.. هاوولاتیـەکانی خۆیان فەرامـۆش ئەکرد و، لە سـەریان هەلنەئەدانی و بە تەنگیـانەوە نەئەهاتن. دوەمـیـان، ولاتانی ئـەوروپای ڕۆژئاوا، ئەمـەیان بە کاریکی تیرۆریستی دائەنا، بەلام ئەکەوتنە گفتوگۆی ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ بۆ پاراستنی ژیان و بەردانیان.

ئەم کارە بۆ ئیمە لە چەند سەرەوە سودی هەبو:

١. ڕۆژنامـــەکـانی ئەو ولاتانە باسی گـــیـــراوەکـــانیـــان ئەکـــرد و، هەوالی هەبونی جولانەوەی کوردیان ڕائەگەیاند.

٢. لە هەندی ولات ئەبو بە هۆی دامەزراندنی پیوەندی ڕاستەوخۆ لە گەل نوینەرانی

یەکیتی. د. کەمال فوئاد چەند ساڵ لە ئەلمانیا نەیتوانی بو پیوەندییان لە گەل دابمەزرینی، بەم هۆیەوە پیوەندییان لە گەل دامەزراند.
٣. لە هەندی وڵات ئەبو بە هۆی هەندی دەسکەوتی مـــاددی: ناردنی دەرمـــان، تەداوی بریندار، دانی پارە..
ئەم کارە هەندی لە هەڤالانی ئەوروپای سەغلەت کرد بو، وایان ئەزانی جیگەیان پی لیژ ئەکا. لە یاتی ئەوەی هەوڵ بدەن بە چاکترین شیوە کەڵکی لی وەربگرن، گوشاریان بۆ سەرکردایەتی یەکیتی ئەهینا واز لەم تاکتیکە بهینی، تەنانەت گەیشتە رادەی هەرەشەی وازهینان لە یەکیتی. بەڵام ئەم تاکتیکە بو بو بە باو. هیزەکانی تریش پەنایان ئەبردە بەری لەوانە: حسک و پارتی. ئەگەر ئیمەش وازمان لی بهینایە ئەوان درێژەیان پی ئەدا.
*
هاوینی .٩٨ لە بەری قەرەداغ ٩ کەسی سۆڤیتی لە کاتی راوەماسی دا گیران. هەریمی ٥ ی قەرەداغ ویستیان بە پەلە بیانپەریننەوە بەری شارباژیر بۆ ئەوەی بیانگەیەننە بارەگاکانی سەرکردایەتی. جەیشی عیراق یەکی لە گەورەترین لەشکرکیشییەکانی کرد بۆ سەریان و، هەمو ئەو ریگایانەی ئەوان گومانیان لی ئەکرد بە هالیکۆپتەر لی ی دابەزین و، گرتیان. لە شوینیک دا پیشمەرگەکانیان دۆزییەوە. بو بە شەریکی قورس. ٦ کەس لە پیشمەرگەکان کوژران لەوانە: گۆران، کە یەکی لە باشترین فەرماندەی کەرتەکانی هەریمی ٥ بو و، ١٧ پیشمەرگە و دوان لە سۆڤیتیەکانیش بریندار بون.
مستەفا چاورەش، فەرماندەی هەریمەکە، بۆ ئەوەی هیرشەکەیان لە کۆڵ بیتەوە سۆڤیتیەکانی بەردا بو.
یەکی لە بریندارەکان شاهۆ (حەمەی تەلە) بو. شاهۆ شاخەوانیکی کەم هاوتا و، شەشالۆنیکی شارەزا بو. لەم شەرەدا گوللەیەک لە سەری و گوللەیەک لە دەستی دابو. برینەکەی سەری لە زمان و، گوللەکەی دەستیشی پەنجەکانی لە کار خست بو، تا ماوەیەکی زۆر قســـەی بۆ نەئەکــرا و، تا کـــوژراش زمـــانی بە تەواوی بەر نەبو، چەند پەنجـــەیەکی دەســـتیـــشی سەقـــەت بوبو. لە گـــەرمەی شـــەر و هیـــرشی هالیکۆپتەردا بە برینداری لە بن دەوەنیک دا ئەبی، خوینی لەشی چۆراوگەی بەست بو. لەو کاتەدا ماریک لە نزیکی پەیدا ئەبی، دەس ئەکا بە لستنەوەی خوینەکەی. شاهۆ هۆشی لە لای خۆی ئەبی بەڵام نە زمانی ئەبی هاوار لە هاوریکانی بکا و، نە دەستی بەرد ئەگری لە مارەکەی بگری. مارەکە تا تیر بوبو چۆراوگـــەی خـــوینەکـــەی لست بوەوە و، دوای ئەوە بی ئەوەی پیـــوەی بدا رۆیشت بو. بیگومان هەلویستیکی دژوار بوە دیمەنەکەی هەرگیز لە بیر شاهۆ نەئەچوەوە.
*
«گروهی حەوت نەفەر»
چوار مانگ دوای گرتنی چوارەمین کونگرەی حدکا، ٧ ئەندامی کومیتەی ناوەندی بەیانیکی دریژیان بلاوکردەوە، جیابونەوەی خۆیان لە حیزب راگەیاند، بە بیانوی جیاوازی هەلویستیان لە حکومەتی ئیسلامی ئیران و، هاوکاری سەرکردایەتی حدکا لە گەل رژیمی بەعس. ناویان لە خۆیان نا بو: «پیرەوانی کونگرەی چوارەم».
لە ناو پیرەوانی کونگرەی چوارەم دا چەند کەسیکیان تی دابو تازە هات بونە ریزی حدکاوە، بەڵام ٣ کەسیان لە ناودارە کونەکان بون: غەنی بلوریان، کە زیاتر لە ٢٠ ساڵ لە

سەر حدکا لە زیندانی شادا بو. رەحیمی قازی، کە لە سەردەمی جمهوریەتی مەهابادەوە چو بو بۆ سۆڤیت و تا رەخانی شا لەوێ مابوەوە. هێمن، کە ١٠ ساڵ زیاتر بو لە عیراق بو، دوای روخانی شا ئەویش گەرابوەوە.

حیزبی تودە لە ئیران دا لاواز بو، لە کوردستان دا سەرەرای لاوازی بەدناویش بو. بەلام نفوزی حیزبی تودە لە ناو حدکا دا کزن بو، ئەگەرایەوە بۆ ئەو جورە پەیوەندییەی لە پەنجاکان دا لە نیوان هەردو حیزب دا دروست کرا بو. دوای سەرکەوتنی شورش، ئەگەرچی ریکخراوی تایبەتی خۆی دامەزراند بو، پاشکوی حەفتەنامەی «مەردوم» ی لە تاران بە کوردی بلاو ئەکردەوە، بەلام هەندی لە تودەییەکان خۆیان خزاند بوە ناو ریزەکانی حدکاوە.

لەو کاتەوە د. قاسملو بو بو بە سکرتیری حدکا، حدکای بەرەو سەربەخۆیی لە تودە هینا بو، لە بەر ئەوە لە گەلی کۆک نەبون، دوای سەرکەوتنی شورش، کە حدکا نەچوە ژیر باری سیاسەتی حیزبی تودەوە، ناکوکییەکەیان قولتر بو، بە تایبەتی تودە پشتیوانی بی چەندوچونی رژیمی ئیسلامی ئەکرد، بە بیانوی ئەوەی دژی ئیمپریالیزمی ئەمەریکایە و، حدکا لە کیشە و شەردا بو لە گەڵ ئەم رژیمە چونکە مافەکانی کوردی نەئەسەلماند.

پیرەوانی کونگرەی چوارەم، بەم جیابونەوەیە لایان وا بو:

- زورایەتی ئەندامانی حیزب و دانیشتوانی کوردستان، کە لە شەر بیزارن و، ریزی تایبەتی دائەنین بۆ رابوردوی سیاسی ئەم تیکوشەرانە، لە دەوری ئەمان کۆ ئەبنەوە و، ئەمان ئەبن بە «حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئیران».

- یەکیتی سۆڤیتی و، ولاتانی ئەوروپای روژهەلات و، حیزبە کومونیستیەکانی جیهان پشتیوانی لەوان ئەکەن.

- رژیمی ئیران لە گەڵ ئەوان پیک دی، ئەگەر خودموختاریشیان نەداتی، بە ئاشتی کیشەی کورد چارەسەر ئەکا.

سەرکردایەتی حدکا زور زو چوەوە بە گژ ئەم تاقمەدا و، بە جاش و خائین ناوی بردن. لە بوچونەکانیان دا و، لە زور - هەلسەنگاندنی خۆیان دا بە هەلە چوبون. جەماوەری حدکا بە زوری لە دەوری سەرکردایەتی قاسملو مانەوە. ئومیدەکانی هەیشیان بو بە سۆڤیت و رژیمی ئیران نەهاتە دی. هاوکاریان لە گەڵ حیزبی تودە و، کاربەدەستانی ئیران هیچ دەسکەوتیکی سیاسی یا سەربەرزییەکی بۆ خۆیان دابین نەکرد. بە لاوازی مانەوە و، سەرەنجام پەرەوازە بون: هەندیکیان لە شەری حدکا دا کوژران (رەحمانی کەریمی). هەندیکیان چونە ئەوروپا (رەحیمی قازی و غەنی بلوریان)، هەندیکیشیان لە شارەکان دا جیگیر بون (هیمن و ئەوانی کە).

هیمن، شاعیر و ئەدیب بو زیاتر لەوەی سیاسی بی، خاوەنی سرودی نەتەوەیی: «گەرچی توشی رەنجەرویی و حەسرەت و دەردم ئەمن..» و، خاوەنی: تاریک و رون، توحفەی موزەففەریە، نالەی جودایی و پاشەروک بو. مەحابن بو خۆی لە کاروباری حیزبایەتیەوە بگلینی.

*

## جەنگی عیراق - ئیران

ناکۆکی عیراق لە گەڵ ئیران پیشینەیەکی میژویی هەیە بە تایبەتی لە سەر دیاری کردنی سنور و، پیروزگاکانی شیعە. ئەگەریتەوە بۆ سەردەمی عوسمانی و صەفەوی. ئەو

ناکۆکییانە بە میرات بۆ دەوڵەتی عیراق مابونەوە. لە سەردەمی پاشایەتی دا هەردو دەوڵەت جۆری لە پەیوەندی دۆستانەیان دامەزراند بو، هەردوکیان ئەندام بون لە پەیمانی بەغدادا. رژیمی جمهوری ناکۆکیە کۆنەکانی هەمو زیندو کردەوە. ئەورەحمان عارف هەوڵی دا نیوانی عیراق لە گەل ئیران باش بکا، بەلام ئینقیلابی بەعس لە ١٩٦٨ دا، نەیهیشت ئەم هەوڵە سەربگری.

ئیران ریککەوتنی سالی ١٩٣٧ ی دەربارەی شەطولعەرەب بەکلایەنە هەلوەشاندەوە. ئەحمەد حەسەن بەکر بەم بۆنەیەوە لە ساحە التحریر لە بەغدا وتاریکی ئاگرینی دا، وتی:«وسوف لن أكون عربيا ولا مسلما اذا نسيت هذا الموقف الذل...» عیراقی بەعسی لەو کاتەدا توانای روبەروبونەوەی چەکداریی ئیرانی نەبو. ئیران یارمەتی شۆرشی کورد و دوژمنەکانی بەعسی ئەدا و، بەعسیش یاوەشیان بۆ موعارەضەی ئیرانی کرد بوەوە تا ریککەوتنەکەی صەددام - شا لە جەزائیر. ئەو کاتەی ریککەوتنی جەزائیر ئیمزا کرا، هەمان ئەو بەکرەی سویندەکەی خوارد بو سەرکۆماری عیراق بو.

صەددام لە ریککەوتنی جەزائیردا (تنازل) یکی زۆر گەورەی کرد بۆ شا، نیوەی شەطولعەرەب و، چەند جیگای تری سنوری وشکایی لە کوردستان دایە، بەرامبەر دەستهەلگرتنی شا لە کورد. ئەم (تنازل) ەی صەددام بۆ شا لە ناو کۆرە نەتەوەپەرستەکانی عەرەب دا بە خراپ دەنگی دایەوە. صەددام ئەگەرچی بە سەرکەوتنیکی میژویی گەورەی دائەنا و، بیانوی بۆ دائەتاشی، بەلام لی ی بوبو بە گری یەکی رەوانی.

دوای روخانی شا و سەرکەوتنی ئینقیلابی ئیسلامی، ترسی صەددام لە ئیران زۆر زیادی کرد. ئەترسا شەپۆلی ئیسلام دەسەلاتی ئەویش رابمالی. وەکو لە کۆرە تایبەتییەکانی خۆی دا وت بوی: «پیش ئەوەی شەر بکەویتە ناو مالی خۆتەوە، شەرەکە بخەرە ناو مالی دوژمنەکەتەوە.» ئیتر خۆی بۆ پەلاماردانی ئیران ئامادە کرد. بە تایبەتی لەو کاتەدا رژیمی ئیسلامی هیشتا جیگیر نەبوبو. ئەرتەشی ئیران بە هۆی پاککردنەوەی ریزەکانی لە ئەفسەرانی سەلتەنەت تەلەب دارزا بو. سپای پاسداران هیزیکی پچوک و، بۆ ئاسایشی ناوخۆ تەرخان کرا بو. کیشەی نەتەوایەتی لە کوردستان، عەرەبستان، ئازەربایجان، بلوچستان، تورکمان سەحرا تەقی بوەوە. باری ئابوری بە هۆی پشیوی ناوخۆیەوە باش نەبو. ئیرانی تازە وەکو دەولەتیکی توندرەو لە دنیا دابرا بو.

صەددام ئەمەی بە هەل زانی بۆ ئەوەی تۆلە لە ئیران بکاتەوە و، رژیمەکەی بروخینی و ولاتەکەیان پارچە پارچە بکا.

رۆژی ١٧ ئەیلولی ٨٠. «ئەنجومەنی نیشتمانی» بانگ کرد بۆ کۆبونەوەیەکی نائاسایی. صەددام لە بەردەمی ئەم کۆبونەوەیەدا وتاریکی دا لەوتارەکەی دا وتی:

«ولقد كانت اتفاقية اذار ١٩٧٥ في حينها قرارا شجاعا، وحكيما، قرارا وطنيا، وقوميا.

«ولقد كانت اتفاقية اذار بنت ظروفها، وقد فهمها شعبنا، واعتبرها في اطار تلك الظروف انتصارا عظيما، واستقبلها بفرح عظيم..

«ولما كان حكام ايران قد أخلوا بهذه الاتفاقية منذ بداية عهدهم بتدخلهم السافر والمقصود في شوون العراق الداخلية، واسنادهم، كما فعل الشاه من قبل، وامدادهم لرووس التمرد المدعوم من امريكا والصهيونية، ولامتناعهم عن اعادة الاراضي العراقية التي اضطرننا

الى تحريرها بالقوة، فانني اعلن امامكم، اننا نعتبر اتفاقية ٦ اذار لعام ١٩٧٥ ملغاة، وقد اتخذ مجلس قيادة الثورة قراره بذلك..»

صەددام نە لە ئیمزاکردنی ریککەوتنی جەزائیر و بەخشینی شەطولعەرەب دا پرسی بە گەلی عیراق کرد بو، نە لە هەلوەشاندنەوەی دا.

رۆژی ٢٢ ئەیلول ١٩٢ فرۆکەی جەنگی کەوتنە فرین بۆ بوردومانی ئیران.

رۆژی ٢٣ ی ئەیلول هیزی زەمینی عیراق لە ٣ لاوە پەلاماری ئیرانی دا:

لای سەرو بۆ راگرتنی هیزەکانی ئیران لە شوینەکانی خۆیان دا.

لای ناوەراست بۆ گرتنی هەندی شار و شوینی ئیران تا نەتوانن لەو قۆلەوە هیرش بۆ بەعقوبە - بەغداد بکەن.

لای خوارو بۆ داگیرکردنی کانگاکانی نەوتی ئیران. ئەمەیان هیرشی سەرەکی بو.

صەددام ئەم جەنگەی ناو نا: «قادسیەی صەددام». لە مەش مەبەستی ژیاندنەوەی دوژمنایەتی کۆنی نیوان عەرەب و ئیران بو. لە قادسیەی یەکەم دا لەشکری عەرەب، لەشکری ئیرانی شکاند و، دەولەتی ساسانیی روخاند و، گەلانی ئیران موسولمان بون. ئەم شەرەی بەو شەرە ئەشوبهاند.

لە سەرەتادا جەبهەی عیراق هەندی پیشرەوی کرد و، هەندی جیگای گرت. بەلام نەیتوانی ئامانجەکانی بەدی بهینی. صەددام بە هیوا بو ئاگربەیکی وەکو ئاگربەکەی جەنگی شەش رۆژەی عەرەب - ئیسرائیلی ١٩٦٧ دوبارە ببیتەوە. کە ئەنجومەنی ئاسایشی ریکخراوی نەتەوە یەکگرتوەکان بریاری راگرتنی شەری دا، صەددام چونکە خۆی بە سەرکەوتو ئەزانی یەکسەر قوبولی کرد، بەلام ئیران بریارەکەی قوبول نەکرد و دریژەی دا بە جەنگ.

خەیالەکانی صەددام هەموی بەتال دەرچو: رژیمی ئیرانی نەروخا و ئیران پارچە پارچە نەبو. شەرەکەش بە چەند هیرشیکی ئاسمانی و، بە چەند هیرشیکی زەمینیی و، بە شەش رۆژ کۆتایی نەهات.

لە کاتی گفتوگۆکانی ١٩٩١ دا کە بردینیان بۆ دیدەنی صەددام، گوناحی دریژەکیشانی شەرەکەی خستە ملی ئیمە. لە قسەکانی دا وتی: «کە شەر هەلگیرسا لە گەل ئیران ٣ فەیلەقمان هەبو. زیاتر لە یەک فەیلەق بە ئیوەوە خەریک بو. لە بەر ئەوە نەمتوانی هەمو جەبهەی عیراق بخەمە شەرەوە دژی ئیران. ئەگەر ئیوەم لە گەل بوایە لە باتی ٨ سال بە ٨ رۆژ شەرەکەم بە لادا ئەخست..»

دوا بە دوای هەلگیرسانی جەنگی عیراق - ئیران لە زنجیرەیەک کۆبونەوەدا بەرنامەی کاری داهاتومان بەمجۆرە دیاری کرد:

١. هەولدان بۆ خۆ بواردن لە شەری لایەلا و خۆلادان لە هەر ناکۆکیەکی لاوەکی سیاسی یا چەکدار، وە هەولدان بۆ خاوکردنەوەی گری ئالۆزەکانی باری ناوخۆی کوردستان لە کۆری بە گژاچونی ریژیم دا.

٢. بەرزکردنەوەی رادەی چالاکی پیشمەرگە و دەس وەشاندنی، وە بە کار هینانی هەندی شیوەی نوی لە شەرکردن دا، بە تایبەتی تەرکیزکردنە سەر نوقتە و شوینەکانی دوژمن لە شار و ئوردوگاکان دا، وە هەولدان بۆ ئازادکردنی هەندی ناوچە.

٣. پەرەپیدانی چالاکی سیاسی بۆ راپەراندنی جەماوەر و بەگەر خستنی کۆمەلانی

خەلک دژی ڕژێم، بە مانگرتن و خۆپیشاندان و شێوەکانی تری خەباتی جەماوەری..

هەرێمەکانی پێشمەرگە و ڕێکخراوەکانی یەکێتی لە پارێزگاکانی هەولێر، کەرکوک، سلێمانی بە پێ ی ئەم پلانە و بە گیانی تەرخان کردنی هەمو هەول و تەقەلایەک دژی هێزە داگیرکەرەکانی ڕژێم و نۆکەرەکانیان کەوتنە چالاکی و جموجول. لە سەرەتای جێبەجێ کردنی ئەم پلانەدا بوین. لە پڕ هێزێکی گەورەی پارتی شاخەکانی بەرامبەریان لێ گرتین.

*

بەیانییەکی زو لە خەو هەلیانساندم وتیان: «کابرایەک هاتوە نامەی پەلەی پێیە. ئەیەوێ وەلامی بدەیتەوە و بگەڕێتەوە.» کابراکە شێخ عەبدولعەزیزی داربەروله و نامەکە هی شێخ محەممەدی شێخ عەبدولکەریم بو.

شێخ محەممەد، لە دوای باوکی بوبو بە شێخی تەریقەتی قادری، لە گەل داوودەزگاکانی حکومەت تێکەلاو بو. تەکیەکەیان لە کرپچنە بو لە بەری قەرەداغ و، لە بەغدادیش تەکیێ ی هەبو.

شێخ محەممەد لە نامەکەی دا نوسی بوی کە: «دوای ئەوەی شەر لە نێوان عێراق و ئێران هەلگیرساوە و، زۆری ڕێکخراوە ئێرانییەکان، تەنانەت ئەوانەیش کە دژی ڕژێمی ئێران بون، پشتیوانی لە ئێران ئەکەن دژی عێراق. ئەرکی نیشتمانی ڕێکخراوە عێراقیەکانیش ئەوەیە لەم شەرەدا پشتیوانی لە عێراق بکەن دژی ئێران.» لە نامەکەی دا پرسی بوی کە ئاخۆ یەکێتی ئامادەیە لە گەل حکومەت گفتوگۆ بکا بۆ بەلاداخستنی کێشەی کورد؟

مامجەلال سەفەری دەرەوەی کرد بو. شێخ محەممەدیش ئەیزانی، بەلام نامەکەی بۆ ئەو نوسی بو. بە شێخ عەزیزم وت: «شێخ نامەکەی بۆ مامجەلال نوسیوە. منیش ئەینێرم بۆ ئەو کەی وەلامەکەی نوسیەوە بۆتان ئەنێرم.» شێخ عەزیز وتی: «پێ ی وتوم ئەگەر مامجەلال لەوێ نەبو بیدەم بە تۆ و جوابەکەی لە تۆ وەربگرم.»

وتم: «باشە، تا تۆ پشویەک ئەدەی منیش وەلامەکەی ئەنوسمەوە.»

لە نامەکەم دا بۆ شێخ محەممەدم نوسی: «ئەم دو حکومەتە: عێراق و ئێران، ئەوەندەیان زولم لە کورد کرد و، کورد خۆیشی نەیتوانی هەقی خۆیان لێ بسێنی وا خوا هەقیان لێ ئەسێنی و، بەم شەرە بەر غەزەبی خوا کەوتون. ئێمە پشتیوانی لە هیچکامیان ناکەین، بەلکو داوا لە خوا ئەکەین وەکو سەگەکانی ڕەزا بەگیان لێ بێ. لە گەل ئەوەیش دا ئێمە هەرگیز دەرگای گفتوگۆمان دانەخستوە. ئەگەر عێراق بە ڕاستی بێتە پێشەوە، بۆ چارەسەرکردنی کێشەی کورد، ئێمەش ئامادەین بۆ گفتوگۆ».

ڕەزا بەگ پیاوێکی قسە خۆشی سلێمانی بوە، خەیالێکی بە پێتی هەبوە بۆ دروستکردنی حیکایەتی خەیالیی. وتویەتی: «دو سەگی گەورەم هەبو ڕۆژێکیان بو بە شەڕیان، ئەمیان قەپالێکی لەو گرت دەستێکی خوارد، ئەویان قەپالێکی لەم گرت دەستێکی ئەمی خوارد، وەختێ ئاوڕم دایەوە هەردوکیان یەکتریان خوارد بو، تەنیا کلکەکانیان مابوەوە ئەجولا!»

وەلامی نامەکەم دایەوە بە شێخ عەبدولعەزیز. شێخ محەممەد نامەکەی پیشانی کاربەدەستان دابو. زۆر زیاتر لە جاران ڕقیان لێ هەلگرتم. ئێستا کە بیری لێ ئەکەمەوە ئەبو بە زمانێکی ئەدەبیتر نامەکەم بنوسیایە. ناشێ هەموجار پیاو ڕازی دلی خۆی بلێ. وەکو دوایی بیستمانەوە نوری حەدیثی خاوەنی پێشنیارەکە بو، بەلام وت بوی:

«بەمنزیکانە یەکیتی ئەکەویتە نیوان کەماشەی پارتی و حکومەتەوە زور لاواز ئەبی، ئیتر بۆچی لە گەلی ریک ئەکەوین؟» پی ئەچو بەعس زانیاری پی گەیشت بی لە سەر نیازی پارتی بۆ لەشکرکیشی بو سەر بارەگاکانی یەکیتی لە ناوزەنگ.

*

## شەری راگەیاندن

پارتی رۆژانە لە رادیوکەی دا هیرشی ئەهینایە سەر یەکیتی. لە وتار و لیدوان و هەوالەکانی دا، بە دەگمەن لیکولینەوە و رەش تی دا بو، بە زوری موهاتەرات و جنیو بو. وکو دوایی دەرکەوت زەمینەی لەشکرکیشیەکیان خۆش ئەکرد. بۆ ئەوەی گویگر توشی بیزاری نەبی لە دوبارەکردنەوەی ئەو بابەتە بی پیزانە. ئیمە زور جار ماوەیەک بیدەنگ ئەبوین و بەرنامەکانی رادیومان تەرخان ئەکرد بۆ باس و بابەتی تر، بەلام نەئەکرا قسەکانی پارتی بی وەلام بهیلریتەوە. ئیمە پەیرەوی فەردەکەی شیخ رەزامان ئەکرد، کە ئەلی:

........ بە فەردی

نەت بیستوە ضەربولمسەلە: صد قەل و بەردی!

لە چەند رۆژیک و لە چەند وتاریک دا بایی هەمو ئەو ماوەیەی رابوردو لە سەریان ئەدواین. بۆ وەلامدانەوەی پارتی زنجیرەیەک وتارم بۆ رادیو نوسی دوایین ئەلقەمیان باسی «تراث»ی بارزانی بو، کە سەرانی پارتی و نوسەرانی رادیوکەیان خۆیان زوری پیوە ئەنازین. دەزگای راگەیاندن ئەم وتارانەی لە کتیبیک دا چاپ کرد بە ناوی: «قیادەی موەقەتە لە چ بەرەیەکدا وەستاوە؟»

*

## هاتنی لەشکری پارتی بو دولەتو

دوای کونگرەی نوهەم، پارتی زورتر هاوکاری لە گەل حکومەتی ئیران ئەکرد و، حکومەتی ئیرانیش یارمەتی ئەدان هیزەکانیان ریک بخەنەوە. لە سەر شیوەی جاران لق و ناوچەکانیان پیک هینایەوە، بەلام بارەگاکانیان هەموی لە ئیران بو. حەدکا، بۆ کزکردنی دەسەلاتی یەکیتی، لە هەمو ناوچەکان دا کارناسانیان بۆ ئەکردن.

جەنگی عیراق - ئیران گەرم ببو، ئیران زوری بۆ هینا بون لە ناو عیراق دا چالاکی چەکدار دژی جەیشی عیراق بکەن، بۆ ئەو مەبەستە لە ئەرتەش بەشیکیان دروست کرد بو بە ناوی «ستاد جنگهای نامنظم» پارتی هەمیشە بونی هیزەکانی یەکیتی ئەکرد بە بیانوی راوەستانی چالاکییەکانی، گوایە یەکیتی ریگا لە وان ئەگری خەبات بکەن، راستییەکەی ئەوە بو سەرکردایەتی پارتی، بە تایبەتی بنەمالەی بارزانی، لای وابو بە شەری کورد حکومەتی عیراق ناروخی، لە بەر ئەوە نەیئەویست کادر و ئەندامەکانی لەو شەرەدا بە کوشت بدا. نەیشی ئەویست هیچ جۆرە ریککەوتنیکی سیاسی لە گەل یەکیتی ئیمزا بکا.

سەرەتای مانگی تشرینی یەکەمی ۱۹۸۰ بیستمان پارتی کەوتوتە سازدانی هیزەکانی. لە پر پەلاماری قەلاتوکانیان دا. قەلاتوکان وەکو ئیستگایەکی سەرە ریگا بۆ ناوچەکانی: قەلادزی، چۆمان، رەواندز، شەقلاوە، هەولیر گرنگییەکی تایبەتی هەبو. هیزەکانی پارتی پەلاماریکی کتوپریان دابو گرت بویان و، هاوزەمان لە گەل ئەم هیرشەدا، هیزیکی گەورەیان لە دەراوی گویزی، دولە کوکە، دەروای دولەتو و چیاکانی پشتی دولە تو سەریان دەرهینا. زوری لیپرسراوە ناسراوەکانیان وەکو: عەلی عەبدوللا، رۆژی نوری

شاوەیس، ئازاد بەرواری، عەبدوللا بەرواری، حەمە سالح جومعە.. لە گەڵ هات بو، دواتر مسعود خویشی هات و، ئیدریسیش بە تەمای هاتن بو.

پیوەندی حسک - یەکیتی ساردی تی کەوت بو، بە پیچەوانەوە پیوەندی حسک - پارتی خوش بوبو، ئەم هاتنەیان، کە هەرشەی بو سەر یەکیتی دروست ئەکرد، پی خوش بو، بەلکو بە دەسکیشیی ئەوان بو. حدکایش کارئاسانییان کرد بو بو هینانیان و، لە کاتی گویزانەوەیان دا ئەوان پاسەوانی خویان لە گەڵ ئوتومویلەکانیان نارد بو.

ئیمە کە بەسەمان زانی یەکسەر هیزیکمان پەراندەوە بو شاخەکانی بەرامبەر ناوزەنگ - شینی و، داوامان لە هەریمەکان کرد هیزەکانیان بنیرن بو سەرکردایەتی و، داوامان لە حشع کرد، ئەویش هەلویستی خوی لەم دەستدریژییەی پارتی دیاری بکا.

ئەگەر شەر بکەوتایەتە ناوچەکەوە، ئەوان بیانویستایە یا نەیانویستایە، ئەگەر لە شەرەکەیشەوە نەگلاتایە، ئەوا جیگەیان پی لیژ ئەبو. لە بەر ئەوە کەوتنە خو بو ناوبژی و، هاتوچو کردن لە نیوان هەردولای ناکوکییەکەدا.

سەرانی پارتی ئەیانوت هاتون شەر لە گەڵ رژیمی بەعس بکەن و، هیزەکانی بەعس لە پشدەر دەربکەن. ئەم بیانوە بو ئیمە جیگەی گاڵتە پی کردن بو، لە شنو هەتا قەسری شیرین، ئەیانتوانی لە سیدەکان هەتا خانەقین شەر لە گەڵ رژیم بکەن، هیچ جیگایەکیان نەدوزیوەتەوە بیکەن بە مەیدانی شەر، دەوروپشتی بارەگاکانی ئیمە نەبی؟

نوینەرانی حشع: مەلا ئەحمەدی بانیخیلانی، بەهادین نوری، فاتیح رەسول.. چەند جاری هاتن بو لای ئیمە و چون بو لای سەرانی پارتی لە دەراوی دولەتو. ئیمە سور بوین لە سەر ئەوەی قەلاتوکان بە جی بهیلن و بگەرینەوە ناوچەکانی خویان و، ئەوان سور بون لە سەر تیپەرین بە ناوچەکانی ئیمەدا بو پشدەر.

ئەوان لەم هاتوچویەدا بون، بەیانی روژی ۱۹/۱۰/۸۰ هیزیکی عیراق پەلاماری مامەندەی دا. ئەو جاشانەی لەم هیرشەدا بەشدار بون، لەوانە بون سەر بە پارتی بون. بەزمەکە لە پیلانیکی ریکخراو ئەچو. لەم لاوە پارتی هەرشەی لی ئەکردین و لەو لاوە حکومەت هیرشی بو ئەهینایین.

هیزیکی دائیمی هەمیشە لە مامەندە بو بو بەرپەرچدانەوەی هیرشی ناکاوی دوژمن، لە کاتی پیویست دا هیزی پشتیوانیمان بو ئەنارد. شەر لە مامەندە گەرم بو، هیزەکانی پارتی بە چیاکانی ئەوبەرەوە چاویان لە شەرەکە بو. بە بیانوی یارمەتیدانەوە ویستیان لە چەمی نوکان بپەرنەوە بو بەری بارەگاکانی ئیمە. یەکیکیان بە هوکی ترکی قسەی ئەکرد، وتی: «ئەمانەوی بیین لەو شەرەدا یارمەتیتان بدەین!» پیم وت: «پیویستیمان بە یارمەتی ئیوە نیە، بەشی هەردولاتان ئەکەین» بە هیزەکانی خومانم وت: «ریگایان نەدەن بپەرنەوە و، حیزفرسەتی بکەن!»

عومەری حاجی عەبدوللا هیزیکی لە گەڵ خوی برد. سەرکەوت بو مامەندە. سەرکردایەتی شەرەکەی گرتە ئەستو. هیرشیکی ئازایانەیان کرد. هیزەکانی حکومەت شکان و، گەرانەوە دواوە. بەلام ۳ پیشمەرگە کوژرا و ۷ یش بریندار بون.

*

مەلا ئەحمەدی بانیخیلانی قسەیەکی بە جی ی کرد. وتی: «ئەم برادەرانە لە ئیران دائەنیشن ئیوە جنیویان پی ئەدەن ئەلین ناگەرینەوە کوردستان خەبات بکەن، ئەوا هاتون

ئەیانەوی بگەرینەوە بۆ کوردستان، ئێوە ئەلێن ئەبی بگەرینەوە شوینەکانی خۆیان. ئێستا ئەمانە بڕۆنەوە بۆ تیهران یا بڕۆنەوە بۆ کوردستان؟»

قسەکەی مەلا ئەحمەد بە جی بو.

لە ناو خەزمان دا باسی ئەوەمان کرد کە هەلویستی ئێمە لە پارتی چی بێ. لە نیوان ئێمە و ئەوان دا رابوردویەکی خویناوی هەبو، هیچ ئاشتبونەوە و ریککەوتنیکی بە دوادا نەهات بو. بێ ریککەوتنیکی سیاسی هێزەکانی ئێمە و ئەوان چۆن پیکەوە هەل ئەکەن. بە تایبەتی ئەوان لە هەر جیبەیەک دا دەسەلاتیان هەبویی، بەکێتیان لە رەگوریشە دەرهیناوە. ئێستایش ئاوا بە «کەلەگایی» ئەیانەوی سواری ملمان بێن و ناوچەکە داگیر بکەن. پرۆژەیەکمان لە لا گەلالە بو:

١. جەنگی راگەیاندن رابگرین.

٢. ماوەی ٣ مانگ شەریان لە گەل رابگرین.

٣. لای رۆژئاوای جادەی هاملتونیان بۆ چۆل بکری، هێزەکانیان لەوی دابمەزرینن، ئەوانیش بەری رۆژهەلاتی جادەکە بە جی بهێلن.

٤. پارتی قەلاتوکان چۆل بکا.

٥. هەر کیشەیەک روی دا بە ناوبژی حشع بە خۆشی چارەسەر بکری.

ئەگەر ئەمانەیان قبول کرد پاش ٣ مانگ سەر لە نوێ چاو بە مەسەلەکەدا ئەخشێنینەوە بۆ هەنگاوی داهاتو.

هێزەکانی پارتی بە شاخەوە بون، نوایەکیان ئەبو لە باران و سەرما بیانپاریزی. شەو هەتا بەیانی هەلئەلەرزین و، خەریکی ئاگر کردنەوە بون. ئەخشەیەکمان دانا ئەگەر بە خۆشیی لە ناوچەکە نەکشانەوە، لە گەل دەس پی کردنی بارانی «پەلە» دا لە چەند لایەکەوە پەلاماریان بدەین و دەریان بکەین.

*

حشع پیشنیارەکانی بە لاوە باش بو، چەند گورینیکی کەمیان داوا کرد: لەوانە هەمو حیزبەکان - جگە لە پارتی - بۆیان هەبی لە قەلاتوکان بارەگایان هەبی، چونکە سەرە ریگای هەمویانە. هێزەکانی پارتی هەتا دەرگەلە بین. یەکەمیان پی باش و دوەمیان پەسند نەکرد.

حشع پیشنیارەکانیان برد بۆ پارتی. سەرانی پارتی لە سەر زۆری رازی بون. ئێمەش جەمال ئاغامان نارد بو ئەوەی ئاگاداری پیشمەرگەکانی یەکێتی بکا لە ناوچەکانی گرتک، روست، گەلالە، هەمودیان.. واتا بەری رۆژئاوای جادەی حاجی ئومەران بکشێنەوە بۆ بەری رۆژهەلاتی جادەکە.

سەرەتای مانگی تشرینی دوەمی ۱۹۸۰ هێزەکانی پارتی دەستیان کرد بە کشانەوە بەرەو شوینەکانی خۆیان لە تیهران. ئەم کیچەلەی مانگیک زیاتری خایاند بە بی شەر لە کۆلمان بوەوە. پارتی هەندی لە هێزەکانی خۆی بۆ ناوچەی حاجی ئومەران نارد، بە نیازی رزگارکردنی حاجی ئومەران، بەلام سەرکەوتو نەبون و، لەو شەرەدا چەند کەسیکی ناسراویان لی کوژرا، لەوانە: فەتاح ئاغا، سەعید تزماری..

فەتاح ئاغا ئەگەرچی خۆی بە هەلگری بیری نەتەوەیی دائەنا و، تا هەلوەشاندنەوەی کاژیک، ژیر بە ژیر لە گەلیان بو، بەلام تا کوژرا خۆی بە دلسۆزی بنەمالەی بارزانی

داتەنا. فەتاح ئاغا لە شەڕەکانی ٧٤ دا سەرلەشکری هێزەکانی سلێمانی و کەرکوک بو. لە ڕۆژانی ئاشبەتال دا لە چەند جێگایەک بۆ لێکۆڵینەوەی هەلومەرجی سیاسی کوردستان کۆبونەوە بە لێپرسراوەکانی شۆڕش کرا. یەکێ لەو کۆبونەوانە لە پێنجوێن کرا هەمو فەرماندەی هێز و بەتالیون و، ئەندامەکانی لقەکانی پارتی.. بەشدار بون. لە پێش دا ڕیوشوێنی ئەوە داتەنین چۆن درێژە بە شۆڕش و بەرەنگاری بدرێ، لەو کاتەدا پرۆسەکەی بارەگای بارزانییان بۆ دێ دەربارەی ئاشبەتاڵ. یەکێ لە فەرماندەکانی پێشمەرگە کە بانگ کرا بو بۆ ئەو کۆبونەوەیە داوا لە فەتاح ئاغا ئەکا گوێ نەدەنە ئەو پرۆسەکەیە و بێننەوە و درێژە بە شۆڕش بدەن و، داوا لەویش ئەکا بێنێتەوە بۆ سەرکردایەتییان. فەتاح ئاغا ئەڵێ: «قاچی بارزانی لە کوێ بێ سەری من لەوێ ئەبێ».

فەتاح ئاغا قسەکەی خۆی بردە سەر. لە ٧٥ دا ئامادە نەبو لە کوردستان بمێنێتەوە سەرکردایەتی هەزاران پێشمەرگە بکا. بە پەنابەری چو بۆ کەرەج. کەچی ٥ ساڵ دوای ئەوە، بۆ ڕازی کردنی دڵی بنەماڵەی بارزانی ئامادە بو لە کەرەجەوە بگەڕێتەوە بۆ کوردستان و، خۆی لە شەڕێکی پچوک دا بە کوشت بدا.

*

جوقد و جود

مامجەلال لە نیسانی ١٩٨٠ دا چو بو تاران و لەوێوە چو بۆ دیمەشق. تاران - دیمەشق ئەگەرچی لە سەر زور مەسەلە ناکۆک بون، بەلام میحوەرێکیان پێک هێنا بو، یەکێ لە ئامانجەکانیان ڕوخاندنی ڕژێمی صەددام حسێن بو. بەرورای ئەم دو لایە لە سەر پاشەڕۆژی عێراق جیاواز بو. هەرچی ئێران بو تازە لە گەرمەی سەرکەوتنی دا بو، ئەیویست شۆڕشی ئیسلامی هەمو دنیا، لە پێشەوە عێراق، بگرێتە بەر. هەرچی سوریایش بو ئەیویست سەرکردایەتی بەعس، بە تایبەتی صەددام و هاوڕێکانی بروخێ، ئیتر داوودەزگاکانی حیزبی بەعس و حکومەتەکەی لە عێراق دا بە هی خۆی ئەزانی.

هەڵگیرسانی جەنگی عێراق - ئێران و، گرتنەوەی لولەی نەوتی عێراق - سوریا و، بێ بەش کردنی لەو دەرامەتە گرنگە، ئومێدێکی زۆری دابو بە نەیارەکانی صەددام. گفتوگۆی خۆ بە خۆ لە ناو سەرانی معارضەی عێراقی و، لە نێوان لایەنەکانی موعارضەی عێراقی لە لایەک و، کاربەدەستانی سوری و لیبی و فەلەستینی لە لایەکی ترەوە، سەرەنجام بە ڕێککەوتنێک کۆتایی هات «الجبهة الوطنیة القومیة الدیمقراطیة» یان لە نێوان ئەم لایەنانەدا پێک هێنا:

لایەنە عەرەبییەکان: حزب البعث العربی الاشتراکی - قیادة قطر العراق، الحرکة العربیة الاشتراکیة، الحزب الشیوعی العراقی، الحزب الاشتراکی العراقی، منظمة الجیش الشعبی لتحریر العراق، هەندێ کەسایەتی سەربەخۆ.

لایەنە کوردیەکان: یەکێتی نیشتمانی کوردستان، حیزبی سوشیالیستی یەکگرتوی کوردستان.

شەوی ١٢ ی تشرینی دوەمی ١٩٨٠ ڕادیۆی دیمەشق هەواڵی دامەزراندنی جوقدی ڕاگەیاند و، حازم لە باتی بەعس و، مامجەلال لە باتی یەکێتی و، عەبدولرەزاق صافی لە باتی حشع وتاریان خوێندەوە. دامەزراندنی جوقد لە عێراق دا بە چاکی دەنگی دایەوە و، ناحەزانی صەددام ئومێدێکی زۆریان لە سەر هەڵچنی بو. من خۆم هیوایەکی زۆرم پێ ی

ئەو. جۆری پێکهاتنی لایەنەکانی و، توانای سیاسی و ڕێکخراوەیی و جەماوەرییان لە سەر ئەرز و، جیاوازی بیروبۆچونیان لە سەر پاشەڕۆژی عیراق.. وای لی کرد بوم من هیوایەکی ئەوتۆم بەم بەرەیە نەبی و، لام وابو شتی لە ئەرکی قورسی سەرشانی ئیمە کەم ناکاتەوە. د. خەسرەو خال، کە ئەوسا سەرپەرشتی خەتێکی گەورەی ڕێکخستنەکانی ناوشاری ئەکرد، لە نامەیەک دا بە هیوایەکی زۆرەوە باسی جوقدی کرد بو، داوای کرد بو «تفصیلات» ی ئەم بەرەیەی بو بنوسم. منیش لە وەلام دا بۆم نوسی حیکایەتی یەکیتی و جوقد وەکو ئەو پەندەی پیشینانە: «بە حوشتریان وت: مژدە بێ کورت بوا وتی: کورم بی یا کچ کۆلی خۆم بە پشتی خۆمەوەیە».

جوقد دەستەی نوێنەرایەتی پێک هینا و، لە هەندی جیگا مەکتەبی کردەوە. زیاتر لەوەی دەزگای خەبات بی بۆ ڕوخاندنی ڕژیمی بەعس، بو بە دوکانی پارە پەیدا کردن و، هەندی لەم لایەنانە بە ناوی پێکهینانی لەشکر و، ڕێکخستنی خەباتی نهێنیەوە پارەی زۆریان لە لیبیا وەرگرت. کورد وتەنی: کێ ئەیکا و کێ ئەیخوا؟

*

لە جوقد دا پارتی ئاڤەرۆز کرا بو. ڕاستەکەیشی ئەوە بو، یەکیتی ئەیویست پارتی وەتەق بخات و، لە مەیش دا هەم بەعس و هەم حرکە هاوکاریی یەکیتیان ئەکرد. حشع و حسک دو لایەنی جوقد بون. د، مەحمود پەیمانی جوقدی لە باتی حسبک ئیمزا کرد بو. بەلام سەرکردایەتی حسیک لە کوردستان بی ئاگایی خۆی لەو ڕێککەوتنە پیشان ئەدا و، خۆی پیوە نەئەبەستەوە، ڕاستیەکەیشی ئەوەبو: ڕەسول ئەیویست بیسەلمێنی کە پیاوی دەسەلاتدار و بڕیار بە دەستی ناو حسبک خۆیەتی نەک د. مەحمود.

دوای ڕاگەیاندنی جوقد بە چەند ڕۆژی سەرانی حشع لە کوردستان: مەلا ئەحمەدی بانیخیلانی، فاتیح ڕەسول، کەوتنە هەولی پێکهینانی بەرەیەکی تر لە گەل پارتی و حسک. بەرنامە و بەلگەکانیان ئامادە کرد بو. بیگومان کارێکی وەها گەورە، کە لەوانە بو بی بە هۆی تیکچونی پەیوەندی حشع لە گەل زوری لایەنەکانی جوقد، لە دەسەلاتی دو کەسی بی دەسەلاتی وەکو مەلا ئەحمەد و فاتیح دا نەبو، بەلکو لە سەروترەوە ڕایان سپارد بون. لە مەیش ئەیانویست بە تیریک دو نیشان بشکینن: یەکەمیان، یەکیتی، کە لە ڕوی پیشمەرگەیی و ڕێکخراوەیی و جەماوەرییەوە، لە چاو هەمو هیزەکانی کوردستان دا بەهیزتر بو، بە هاوپەیمانیتیەکی ٣ قولی گەمارۆ بدەن و، بالادەستی یا هاوسەنگیەکی پیشمەرگەیی و سیاسی لە گەل دروست بکەن. دوەمیان، مستی لە دەمی حازم و هاوڕیکانی بدەن.

لە گفتوگۆی دوقولی ئیمە و حشع دا چەند جاری زۆر بە وردی مەترسیەکانی ئەم کارەمان بۆ ڕون کردنەوە و، تیمان گەیاندن کە دامەزراندنی بەرەی دوەم نرخی بەرەی یەکەم ناهیلی. خۆ ئەگەر هەر سورن لە سەر ڕازی کردنی پارتی، لە باتی ئەوەی بەرەیەکی تازە دروست بکەن و، ناوی «بەرە» سوک بکەن، پەیمانیکی «هاوکاری دوقولی» یان لە گەل ئیمزا بکەن و، لە گەل لایەنەکانی جوقد خەریک بن پارتی بش بە ئەندام قبول بکەن.

گوییان لە قسەکانی ئیمە نەگرت. ڕۆژی ٢٨ ی تشرینی دوەمی ٨٠ لە ڕاژان پەیمانی «الجبهه الوطنیه الدیمقراطیه» لە گەل پارتی و حسک ئیمزا کرد.

*

فەرهەنگی سیاسی حیزبە شیوعییەکانی عەرەب لە کاروباری حیزبایەتی دا لاسایی کردنەوەی سۆڤیێت و ولاتانی ئەوروپای رۆژهەلات بو، زور جار زاراوەکانی ئەوانیشیان بە کار هیناوە. یەکی لەو شتانە «بەرەی یەکگرتو» بوە. کە هەندی لە پارتیە کومونیستیەکان لە سەردەمی دوەمین جەنگی جیهانی دا دایان هینا بو کوکردنەوەی حیزب و ریکخراوەکان دژی فاشیزم. لە هەمو ئەو بەراتەدا خویان بە «پیشرەو» و، حەزبەکانی تریان بە بورجوازی و وردەبورجوازی دائەنا. ناوی بەرەکانیشیان بە وشەی بریقەدار ئەرازاندەوە. حشع لەم بوارەدا پیشینەی میژویی هەبو.

– لە سەردەمی پاشایەتی دا «جبهە الاتحاد الوطنی» لە گەل حیزبە نەتەوەییەکانی عەرەب لە عیراق دا پیک هینا بو.

– سالی ۱۹۷۳ لە گەل بەعس و هەندی لە حیزبە کارتونیەکانی کورد «الجبهە الوطنیە والقومیە التقدمیە» پیک هینا بو.

– ئیستاش لە شام لە گەل هەندی لە حیزبە عیراقی و کوردیەکان «جوقد: الجبهە الوطنیە والقومیە والدیموقراطیە» و، لە راژان لە گەل دو حیزبی کوردی تر «جود: الجبهە الوطنیە الدیموقراطیە» یان ریک خستوە.

بیگومان ئەمانە زورتر قەوارەی بی ناوەروک و هیچ لە بارا-نەبو بون، نەک داوودەزگای خەبات و روخاندنی رژیمی دیکتاتوری و دامەزراندنی رژیمی دیموکراسی، وەکو ئەلین: «ناوی زل و دی ی ویران» بون.

*

جەمیل رەنجبەر و پیرانە رەش

هەندی لەوانەی تازە ئازاد بوبون بە کاری ریکخراوەیی و سیاسی قایل نەئەبون، حەزیان ئەکرد کاری پیشمەرگەیی بکەن. عومەری سەید عەلی کرا بو بە بەرپرسی دەزگای ریکخستنی کومەلە، کارەکەی بو خوی بە پچوک ئەزانی و، چەند جاری لە کوبونەوەکان دا داوای ئەکرد کاریکی تری پی بسپیرن. چوە مەکتەبی عەسکەری و، ماوەیەک کاروباری دارایی م ع ی ئەکرد.

دوای ئەوەی گیچەلی پارتی مان لە کول بوەوە، ئەو هیزانەی لە سەرکردایەتی کو کرابونەوە، ئیتر پیویستی مانەوەیان نەما بو، کوبونەوەمان لە گەل کردن بو ئەوەی باسی گەرانەوە بو ناوچەکانی خویان و، وشاندنی دەس لە هیزەکانی بەعسیان لە گەل بکەین. سەید کەریم کە ئەندامی م ع بو، ئەویش ئەچو بو نزیک هەولیر. ژمارەیەک لە پیشمەرگە و کادرەکانی هەولیر و سلیمانی لە گەل چو.

روژی ۱۸ ی تشرینی دوەمی ۸٠ لە کاتیک دا ئەم هیزە لە گوندی جەلکەوە ئەچون بەرەو پیرانە رەش لە ناوچەی پشدەرە رەقە چەند هالیکوپتەریک ئەگاتە سەریان، بە شەستیر و نارنجوک هیزەکە دائەگرنەوە ۹ یان لی کوشتن و ۱۲ یان لی بریندار کردن. لە ناو کوژراوەکان دا جەمیل رەنجبەر و، دلشاد محەمەد، لیپرسراوی ناوچەی کویە و، لە ناو بریندارەکان دا عومەری سەید عەلی و صابیر رەسولی تی دا بو.

جەمیل سالی ۱۹٤۷ لە دایک بوبو. ماموستای سەرەتایی بو. حاجی صالحی باوکیشی پیاویکی کوردپەروەر بو. لە سەرەتای شەستەکانەوە تیکەلاوی کاروباری سیاسی بو. لە سەرەتای دامەزراندنی کومەلەدا هات بوە ناو کومەلە. لە ۱۹۷٤ دا چوە ریزی

شورشەوە. سالی ٧٦ چەند مانگی گیرا و بەربو، بەلام سالی ١٩٧٧ لە گیرانی بە کۆمەلی پەشی لە ریکخستنەکانی کۆمەلە گیرابەوە و ٦ سالیان حوکم دا. لە ئابی ٧٩ دا بەر عەفوی عام کەوت و بەر بو. دوای ماوەیەک هاتە ریزی پیشمەرگایەتیەوە. جەمیل تیکۆشەریکی کۆلنەدەر و رۆشنبیریکی تیگەیشتو و، کادریکی بە نرخ بو. ماوەیەک لە دەزگای راگەیاندن کاری کرد و ئینجا دانرا بە ئەندامی لقی یەکیتیی نیشتمانی لە هەولیر. لەم پەلامارە ئاسمانیەدا کوژرا.

لەو سەردەمەدا لە ناو ئەدیب و شاعیرەکانی هەولیردا وا باو بو ناوی وەکو: بی خەو، پەریشان، زامدار، پەشیو، خەمبار.. یان هەلئەبژارد بۆ خۆیان. لە زمانی هیمنەوە ئەیانگیرایەوە جاریک پی ی وت بون: ئەمە نەخۆشخانەیە یا لقی نوسەرانە؟ جەمیل، وەکو نیشانەی بیری پیشکەوتوانەی ناوی «رەنجبەر» ی کرد بو بە نازناوی ئەدەبیی خۆی. ئەندامی یەکیتیی نوسەرانی کورد بو. سالی ٦٩ یەکەمین دیوانی شیعری لە ژیر ناوی: «راز و سکالا» دا بلاو کرد بوەوە. دەزگای راگەیاندن هەندی لە شیعرەکانیان کۆ کردەوە و چاپیان کردەوە.

*

سەید عومەریان لە ناو دارە مەیت دا هینایەوە ناوزەنگ، پشتیی وەکو بیژنگی لی هات بو، چەند پارچەیەک لە بربرەی پشتی دابو. هەردو قاچی لە کار کەوت بو. لە نەخۆشخانەکەی خۆمان تەداویەکی سەرەتایی کرا و، دەسبەجی رەوانەی ئیرانمان کرد. پاشماوەیەک لە تهرانەوە چوە سوید. ماوەیەکی دریژ لە نەخۆشخانەدا مایەوە. هەرچەندە قاچەکانی کەوتنەوە کار بەلام هەرگیز وەکو جارانی لی نەهاتەوە.

ئەو ماوەیە لە چەند جیگا، بە تایبەتی لە دەشتی کۆیە و لە جەبهاری، پیشمەرگەی یەکیتی توشی زەرەری قورسی گیانیی بون. هۆیەکەیشی بیباکی و بی پەروایی، یان وەکو پی ی ئەلین: لە ئەنجامی «بە کەم گرتنی دوژمن» دا بو. هیزەکانی جەیش لە هەندی شوینی کوردستان کیشرا بونەوە بۆ مەیدانەکانی جەنگ لە گەل ئیران، پیشمەرگە لایان وابو بە هۆی شەری ئیرانەوە، عیراق ناپەرژیتە سەر ئەوان.

*

ستاری سەعید خەلەف

ستار دوای تەسلیم بونەوەی زۆر زو پەشیمان بوبوەوە. هەوالی بۆ ناردین کە ئەیەوی پەیوەندی لە گەل یەکیتی دابمەزرینی و لە ناو شار پلانی هەندی کاری پیشمەرگانە دابنی. ئیمە هەوالەکەمان زۆر پی خۆش بو. ستار پیاویکی ئازا و چاونەترس بو، کاری گەورەی لە دەس ئەهات. بەلام پەیوەندی لە گەل زۆر لەوانە کرد بو کە تەسلیم بوبونەوە و، هەندیکیانی ریک خست بو، لەوانە: عومەری ئاوەکەلە.. جاریکیان بە کەریمی دادە مەنە دا نامە و ژمارەیەکی زۆر کتیب و نامیلکەی زانستەکانی جەنگ، بە تایبەتی زۆری کتیبەکانی (کلیەی عسکری) عیراقی بە دیاری بۆ نارد بوین. کەریم لە لای ئیمە نەمایەوە چو بۆ لای حسک.

ستارمان ئاگادار کرد کە زۆر وریا بی لە پەیوەندییەکانی و، لە هەلبژاردنی ئەوانەدا کە قسەیان لە گەل ئەکا. ئەو باوەری زۆر بە خۆی هەبو، باوەری بەوانەش هەبو کە هەلی بژارد بون. داوای چەند دەمانچەیەکی بیدەنگی کرد بو بۆمان نارد. بە تەما بو چەند

کاریکی گەورە ئەنجام بدا: لەوانە کوشتنی بەرپوەبەری ئەمنی سلیمانی، ئینجا ببتەوە دەرەوە.

لە سەرەتای تشرینی دوەم دا هەوالمان پی گەیشت. ستار لە ناو ئوتومۆبیلەکەی خۆی دا بە دەمانچەیەکی بیدەنگ کوژراوە. ئەم روداوە بۆ ئیمە زۆر ناخۆش بو. تازە دۆستایەتی لە گەل ئیمە تازە کرد بوەوە. چاوەروانی کاری گەورە بوین لی ی. کەوتینە دوای روداوەکە.

لیکۆلینەوە دەری خست عومەری ئاوەکەلە لە سەرەتاوە «ئەمن» ی ئاگادار کرد بو. «ئەمن» عومەریان راسپارد بو لە گەل ستار بروا و، بە وردی چاودیری پلانەکانی بکات. وەختی کاتی جیبەجی کردنی کارەکە نزیک بوبوەوە، «بەرپوەبەری ئەمن» بە ناوی میوانداریەوە نارد بوی بە دوای دا. بە دەمانچە بیدەنگەکەی خۆی و، بە عومەری ئاوەکەلەی کوشت بو، لە ناو ئوتومۆبیلەکەی خۆی دا فریبان دابو.

*

بەربونەوە لە چلەمین فرین دا

رۆژی ٢٠ی کانونی یەکەمی ٩٨٠. فرۆکەیەکی ئیرانی لە ناوچەی رانیە کەوتە خوارەوە. فرۆکەوانەکەی ناوی سەرگورد عەبدوللای شەریفی بە پەرەشوت خۆی هاویشت بو. هەندی ئازاری پی گەیشت بو، بەلام بە زیندویەتی کەوتە دەس دانیشتوانی ناوچەکە. ئەوانیش تەسلیمی پیشمەرگەکانی هەریمی ١٤ ی ئاکۆیان کرد.

حکومەتی عیراق هەولیکی زۆری لە گەل سوار ئاغا دا و، تەماعیکی زۆری خستە بەری بۆ ئەوەی تەسلیمی ئەوانی بکا. ناردمان فرۆکەوانەکەیان هینا بۆ ناوزەنگ و رەوانەی ئیرانمان کردەوە. شەریفی خۆی ئەم روداوەی کرد بە کتیبی لە ژیر ناوی: «سقوط در چلهمین پرواز» دا بلاوی کردەوە. هەر لەو ماوەیەدا کتیبەکەیان کرد بە فلیمی سینەمایی.

نیوانی ئیران و یەکیتی ساردی تیکەوت بو، ئەم چاکەیەش نەیتوانی گەرمی بکاتەوە. لە فلیمەکەدا بە هیچ جۆری باسی دەوری یەکیتیان نەکرد بو لە روداوەکەدا، بەلکو خستبویانە قالبی ئازایەتی فرۆکەوانەکە و، پیاوچاکی دانیشتوانی ناوچەکە، کە لە بەر خۆشەویستی ئیرانی ئیسلامی ئەم کارەیان کردوە.

# سالی ١٩٨١

## بۆچی چووم و، توشی چی بووم

ناوچەی هەورامان و شارەزوور لە سەرەتای دەسپێکردنەوەی شۆڕشەوە، یەکێ بوو لە ناوچەکانی نفوزی کۆمەڵە. یەکەمین مەفرەزەی ئەوێ: شێخ عەلی، عەلی ئەحمەد شیعە، حامیدی حاجی غالی، حەمەی حاجی مەحمود، دکتۆر ڕەزا، حەمەی حاجی سابیر.. لە سەرەتادا هەموویان ئەندامی کۆمەڵە بوون، بەڵام لە بەر هۆی جۆراوجۆر هەندێکیان لە کۆمەڵە تەکێ بوونەوە.

حەمەی حاجی مەحمود زۆر زوو وازی لە کۆمەڵە هێنا بوو، دیسیلپینەکانی پێ قوبوڵ نەئەکرا و، فێری ئەوە بووبوو لە سنووری کارەکانی خۆی دا بە ئازادی و بێ لێپرسینەوەی کەسێکی سەرووی خۆی کار بکا. لە پێشمەرگایەتی دا ئازا و زیرەک و، توانایەکی باشی ڕوێشتن و بەرگە گرتنی ناخۆشیی هەبوو. بە پێشمەرگایەتی دەستی پێ کرد بوو، بووبوو بە فەرماندەی مەفرەزە، ئینجا فەرماندەی کەرت تا گەیشت بوە فەرماندەی هەرێمی ١ ی شارەزوور و هەورامان. لە زۆری شەڕەکانی یەکێتی دا دژی قم بەشداری کرد بوو. ئەم و جەمالی عەلی باپیر و ٦ کەسی تر لە کارەساتی هەکاری دەرباز بوون. لە گەڵ پێشمەرگەکانی دا نەرم بوو، پارەی ئەدانێ و چاوپۆشی لە کەموکورییەکانیان ئەکرد. لە بەر ئەوە پێشمەرگەی لێ کۆ ئەبوەوە.

مامجەلال کە چوو بوو بۆ نیشکولان بۆ بینینی نوێنەرانی ئێران بۆ ناوبژی لە نێوان ئێران و کوردەکان دا. مامجەلال ئەمیشی لە گەڵ خۆی برد بوو، لەوێ لە گەڵ سالار بووبوو بە ناخۆشییان. حەمە خۆی لە زۆری مەسئولەکان بە بچووکتر نەئەزانی و، بە مەسئولی خۆی دانەئەنان.

زۆری کادر و فەرماندە و پێشمەرگەکانی هەرێمەکەی کۆمەڵە و، لە ناو کۆمەڵەیش دا لە توندڕەوەکان بوون. ماوەیەک بوو گەرییان تێ ئالاند بوو ئەیانویست کزی بکەن و لە دەسەڵاتی بخەن. چەند جاری لە گەڵیان تێک ئەچوو. ئێمە بۆ ئەوەی یەکێتی هەرێمەکە بپارێزین ئاشتمان ئەکردنەوە. هاوینی سالی ٨٠ لە ناو خۆیان دا تێکچوون. زۆری کادر و فەرماندەی کەرتەکان لێ ی هەڵگەڕا بوونەوە. خەریک بوو بێی بە شەڕیان. لە بەر ئەوە هەموومان داوا کردن بۆ ناوزەنگ.

هەردولایان شکاتیان لە یەکتری هەبوو. حەمە ئەوانی تاوانبار ئەکرد بە توندڕەوی و تێکدانی هەرێمەکەی و، ئەوانیش حەمەیان تاوانبار ئەکرد بە ڕاووڕوت و کۆکردنەوەی پارە و خەرجی بێ لێپرسینەوە. هەردولایشیان ڕاستیان ئەکرد. حەمە پارەیەکی زۆری کۆکرد بوەوە و خەرجی کرد بوو بێ پرسی سەرکردایەتی. ئەو پارانەی سەنەد بوی:

- لە هەموو دانیشتوانی ناوچە ڕاگوێزراوەکانی سنووری پێنجوێن و سوورێن و هەورامان، ئەوانەی «تعویض» یان وەرگرت بوو، لە سەدا چل تا لە سەدا پەنجای لێ سەند بوون.

- پارەی زوری، بی هیچ بیانویەک، لە چەند کەسی تر سەند بو، هەندیکیان لای سەرکردایەتی یەکیتی شکاتیان لی کرد بو، سەرکردایەتی داوای لە حەمە کرد بو پارەکانیان بو بگیریتەوە، بەلام ئەو گوی ی نەداپویە. لەوانە: کامباری مەجیدخان و حاجی ئەولەی هەلەبجەیی..

حەمە ئەبوت بەو پارەیە چەک و تەقەمەنی بو پیشمەرگەکانی هەریمەکەی کریوە، یارمەتی مانگانەی لی داوە، یارمەتی مالە شەهیدەکانی داوە، ئەپارەکانیشی ئەیانوت هەندی لەو شتانەی کردوە، بەلام زوری پارەکەی بو خوی هەلگرتوە، تازەیش ژنیکی تری بە سەر ژنە کونەکەی دا هینا بو، تفەنگیکی کرد بوە ملی، لە گەل خوی ئەیگیرا.

*

مەکتەبی سیاسی هەیئەتیکی، بە سەروکایەتی عومەر شیخموس، دروست کرد بو لیکولینەوەی شکاتەکانی هەردولا. ناکوکییەکانیان وا توند بوبو ئیتر نەیانئەتوانی پیکەوە کار بکەن، یان لە ناوچەیەک دا هەل بکەن. هەمومان لە ناوزەنگ گل دانەوە. بە تایبەتی لەو کاتەدا مەترسی هیرشی پارتی هەبو بو سەر بارەگاکانی سەرکردایەتی.

لە ناو مەکتەبی سیاسی و سەرکردایەتی دا، زوریان رەئیان وابو: حەمە بە ناوی یەکیتییەوە، بەرەللایی و راووروتی زوری کردوە و، پارەیەکی زوری کو کردوتەوە، پیویستە بی سزادان وازی لی نەهینین، بەلام لە بەر ئەوەی لە دەستی دی یاخی بی و بداتە پال ناحەزەکانی یەکیتی یا بچیتە پال رژیم، چاکتر وایە چەکی بکەین و بیگرین، ئەگەر دەستی کردەوە بیکوژین. من بە توندی چوم بەگژ ئەم رەئیەدا و، نەمهیشت هیچی لی بکەن چونکە لام وابو بو ناوبانگی یەکیتی باش نییە بەو جورە رەفتار لە گەل کاربەدەستیکی ناسراوی خوی بکا، ئەبی بە نەرمی و ئاموژگاری لە گەلی بجولیینەوە.

روداوەکان دەریان خست من بە هەلەدا چو بوم و، رەئی هاوریکانم راست بو.

شەویکی سەرەتای مانگی ئەیلول حەمە هەمو دەستە و دائیرەکەی خوی کو کرد بوەوە لی دا بو رویشت بو. گەرا بوەوە شارەزور. نامەی بو سەرکردایەتی حسک نوسی بو، کە ئیتر وازی لە یەکیتی هیناوە و، ئەیەوی بچیتە ناو ئەوانەوە و، داوای لی کرد بون هیزیک بنیرن بو پشتیوانی. حسک، وای زانی بو هەنگی لە داردا دوزیوەتەوە، بو بە پیرەوە چونی ئەم روداوە، هیزیکی بە سەرکردایەتی تایەری عەلی والی بو نارد بو. قادر جەباری و شیروان شیرەوەندی و شیخ مەنصوری حەنیدیشی لە گەل بو.

*

زور لە میژ بو هاوریکانم سەریان کرد بوە سەرم ژن بهینم. زوریان تا ئەو کاتە سەلت بون. ئەیانویست من رچە بشکینم و، ئەوانیش بە دوای من دا ژن بهینن. بە تایبەتی جولانەوەکە زوری خاپاند بو، بەو نزیکانەش هیوای سەرکەوتنی لە ئاسودا دیار نەبو، ناوچەکانی ژیانی ئیمەش، بە هوی شەری ئیرانەوە، وەکو جاران مەترسی دوژمنی لە سەر نەما بو. د. خەسرەو خال، بەرپرسی یەکی لە ریکخراوە گەورەکانی شار بو، ئەویش چەند جاری لە نامەکانی دا داوای لی کرد بوم ژن بهینم. تا ماوەیەکی زور دودل بوم. سەرەنجام د. خەسرەوم کرد بە وەکیلی خوم ئافرەتیکم بو بدوزیتەوە بە هەلومەرجی ژیانی سەخت و هەژارانەی من لە شاخ رازی بی. ئاگاداری کردم کە کچیکی باشی بو دوزیوەتەوە و، ناوەکەی و ناونیشانی بنەمالەکەیانی بو نوسی بوم، تا ئەگەر رازی بم قسەی لە گەل بکا.

وەهاب کە شارەزای ئەو ناوچانە بو بانگم کرد و، قسەم لە گەڵ کرد، کە سەفەرێکی پەلە و نهێنی ناوەهام بە دەستەوەیە، داوام لی کرد: دوسی پێشمەرگەی شارەزام بۆ ئامادە بکا.
من و کامەران و شەهاب بە ٣ قولی لە ناوزەنگەوە بە پێ بەرێ کەوتین.

*

ئەو سەردەمەی کە هێشتا ئۆتۆمۆبیل دانەهات بو یان کەم بو، خەلک بە پی یان بە سواری هاتوچۆیان کردوە. لە ڕیگا کە بە یەکتری ئەگەیشتن یەکتریان بناسیایە یا نە مەرحەبا و چاکوچونیان لە گەڵ یەکتری ئەکرد. ئەمەیش هەندی ڕەوشوێنی دیاریکراوی هەبو ئەبو پیرەوی بکرایە.
سوار و پیادە کە بە یەک ئەگەیشتن ئەبو سوار سەلام لە پیادە بکا.
ڕیبوارێک کە بە لای دانیشتویەک دا بڕویشتایە ئەبو کابرای ڕەفتەنی سەلام لە دانیشتوەکە بکا.
ڕیبوارێک کە بگەیشتایە بە ڕیبوارێکی تر ئەیوت: «ماندو نەبی!» ئەویش لە وەلام دا ئەیوت: «خۆت ماندو نەبی!»
ڕیبوارێک کە بگەیشتایە بە یەکی لە سەر کار بوایە، ئەیوت: «خوا قوەتت بدا!» ئەویش لە وەلام دا ئەیوت: «خوا دەوامت بدا!»
ڕیبوارێک کە بگەیشتایە بە شوان یا بە گاوان ئەیوت: «بە دەولەت بی!» ئەویش لە وەلام دا ئەیوت: «خوا عافوت کا!» مەبەستیان لە دەولەت: «ئاژەل» بوە.
لە هەندی ناوچە لە باتی وەلامەکانی: «خوا عافوت بکا» و «خوا دەوامت بدا» ئەیانوت: «بچیتە بەهەشتی!»
ڕیبوارێک کە بگەیشتایە بە یەکی کە خەریکی دروێنە بوایە، ئەیوت: «تیغت بوڕا» ئەویش لە وەلام دا ئەیوت: «دوژمن بڕنا!»
ڕیبوارێک کە بگەیشتایە بە یەکی کە لە سەر خەرمان بوایە، ئەیوت: «خەرمان بەرەکەت!» ئەویش لە وەلام دا ئەیوت: «خێر و بەرەکەت!»
مەکینە ئەم نەریتانەی کوێر کردۆتەوە.

*

ئەوکاتە حدکا لە شەڕدا بو لە گەڵ حکومەتی ئیران، بە درێژایی ناوچەکانی سنور بارەگای دانا بو. ئیوارەیەکی درەنگ لە گوندێکی سنور ناوی ئیروان بو لە ناوچەی بانە لامان دا، چوینە مزگەوتەکە. هاشمی کەریمی بەرپرسی کومیتەی شارستانی بانە بو، ئەو و، چەند کەسێکی تر لە ئەندامانی کومیتەکە و پێشمەرگەکانی لە هۆڵی مزگەوتەکە بون. کەسیان بە ڕو منیان نەئەناسی، منیش خۆمم لە لا ئاشکرا نەکردن. هەندی قسە و باسی گشتی کرا، من هەولم دا خۆمی لی لا بدەم. شەو لەوی ماینەوە بەیانی زو بە ڕی کەوتین لە ڕیگا توشی سەید ڕەسولی بابی گەورە بوین. لە گەڵ ئەو یەکتریمان ئەناسی. چاکوچونیمان کرد، سەیری پی هات منی بەوجورە و لەوی بینی، وتم: «کارێکی پەلەم هەیە لە دیوی خۆمان. بە پەلە ئەڕۆم و بە پەلە ئەگەڕێمەوە. ئەمەوی کەس نەزانی. شەوی ڕابوردو لای کاک هاشم بوین. بەلام منی نەناسی و، خۆیشم نەمویست خۆم ئاشکرا بکەم!»
من بەرەو شارەزور ئەچوم، بە سەید ڕەسول دا لالە سەرحەدم بیرکەوتەوە.

*

کچەکە و بنەمالەکەیانم ئەناسی. بە لامەوە پەسند بون و داوام لی کرد قسەی لە گەل بکا. قسەی لە گەل کرد بو ئەویش رازی بو.

زور ماندو بوم و، لە تاو ململانیی ناوخۆ بە تەواوی بیزار بوبوم. ئەمویست ماوەیەک دور بکەومەوە. لە چەند نامەیەک دا داوام لە مامجەلال کرد بو هەولی گەرانەوە بدا. گەیشت بوە تینم لە دوا نامەدا بۆم نوسی، ئەگەریتەوە یان نا ئارەزوی خۆتە، من بەم نزیکانە سەفەر ئەکەم. نەمئەویست لە ناوزەنگ ژن بگویزمەوە، ئەمویست لە ئەوروپا ئەم کارە ئەنجام بدەم. ئەو کاتە سەفەر لە عیراقەوە ئاسان بو. ئاگاداری د. خەسرەوم کرد بە کچەکە بلی ئەگەر ئەتوانی خۆی ئامادە بکا بۆ سەفەر. لە ئەوروپا یەک ئەگرینەوە و، هەر لەوی مەراسیمی مارەکردن و گواستنەوەش جیبەجی ئەکەم. ولاتیکی ئەوروپا و، ماوەیەکیشم دیاری کرد بو، کە ئەگەر پەسندی کرد لەو ماوە دیاریکراوەدا لەو ولاتە ئەوروپاییە بی، منیش لەوی ئەبم.

کچەکە بە گویرەی تەگبیرەکەی من هەمو هەنگاوەکانی نا بو. منیش بە گویرەی تەگبیرەکەی خۆم بەرنامەی کاری داهاتوی خۆمم ریک خست بو. بەلام وەکو ئیرانی ئەلی: «تەگبیر» هەمو جاری لە گەل «تەقدیر» ریک ناکەوی!

*

بۆ چاوترساندنی خەلک ماوەیەک بو بەعس کابرایەکی درندەی بە ناوی مولازم موحسین نارد بو بۆ سلیمانی، فەرماندەی مەفرەزەی هاوبەشی دەزگا سەرکوتکەرەکانی بەعس بو. زوری ئازاری خەلک ئەدا و، هەمو شەو ئەچوە سەر مالان و، خەلکی ئەکوشت. چەند جاریک چو بوە سەر بەختیاری برام و ئەحمەدی مامەرەزام. جاریک ئەوەندەی لە ئەحمەد دا بو، گوی یەکی کەر کرد بو. هەرەشەی لە بەختیار کرد بو، کە ئەگەر لە سلیمانی چی تر پیاوی حکومەت بکوژری، ئەویش بەختیار ئەکوژی.

روژیک لە پر بەختیاری برام پەیدا بو. لە سلیمانیەوە رای کرد بو. حازمەی هاوسەری بەختیار و، دایکم و تائگەی خوشکیشم رایان کرد بو بۆ شارەزور لە مالی حەمەمینی فەتاح لە شاتوان، خویان شارد بوەوە. هاتنی ئەمانەم زور پی ناخوش بو، چونکە من خۆم بە تەمای سەفەری ئەوروپا بوم.

*

لە گەل بەختیار خەریک بوم بگەریتەوە بۆ سلیمانی و، دایکم و ئەوانیش بیاتەوە سلیمانی. وەها ترساند بویان، هەرچی لە گەلم وت، گەلکی نەگرت. دایکیشم بە پیشمەرگەیەکی شارەزوردا نامەیەکی بۆ نارد بوم کە چاریکیان لی بکەم. لە ناوزەنگ خانوبەرەیەکی باشم هەبو. شوینەکەیشمان ئەمین بو. بە سەلاحی حاجی رەفیق دا نامەیەکم بۆ دایکم نارد کە بین بۆ ناوزەنگ، بەختیاریش لە گەلی چو، بەلام لە ریگا بەختیار لە گەل سەلاح بری نەکرد بو، گەرا بوەوە. سەلاح نامەکەمی گەیاند. بەلام دایکم تورە بوبو، وت بوی: «ئیمە لە سەر ئەو وامان لی هاتوە، پانزە سالیشە نەمبینیوە، کەچی هیشتا ئەو بە من ئەلی وەرە بۆ لام!» دایکم مەترسییەکانی ریگاوبانی نەئەزانی.

تازە عەزیز محەممەد گەیشت بوە کوردستان. چو بوین بۆ سەردانی و دەعوەتمان کرد بۆ سەردان و فراوین. بەلام من ئیتر بریارم دا بچم سەردانیکی دایکم و خوشکم بکەم و، داوایان لی بکەم بین بۆ ناوزەنگ. ویستم کەم کەس بزانی، هاوریکانی خۆم ئاگادار کرد.

لاله سەرحەد یەکێ بوە لە پیاوە ناسراوەکانی تیرەی رۆغزایی ئێلی جاف. زۆر قسەی خۆش و نەستەق، و روداوی سەیری لێ ئەگێڕنەوە. یەکێکیان خۆوە بە ناوبانگەکەیەتی کە پیرەمێرد لە «گاڵتەو گەپ» و عەلادین سەجادی لە «رشتەی مرواری» دا گێراویانەتەوە. پێ ئەچێ لاله سەرحەد خاوەنی خەیاڵێکی بە پیت بوبێ. لەو سەردەمەدا جەردەیی و روتکردنەوەی کاروان باو بوە و، بە ئازایەتی و دەسەلاتداری دانراوە. ئەویش تا گەنج بوە لەمەدا دەستێکی باڵای هەبوە. کە پیر ئەبێ و لە مردن نزیک ئەکەوێتەوە، کوڕەکانی کۆ ئەکاتەوە وەسیەتیان بۆ بکا. ئەڵێ: «تا گەنج بوم زۆرم بۆ کردون و زۆرتان پێوە ماندو بوم تا کردومن بە پیاو، ئەمەوێ دوای مردنیشم خێرێکتان بۆ بدەمەوە. کە مردم مەیکەن بە هەرا بە بێدەنگی لبادێکم تێوە بپێچن و، بە شەو بمبەن لە داری مەحمەوی سەرموالە برکم دەن. بەیانی کە ڕۆژ بوەوە بڵێن باوکمان دیار نەماوە. سوار بەو ناوەدا بڵاو بکەنەوە. ناوچەکە کیو ماڵ بکەن تا ئەمدۆزنەوە. ئەوسا بڵێن خەڵکی ئەو ناوە باوکمانیان کوشتوە و هەمویان ساف لە ساف تالان بکەن. ئینجا پرسەیەکی گەورەم بۆ دابنێن و بڵێن: هەی بە زیندویی هەر خەیر و بە مردویی هەر خەیرا»

گۆڕی مەلا مستەفا لە شنۆ بو. زیوانی بە دیارەوە بو. شەوێک، تاقمێکی نەناسراو، تابوتەکەیان دەرهێنا و برد بویان لە شوێنێکی نزیک گلکۆکەی فڕێیان دابو. چەکدارەکانی پارتی لە کاتی قیام دا تەقەیان لە خۆپیشاندنی خەڵکی شنۆ کرد بو، چەند کەسێکیان لێ کوشت بون، لە بەر ئەوە خەڵکی شنۆ دوژمنایەتیان ئەکردن.

- بنەماڵەی بارزانی، ئەم تاوانەیان بە پاڵ حدکا و لە ناو ئەوانیش دا بە پاڵ سەید رەسولی بابی گەورە ئەدا.

- حدکایش بنەماڵەی بارزانییان تاوانبار ئەکرد کە خۆیان ئەم کارەیان کردبێ، بۆ ئەوەی بیکەن بە بیانو بۆ هاوکاری لە گەڵ هێزە چەکدارەکانی ئێران بۆ شەڕی ئەوان. هەرچەندە گومانم نەبو کە حدکا لەم تاوانە بەرییە، بەلام قسەکانیان لەو حیکایەتە ئەچو کە بە زمانی لاله سەرحەدەوە ئەیانگێڕایەوە.

بێگومان سوکایەتی بە مردو و بە گۆڕ تاوانێکی گەورە و ناشیرینە. لە کوردەواری دا ئەمە بە کارێکی زۆر نزم دائەنرێ. هیچ لێکۆڵینەوەیەکی جیددی و بێلایەن لە سەر ئەم تاوانە نەکرا تا دەستی تاوانباری راستەقینە ئاشکرا بێ.

*

لە گەڵ سەید رەسول جیا بوینەوە لە یەکتری و شەو ئێمە چوینە گوندی «چەمپاراو» میوانی ماڵە شێخێکی قسە خۆش بوین. ڕۆژی دوایی بە سورکێودا ئاوای دیوی کوردستانی عیراق بوین.

گوندەکانی سوەرەهان، زێ، چالە خەزێنە.. لە سەر ڕێمان دا بو، لە هیچیان لامان نەدا تا گەیشتینە قەلاتی. ماوەیەک لەوەو پێش هالیکوپتەری عیراقی لە کاروانێکی گەورەی کاروانچییەکانی دابو. ئێسک و پروسکی ولاخە کوژراوەکان بە درێژایی ڕێگاکە کەوت بو، دیمەنێکی ناشیرین و خەمناکی هەبو.

لە قەلاتی گیر نەبوین بە دەشتی خەرمان دا بە ڕێ کەوتین بۆ دوستەدەرە. شەو چوینە ماڵێک لەوێ پیرەمێردێکی نورانی کەرولالی لێ بو. بە ئیشارەت قسەمان لە گەڵ ئەکرد. حەمەی حاجی سابیر لێپرسراوی ناوچەکە بو، هەواڵم بۆ نارد بۆ رۆژی دوایی لە

گوندی رەزلە ببینیم و، مەبەستی هاتنەکەم بۆ باس کرد. هەواڵم بۆ مامە رەزام نارد کە ئەوسا لە سەید صادق دوکانی هەبو، وا ریک کەوتین ئەوان بێنە گوندی بەردەرەش و منیش بچمە ئەوێ. نیوەڕۆی رۆژی داهاتو مامم بە تراکتور هەموانی هێنا بو، لە بەردەرەش یەکمان گرتەوە، پاش پانزە ساڵ دایکم و تاڵگم بینییەوە و، بۆ یەکەم جاریش برازنم و منالەکانیم بینی. نانی نیوەڕۆمان لە ماڵی جوامێرێکی بەردەرەشی خوارد. ماڵێکی باش و بە مەعریفەت بون و، بە ناو لە دورەوە منیان ئەناسی. قسەم لە گەڵ دایکم کرد و، لە گەڵیان ری کەوتم هەمویان بین بۆ ناوزەنگ و، ئیتر لە یەکتری جیا بوینەوە: ئەوان گەڕانەوە بۆ شارەزور و من بەرەو ناوزەنگ.

لە گەڵ حەمەی حاجی سابیر و ۳ پێشمەرگە: کامەران، شەهاب، حەمەی ئامۆزای حەمەی حاجی سابیر بەری کەوتین بەرەو «چەمی گەلاڵ». چەمی گەلاڵ ناوچەیەکی شاخاوی سەختی پر لە دارویار بو. گوندەکانی: کانی سپیکەی پەرخ، بەردەرەش، قەویلە، هەنارو، ماپەندول، پەری هیرو، شیرەبەرە، قزلچی، مزگەوتە، دولە چەوت، هۆزخواجا، سلیمانە، میرمام، پەرخ، بیوەک، زلزلە.. هەندێکیان گوندی گەورە بون، بەلام بە خورایی ناوچەکەیان ناو نابو چەمی گەلاڵ، چونکە چەمەکەی وشک و، ناوچەکە بی ئاو بو، بە هاوین چولیان ئەکرد. دانیشتوانەکەی تیکەلاون لە هۆزەکانی: چوچانی، بیسەری، قەویلەیی، زەردویی، کە پێیان ئەلین: «غەوارە». خیلی زەردویی لە پەیمانی زەهاودا ناوی هاتوە و، بەر ئیران کەوتوە. دیارە لەو سەردەمەدا خیلیکی گەورە بوە، پاشان کەم و کز بوە. خانوەکانیان تەنگ و تاریک و نزم و کشتوکالیان زور کەم بو، ئاژەلداریان ئەکرد. قەلای سروچک و، قەلای شوجاع لە شوینە دیرینەکانی بو. ئەوسا هیچ جورە جادەیەکی قیرتاو یا خاکی بە ناودا نەئەرویشت.

چەتە!

چەتەی بە ناوبانگی ناوچەی سلیمانی: «خولە پیزە» لە تیرەی «بیسەری» بوە. لە سەرەتای پەنجاکان دا چەند سالی ئاسایشی لە ناوچەی شارباژیردا نەهیشت بو، بە دەیان پولیس و کاربەدەستی حکومەتی کوشت، تا سەرەنجام موتەصەریفی ئەوسای سلیمانی عومەر عەلی، لە ناو خویان دا چەند کەسیکی چاند، لە کاتی خەوتن دا کوشتیان.

لە سەردەمی عوسمانی دا گەلانی بالقان کە خەباتیان کردوە بۆ ئازادی، بە پارتیزانەکانیان وتوە: «چەتە» و بە شەری پارتیزانییان وتوە: «شەری چەتەگەری». شیخ مەحمودیش کە لە سلیمانی هەلکەنرا و، ماوەیەک شەری پارتیزانی ئەکرد، بە پارتیزانەکانیان ئەوت: چەتەی شیخ مەحمود، یان چەتەی کورد. وشەی چەتە بەم مەعنایە لە ژمارەکانی «بانگی حەق» دا هاتوە، کە لە ئەشکەوتەکەی جاسەنە بە ناوی قەرارگای ئوردوی کوردستانەوە دەرچوە. بەلام هەندی لەو چەتانە لە سالانی دوایی دا ئەوەندەیان دزی و جەردەیی و راوورووت کرد، مەعنای ئەم وشەیە لە ناو خەلک دا لە پارتیزانەوە گۆڕا بۆ جەردە یان وەکو ئەلین: «خارج عن القانون».

ئیمەیش زۆر جار ئەترساین وشەی پێشمەرگەش وەهای لی بی.

*

کەمال شاکیریش گەیشتە لامان. بو حەسانەوە و فراوین لامان دایە گوندی سلیمانە. سلیمانە کەوت بوە ناو گەروی شاخیکی بەردەلانەوە. حەمە و کەمال و من پیکەوە لە

مالیک و، کامەران و ئەوانی تریش لە مالیکی تر بوون. خەریکی نان و ماست خواردن بووین، خاوەن مالەکە هاتە ژوورەوە وتی: «شاخەکە چەکداری پیوەیە دەوریان گرتوون!» بە پەلە لە مالەکە دەرچووین و، پیشمەرگەکانی تریش هاتنە دەری. لە بەرزایی شاخەکەوە دایان گرتینەوە. بە راکردن لە دی دەرچووین بەرەو شاخەکەی بەرامبەری. تا گەیشتینە ئەوی تەقەمان لە سەر بوو. ئیمەش گەیشتینە شاخەکە و، ئیتر شوینەکەمان قایم و سەلامەت بوو. چووینە سەر کویرە کانییەک، ئاویکی کەمی هەبوو، بۆ پشوودان دانیشتین. لە دەسڕێژی یەکەم دا گوللەیەک لە ئەژنۆی کامەرانی دابوو، بە برینداری لە سلیمانە بە جێ ما بوو، شەهابیشمان لێ دابڕا بوو. ما بووینەوە حەمە و حەمەی ئامۆزای و کەمال و من.

رۆژی رابوردوو، فەرەیدون حەمە سالح، فەرماندەی یەکی لە کەرتەکانی هەریمی یەک، چەند پیشمەرگەیەکی حسکی لە مزگەوتەکەی بیوەک دا چەک کرد بوو، ئاڕیپیجیەکی لی سەند بوون. چەکدارەکانی حسک ئەم پەلامارەیان بۆ سەر ئیمە لە تۆلەی رووداوەکەی دوێنێ دا کرد بوو. وامان بە چاک زانی دەمەو ئیوارە بچین بۆ قەوێلە و، لەوێوە من نامەیەک بۆ تاهیری عەلی والی بنوسم.

شەو چووینە گوندی قەوێلە، لە مالی حاجی عەلی، کە ئاسیاوی حەمەی حاجی سابیر بوو، دابەزین. میوانیکی کەیشیان هەبوو، دەرویشیکی قسە خۆش بوو. نامەیەکم بۆ تاهیر نوسی و، لە نامەکەدا ئاگادارم کرد بوو کە بۆ کاریکی تایبەتی خۆم هاتومەتە ناوچەکە و، ئامادەیی خۆمم دەربڕی بوو بۆ بیبینی و بۆ ئەوەی هەردوکمان هەولی خاوکردنەوەی گرژی نیوان پیشمەرگەکانی هەردولا بدەین و، سەرسوڕمانی خۆمم دەربڕی بوو لەوەی کە پاش چەند سال ئەوە یەکەم جارە ئەو بیتە خواری بۆ «جەولە» و، جەولەکەیشی بە شەڕی یەکیتی دەس پی بکا.» کەمال شاکیر نامەکەی برد و رویشت، شەو ئیتر نەهاتەوە بۆ لای ئیمە. بە ئاسیاویکی خۆی دا نارد بوی بۆ کاک تاهیر لە گوندی هوزخواجا. تا ئەو کاتە کەسیان نەیانئەزانی کە من لەو ناوچەیەدام، تەنانەت کامەرانیش، کە بە برینداری گیرا بوو، باسی هاتنی منی بۆ نەکرد بوون. دوای گەیشتنی نامەکەم ئینجا زانی بوویان من هاتومەتە خواری و لە گوندی «قەوێلە» م.

ئەم نامە نوسینە، بی خۆ ئامادەکردنی پیشمەرگەیی پیشەکی، هەلەیەکی گەورە و کوشندە بوو کردم، لە پاتی ئەوە ئەبوو دەسبەجی هەموو هیزەکانی یەکیتی لە ناوچەکەدا کۆ بکەمەوە ئینجا نامەیان بۆ بنوسم، بەلام من ئەوەندەم لە خۆم رائەدی و بە خۆما رائەبەرموو کە بی چەکدار و هیز بچمە ناویان و قسەیان لە گەل بکەم، بە تایبەتی هەموی چەند حەفتەیەک لەوەو پیش چەند ئەندامی سەرکردایەتی حسکم بینی بوو.

دەمەو بەیانی کەمال وەلامی نامەکەمی بۆ ناردمەوە کە ملازم تاهیر نوسی بوی. لە نامەکەی دا: پیخۆشحالی خۆی دەربڕی بوو لە بوونی من لە ناوچەکەدا و، گلەییەکانی خۆی لە یەکیتی نوسی بوو، ئامادەیی خۆیشی پیشان دا بوو بۆ یەکتر ببینین.

رۆژی ٥ ی کانونی دوەمی ٨١ ، تازە نانی بەیانی مان خوارد بوو، هەر لە ناو مالەکەدا دانیشت بووین، خاوەن مالەکە هات وتی: «ئاوایی پڕ بوو لە حسک!» هەرچەندە حسک هەمویان مەسئول بوون، ناردم بپرسن مەسئولەکەیان کی یە. قادر چاوشین هات. دەمیک بوو قادرم ئەناسی. قادر لە پیشمەرگە کونەکانی یەکیتی و، خوشکەزای عەبدولقادر هەلەدنی بوو، لە جیابوونەوەکەدا دابویە پال حسک. من پەلەی گەڕانەوەم بوو. هەوالی ملازم

تاپەر و هێــزەکــەیانم پرسی، وتی: «لە هۆزخـــواجــان.» پێم وت: «با بچـــین بۆ لای!» بە کۆمەڵ بە ڕێ کەوتین.

لە هۆزخواجا مـلازم تاپەر و لێپرسـراوەکـانی تریان بە پێـرمـانەوە هاتن و ناردیان هەندێ مـریشکیـان بۆ نانی نیـوەڕۆ کـرێ. دانیـشـتـین بۆ قـسـە کردن. باسی تێکچـوونی هەلومەرجی ناوچەکـەمان کـرد. مـلازم تاپەر باسی ئەوەی کـرد کـە مەلا بەختـیـار هێـزێکی گەورەی کۆ کردۆتەوە. چەند جار ڕێگای پێ گرتوون و، بۆسەی بۆ ناونەتەوە. مەفرەزەکانی یەکێتی چەند جار تەنگیان پێوان هەڵچنیوە و، پێشمەرگەیان گرتوون و چەک کردوون. قسەو باسی لەم بابەتەمان زۆر کرد و، باسی ئەوەمان کرد کە چۆن باری ناوچەکە ئاسایی بکەینەوە و، گرژی نێوان چەکدارەکانی هەردولا خاو بکەینەوە. پشکنکاوییان پێوە دیار بو بە یەکا ئەهاتن و ئەچوون. دوای نان خواردن ویستم ئیـزنیـان لێ بخـوازم بڕۆم. مـلازم تاپەر وتی ئەختێکی تر ڕاوەستە خۆی چوە دەرەوە. خولەی حەمە تاتە هاتە ژوورەوە تفەنگەکەی من، بە دیوارەکەدا هەڵپەسـێردرا بو، دەستی دایە و بردی، ئیتر تێگەیشتم. مـلازم تاپەر پیاوێکی بە ئەدەب بو، شەرمی ئەکرد ڕاست و ڕەوان پێلی تۆ گیراوی، هەندێ منجە منجی کرد، بە گیرم هێنا ئاخریەکەی وتی: «برادەران حەز ئەکەن لە گەڵیان بمێنیتەوە، چونکە لە خۆیان ئەمین نین و ئەترسن برادەرانی ئێوە بێنە سەریان!»

وتم: «گلدانەوەی من لە لای خۆتان کارێکی خراپە، ڕەنگە ئەوە هێزەکانی یەکێتی بوروژێنی و بێنە ســەرتان، ڕێگەم بدەن بڕۆم بۆ ئەوەی وەکــو خــوتان ئەڵێن گــرژییــەکــە نەهێلم!»

وتی: «تۆ میوانی لای ئێمە و زۆر موحتەرەمی و...» هەندێ ڕاوە ڕێوی هێنایەوە.

منیش وتم: «کـاک تاپەر لەم مـوجـامـەلە ناڕاسـتـانە گـەڕێ، من نە مـیـوانم و نە مـوحـتـەرەمم، بەڵکو گـیراوم و، بەم کارە ئاوێکی خـراپ ئەڕێژن و سـابیـقـەیەکی خـەتەر لە جوڵانەوەی کوردا دائەنێن، ئیتر هیچ لایەک باوەر بەوی تر ناکات»

وەکـو دوایی بیـسـتـمـەوە، ئەو مـاوەیەی من لە ژوورەوە لە گـەڵ مـلازم تاپەر و قـادر جەباری خەریکی گفـتوگۆ بوم، لە دەرەوە هەندێ لە وردە مـەسـئولەکانیان لە ناو خۆیان دا مشتومڕیکیان بوە لە سەر ئەوەی ئیزنم بدەن بڕۆم یان گلم بدەنەوە. ڕەوفی خەلیفـە سەعیدی ئامۆزای حەمەی حاجی مەحمود، کە تازە چو بوە ناو حسیک و بوبو بە دوژمنی خوێنەخۆری یەکێتی، کەریمی دادە مەنە و خولەی حەمە تاتە و، چەند کـەسێکی تری لەم بابەتانە وت بویان: «ئەمە فرسەتێکی باشە فلانمان کەوتوتە بەردەس لای خۆمان گلی بدەینەوە بۆ ئەوەی هێـزەکـانی یەکیـتی ئیتر نەیەنە سەرمان و، مـەرجەکانی خـومانیـان بە سەردا بسەپێنین» هەرمشـەی ئەوەیشـیـان کـرد بو کـە ئەگـەر ئیـزنم بدەن، ئەوان تـەقـەم لێ بکەن بمکوژن و تەسلیمی حکومـەت بینەوە. مـلازم تاپەر و قـادر و ئەوانی تر لە ژێر ئەم گـوشـارەدا بڕیاری گرتنیان دابوم.

من ئیـتر نائومێد بوم لێیـان و، زۆر ئەترسام ئەم گـەوجـیـتـیـیـەی ئەمانە کرد بویان، بێی بە هۆی شەڕێکی خوێناوی سەرانسەری لە نێوان ئەوان و یەکیتی دا. سەدان کەسی تی دا بکوژرێ و، هەمویشیان جنێو بە گۆڕەکەی من بدەن.

لە هۆز خواجاوە کەوتنە گـەران بۆ دولە چەوت، زەردویی، کەولوس، قـەویلە.. دێ بە دێ منیـشـیـان لە گـەڵ خـۆیان ئەسـوراندەوە. لە قـەویلە بوین لە پڕ وتیـان با بڕۆین بۆ

شاخەکە. هەندێ چەکداری یەکێتیان لە نزیک قەلای سەروچک دێ بو. کردیان بە هەللا وتیان: «فەرمو ئەوە ‹مەساعەتی ئیوە وازمان لێ ناهێنن!» بو بە شەر. گەماروی چەند پێشمەرگەیەکیان دا گرتیانن. دەرکەوت مەفرەزەیەک بون لە گەل مەحمود گەرمیانی لە شارەزور بون، ئاگایان لە بەزم و رەزمی گرتنی من نەبوبو. بۆ حەوانەوە و پشودان ئەچون بۆ شاربازێر و، بە رێکەوت بە سەر ئەم شەرەدا کەوت بون.

*

مامجەلال لە دەرەوە بو، عومەر شێخ موس، عومەر مستەفا، کەمال خۆشناو، جەمال حەکیم، جەعفەر، ملازم عومەر، فەرەیدون.. لە بارەگاکانی سەرکردایەتی بون.

مەکتەبی سیاسی بەیانێکی لە سەر گرتنی من دەرکرد بو بە رادیو خوێند بویانەوە، هەرەشەی قورسیان لە حسک کرد بو و، لە هەمان کات دا داوایان لە حشع کرد بو، بە تایبەتی لەو کاتەدا عەزیز محەمەدیش لە کوردستان بو، هەولی بەردانم بدەن. جەمال تاهیر، کە ئەوسا بەرپرسی رێکخستنە نهێنییەکانی ناوشارەکان بو، نامەیەکی بۆ عەلی بەگی باوکی تاهیر نوسی بو، هەرەشەی لێ کرد بون کە ئەگەر من شتێکم لێ بێ، بنەمالەکەیان لە رەگوریشە دەرئەهێنێ. عەلی بەگ ماوەیەکی درێژ ئەفسەری شورطە بو. هەرەشەکەی بە جیددی وەرگرت بو. نامەکەی برد بو بۆ کاربەدەستانی «ئەمن» ی سلیمانی. مەلا بەختیار و سالاریش زوری هێزەکانی شاربازێر، هەورامان، شارەزور، گەرمیانیان کۆ کردبوەوە لە نامەو نامەنوسین دا بون لە گەل ملازم تاهیر و، هەرەشە و گورەشەیان بۆ ئەناردن.

*

هێزەکەی حسک و لێپرساوکانیان سەریان لێ شێوا بو نەیانئەزانی چی بکەن و، چی لە من بکەن، لە تاو هێزەکانی یەکێتی پش جێیان بە خۆیان نەئەگرت. چونە دولە سور و بە ناو ئوردوگای شانەدەری دا چون بۆ کێوی سورێن. لە شانەدەری لایان دابە مالی جەلالی حاجی کاکەلی. جەلال هاوڕێ ی کومەلە بو، زوری پێ ناخۆش بو منی بەو حالە دی، هیچیشی پێ نەئەکرا. چوینە ئەشکەوتی دەرە گولان لە شاخی سورێن.

سورێن دیوێکی ئێران و دیوێکی عیراق بو. بە پێ ی پەیمانی زەهاوی ئێرانی - عوسمانی ئەم کێوە کرا بو بە سنوری هەردو دەولەت و، لە پەیمانەکەدا ناوی قەلای زەلم و گەردنەی چەقان هاتوە، وەکو ناوچەی سنور، هەردوکیان لەم سەر و ئەوسەری کێوی سورێن دان.

چەند سەرچاوەیەکی ئاو لە بناری سورێن دایە لەوانە: چەمی چەقان، کە لە یەکگرتنی چەمەکانی جومەرەسی، عەرەبسوار، کەولوس دروست ئەبێ و، چەمی شەلم، چەمی ریشێن، چەمی شیرمەمر. ئەم چەمانە ئەرژێنە شارەزورەوە. قسەیەکی کۆن هەیە، بۆ ئەوەی منال دەمی تەتلە بکا پێ ی دوبارە ئەکەنەوە، ئەلێ: «چومە چەمی چەقان، چەقەل چەلتوکی ئەچەقان!» سەرچاوەی شەلم ئاوەکەی گەرمە وەکو ئەیانوت ماسیەکانی کوێر بون.

سورێن چەندین ئەشکەوت و کەورگی لێ یە، لەوانە: دەرە گولان، هەزار ئەستون، قوچی سولتان، دەرە کۆزە. لە دولی خورنەوەزان و وشکەناویش چەند ئەشکەوتێکی تری لێ یە. کانی و ئاو لە هیچیان نزیک نەبو. دەرە گولان بەرامبەر سەید صادق بو.

ئاوایییەکانی سورێن و بنارەکەی: چەوتان، کولێتان، زەنگیسەر، خرنوک، سیامیرە، کانی سێف، وەلسمت، بەرئەشکەوتان، توتەقاج، قەلبەزە، تازە دێ، بەردەبەل، جومەرەسی،

بوریدەر، نەوی، بانی بنوک، چنارە، دەرەگولان، میری سور، ریشبین، عامورە، بانی شار، قاپنجە.. هەمو راگویزرا بون. گوندی «دزلی» کە لە دیوی ئیران بە سورینەوە بو، بنکەی سەرەکی پارتی لی بو. نادر هەورامی بەرپرسی بنکەکە بو. هەندی لە پیشمەرگەکانی حسک هاتوچۆیان ئەکردن.

ئەو ماوەیە منیان بە مەحمودی حەمە تاتە سپارد بو ئیشکم لی بگری. غەفور (دەرسیم) یاریدەری مەحمود بو. مەحمود برایەکی خوی لە گەل بو، گالتەی بە حسک ئەکرد، هەمیشە شەرە دەنوکیان بو. بەفر سورینی گرت بو. هەوا زور سارد بو. رایەخ و پیخەفیان نەبو. لە بن تاشە بەردیک دا لە سەر ئەرز بە دیار ئاگری دوکەلاویەوە هەلتروشکا بوین.

زورجار غەفور و کەریم ئەیاندایەوە بە چاوما کە ئەوان پەرەوازەی دەستی منن و، من وام لی کردون ناچارین تەسلیمی رژیم بینەوە و، دوایی بینەوە شاخ و لە داخی من بێن بە حسک و، لە ژیانی سیاسی و پیشمەرگایەتی دوا بکەون. هەردوکیان راستیان ئەکرد، بەلام من هیچ دوژمنایەتییەکی تایبەتیم لە گەل کەسیان نەبو، حەزم ئەکرد ئەمانیش پیش بکەون و، ببن بە کادری خوشناو و سەرکەوتو. لە بەر ئەوەی ئاموژگاری سودی نەبو لیم پرسی بونەوە و، بەلام ئەوان بەرگەی لیپرسینەوەیان نەگرت بو .

*

ئەو کاتەی لە شاربازیر بوم جاریک بە دو قولی لە گەل کەریم دانیشتم هەندی ئاموژگاری بکەم. پیم وت: «تو لە سایەی شورشەوە لە کەریمی دادەمەنەوە بوی بە دکتور چالاک، لە کاتیکا نە دکتوری و نە چالاکی. هیچ کلیە یا مەعهەدیکی طبیت نەخویندوە و، هەمو بەهانییەکیش بە زور لە خەو هەلت ئەسپێنێ. هیچ نەبی شورش ئەو چاکەیەی بە سەر تو و غەفور لگاو و خولەی جگەرەوە هەیە کردونی بە د. چالاک و دەرسیم و نەبەز. لە بەر ئەوە حورمەتی شورشەکە بگرن، ئەگەر پاکی ناوبانگی کومەلە و یەکیتیتان نیە، پاکی ناوبانگی ناوەکانی خوتان هەبی!»

کەریم کوریکی وریا و لەبلەبان بو. هەرگیز بو قسە دانەئەما. دوای ئەوە بە ماوەیەک تەسلیم بوەوە. پاش ماوەیەک نامەی ستاری سەعید خەلەفی بو هینابن. لای ئیمە نەمایەوە چو بو لای حسک. ئیتر نەمبینیەوە تا لیرە یەکمان گرتەوە.

*

کەریم بە ناوی گەیاندنی بەریدی سیزیەوە لە سورینەوە بە ناو ئیران دا گەرایەوە بو دەراوی دولەتو. غەفور جاروبار قسەی خوشی ئەکرد. لە ناو خویان دا باسی زەلامیکیان ئەکرد بە خراپە. یەکیکیان وتی: «حیزب دەری کردوە». غەفور هەلی دایە، وتی: «بوچی ئەم حیزبەی ئیمەش خەلک دەرئەکات؟»

*

عەلی بەگی باوکی تاهیر هات بو دەرە گولان. راسپاردەی د. فاضل بەرواک ی پی بو، کە ئەوسا بەرپوبەری «ئەمنی عام» بو. بە باوکی تاهیردا جوابی بو نارد بون کە منیان تەسلیم بکەن، یان ئەگەر ئەوە بە باش نازانن کاریکی وا بکەن بکەومە کەمینیکی ئەوانەوە و، بە زیندویەتی بمگرن، بەرامبەر بەوە بەلینیان دابوی چەردەیەکی باش پارەیان بدەنی. شتی وەها لە مولازم تاهیر نەئەوەشایەوە. قادر جەباری مەسەلەکەی بو باس کردم. کردم بە

گاڵتە لە گەڵی وتم: «تا چەند ساڵی تر خزمەتی یەکێتی بکەم بایی ئەو پارەیە خزمەتم پێ ناکری. منیان تەسلیم بکەن و پارەکە وەربگرن و بیکەن بە دوو بەشەوە، بەشێکی بۆ خۆتان و بەشێکی بۆ یەکێتی!»

شەوڵەناو ئاربیجیەکیان نا بوو بە ماڵی عەلی بەگەوە لە سلێمانی. تابەر بە گلەییەوە رووداوەکەی بۆ گێڕامەوە. ئەو بە هاورێکانی منی ئەزانی. بەڵام بە راستی ئەوان ئەبوون، «ئەمنی سلێمانی» بۆ خۆشکردنی ئاگری ناکۆکییەکە، ئەمەیان کرد بوو.

چەند جارێ مەحموود باسی راکردنی لە گەڵ کردم. ئەیوت: «ئەگەر بەڵێنم بدەیتێ شتی کۆنم لە گەڵ حساب نەکەن و ڕێزم بگرن و، بمکەن بە فەرماندەی کەرت، لە گەڵت دێم.» لەو کاتەدا کەولی من پارەی زۆری ئەکرد باوەڕم پێ نەئەکرد لە گەڵی بڕۆم، گوێم نەئەدایە قسەکانی. خەلیفەی عەبدوڵلا مارف، کە خۆی بە یەکێتیەکی تۆزاو دائەنا، ئەویش چەند جارێ ئەو باسەی لە گەڵ کردم، هەلێکی لە بارمان بۆ هەڵ نەئەکەوت. ڕۆژێکیان دابەزی بووین بۆ ناو کەلاوەکانی قاینجە. قادر جەباری مان لە گەڵ بوو، دنیا تەمومژێکی چڕ بوو چاو چاوی نەئەبینی. بە خەلیفەم وت: «ئەمڕۆ فرسەتە با بڕۆین!» خەلیفە ملی نەدا وتی: «ئەترسم بگەینە سەر جادەکە و تەمومژ بڕەوێتەوە و بگیرێین. خەڵک وا ئەزانی بە ئەنقەست تەسلیمم کردووی.» هەلەکمان لە دەس چوو.

چەند ئێوارەیەک بۆ شەو دابان بەزاندم بۆ گەڵەک، شەبرەمەر.. دوای ئەوە ئیتر بردمیانە ئەشکەوتی «هەزار ئەستوون». حشع لەم ئەشکەوتەدا بنکەیەکیان دانا بوو. لە گەڵ ئەوان بوون بە یەک ماڵ.

*

دانیشتوانی ئەشکەوتەکە تێکەڵاو بوو لە: مەفرەزەیەکی حشع، کابرایەکی گیراو بە تاوانی جاسوسی، مەفرەزەیەکی حسک کە پاسەوانییان لە من و حەمەی حاجی سابیر و فەرەح ئەکرد، هەروەها یەکدوو عەرەبی عیراقی کە لەو هەرایەدا لە گەڵ حسک بوون. پاشماوەی هێزەکەی حسک لە ناو دۆڵەکەدا بەرامبەر بە شارەزوور دامەزرا بوون. فەرەح، نامەی مەلا بەختیاری بۆ هێنا بوون، ڕێگەیان نەدا بوو بگەڕێتەوە گرتبوویان.

پاش چەند ڕۆژێ حەمەیان بەر دا. من و فەرەح مابووین.

*

کاوەی شێخ لەتیف و ناصر حەفید «ناڵە» هاتن بۆ ئەشکەوتەکە. لە گەڵ بەرپرسەکانی حسک قسەیان کرد بوو، قسەکانیان جێگەی نەگرت بوو، ئیزنیان لێ وەرگرت بوون بێن لە لای من بمێننەوە تا چارەنووسی من بە لایەک دا ئەکەوێ. کاوە پیاوێکی قسە خۆش و نوکتەباز بوو. زۆری حەز لە ڕاگرتنی کەو و ڕاو ئەکرد و، نیشانچییەکی دەسڕاست بوو. بەڵام نەخۆش بوو، بە شرینقە خەوی لێ ئەکەوت، زۆر کەم ئەنووست و، زۆر کەم خواردنی ئەخوارد. هەلومەرجی ژیان لە ئەشکەوتەکەدا ناخۆش بوو. زۆری لە گەڵ خەریک بووم بگەڕێتەوە، بە قسەی نەئەکردم و بۆ پارێزگاری من مابەوە. مەترسی هەبوو یەکێ لە پێشمەرگەکانی حسک، بۆ پارە، تفەنگێکم پێوە بنێ و بڕوا تەسلیم ببێتەوە.

چەند جارێ هەڵم بۆ هەڵکەوت هەڵێم لە بەر ئەو دوام خست پێم جوان نەبوو تووشی گێچەڵی بکەم. لە گەڵ خۆی باسم کرد پێکەوە بڕۆین ئەیوت لە گەڵتان دەرناچم، ڕاستیشی نەکرد نەیئەتوانی بە پێ بڕوا بە وڵاغ هاتوچوی ئەکرد.

* حشع، بە تایبەتی عەزیز محەممەد، لە سەر داوای سەرکردایەتی یەکیتی، هەولی زوریان لە گەل سەرکردایەتی حسیک دابو بو بەردانم. سەرکردایەتی حسیک لە سەرەتادا هەندی بروبیانویان هینا بوەوە و، هەندی مەرجی سیاسییان دانا بو. سەرەنجام لە روژی ٨١/١/٢٣ دا بریاریان دا بو من بەر بدەن. بە نامە ئاگاداری حشعیان کرد بو، نامەیشیان بو هاوریکانی خویان نوسی بو داوایان لی کرد بون: «بە بی قەید و شەرت» بەرم بدەن و، تەسلیمی نوینەری حشعم بکەن. مەکتەبی سیاسی یەکیتی جەمال حەکیم و، حشع قادر رەشید و عەلی کلاشینکوف یان لە ناوزەنگەوە نارد بو بو ئەم مەبەستە.

روژیکیان لە ئەشکەوتەکە دایانبەزاندین بو دەشتاییەکەی بەردەمی. جەمال حەکیم، کە ئەوسا ئەندامی م س - یەکیتی و، دارای شیخ جەلالی حەفید، کە فەرماندەی هەریم بو، لە گەل تاقمی پیشمەرگە لەوانە: شیخ عومەری حاجی شیخ کەریم، هات بون. نامەی سەرکردایەتی حسکیان بو تاهیر و هاوریکانی هینا بو من تەسلیمی ئەوان بکەن.

لیپرسراوەکانی حسک ئامادە نەبون بریارەکەی مەکتەبی سیاسی حیزبەکەیان جیبەجی بکەن. داوایان لە جەمال ئاغا کرد بو: بو ئەوەی من بەر بدەن ١٠٠ تفەنگیان بداتی. چەندی لە گەلیان تەلبن، کەلکی نابی. جەمال ئاغا بە ناچاری داواکەی قبول کرد بون، وت بوی: «نیمە تفەنگی کەلەکە کراومان نیە لە عەمبار دا، ئەبی بچین لە ناو هیزەکان دا کوی بکەینەوە»

ئەم داوایەی حسکم پی سوکایەتیەکی زور گەورە بو، خومم لە بەر چاو کەوت بو، چونکە یەکی بو لە نزمترین شیوەکانی «ئیبتیزاز». ئەم داوایەی ئەوان زیاتر لەوەی لە هی حیزبی سیاسی بچی، لە هی باندی مافیا ئەچو.

* نیوەرویەکیان ملازم تاهیر هاتە لام. چەند سەعاتی مایەوە قسە و باسی گشتی مان ئەکرد. پیش ئەوەی هەستی بروا، وتی: «ئەو برادەرانەی ئیوە ئەوەندە هاتوچوی ئەم ناوانەیان کردوە هەموشتیکمان ئەزانن، هیزیکی گەورەیان لە چەمی گەلال کو کردوتەوە، رەنگە پەلامارمان بدەن لە بەر ئەوە بریارمان داوە بگویزینەوە بو جیگایەکی تر، سبەینی دین بە دواتا». لە ناو هیزەکەی حسک دا چەند کەسیک هەبون بەردەوام هەوال و دەنگوباسیان بو ئەهینام. یەکیکیان خەبەری بو هینا بوم کە لەگەل تالە هەورامی ریک کەوتون لە نزیک بانی شار بنکەیەکی هاوبەشی پارتی و حسک دابنین و، منیش ببەن بو ئەوی بو ئەوەی، هیزەکانی هەردو حیزب پیکەوە ئیشکم لی بکرن. کاوەش ئەم هەوالەی بیست بو.

کە تاهیر رویشت بە کاوەم وت: «گویت لە قسەکانی کاک تاهیر بو؟»

وتی: «بەلی!»

وتم: «ئەلی ی چی؟»

وتی: «تو خوت چی بە چاک ئەزانی بیکە!»

وتم: «ئەگەر ببەن بو لای پارتی، ئیتر هیچ هیوایەکم نامینی، لە بەر ئەوە پیم باشە ئەمشەو فرسەت بهینین بروین»

وتی: «تو برو، هەرچی چەکیشت ئەوی ببە! بەلام من بر ناکەم و نامەوی دوات بخەم»

وتم: «ئەترسم توشی کیشە بێی لە گەل حسک»
وتی: «گوێ مەدەرێ، لام وایە توشی کیشە نابم، ئەگەر توشیش بوم، تۆ لەو لای مشورم بخۆ!»
ئیتر دلنیا بوم شیخ کاوە لیم زیز نابێ ئەتوانم بە ئازادی بجولیم.
پیشتر لە بەردەمی ئەشکەوتەکەدا زور جار راوەستا بوم، سەرنجی سەرەوەی و ریگاکانی ئەملا و ئەولایم دابو. زور جار بیرم لی کرد بوەوە ئەگەر بروم لە کوێوە بروم. بریارم دا بە ریگا ئاسایێەکان دا نەروم. شەوی بە تاریکی بە لای ئەشکەوتەکەدا راستە و راست بە شاخەکەدا هەلبگەریم و بە بناری سورین دا بەرەو شانەدەری بروم.
فەرەحم ئاگادار کرد خوی ئامادە بکا. کاوە وتی: «ئەوەکو توشی تەقە بێن چەکی پیشمەرگەکانی من بەیەن» من ئەمئەویست کاوە ئیحراج بکەم چەکم لی وەرنەگرتن، بەلام هەندی نارنجوکم لی وەرگرتن. کاوە بە زور دەمانچەکەی خوی دامی. لە گەل فەرەح وا ریک کەوتم کە من دەرچوم ئەویش بە دوای من دا بیت بۆ شوینی چاوەروانی. دەوروبەری سەعات ۱۰ ی شەو لە کاتی گورینی ئیشکگرەکەدا بە ناوی میزکردنەوە لە دەرگای ئەشکەوتەکە دەرچوم. دنیا زور تاریک بو. چاو چاوی نەئەبینی. بەردە قوتەکانی بەردەمی ئەشکەوتەکە لە زەلام ئەچون. پاسەوانەکە لە بەر دەرگای ئەشکەوتەکەدا راوەستا بو. چومە پەنا بەردیک و بە بی راوەستان روم کردە لای سەروی ئەشکەوتەکە. چاوەروانی فەرەح بوم دوای ئاوی ئەویش هات و، دو چەکداری شیخ کاوەش بۆ پاریزگاری بە دوامان دا هاتن زور بە خیرایی بە شاخەکەدا هەلگەراین، لە ماوەیەکی کورت دا ماوەیەکی باش دور کەوتینەوە. دە دەقیقەیەکی پی چو کابرای پاسەوان کە زانی ئیمە چەکدارەکانی شیخ کاوەمان ئیزن دا. دیار نەماوین و، گومانی کرد بو رامان کردبی، ریزیک تەقەی کرد بۆ هوشیار کردنەوەی هاوریکانی. گوێ مان لە تەقەکان بو بەلام ئیمە ئەوەندە دور کەوتبوینەوە مەترسی ئەوانمان لە سەر نەما بو.
بە بناری سورین دا رویشتین بە سەروی ئوردوگای شانەدەری دا لە جادەمان دا و پەرینەوە بەری چەمی گەلال. تاریکایی شەو و ماندویەتی سەری لی تیکدا بوین شور بوبوینەوە بۆ لای کانی سپیکەی پەرخ. تاریک و رونی بەیانی ئاقاری راستمان دوزیبوە بە شاخەکەدا هەلگەراینەوە بە لای مابندول دا بۆ چەمی گەلال.
روژ بوبوەوە، بەلام ئیمە ئەوەندە خومان رەتاند بو هەردوکمان پرزەمان لی برا بو، منیش ئەوەندە هەل ئەنگوت بوم و شەقم لە بەرد هەل دا بو، نینوکەکانی هەردو کەلەموستی پیم شکا بون، نەیشمانئەویرا بۆ پشودان لا بدەین. بە نزیک هوزخواجادا دریژەمان بە رویشتن دا. ماوەیەکی باشمان لە دولەکە بری بو. فەرەح چو بۆ دی یەکی ئەو نزیکانە ولاخ پەیدا بکا. منیش پالم دابو بە بەردیکەوە دانیشت بوم، لە دوروە زەلامیکم بەدی کرد جلی پیشمەرگەی لە بەردا بو. چومە ئەدیو چاودیری بکەم، روانیم ئەبەرد کەلاری بو. هەستام و بانگم کرد. بۆ ئەبەرد شتیکی چاوەری نەکراو بو من لەو بن بەردەدا ببینی. لە خوشی دا پی ی ئەرزی نەئەگرت. دوای ماچومەوچ بە راکردن بەرەو پەرخ بە ری کەوت مژدە بدا بە پیشمەرگەکان. پیشمەرگەکان بە بیستنی هەوالەکە کردیان بە تەقەی خوشی و زوریان بەرەو پیرم هاتن. هەندی لە دانیشتوانی ئاوایی نەیانئەزانی بو بوچی کتوپر کردویانە بە تەقە. ژنیک لە ژنی دراوسیکەیانی پرسی بو: «ئەوانە بوچی تەقە ئەکەن؟» لە وەلام دا وت بوی:

«بەژن مەنسولیکی زلهان بەلسە بوە!».
دوای ۳۲ روژ دەلی گەیشتمەوە ناو هاوریکانم.

*

حەمەی حاجی سابیر مالەکەی لە پەرخ بو، چومە مالی ئەوان. جەمال ئاغا خەریکی کوکردنەوەی چەک بو بۆ حسیبک، ئەم ئەرکە زەحمەتەی لە کول بوەوە. پاش دانیشتن و گفتوگۆ، زوری هەزەکەمان ریگە دا پەگەرینەوە شوینەکانی خویان و، نامەیەکیشم بۆ کاک تایەر و هاوریکانی نارد، دلنیام کردن لەوەی یەکیتی نیازی شەری نیە و، ئەوان بە ئازادی و دلنیایی ئەتوانن لە هەر جیبەکی خویان ئەیانەوی جەولە بکەن. بەلام ئەو کارەی ئەمان کرد بویان ئەوەندە دزیو بو، تا چەندین سال زاتیان نەئەکرد بینە ناوچەکانی ژیر دەسەلاتی یەکیتیەوە.

ئەگەر ئەم روداوە نەبوایە لەوانە بو رەوتی ژیانی من بە جوریکی تر برویشتایە، چونکە دوای ئەمە ئیتر لە سەفەری ئەوروپا و لە ژنهینان پەشیمان بومەوە. ئەمە جاری دوهەم بو بە هوی کیشەی سیاسیەوە هەلی ژنهینانم لە کیس چو. جاری یەکەمیان بەر لە بەیانی ئازاری ۷۰ لە گەل کچیک، کە بە ئارەزوی دلی خوم هەلمبژارد بو، ریک کەوت بوم بیخوازم، بە هوی روداوەکانی دوای ئازارەوە وازم لی هینا. ئەمجارەیش بە هوی ئەم روداوەوە.

پاش چەند روژی مانەوە لە شارباژیر گەرامەوە ناوزەنگ.

*

## کاروباری کۆمەلە

### رەوشتی هاوری ی کۆمەلە

لە خەباتی ژیر زەمینیی سیاسی - چەکداردا هەندی جار کەسانی وا پیش ئەکەون کە لە ژیانی گشتی دا خاوەنی پایەی بەرزی کومەلایەتی و دەسەلاتی حوکمرانی و سامان و دارایی نەبون، بەلام بە هوی خەباتەوە دەسەلات و چەکدار و پارەیان ئەکەویتە بەر دەست. بیگومان ئەمەیش «نەفسییەت» ئەگوری و، ئەگەر پیگەیاندنی راست و پەروەردەکردنی دروست و، ئاموژگاری و چاودیریی بەردەوامی لە گەل نەبی کابرا بەرەو کەندەلاتی «فساد» ئەخلیسکینی. ریکخراوە تیکوشەرەکە ئەبی بە جوری لە باندی مافیا و، کابرای تیکوشەر بە سەرۆکی باند یان بە «میری شۆرش».

لە شۆرشی کوردا نمونەی ئەمانە زۆرە.

کۆمەلە ریکخراویکی «عقائدی» بو. بیروباوەر ئەندامەکانی بە یەکەوە بەست بون. من و زۆری کە لە هاوریکانم لامان وابو کە تیکوشەری کۆمەلە ناتوانی لە هەمان کات دا دو ژیانی هەبی: ژیانیکی تایبەتی و ژیانیکی سیاسی. لامان وابو هەردوکی بە جۆریک تیکەلاون کە لە یەک جیا ناکرینەوە.

یەکی لە ژیانی تایبەتی دا دز بی ناتوانی لە ژیانی گشتی دا پاک بی و، لە ژیانی تایبەتی دا درۆزن بەلام لە ژیانی گشتی دا راستگۆ بی... بۆ پیگەیاندنی ئەندامەکانی کۆمەلە:

١. چاودێری و ئامــــۆژگـــاری بەردەوام هەبو. هەر یەکـــێکیـــان هەڵەیەک یان موخالەفەیەکی بکردایە بانگ ئەکرا بۆ لێپرسینەوە و سزادان.
٢. بەردەوام بڵاوکراوەی ناوخۆ بۆ ڕیزەکانی ڕێکخستن دەرئەچو.
٣. دەورەی پێگەیاندنی کادر ئەکرایەوە.
یەکێ لەو بڵاوکراوانەی ئەبو بە وردی پەیڕەوی بکرایە ئەمە بو:

*

## ڕەوشتی هاوڕێ ی کۆمەڵە

هاوڕێ ی تێکۆشەر!

هاوڕێ ی کۆمەڵە بە چی لە خەڵکی جیا ئەکرێتەوە؟ بە چی دا ئەناسرێتەوە؟ ئەبێ جیاوازیی چی بێ لە گەڵ یەکێکی تر؟ ئاخۆ ڕەنگ و ڕوی جیاوازە؟ جلوبەرگێکی تر لە بەر ئەکا؟ شاخ و باڵی هەیە؟ باڵای بەرزە؟ یا چی...؟

هاوڕێ ی کۆمەڵە مرۆڤێکی ناناسایی نیە. هاوڕێ ی کۆمەڵە ئادەمیزادێکی ئاساییە وەکـو هەمـو خـەڵکی تر، بەڵام ئەبێ بە کـردار و ڕەفـتـار و وتاری لە خـەڵکی کـە جـوێ بکرێتەوە.

هاوڕێ ی کۆمـەڵە پێویـسـتـە لە کاری سیاسی و ڕێکخراوەیی و پێشـمـەرگەیی دا نمونەی ئیلتیزام و گوێڕایەڵی بێ بەرامبەر بە لێپرسراو یا فـەرماندەکەی و، لە جێبـەجێ کردنی بێ قەید و شەرتی فرمان و بڕیار و ئامۆژگاری دەزگا دەسەڵاتدارەکانی سەروی خۆی دا.

هاوڕێ ی کۆمـەڵە ئەبێ لە ژیانی ڕۆژانەی دا نمونەی مرۆڤێکی نمونەیی بێ، لە قـسـە و گـفـتـوگـۆی دا، لە هەڵسـوکـەوت و کردەوەکـانی دا، بە گوێرەی هەلومـەرجی ئەو کـات و شوێنە نوێنەرەوەی بیروباوەڕی بەرزی کۆمەڵە و ڕێباز و سیاسەتەکەی بێ.

هاوڕێ ی کۆمەڵە ئەبێ لە شەڕا نمونەی ئازایەتی و لە خۆ بوردن و لە خۆ بڕان بێ، لە حـەسـانەوە و پشـودان دا هاوڕێکانی لە بیر بێ و، بە پـێـشـیـان بخـا، لە ناخۆشی دا بە تەنگیانەوە بێ و مشوریان بخوا، لە ڕاپەڕاندنی ئیشوکاردا ڕوح سـوک و لەش سـوک بێ، لە گفتوگۆدا هێمن و لە سەر خۆ و بە ئەدەب بێ.

هاوڕێ ی کۆمەڵە لە کاتی دەزگیر بون دا ئەبێ نمونەی خۆڕاگری و نتمی بێ و، لە ژێر باری ئەشکـەنجــە و ئازاردا نمونەی دان بە خـــۆدا گـــرتن بێ و، زیان بە هاوڕێکانی نەگەیەنێ.

هاوڕێ ی کۆمـەڵە ئەبێ فـەمری ژیانی بە کۆمـەڵ و گوڵجان بێ، ئەبێ بزانێ چۆن لە گەڵ خەڵکی ترا ئەژی، لە مـەقـەرەزەیەک یا لە کەرتێک دا، لە ماڵێک دا یان لە بارەگایەک دا لە گەڵ پێشمەرگە و خەڵکی ترا ئیش ئەکا و هەڵ ئەکا و ئەگوڵجی و بناغەی دۆستایەتی و هاوخەباتی و هاوسەنگەرییان لە گەڵ دائەمەزرێنێ.

هاوڕێ ی کـــۆمــــەڵە ئەبێ لە شکان و تێکەوتن و تەنگانەدا وره بەر نەدات، لە ماندوبون و برسێتی و تینوێتی و بێ دەرامەتی و بێ پارەیی دا خۆگر بێ، لە بێ هێزی و بێ دەسـەڵاتی دا بە زات بێ. لە سـەرکـەوتن دا بایی نەبێت و لە کـاتی دەسـەڵاتداری دا لە خۆی نەگۆڕێت و لە زاڵ بون دا زوڵم نەکات.

هاوڕێ ی کـــۆمــــەڵە لە هەر ناوچەیەکـــا بو ئەبێ حـــورمـــەتی عـــورف و عـــادەتی

دانیشتوانی ناوچەکە، حورمەتی خو و رەوشت و نەریتی دیرینەیان بگری، حورمەتی ریش سپی و پیاوماقولانی ناوچەکە بگری، حورمەتی دین و کەسانی دیندار بگری، حورمەتی مزگەوت و گۆرستان و شوینە پیروزەکانیان بگری.
هاوری ی کۆمەلە ئەبی لە گەل خەلکا رەفتاری باش بی، بە چاوی سوک تەماشایان نەکات، گوی لە رەخنەکانیان بگری چەندە بی کەلک و سادەش بن، گوی شل بکا بو داوا و پیشنیارەکانیان، بە سنگیکی فراوانەوە ئامۆژگاریەیان لی قەبول بکات، بە دەنگ داوا و گیروگرفتەکانیانەوە بچی، بەوپەری ژیری و هیمنی و پشودریژییەوە هەولی چارەسەرکردنیان بدا.
هاوری ی کۆمەلە ئەبی لە بەرامبەر دوژمنانی گەلەکەمان دا ئازا و نەترس بی، دل رەق و بی بەزەیی بی، چاوپۆشییان لی نەکات، کۆمەلانی خەلکی خوش بویت و لە گەل مهینەتی و ئیش و ئازارەکانیان دا بژی.
هاوری ی کۆمەلە ئەبی دەس پاک بی، هیچ بە زۆر لە کەس نەسینی، چاو نەبریتە مالی خەلک، مالی گەل و شۆرش بە فیرو نەدات.
هاوری ی کۆمەلە ئەبی داوین پاک بی، چاو نەبریتە ناموسی کەس و شەرەفی خەلک بە هی خوی بزانی، وەکو شەرەفی خوی بیپاریزی.
هاوری ی کۆمەلە ئەبی دەم پاک بی، جنیو بە کەس نەدا، بوختان و قسەی ناراست نەداتە پال کەس، لە پاش ملە بە خراپی زەمی کەس نەکات.
هاوری ی کۆمەلە ئەبی فەرق و جیاوازی لە بەینی هاوریکانیا بە هوی خزمایەتی و ناسیاوی و برادەرایەتییەوە نەکات. مەگەر سەبارەت بە ئازایەتی زیاتر و گویرایەلی و دلسوزی و لە خوبرانی زیاترەوە.
هاوری ی کۆمەلە ئەبی راستگۆ و سەر راست بی، هیمن و ژیر بی، رەوشت بەرز و بە وەفا بی، سادە و روح سوک بی، ئەبی دژی خوپەرستی و خوهەلکیشان بی، دژی خوبادان و کەش و فش و خو بە زل زانین بی، دژی لە خوبایی بون و لوت بەرزی و بە خوەوە نازین بی، دژی درۆ و فشە و فیشال بی، دژی لە خوبزازی بون و کەس بە هیچ نەزانین بی.
هاوری ی کۆمەلە ئەبی هەمیشە ئەوەی لە بیر بی کە خەباتی کۆمەلە لە ناوەرۆک دا خەباتیکی سیاسی چینایەتی و نیشتمانیە، ئەبی بی وەرس بون و ماندو بون کاری سیاسی لە هیچ بوار و کاتیک دا پشت گوی نەخات، بە کردار و رەفتار و وتاری چاک نەک بە زۆر و بە ترساندن جی ی خوی لە ناو دەوروپشتەکەی دا بکاتەوە و حورمەتی خوبان بە سەرا بسەپینی و هەولی دۆزینەوەی ناسیاو و دۆست و هاوری ی نوی بدات.
هاوری ی کۆمەلە ئەبی ئەخلاقی بەوجۆرە بی، پەیرەوی ئەم سەرەتایانە بکات، بەم گیانە خوی و هاوریکانی پەروەردە بکات، بەم شیوەیە بژی و کار بکات.
ئەوانەی وەها نین هاوری ی راستەقینەی کۆمەلە نین.

*

ئەم ئامۆژگاریانە بو ئەوەی لە گیرفان دا جیگەی ببیتەوە لە قەوارەی پاکەتی جگەرەدا چاپ کرا بو. هەمو هاورییەکی کۆمەلە دانەیەکی ئەدرایە و، ئەبو جیبەجی ی بکا. ئەگەر جیبەجی ی نەکردایە یا لی ی دەرچوایە بە گویرەی سەرپیچییەکەی سزا ئەدرا.

سزادان: چەک کردن، لابردن لە سەر کار، گرتن و دەس بەسەر دانان و، لە هەندی حالەت دا ئیعدام.

ئەوانەی موخالەفەیان ئەکرد هەتا پلەیان بەرزتر بوایە سزاکەیان قورستر ئەبو. ئەو کاتە وشەی «ترۆ» بلاو بوەوە. ئەم وشەیەمان لە شیعرەکەی «مەحوی» وەرگرت بو کە ئەلی:

دنیا تیاترۆیە موستە تیا بڕۆا

کێ مایەوە هەتا سەر نەبوبیْ تیا ترۆ؟

نمونەیەکی ئیعدام، ئیعدامی ریبوار چاوشین بو.

ریبوار، فەرماندەی مەفرەزە بو لە تیپی قەرەداخ. هاتوچۆی مالی کابرایەکی کرد بو. ئەو سەردەمە پیشمەرگە گەرۆک بون. بۆ خواردن و نوستن لە مالان دائەمەزران. ئەم کابرایە مالەکەی کرد بو بە بنکەی پیشمەرگە. بە دلسوزی و دلپاکی خزمەتی ئەکردن. ریبوار ژنەکەی لی هەلگیرا بوەوە و هەلی گرت بو بیبا بۆ ئیران. ژنەکە ۳ منالی بە جی هیشت بو. ئەم روداوە لەو کاتەدا زۆر بە خراپی دەنگی دایەوە. دوای گەرانیکی زۆر ژنەکە و پیشمەرگەکە لە دیەکی دۆلی جافەتی دۆزرانەوە. بۆ ئەوەی بەدگومانی لە نیوان پیشمەرگە و مالی جوتیاران دا دروست نەبی و، بۆ ئەوەی جاریکی کە هیچ پیشمەرگەیەک زات نەکا بەدرەوشتی وەها دوبارە بکاتەوە، م س بریاری ئیعدامی کورەکەی دا و، ئیعدام کرا.

یەکەمین کۆنفرەنس

ئەو ماوەیەی من گیرا بوم، کادرەکانی کۆمەلە لە پارەگاکانی سەرکردایەتی زنجیرەیەک سیمیناری فیکری و سیاسییان گرت بو. ناکۆکییەکانی ناو ریزەکانیان قولتر و ئاشکراتر بوبو. ئەمەیش زۆری کادرەکانی تورە کرد بو. بیری گرتنی کۆنفرەنسیان لە لا گەلالە بو. کە گەیشتمەوە ناوزەنگ چەند کۆبونەوەیەکمان کرد و بریارمان دا کۆنفرەنس ببەستین. کەوتینە خۆ ئامادە کردن. لە مانگی مایس دا نوینەرەکان تاقم تاقم گەیشتن.

*

سرودی ئینتەرناسیونال

لە ناو ئیمەدا ئازاد هەورامی دەستی مۆسیقای هەبو. هەندی ئالەتی موسیقای ئەزانی و، سەری لە دانانی ئاواز دەرئەچو. لە هەمان کات دا لەوانە بو باوەریکی قولی بە مارکسیزم هەبو، روالەتە ئاشکراکانی لە بابەتی «چەکوش و داس» و «ئەستیرە» و «سرودی ئینتەرناسیونال» ی.. بە لاوە زۆر گرنگ بو. ئەیویست کۆنفرەنسەکە بەم سرودە دەس پی بکا و، لی برا بو تاقمیک فیر بکا بیلین. تاقمی لە پیشمەرگە کۆنەکانی هەلبژارد بو، هەندیکیان سەریان لی ی دەرنەئەچو، لە بەر خاتری ئازادیش دلیان نەهات بو داواکەی رەت بکەنەوە.

ئازاد سرودەکەی بۆ چاپ کرد بون و، یەکی دانەیەکی دابونی بۆ ئەوەی لە بەری بکەن. خۆیشی رۆژانە لە گەلیان دائەنیشت و لە گەلی ئەوتن. ئاخر رۆژ کە رۆستەم ئەبینی لی ی ئەپرسی: «سرودەکەت لە بەر کردوە؟» ئەلی: «بەلی!» ئەلی: «ئادەی بۆم بلی!» روستەم دەس ئەنیتە بنا گوی ی لە سەر ئاوازی یەکی لە گۆرانیەکانی سەید محەممەدی صەفایی ئەلی: ئەری ئینتەرناسیونال.. وەی وەی ئینتەرناسیونال...

ئازاد زۆری پی ناخۆش ئەبی و زۆر تورە ئەبی.

## یەکەمین کۆنفرەنسی کۆمەڵە

لە ژێر دروشمی: لە پێناوی پتەوکردنی ریزەکانی کۆمەڵە و راپەراندنی جەماوەری گەلەکەمان دا، لە مانگی ئاباری ساڵی ۱۹۸۱ دا لە مالپەوس یەکەمین کونفرەنس بە ئامادەبونی ۱۸۵ ئەندام، بەسترا. ئەندامانی کونفرەنس نوینەرایەتی نزیکەی ۸ هەزار ئەندام و لایەنگری ریکخراویان ئەکرد، لە ناو پیشمەرگە و لە ناو شارەکان و لە دەرەوەی ولات.

ئەندامانی کۆنفرەنس خەلکی بەشی هەرەزۆری شار و شاروچکە و ئوردوگا و ناوچە دیهاتیەکانی کوردستانیان تی دا بو.

لە روی تەمەنیانەوە: ٤٩ ئەندامی لە بەینی ۲۰ - ۲٤ و، ۷٤ ئەندامی لە بەینی ۲٥ - ۳۰ ساڵ و، ۱۱ ئەندامی لە بەینی ۳۱ - ۳٥ ساڵ و، ٤۱ ئەندامی لە بەینی ۳٦ - ٤۰ ساڵ و، ۱۰ ئەندامیشی بەرەوژوری ٤۰ ساڵ بون.

لە روی کار و پیشەوە: ٤٤ ئەندامی کریکار و، ۱۷ ئەندامی پیشەگەر و، ٦٥ ئەندامی موچەخۆری پچوک و فەرمانبەر و، ۹ ئەندامی پیشەگەری گەورە و، ٥۰ ئەندامی خویندکاری زانکو و پیشمەرگە بون. لەوانە ٥ یان ئافرەت بون.

لە سەرەتادا من راپورتیکی دریژم خویندەوە باسی دامەزرانی کۆمەڵە و، قوناغەکانی گوران و گەشەکردنیم کرد لە سەرەتاوە تا ئەو کاتە. کومیتەی سەرکردایەتی ریکخستنی ناوخو و، کومیتەی راپەرین و، ریکخراوی شەهید جوامیر (بەغداد) و، ریکخراوی شەهید لەیلا (ئافرەتان) و، ریکخراوی بادینان، راپورتی دریژیان ئامادە کرد بو. خویندرانەوە و گفتوگویان لە سەر کرا.

بەشیکی کاتی کونفرەنس بو پیاچونەوەی رابوردوی کۆمەڵە و، بەشیکی بو دانانی ریوشوینی کاری قوناغی داهاتو تەرخان کرا بو. یەکی لە کارە گرنگەکانی ئەم کونفرەنسە دانانی «پیرەوی ناوخو» بو. گفتوگو و باسەکان تیکرا ۸۰ سەعاتیان خایاند و، بە هەلبژاردنی سەرکردایەتی تازەی کۆمەڵە کوتایی هات.

*

ئەوانەی ناودیر کرا بون بو سەرکردایەتی کۆمەڵە لە ۲۰ کەس زیاتر بون. بو ئەوەی ئەندامانی کونفرەنس، پیش دەنگدان، بە چاکی بیانناسی: دو کەس رەخنەیان لی ئەگرت و، یەک کەس پەسنی ئەدا. بو ئەوەی بین بە ئەندامی سەرکردایەتی بریار درا ئەبی لە نیوەی دەنگەکانی ئەندامانی کونفرەنس زیاتر بهینن. بو ئەوەی کاروباری کونفرەنس بە ریکوپیکی بروا، من خوم دەنگم نەدا، ستایشی کەسم نەکرد و رەخنەیشم لە هیچ کەس نەگرت، هیچ لیستەیەکیشم ئامادە نەکرد بو.

ئەندامانی کۆمەڵە، لە هەندی لەو هاوریانە بە داخ بون، چونکە:

۱. ململانییەکی نالەباریان دەس پی کرد بو لە سەر پلە و پایە بە تایبەتی لە گەل ئەوانەی لە زیندان بەر بوبون، ئاژاوەیەکی زور و پشیوییەکی قولیان خست بوە ناو ریزەکانی ریکخستنەوە، دەستەگەرییان تی دا دروست ئەکردن.

۲. لە بیروباوەردا توندرەو بون و، ئەیانویست کۆمەڵە بە لای توندوتیژی دا ببەن.

۳. رەفتاریان لە گەل پیشمەرگە و کادرەکان باش نەبو، هەندیکیان بە لوتبەرزی و غەراییەوە لە گەلیان ئەجولانەوە.

لە ئەنجامی دەنگدان دا ساڵار و جەعفەر دەرنەچون و، عومەر و مەلا بەختیار بە

دەنگیکی کەم دەرچون. دوای بلاوکردنەوەی ئەنجامی هەلبژاردن بە ریز، سالار، مەلا بەختیار، جەعفەر، مەلازم عومەر.. قسەیان کرد و، هیرشیان کردە سەر ئەندامانی کونفرنسەکە. لی گەراین قسەی خویان بکەن، چەند کەسی لییان راپەرین ویستیان بە توندی وەلامیان بدەنەوە، بەلام بو ئەوەی وەزعەکە نەشیوی، من ریگەم نەدان.

*

دوای کونفرەنس ئەم هاوریبیانە تورە بون و، هەرەشەیان کرد کە شورش و کومەلە بە جی ئەهیلن و، ئەچن بو دەرەوە. من چەند جاری سەردانم کردن و، زورم لە گەل وتن بو ئەوەی دلیان بهینمەوە جیگەی خوی و، بیننەوە کار بکەن. بەلینم بە سالار و جەعفەر دا کە هەر لە م س یەکیتی دا بیانهیلینەوە. قسەکانم سودی نەبو. سور بون لە سەر هەلویستی خویان. مەلا بەختیار لە هەمویان زیاتر خوی بە دلشکاو ئەزانی و، نارەزایی دەرئەبری. گەیشتە تینم بە مەلا بەختیارم وت: «کاتی خوی کە من بوم بە کومەلە و، دوایتر بە یەکیتی و، دەستمان کردەوە بە شورش، نەمبیست بو کابرایەک هەیە ناوی مەلا بەختیارە، ئیستایش ئەگەر ئەمینیتەوە زور باشە، ئەیشروی خواحافیزت بی، بە بی تویش کومەلە و یەکیتی و شورش بەردەوام ئەبی!»

بە کومەل چون بو تاران. لەو روژانەدا مامجەلال گەرایەوە تاران. قسەی لە گەل کرد بون بگەرینەوە کوردستان و قانیعی کرد بون. بەلام ئەمان لە هەولی ژیر بە ژیری خویان نەکەوتن و، ئەو داخەیان لە دل دەرنەچو. جەعفەر نامیلکەیەکی چاپ کرد بو بە ناوی «مانگ گیران» ەوە. دەرنەچونی خوی و هاوریکانی بە گیرانی مانگ شوبهاند بو.

*

حدک و پدک

نوینەرانی شورای شارەکان لە مەهاباد کوبونەوەیەکیان کرد بو گفتوگو لە گەل کاربەدەستانی رژیمی نوی. داواکانیان لە ٨ ماددەدا کو کرد بوەوە. لە ماددەی یەکەمین دا داوای سەلماندنی مافی ئازادی بریاردانی چارەنوسی کوردیان کرد بو، لە ماددەی هەشتەمین دا داوای دەرکردنی سەرانی قیادە موقەتەیان کرد بو لە ئیران. لەم کوبونەوانەدا نوینەرانی زور لە ریکخراوە سیاسییەکانی کوردستانی ئیران بەشدار بون. هەمویان، جگە لە نوینەرانی دیموکرات، سور بون لە سەر ئەوەی حکومەتی ئیران قم دەریکا لە ئیران.

لەو نامیلکەیەدا کە سەبارەت بە قیادەی مووەقەتە دەریان کرد هەلویستی خویان بەم جورە ئەگیرنەوە:

«پاش زیاتر لە یەک سال راپەرین و قوربانی دانی گەلانی ئیران لە ٢٦ ی ریبەندانی ١٣٥٧ دا شورشی خەلکی ئیران یەکەم قوناخی سەرکەوتنی بری و یەکیک لە کونەپەرستترین و درندەترین ریژیمەکانی سەر بە ئیمپریالیزمی لە روژهەلاتی نیوەراست دا تیکەوە پیچا. ئەو سەرکەوتنە ئەگەر بو خەلکی ئیران مایەی جەژن و شادمانی بو، بو بەریوەبەرانی دەزگای یەکریگیراوی بنەمالەی بارزانی زەربەیەکی گورچو بر و دل تەزین بو. چونکە ئەوانە هیچ پیوەندیەکی دوستانەیان لە گەل گەلانی ئیران دا نەبو و، جاری نەشیان توانی بو لە گەل کاربەدەستانی تازە بە سەرداکەوتوی حکومەتی خومەینی ریک کەون. شەپولی قین و تورەیی و نارەزایی بەرامبەر بە قیادەی مووەقەت سەرتاپای ئیرانی داگرت

بو، زوربەی حیزب و ریکخراوەکانی کوردستان و سەرتاسەری ئیران داوایان دەکرد تەواوی ئەفرادی قیادەی مووەقەت لە ئیران دەربکرین. سەربەند و بی بەندی هەمو باس و خواسیکی سیاسی دەهاتە سەر قیادە و ئەو تاقمەیان لە زوربەی جینایەتەکانی کون و تازەی کاربەدەستانی ئیران دەرهەق بە کومەلانی خەلک دا بە بەشدار دەزانی.

ئەگەرچی حیزبی دیموکراتی کوردستان زیاتر لە تەواوی ریکخراوە ئیرانیەکان شارەزای ئاکار و کردەوەی دژی گەلی سەروکایەتی ئەو تاقمە بو، هەرچەند حیزبی ئیمە پتر لە هەمویان کوتەکی خوفروشی و بەکریگیراوی ئەوانەی وی کەوت بو، بەلام لە بەر هەستی مەسئولییەت بەرامبەر بە چارەنوسی گەلی کورد و هەزاران مالی لیقەوماوی کوردی عیراقی کە لە ئیران دا ئاوارە و سەرگەردان بون هیچ کاتیک فیکری تولە ئەستاندنەوەی نەبوو هەمو کاتیک لەو باوەرەدا بو کە پاداشی جینایەت و خەیانەتی ئەو تاقمە دەبی بە رەفتاری باش لە گەل کوردە عیراقیە دەربەدەرەکان بداتەوە. هەر بویەش لە هەمو جیگایەک دژی ئەو داوایە راوەستا کە کوردە پەنابەرە عیراقیەکان لە ئیران دەربکرین.

بە دوای سەرکەوتنی شورش دا کاتیک نوینەرانی دەولەتی کاتیی موهەندیس بازرگان هاتنە مەهاباد تاقە نوینەری حیزبی ئیمە لەو کوبونەوەدا زور دژی بەندی هەشتی داخوازەکان بو کە داوای دەکرد ئەفرادی قیادەی مووەقەت لە ئیران دەربکرین، دوایەش کە ئەو بەندە بە زوربەی دەنگ پەسند کرا حیزبی ئیمە چەندین جار بە رەسمی ئەو داخوازەی بە شتیکی غەیرە ئوسولی دانا و رەتی کردەوە. کومەلانی خەلکی کوردستانی ئیران شاهیدیکی زیندون کە حیزبی ئیمە لە سەر ئەو سیاسەتە چەندی قسە پی گوترا و چون لە لایەن زوربەی ریکخراوە سیاسیەکانی ئیرانەوە پەلاماری توندی تەبلیغاتی کرایە سەر.

بەلام حیزبی ئیمە دیسان لە سەر ئەو سیاسەتە مەسئولانەیەی خوی رویشت و ئەوەندەی لە تواناشی دا هەبو خەلکی کوردستانی بو کومەگ بە پەنابەرانی کوردی عیراق هان دا. هەزاران مالی عیراقی کە لە ناوچەکانی دوورەدەستی ئیران سەرگەردان بون بە موافەقەتی حیزبی ئیمە گەرانەوە کوردستان و بە تەشویقی ئیمە لە کوردستان دا جیگا و ریگایان بو دابین کرا و حاوانەوە.

لە کونفرانسی گەلان لە تارانیش کە نوینەری زور لە حیزب و ریکخراوە سیاسیە ناوچەیی و سەرتاسەرییەکانی ئیرانی تی دا بو، تەنیا ریکخراویک کە دژی هیرش کردن بو سەر قیادەی مووەقەت راوەستا حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئیران بو، لە بریارنامەی کونفرانس دا بە زوربەی دەنگ بریاریک لە دژی قیادەی مووەقەت پەسند کرا، بەلام هەر لەوی دا بە سەراحەت گوتراوە کە حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئیران موخالیف بوە.

بە کورتی لە گەل ئەوەی زوربەی هیزە سیاسیەکانی ئیران و بە تایبەتی کوردستان بە توندی لە دژی قیادەی مووەقەت کاریان دەکرد، حیزبی ئیمە هیچ وەخت هەلویستی دوژمنانەی بەرامبەریان نەگرت و هەر لەو باوەرەدا بو کە ئەوانە وەک میوانیک دەبی چاویان لی بکری و بە پی ی توانا یارمەتی خیزانە لیقەوماوەکانیان بدری.»

سەرکردایەتی حدکا لەم راپورتەدا دەوری خویان باس ئەکا لە چەند مەسەلەی گرنگ دا بەرامبەر قم:

- رازی نەبون بە تاوانبار کردنی سیاسی قم.
- رازی نەبون بە دەرکردنی سەرکردەکانیان.

- هێنانەوەی هەزاران خەزانی ئەندامەکانی قم بۆ کوردستان، کە دواییتر بون بە چەکهەڵگری لەشکری بارزانی بۆ شەڕی حدکا و، یەکیتی.

بێگومان ئەم هەڵویستەی حدکا سەبارەت بە هەست کردن نەبو بە مەسئولیەت، وەکو لەم راپورتەدا بۆ پاساودانی ئەم هەڵویستەیان نوسیویانە، بەڵکو بۆ هێشتنەوەی قم بو وەکو ملوزمی گیانی یەکیتی. حدکا نەیئەویست یەکیتی لە پەژارەی قم ئاسودە بی. بەڵام قم بون بە هێزی پارمەتیدەری ئیران بۆ تێکشکاندنی حدکا و دەرکردنی لە زۆری ناوچەکانی کوردستانی ئیران.

قم لە حدکا بون بە مارەکەی شیخ هۆمەر!

*

لە فۆلکلۆری کوردی دا ئەگێڕنەوە: شیخ هۆمەر بە لای شەخەڵیکی چڕ و پڕدا رائەبوری. شەخەڵەکە ئاگری گرت بو دوکەڵی لی بەرز ئەبوەوە. شیخ هۆمەر ئەروانی ئاگر زۆری بۆ مارێک هێناوە کە لە ناو توترکێک دا گیری خواردوە، خەریکە لە گەڵ پوش و پاوانی شەخەڵەکەدا بسوتی. مار لە تاو گڕ و دوکەڵ ئەفیشکینی و، هەڵئەبەزیتەوە، بەڵام هیچ ریگایەکی نابی دەرباز بی. شیخ هۆمەر بەزەیی بە مارەکەدا دیتەوە. گالۆکیکی درێژی پی ئەبی بە سەر ئاگرەکەدا بۆی رابەڵ ئەکا. مارەکە خۆی لە گالۆکەوە ئەپیچی و لە ئاگرەکە تی ئەپەری، بەڵام هەرکە ئەگاتە شیخ هۆمەر خۆی لە ملی ئەئاڵینی و ئەیەوی پاداشتی چاکەی شیخ هۆمەر بە گەستنی بداتەوە.

*

لاک

لە سەرەتای شوباتی ١٩٨١ دا لە تاران ریکخراویکی تازە بە ناوی: «لەشکری ئیسلامی کورد» کە بۆ گاڵتە پی کردن ناویان لی نا بو: «لاک» دامەزرا.

ئەم ریکخراوە تازەیە هیچ بەرنامەیەکی سیاسی نەبو. دامەزرینەرەکانی: مەلا حسین ماربونسی، شیخ قادری سۆتکە، عەبباس شاهین، کە لە تاران داتەنیشتن لە ناو خۆیان دا کۆک نەبون.

مەلا حسینی ماربونس و شیخ قادری سۆتکە لە دوای ئاشبەتاڵەوە لە ئیران دانیشت بون. مەلا حسین، خەڵکی ناوچەی تەلەعفەر، کابرایەکی کۆنەپەرست و دواکەوتوی لە کوردستان دابڕاو و، شیخ قادریش، خەڵکی گوندی سۆتکەی ناوچەی قەڵاسیوکە، قولە دەرەبەگیکی زاڵم و نەخوێندەوار بو. بەڵام عەبباس شاهین، کابرایەکی زیرەک و لیزان بو، سەردەمیک لە گەڵ «حرکە اخوان المسلمین» لە موسڵ کاری کرد بو. لە ٧٤ دا بوبو بە پیشمەرگە و، لە سەرەتای دامەزراندنی یەکیتی دا هاتە قامیشلی لە گەڵ یەکیتی کاری ئەکرد. خۆی وا دەرئەخست ریکخراویکی لە ناو ئەفسەرانی جەیش دا هەیە. بەم ئیدیعایانە ماوەیەک دەستی مامجەلالی بری هەندی پارەی لی کیشایەوە و، سەردانی سعودیەی کرد و، دواییتر کە وازی لە یەکیتی هێنا هاوکاری لە گەڵ دەزگای موخابەراتی سوری و لیبی ئەکرد و، خۆی گەیاندە کاربەدەستانی ئیرانی.. ئەمانە هەر یەکەیان بۆ مەبەستی، بەڵام هەمویان لە ژیر چەتری ئیران دا و، بە ئامۆژگاری ئەوان یەک کەوت بون.

*

لەشکرەکەیان نمونەی لەشکری بەکریگیراو بو. ئیران چەک و پارە و پەناگای، وەک

بەشێک لە سپای پاسداران، بۆ داببین کرد بون. هەرکەس ئەبو بە چەکهەلگری ئەوان:

١. پارەی مانگانەیان بە رێکوپێکی ئەدایە.
٢. چەکی جوان و تازەیان ئەدایە.
٣. ئەیتوانی ماڵ و خێزانەکەی بهات بۆ ئێران و، خوێشی بە ئازادی بە سەرانسەری ئێران دا بگەڕێ و بسوڕێتەوە.
٤. شەڕی رژێم نەکا.

*

ئەم «ئیمتیاز» انە لەو کاتەدا کە بە هەزاران کەس لە جەبهەی عێراق هەڵات بون، لە دێهاتەکان دا بێ دەرامەت و ئیشوکار دانیشت بون، هەروەها بۆ هەندێ لە دانیشتوانی دێهات کە ئەیتوانی لە گوندەکەی خۆی دا بمێنێتەوە و، هەمو ئەو دەسکەوتانەیشی هەبێ و، بە ناو خزمەتی دین و نیشتمان ئەکا، وای کرد لە ماوەیەکی کورت دا پەرە بسێنێ و، هێزێکی زۆر پێکەوە بنێن. هیچ بیروباوەڕێکی دینیی یا نەدینیی نەبو کە ئەمانە پێکەوە کۆ بکاتەوە، ئەوەی کۆی کرد بونەوە دەسکەوتی ماددی و، مەبەستی تایبەتی بو. لە ناو هێزەکەیان دا کەسانی جۆراوجۆر کۆ بوبونەوە. پارتی بەش دەستی تێ خست بون و، هەندێ کەسی خۆی نارد بوە ناویانەوە. یەکیتی بەش هەندێ لە کادرەکانی خۆی نارده ناویانەوە.

گۆرانیبێژێکی سوری هەبو ناوی محەممەد شێخۆ بو. لە گەڵ ئاشبەتاڵ دا ئەویش چو بو بۆ ئێران. لەم بەزمەدا ئەویش چو بوە ناو لاکەوە. مەلا حسێن دژی گۆرانی و مۆسیقا بو. ئەویش بە چاولێکەری ئیمام خومەینی لای وابو حەرامە، نابێ کەس گۆرانی بڵێ یا گوێ ی لێ بگرێ. رۆژێکیان لە بارەگای لاک لە تاران لە سەر ئەم کێشەیە مەلا حسێن و محەممەد شێخۆ ئەبێ بە مشتومڕیان. محەممەد ئەڵێ: «تۆ قورئانی خۆت بخوێنە، منیش تەنبوری خۆم لێ ئەدەم، بزانە خەڵک لە کامیان کۆ ئەبێتەوە؟» مەلا حسێن ئەڵێ: «ئەهلی ئەم زەمانە تابیعی فسق و فجورن، دیارە لە تۆ کۆ ئەبنەوە!»

*

سەرەتا کە ویستیان دەس بکەن بە کارکردن خۆیان چەند کەسێکیان نارد بۆ ناوزەنگ بۆ گفتوگۆ لە گەڵ مەکتەبی سیاسی و، لە سەر چەند مەسەلەیەک پێک هات بون. هەروەها ئێرانیش داوای لە یەکیتی کرد بو کارئاسانیان بۆ بکا، بەرامبەر بەوەی ئێران کارئاسانی بۆ یەکیتی بکا.

کە نێوانی ئێران و یەکیتی تێک چو، ئەمە کاری لە نێوانی لاک و یەکیتی یش کرد. لاک بەڵێنیان دابو:

١. دەس نەخەنە ناو کاروباری خەڵکەوە.
٢. دوژمنانی یەکیتی و کەسانی گومانلێکراو لە ریزەکانی خۆیان دا وەرنەگرن.
٣. یارمەتی یەکیتی بدەن بۆ گوێزانەوەی چەک.

*

## گەل

هەر لەو ماوەیەدا سامی سنجاری یش حیزبێکی تازەی دامەزراند بە ناوی: «حزب الشعب الدیمقراطی الکردستانی».

زۆری ئەم حیزبانە هیچ زەمینەیەکی فیکریی یا کۆمەڵایەتییان نەبو. لە سایەی

جەنگی عیراق - ئێران و، ناکۆکیی یەکیتی - پارتی دا دروست ئەکران.
سامی لە بنەماڵەیەکی دەروێشتوی سنجارە. بە ڕیچەڵەک یەزیدی بون و موسوڵمان بون. لە سەردەمی پاشایەتی دا بە «بەعسە» نێردراوە بۆ بەریتانیا و، لەوێ هەندەسەی خوێندوە. هەر لەوێ تێکەڵاوی حشع بو. دوای ١٤ تەمموزی ٥٨ یەکی لە توندڕەوەکانی حشع بو. تاوانبار کرا بو بە هاوبەشی لە ڕوداوەکانی ١٩٥٩ ی موسڵ دا. کە ئینقیلابی ٨ ی شوباتی ٦٣ بو، وازی لە حشع هێنا و، هەڵات بۆ ماڵومە کە ئەوسا بارەگای مەکتەبی سیاسی پارتی لێ بو. لە ئیستگەکەی شۆرش دا لە گردەڕەش کەوتە کار.
لە ناکۆکی نێوان بارزانی و مەکتەبی سیاسی دا، بە لای لای سەرکەوتودا دای شکاند و، لە هاوینی ٦٦ دا بو بە ئەندامی مەکتەبی ئەنفیزی و، لە کۆنگرەی حەوتەم دا هەڵبژێردرا بە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی و مەکتەبی سیاسی. دوای خوێندنەوەی بەیانی ئازاری ٧٠ بو بە وەزیری ئیعماری شیماڵ.
سامی ئەو کاتەی وەزیر بو هەوڵی دابو دەستەیەک ڕوشنبیر و خوێندەوار بە تایبەتی ئەوانەی خۆیان بە چەپ دائەنا و، ئەوانەی لە ناو حیزبی شیوعیەوە هات بون، لە خۆی کۆ بکاتەوە. دوای هەڵگیرسانەوەی شەڕی کوردستانیش لە گەڵ ئەوانە پەیوەندی باش و نزیکی ڕاگرت بو.
دوای ئاشبەتاڵ سامی چو بۆ ئێران و، مانگی کانونی یەکەمی ١٩٧٥ بە ئاگاداری و یارمەتی ساواک ق م ی پێک هێنا و، خۆی بو بە سکرتێری و، بۆ ئەو مەبەستە سەفەری ئەوروپای کرد.

*

سامی لە ساڵانی ١٩٧٥ - ١٩٧٩ دا سکرتێری قیادە مووەقەتەی پارتی بو، لە کۆنگرەی نۆهەمی پارتی دا خۆی هەڵنەبژاردەوە. ماوەیەک خۆی وا پیشان دا کە دەستی لە کاری سیاسی هەڵگرتوە. دوای ماوەیەک ئێران گرتی. قسەی جیاواز لە سەر گرتنەکەی هەبو. هەندێک ئەیانوت: بنەماڵەی بارزانی بە گرتنی داوە و، هەندێکی تر ئەیانوت: بە تۆمەتی جاسوسی گیراوە. دوای چەند مانگی بەربو ڕۆیشتە لەندەن. لەوێ کەوتەوە جموجوڵ. پەیوەندی لە گەڵ هەندێ لە هاوکارەکانی سەردەمی قیادە مووەقەتە، بە تایبەتی ئەوانەی لە ئەوروپا بون، تازە کردەوە و، سەردانی سوریای کرد.
لە تەمموزی ٨١ دا سامی هاوڕێ و هاوکارەکانی خۆی کۆ کردەوە بۆ کۆنگرەی دامەزراندنی حیزبێکی تازە بە ناوی: «پارتی دیموکراتی گەلی کوردستان». سامی حیزبەکەی بە ژمارە کەم بو، بنکەی جەماوەریی و هێزی پێشمەرگەی نەبو. تاقمی ڕۆشنبیری لی کۆ بوبوەوە، لە گەڵ تاقمی سەربازی هەڵاتو. لەو زەمانەدا کە ژمارەیەکی زۆر گەنجی کورد لە سەربازی هەڵات بون، هەمو لایەک ئەیتوانی هەندێکیان بۆ لای خۆی ڕابکێشێ. بەڵام لە کاری خۆی دا بایەخی بە دو شت ئەدا: ڕاگەیاندن و، پەیوەندی دەرەوە.
لە شام جەریدەیەکی کوردی - عەرەبی لە ژێر ناوی: «گەل - الشعب» دا دەرئەکرد، لە چاو جەریدەی زۆر لە حیزبەکانی کەدا بە ڕواڵەت جوانتر و بە ناوەڕۆک دەوڵەمەنتر بو. چەند نامیلکەیەکیشی بڵاو کردەوە.
سامی دۆستایەتی لە گەڵ سوریا، لیبیا، ئێران دامەزراند. حیزبەکەی وەکو دوکانێکی سیاسی لی کرد بو بۆ داوای یارمەتی لە دەوڵەتان، تەنانەت لە حیزبە

کوردیەکان. تەنیا یەک جار سامی یەک ملیون دۆلاری لە لیبیا بۆ یارمەتی حیزبەکەی وەرگرت. وەکو ئەیانوت لە ناو خۆیان دا لە سەر ئەم پارەیە تێکچوون و، هەندێکیان بە یەکجاری لێ ی دور کەوتنەوە.

*

## تێکچونی یەکێتی و ئێران

ململانێ ی دەسەلات لە ئێران دا لە نێوان بالی دینیی میزەربەسەر و بالی دینیی پانتۆل لە پێ گەیشت بوە پۆپە. مامجەلال لە حوزەیرانی ٨١ دا گەیشتەوە تاران. بەنی صەدر، سەرۆک کۆماری ئێران، مستەفا چەمران، وەزیری دیفاع، فەلاحی سەرۆکی ستادی ئەرتەشی بینی.

وەجبەیەکی گەورەی چەکی قورس، ناوەنجی و، سوک بە فرۆکە و بە پاپۆر گەیشت بوە ئێران بۆ یەکێتی. ئێران بەلێنی پێشەکی بە سوریا و لیبیا دابو ئەم چەکانە تەسلیم بە یەکێتی بکا. دەستی بە سەردا گرت و، تەنیا پارچەیەکیشی نەدا بە یەکێتی.

بەنی صەدر، بەلێنی بە مامجەلال دابو، کە پەیوەندی ئێران لە گەل یەکێتی چاک بکا و، چەکە گیراوەکان بداتەوە و، هەولی چارەسەرکردنی ئاشتیبانەی کێشەی کوردەکانی ئێران بدا. فەلاحی یش هەمان بەلێنی دا بو. ۳۰۰۰ کلاشینکۆفیان دابویە لە گەل خۆی بیهێنێتەوە. گەیشتنەوەی مامجەلال و ئەو بەلێنە خۆشانەی پێیان دابو، هەمومانی دلخۆش کرد. لامان وابو «دەروی رەحمەت» مان لێ ئەکرێتەوە. بەلام دوای ماوەیەکی کەم ناکۆکییەکان تەقینەوە. بەنی صەدر بە سواری فرۆکە هەلات بۆ پاریس و، فەلاحی لە هالیکۆپتەردا تەقینرایەوە و، ئەو بالەی دەستی بە سەر کاروباردا گرت بە ئاشکرا کەوتە دوژمنایەتی یەکێتی.

*

بالی دینیی کە بەرەو زال بون ئەچو، هەلویستی بەرامبەر یەکێتی دوژمنانە بو. دەستیان بە سەر چەکەکان دا گرت. چەند جاری لەم بارەیەوە قسەیان لە گەل کرا بێ سود بو. کابرایەکی سەرهەنگ کرا بو بە فەرماندەی هێزەکانی «شیمال غەرب» ناوی صەیادی شیرازی بو. داوای وەفدێکی «نیزامی» و، لێپرسراوی ناوچەی پێنجوێنی یەکێتی کرد. ئێمەش، ملازم عومەر، ئازاد هەورامی، بەکری حاجی صەفەرمان نارد.

دوای ئەوەی قسە و گفتوگۆیان کرد بو، صەیادی شیرازی بە راشکاوی پێ ی وت بون: «ئازاد کردنی عیراق، لە پاککردنەوەی ئێرەوە دەس پێ ئەکات - کۆبونەوەکە لە ورمی بو. مەبەستی پاککردنەوەی ناوچەی ورمی بو - ئەبێ ئێوەش هێزەکانتان وەکو ئەفرادی بارزانی بهێنن بۆ ئێرە، پێکەوە تا سەر سنوری عیراق لە هێزەکانی ضیدی ئینقیلاب - مەبەستی هێزەکانی حدکا و سازکا بو - پاک بکەینەوە، کە گەیشتینە سەر سنوری عیراق، لەو چەکانەی هیناوتانە زۆر زیاترتان ئەدەمێ! تا ئەوە نەکەن جارێکی کە باسی چەک مەکەن»

هەر بەم تێگەیشتنە یەکێ لە دروشمەکانی ئێران لەو زەمانەدا: «راه قدس از کربلا میگذرد» بو. گوایە ئەگەر رژێمی عیراق بروخێنن و کەربەلا بگرن رێگەی رزگارکردنی

قودس له ئیسرائیل ئەکریتەوە.
وەفدەکەی بەریزەوە بە هالیکوپتەر رەوانە کرد بو بو مەهاباد. بە نائومیدی گەرانەوە لامان. داواکانی سەرهەنگ صەیادی شیرازی رون و ئاشکرا بو، بەلام بە ئیمە جیبەجی نەئەکرا.

*

سوریا وەفدیکی گەورەی بە سەروکایەتی عەبدولحەلیم خەددام نارد بو گفتوگو لە گەل کاربەدەستانی ئیران. یەکی لەو باسانەی ئەم وەفدە لە گەل ئیرانی کرد بو، چاککردنی پیوەندی یەکیتی - ئیران و، ریگەدان بە ناردنی چەک بو. حازم (عەبدالجبار الکبیسی) یش لە گەل ئەم وەفدە هات بو. ئیرانیەکان وت بویان: «ئیوە چۆن چەک ئەدەن بە مانە ئەمانە هەم کوردن و هەم سوننەن بو هەردولامان خەتەرن!» نەیانزانی بو خەددام سوننەیە.
وەفدیکی ئیرانی لە گەل حازم هاتن بو ناوزەنگ بو هەلسەنگاندنی هەلومەرجی ناوچەکە و، پیوەندی یەکیتی و حدکا. ئەمانە لە سەردەشتەوە بە پی هاتن بو ناوزەنگ، زوریان جلی پاسداریان لە بەر کرد بو، چەکیان پی بو، بە دریژایی ریگا لە چەند جیگا بە بیانوی نویژکردن و پشودانەوە بو چاو هەلفستن خویان دوا خست بو، بو ئەوەی کیشەیەک لە گەل حدکا دروست بکەن. دوای گەرانەوەی وەفدەکە ئیران بریاری دا پیوەندی لە گەل یەکیتی ببری.

*

راگرتنی هاوسەنگی لە دوستایەتی دا لە گەل حدکا و بزوتنەوەی کورد لە لایەک و، دوستایەتی لە گەل حکومەتی ئیران لە لایەکی تر کاریکی لە کردن نەهاتوبو. مامجەلال ئەیویست ئەم هاوسەنگیە رابگری، بەلام زوری نەئەخایاند ئاشکرا ئەبو. هەردولا ئیران و حدکا ئەکەوتنە تەنگ هەلچنین بە یەکیتی. راستیەکەی زور جار پیشمەرگەی کوردستانی عیراق لە شەرەکان دا بەشدار ئەبون بی ئەوەی پیمان وترا بی، خویان لە بەر سەختی هەلومەرجی کوردستانی عیراق بو پشودان و گەران و سوران ئەچونە دیوی ئیران و، تیکەلاوی ئەو شەرانە ئەبون. لە لایەکەوە سەرکردایەتی حدکا و ریکخراوەکانی تر مەمنونیان نەبون، لە لایەکی ترەوە گیروگرفتی سیاسی گەورەیان بو یەکیتی لە لای حکومەتی ئیران دروست ئەکرد.
دوای هەلاتنی بەنی صەدر، ئیران لە پر پەلاماری هەمو ئەوانەی دا کە بە ئەندام و پیشمەرگەی یەکیتی ناسرا بون و گرتنی. موحسین عەلی ئەکبەر، عەبدورزاق میرزا، عەلی حەویز، لاوکو و تاقمی پیشمەرگەی بریندار کە لە نەخوشخانەکان دا بون و، هەندی پیشمەرگە کە بو کرینی کەلوپەل لە بازاری شارەکانی ئیران بون. ئەمانەی گیرا بون هەمویان ئیجازەی رەسمیی دەولەتیان پی بو. موحسین نوینەری یەکیتی بو لای ئیران و، عەبدورزاق لە سەفارەتی سوری کاری ئەکرد. ئەم کارە لە کاری حکومەت نەئەچو. بەلام ئەوان سەفارەتی ئەمریکایان داگیر و، هەمو دیپلومات و فەرمانبەرەکانیان گرت بو. شتی وا چاوەروان نەکراو نەبو. چەند مانگی لە زیندان دا مانەوە، حکومەتی سوری لە سەری هەلدانی، ئینجا بەر دران. بەلام پیوەندی نیوان یەکیتی و ئیران پچرا.

*

## پەشێوانی هەلومەرجی کوردستان

هاوینی سالی ۱۹۸۱ هەلومەرجی کوردستان ئالوزا بو. جەبهەی عێراق زورتر خەریکی شەری ئێران بو. دەسەلاتی بە سەر زوری دیهاتەکانی کوردستان دا نەما بو. لاوانی کورد بە کومەل لە دەس سەربازی هەلئەهاتن و، رویان ئەکردە لادێکان. دەیان هەزار سەربازی هەلاتو لە دیهاتەکان دا کو بوبونەوە و، هەر حیزبە هەولی ئەدا زورترین ژمارەیان بە لای خوی دا رابکیشی و، بیانهێنێتە ریزی پێشمەرگەکانیەوە. هەر حیزبە بەشی خوی گەنجی راکێشا بو، هێزی چەکداری لێ دروست کرد بون. جود و جوقد، هیچکامیان کێشەی یەکخستنی میلیشیای حیزبەکانیان چارسەر نەکرد بو، هەر حیزبە هەولی ئەدا خوی زورترین ژمارەی چەکداری هەبی و، لەو ریگایەشەوە دەس بگری بە سەر مەیدانی کار و چالاکی دا.

هاوینی سالی ۱۹۸۱ پێنج هێزی چەکدار کە سەر بە پێنج حیزبی جیاواز بون، بە ناوی پێشمەرگەوە لە دیهاتەکانی کوردستان دا، بە تایبەتی لە ناوچەکانی سلێمانی، هەولێر، گەرمیان.. دا تەراتێنیان ئەکرد. ئەگەرچی چوار لەم حیزبانە: پدک، حسک، حشع، پاسوک، لە چوارچێوەی سیاسی «جود» ا کوببونەوە، بەلام هێزەکانیان سەربەخو و لە یەکتری جیاواز بون، هەریەکەیان سەرکردایەتی و، فەرماندەیەتی تایبەتی خویان هەبو، کەسیان گوی ی لە فەرمان و ئاموژگاری ئەوی تریان نەئەگرت.

چەکداری حیزبەکان، بە ئارەزوی خویان و بی هیچ لێپرسینەوەیەک، خەلکیان ئەگرت و ئەکوشت و بەر ئەدا، پارەیان ئەسەند و، پارمەتیان کز ئەکردەوە، سەرانەیان وەرئەگرت. بێگاریان بە دانیشتوانی دیهاتەکان ئەکرد و، زور جار لێیان ئەدان و سوکایەتیان پی ئەکردن. دانیشتوانی دیهات خەریک بو پێشمەرگەیان لە بەر چاو ئەکەوت و، لە شورش ئەبێزران. سەرکردایەتی هیچ لایەکیشیان مشوری چاکردنی ئەم بەرەللایی و بی سەروبەرییەی نەئەخوارد و، چاوپوشی لە خراپەکانی چەکدارەکانی ئەکرد.

ئیمە لە سەرکردایەتی یەکیەتی دا زور جار باسی ئەم هەلومەرجە نالەبارەمان ئەکرد. یەکی لە ژمارەکانی «ژیانی رێکخراوەیی» کومەلەمان بو جوری رەفتار لە گەل خەلک تەرخان کرد و، هەولمان ئەدا کادر و پێشمەرگەکانمان بە جوری پەروەردە بکەین، کە رەفتاریان جیاواز بی لە هی حیزبەکانی تر، بە تایبەتی چونکە تا ئەوسایش یەکیەتی هێزی هەرە گەورە و دەسەلاتدار بو. بریارمان دا لە ئاواییەکانی ناوچەکانی ژیر دەسەلاتی شورش دا خەلک هان بدەین بە هەلبژاردنی ئازاد چەند کەسی لە خویان بو «ئەنجومەنی ئاوایی» هەلبژیرن. ئەنجومەنی ئاوایی، تا بوی بکری خوی کێشەکانی ناو ئاوایی چارسەر بکا، ئەوان پێشوازی لە پێشمەرگە بکەن و، بو حەوانەوە و خواردن لە مالەکان دا دایانبمەزرینن و، ئەگەر کاریکیان هەبو بە خەلکی ئاوایی لە ریگای ئەوانەوە جێبەجی ی بکەن. لامان وابو ئیتر کاتی ئەوە هاتوە خەلک کەمی کەلک لە کز بونی دەسەلاتی بەعس وەربگری بو حوکمرانی خوی و، لابەلا کردنی کێشە ناوخوییەکانیان و، ریبرین لە پێشمەرگە کە دەس وەربدەنە کاروباری ناوخو و ژیانی تایبەتیانەوە.

لە چەند جێگا دەسمان کرد بە جێبەجی کردنی ئەم تەجروبەیە و، ئەنجامی باش و سەرکەوتوی هەبو، خەلک بە گەرمی پێشوازیان کرد و، بە چاکی جێبەجیان کرد.

لایەنەکانی جود، هەریەکەیان، بە جوری هەلویستی لەم تەجروبەیە گرت:

- حسک که له ناو لایەنەکانی جودا له هەمویان زیاتر له سەر ئەرزی کوردستان چەکداری هەبو، هەر له سەرەتاوە کەوتە دوژمنایەتی ئەنجومەنی ئاوایی. ئەوان نەک هەر ریزی ئەندامانی ئەنجومەنەکەیان نەئەگرت، بەلکو ئەنجومەنەکانیان هەلئەوەشاندنەوە و، له ئەندامەکانیان ئەدان و، له چەند جیگا بو ئەوەی سوکیان بکەن له حەوزی مزگەوتەکانیان هەل ئەکیشان و، چەکیان ئەکردن و، جەزایان لی ئەسەندن.

حسک بو ئەوەی بو خەلکی دەربخا که یەکیتی تەنیا هیزی دەسەلاتدار و دەسرویشتوی کوردستان نیه، له هەر جیبەیەکی بوی بکرایە بریارەکانی یەکیتی هەلئەوەشاندەوە، بو غونە: که یەکیتی راوی کەو و کیوی قەدەغه کرد، ئەو راوی ئازاد کرد و هانی خەلکی ئەدا گوی له قسەی کادرەکانی یەکیتی نەگرن و، راو بکەن. که یەکیتی داربرین و خەلوز کردنی قەدەغه کرد، ئەو هانی خەلکی ئەدا گوی له قسەی کادرەکانی یەکیتی نەگرن، دار ببرن و خەلوز بکەن.

- حشع که هیزی چەکداری له حسک کەمتر و، له ناو دیهاتەکان دا کەمتر گوییان لی ئەگیرا، لەو کوبونەوە دوقولیانەی له نیوان سەرکردایەتی یەکیتی و ئەوان دا ئەکرا، وایان دەرئەخست که ئەوان وەکو سەرەتا دژی ئەم تەجروبەیە نین، بەلام یەکیتی بو بەهیزکردنی خوی بە تەنیا کردویەتی بی ئەوەی حساب بو لایەنەکانی تر بکا. وایان پیشنیار ئەکرد له هەمو ئاواییەک دا ئەنجومەن پیک بی له نوینەرانی حیزبەکان: یەکیتی و، لایەنەکانی جود. چەندی بومان رون ئەکردنەوە که «ئەنجومەنی ئاوایی» شتیکی جیاوازە له «حکومەتی ئیئتیلافی» و «بەرەی یەککگرتوی حیزبەکان» و، ئەمە بو کەمکردنەوەی دەستیوەردانی چەکدار و کادری حیزبەکانە، لەوانه هی یەکیتی، له کاروباری ناوخوی دیهاتەکان، نەیانئەویست بیسەلمینن. سور بون له سەر هەلویستی خویان، ئەیانویست لەو ریگایەوه جیگا پییەک له ناو دانیشتوانی دیهاتەکان دا بو خویان بکەنەوە، له کاتیک دا له زورایەتی دیهاتی کوردستان دا ئەندام یا دوستی حشعی تی دا نەبو. ئەمەیان کرد بو بە بیانو ئەوانیش دانیان بە ئەنجومەنەکان دا نەئەنا و، ریزیان نەئەگرتن.

- پارتی لەو کاتەدا هیزیان له ناو کوردستانی عیراق دا نەبو، بە تایبەتی لەو ناوچانەدا که یەکیتی لی بو، هەندی مەفرەزەیان جاروبار ئەگەیشتنە شارەزور، هەورامان، روستی.. پاش ماوەیەک ئەگەرانەوە بو ئیران.

- پاسوک، هیزیکی چەکدار یا سیاسی ئەوتوی نەبو، بتوانی کار له رەوتی رووداوەکان بکا، بەلام ئەمیش وەکو حسیک هەلویستی دوژمنانە بو له ئەنجومەنی ئاوایی.

*

یەکەمین شەری جود - یەکیتی

هاوزەمان له گەل گرژبونی پەیوەندی ئیران - یەکیتی دا، تا ئەهات گرژی و ئالوزان له پیوەندی نیوان چەکدارەکانی جود - یەکیتی دا له سەرانسەری کوردستان دا زیادی ئەکرد. چوار براکەی جود له ناو خویان دا ناکوک بون، بگرە له سەر هیچ شتی ریک نەبون یەک مسئلە نەبی، ئەویش: بەرەنگاریی مەترسی یەکیتی، بو.

لەو ماوەیه دا زیاتر له ۱۰ جار پیکادانی خویناوی پچوک و گەورە له نیوان لایەنەکانی جود و، هیزەکانی یەکیتی دا روی دابو. زوریشی له سەر چەک فراندن له ناو یەکیتیەوە بو لای ئەوان و بە پیچەوانەوە، پارە وەرگرتن، رەفتار له گەل ئەنجومەنی

ئاوایی، خەڵک گرتن، بە واتەیەکی تر حوکمڕانی ناوچەکان. لە ناو ئەم ڕوداوانەدا هەندێکیان مەترسی دار بون.

*

## پاسۆک و یەکێتی

پاش نیوەڕۆیەک، هەوا خۆش و، کۆمەڵێکی تێکەڵاو لە کوردی هەر چوار پارچەکە: محەممەدی موهتەدی لە ئێران، یوسف زۆزانی لە سوریا، خەجۆ و چەند کەسێکی تری کوردستانی تورکیا، لە سەربانی یەکێ لە خانوەکانی ناوزەنگ لە بەر هەتاو دانیشت بوین دەمەتەقێ مان ئەکرد. ئازاد مستەفا پەیدا بو، لای دایە لای ئێمە. بە خێرهاتنمان کرد و، لە گەڵ دانیشتوەکان بە یەکترم ناساندن. بە گاڵتەوەپێمان وت: «هەر ئێوە کوردستانیی نین، ئەبێنی کوردی چوار پارچە کۆبوینەتەوە؟»

دانیشتوەکان شتێکی ئەوتۆیان لە سەر پاسۆک نەئەزانی. کەوتنە پرسیاری جۆراوجۆر لە ئازاد. یەکێ لەو پرسیارانەی محەممەدی موهتەدی کردی ئەوە بو: «لە ناو ڕێکخراوەکانی کوردستانی عیراق دا خۆتان لە کام ڕێکخراو لە هەمویان بە نزیکتر ئەزانن؟» ئازاد یەکسەر وتی: «کۆمەڵە!»

*

ڕۆژی ٢٢ ی حوزەیرانی ٨١ چەند پێشمەرگەیەکی هەرێمی ٣ ی شارباژێر لە گوندی مامەخەلان لە گەڵ چەند پێشمەرگەیەکی پاسۆک دەمیان لە یەک ئەگیری و بە تفەنگ لە یەکتری ڕاسا بون. لە پاسوک دو کەس: فارس و بیستون و، لە یەکێتی عومەری حاجی عەبدوڵلای گەنکی، کە فەرماندەی مەفرەزە بو لە کەرتی ١ ی هەرێمی ٣ ئەکوژرێن.

بۆ ڕۆژی دوایی تاقمی پێشمەرگەی تێکەڵاوی یەکێتی، کە هەندێکیان تازە لە ناو شاری سلێمانی گەڕا بونەوە و، هەندێکیان چو بون بۆ بەری کردنەوەی کەسوکاریان بۆ سلێمانی، بە سواری ئۆتۆمبیلێک لە سیتەکەوە ئەچن بۆ گەڕەدێ، بێ ئەوەی ئاگایان لە ڕوداوەکەی ڕۆژی ڕابوردو بێ. تومەز هەمو چەکدارەکانی پاسۆک لە گەڕەدێ کۆبونەتەوە. پێشمەرگەکانی یەکێتی ئەچنە ناو پێشمەرگەکانی پاسۆکەوە. ئەوانەی پاسۆک ئەیانەوێ چەکیان بکەن و، ئەیاندەنە بەر دەسرێژ. هەندێکیان ئەکوژرێن و، هەندێکیان بریندار ئەبن. ئەچنە سەر بریندارەکان ئەوانیش تەواو ئەکەن.

لەم ڕوداوەدا شەش کەس کوژران لەوانە: جەمال عەزیز فەرماندەی کەرتی ٥ ی هەرێمی ٣ ی شارباژێر. وستا فایەقی بەرگدرو. وستا ڕەحیمی بەنا. هەرسێکیان ئەندامی کۆمەڵە و جەمال و فایەق ئەندامی یەکەم کونفرەنس بون. جەمال مامۆستا و باوکی چەند منالی بو، لە کارساتی هەکاری دا لە سەر داوای ڕێکخستن هات بوە دەرەوە، بەشداری دەورەی کادران بو لە قەندیل. تا ئەو کاتە پاسۆک هێشتا شەش کەسی لە هێزەکانی عیراق نەکوشت بو، بە هەمو ڕێکخراوەکەیشیان لە شەری هێزەکانی عیراق دا هێشتا یەک کوژراوی نەبو.

بۆ ئێمە ئەم ڕوداوە جێگای سەرسورمان بو. چونکە هیچ کارێکی دوژمنانەمان بەرامبەر نەکرد بون، بگرە بە ڕێزێکی تایبەتیەوە ڕەفتارمان لە گەڵ کرد بون.

*

له سەرەتادا پاسۆک له شاخ مەفرەزەیەک و، جەلالی حاجی حسین مسئولیان بو.
نەوانی له گەل یەکیتی خۆش بو. پروگرام و پیرەوی ناوخۆی حیزبەکەیان و هەمو
بلاوکراوەکانیان نیمە بۆ مان چاپ کرد بون و، بۆ ژیانی خۆیان و پیشمەرگەکانیان و چەک
و تفاقی شەر وەکو پیشمەرگەکانی یەکیتی رەفتارمان له گەل ئەکردن. له کاتی روداوەکانی
هەکاری دا جەلال له گەل ئیمە له قەندیل بو، دوایی کرا به فەرماندەی پیشمەرگەکانی
پینجوین. ئەگەرچی ئەمە نارەزایی له ناو زۆری پیشمەرگەکانی ناوچەکەدا دروست کرد، بە
تایبەتی لای حەمەصدیق خانی میشیاو کە تازە هات بوە شاخ و، له سەر ئەمە وازی له
یەکیتی هینا. له گەل ئەوەش دا بۆ ئەوەی جەلال وەکو تەجروبەیەکی تازەی دانانی
فەرماندەی پیشمەرگە له حیزبیکی تر جیگیر بی، گوی نەدرایە گلەییەکانی حەمە صدیق
خان. له جیابونەوەی رەسول مامەند و د. مەحمودا جەلال ماوەیەک له گەلیان رۆیشت، بەلام
له گەل ئەوان تیکەلاو نەبو، زۆر زو خۆی لی جیا کردنەوە.
دوای عەفوەکەی ۱۹۷۸ ئازاد مستەفا له زیندان دەرچو. ئەویش هاتە شاخ. ئەو
کاتە له شینی بارەگایەکی پچوکیان هەبو. دوای ئەویش بە ماوەیەک، بە تایبەتی له گەل
دەس پی کردنی شەری عیراق - ئیران دا، چەند ئەفسەریکی گەنج هاتنە دەری. پاسۆک له
ناوخۆیان دا کیشەیان هەبو. حیزبەکەیان هیشتا کەسی یەکەمی نەبو هەمویان گوی ی لی
بگرن. هەولیکی زۆریان له گەل د. جەمال نەبەز دابو، ببیتە سکرتیریان قوبولی نەکرد بو.
هەروەها هەولیکی زۆریان له گەل فەتاح ئاغا دابو، ئەویش بە دەنگیانەوە نەهات بو. جەلال
له گەل ئازاد و هەندیکی کەیان ناکۆک بو. هەلویستیکی یەکگرتویان نەبو له ناکۆکی
یەکیتی و پارتی. ناوچەی چالاکی و جموجولیان له ژیر دەسەلاتی یەکیتی دا بو، بەلام
هەندیکیان بە دل له گەل بنەمالەی بارزانی بون. ئیمە بەم کەین و بەینەمان نەئەزانی. تا
جاریک جەلال هات بۆ خواحافیزی لیمان. له پاسۆک تۆرا بو. ئەو کاتە هۆکانی بۆ باس
نەکردین. هەرئەوەندەی درکاند وتی: «من له گەل ئەو برادەرانە ئیتر ناتوانم کار بکەم ئەرۆم
بۆ دەرەوە دائەنیشم» چو بۆ شام و لەوی دانیشت وازی له پاسۆک هینا.

*
چەند جاریک و له چەند دانیشتنیک دا ئیمە پیشنیارمان بۆ کردن کە هەندی له
ئەفسەرەکانیان له باتی ئەوەی کاتی خۆیان بە مەفرەزەیەکی چەند کەسیەوە بە فیرۆ بە سەر
بەرن، بین بن بە فەرماندەی هەریمەکانی یەکیتی، له سەر بیروباوەری پاسۆک بیننەوە و له
ناو هەریمەکەش دا چەند پیشمەرگەی تریان پی رائەکیشری بیکەن. لەو کاتەدا کۆمەلە،
بزوتنەوە، خەتی گشتی له ناو پیشمەرگەکانی یەکیتی دا بە تیکەلاوی کاریان ئەکرد،
ئەیانتوانی ئەوانیش بن بە لایەنی چوارەم. ئەمانویست له دو لاوە کەلکیان لی وەربگرین:
یەکیکیان، وەکو تەجروبەی پیکەوە کارکردنی بیروباوەری سیاسی جیاجیا له ناو یەک
هیزی چەکداری یەکگرتودا. دوەمیان، بۆ گەشە پی دانی هیزەکانی پیشمەرگە. ئەمانە
گەلیکی کوردپەروەر و، دەرچوی کوللیەی عەسکەری بون و، له شەرەکانی ٧٤ دا بەشدار
بون. بەو پیبە شارەزای کاروباری عەسکەری و پیشمەرگایەتی بون. ئەوان گالتەیان بەم
قسانە ئەهات.

*
دوای روداوەکەی گەرەدی هیزەکەی پاسوک کشایەوە ناوچەیەکی دوری سنوری

ئیران. له کوردستانی عیراق داپران. ئازاد کەوتە نوسینی بەیان و وتار. لە بواری موهاتەراتی سیاسی دا، زۆری هەمو ئەوانەی پێش خۆی دا، هەژاری موکریانی بە تۆزی پێ یا نەنەگەیشت.

*

## حسک و یەکێتی

مەلا بەختیار چو بو بۆ ناوچەکانی دۆلی جافەتی بۆ گەڕان و بە سەر کردنەوەی پێشمەرگە. جەمال فەرماندەی هەرێمی ٤ ی یەکێتی و، شێرکۆی شێخ عەلیش فەرماندەی پێشمەرگەکانی حسک بو لە هەمان هەرێم. شێرکۆ لە شێخەکانی سەرگەڵو بو.

هەواڵمان بۆ هات کە رۆژی ٢٣ ی تابی ٨١ لە بنکەی حسک لە کانیە رەشەی نزیک گوندی سیکانیان لە دۆڵی جافەتی شەڕێکی قورس روی داوە. لە حسک ٦ کەس کوژراوە لەوانە: شێرکۆ و بیستونی برای و ٥ یش بریندار و، لە یەکێتی ٧ کوژراوە لەوانە: جەمالی عەلی باپیر و سمایل گەورەدێی و ٧ یش بریندار بوە.

جەمال وەرزشکار بو. لە راکردنی ١٠٠ مەتری دا یەکەمی سلیمانی بو لە سەرەتای شۆرشی تەیلول دا چوە ریزی پێشمەرگایەتیەوە. ماوەیەکی درێژ لە گەڵ عەریف مەجید شوان پێشمەرگە بو. پاشان چو بۆ هەمەدان و لە گەڵ ئەوان گەڕایەوە. ساڵی ٦٩ لە دەورەیەکی تایبەتی دا بو بە (مفوضی شرطه) و، بو بە یەکی لە یاریکەرەکانی تیپی پۆلیس. لە ٧٤ دا چوەوە ریزی پێشمەرگایەتی و کرایە سەرلق. جەمال هاوڕێ ی کۆمەڵە بو. لە دەسپێکردنەوەی شۆرشی حوزەیران دا چوە ناوچەی جافەتی و، یەکی لە مەفرەزە سەرەتاییەکانی پێشمەرگەی پێک هێنا. دوایی کرایە فەرماندەی کەرت و ئینجا فەرماندەی هەرێم. هەتا پلی ی لە رویشتن دا گورجوگۆل و بە توانا بو. لە شەردا ئازا و وریا بو، یەکی بو لەوانەی لە هەکاری گەڕایەوە.

بەم بۆنەیەوە حسک بەیانێکی دەرکرد هێرشێکی توندی کرد بوە سەر یەکێتی و، تاوانی هەڵگیرسانی شەڕی براکوژی و، غەدر و خیانەتی داپوە پاڵی، یەکێتی یش بەیانێکی دەرکرد هێرشێکی توندی کرد بوە سەر حسک.

شێرکۆ و بیستونی برای بە دەستی یەکێتی کوژران، ئاراسی برایشی، کە پێشمەرگەی یەکێتی بو، لە کارەساتی هەکاری دا بە دەستی پارتی کوژرا بو، جەمالیش بە دەستی شێرزادی برای شێرکۆ کوژرا. ئەمە قوڵایی پڕ لە ناسۆری شەڕی ناوخۆی دەرئەخست.

رووداوەکەیان بە دو جۆری جیاواز ئەگێرایەوە:

– ئەوانەی حسک ئەیانوت: جەمال بە فێتی مەلا بەختیار بە ناوی میوانیەوە چوە بۆ سەردانی شێرکۆ بۆ ئەوەی لە پەنای دۆستایەتی دا بە فێڵ بیکوژێ.

– مەلا بەختیار ئەمەی ئینکار ئەکرد، ئەیوت: جەمال چوە بۆ سەردانی شێرکۆ بۆ ئەوەی هەندێ کێشەی نێوان حسک و یەکێتی بە لادا بخەن و، لەوێ بوە بە شەڕیان و ئەو کارەساتە قەوماوە.

جەمال پێشمەرگەیەکی وریا بو، ئەگەر لە کوشتنی شێرکۆ بوایە پێویستی بە فێڵ و میوانداری نەبو، ئەیتوانی بە جۆرێکی وەها شێرکۆ بکوژێ کە خۆی تێ دا نەکوژرێ. ئیتیهامەکەی حسک و ئینکارەکەی مەلا بەختیار هەر کامێکیان راست بێ، ئەم رووداوە

تالەبانی بو بە هۆی شەڕێکی خوێناوی نێقلیمگیر لە نێوان حسک - یەکێتی دا و، دوایتر لە نێوان هەمو لایەنەکانی جود - یەکێتی دا.

پێشمەرگەکانی هەرێمەکە دوای ئەم ڕوداوە کە فەرماندەکەیان و، هەندێ لە کادرەکانی هەرێمەکەیانی تێ دا کوژرا بو، وە شەڕێکی خوێناوییان لە گەڵ حسک دا بۆ بە جێ مابو، خەمبار و سەر لێ شێواو بون، مەلا بەختیاریش بە جێ ی هێشت بون، گەڕابوەوە بارەگای سەرکردایەتی.

*

## حشع و یەکێتی

ئامێر مەفرەزەیەکی جاش بە ناوی عەبدوللا ماوێلی، هات بوە ڕیزی حشع. حشع وەری گرت و لە ناو هێزەکانی خۆی دا لە ناوچەی دەرگەلە کاری پێ سپارد. ئەم کارە بو بە هوی تورە بونی پێشمەرگەکانی بالەکایەتی و، هەڕەشە لێ کردنی، گلەیی کەیشتەوە سەرکردایەتی کە حشع عەولا ماوێلی وەرگرتوە. عەولا ماوێلی، پێشتر پێشمەرگە بوبو، لە کاتێک دا لە گەڵ تاقمی پێشمەرگەی یەکێتی پێکەوە ئەبن بۆ خۆپاراستن و حەوانە، پێشمەرگەکانی یەکێتی لە کاتی نوستن دا گرت بو. دوای چەککردن و پەلبەستن تەسلیمی عێراقی کرد بون. پاش ئازار و ئەشکەنجەیەکی زور حوکمی ئیعدام دران و لە موسل هەڵیانواسین. ئەم پێشمەرگە گیراوانە لە «ڕەدهەی ئیعدام» ی زیندانی موسڵەوە، پێش ئەوەی لە سێدارە بدرێن، نامەیەکیان بۆ مامجەلال و سەرکردایەتی نوسی بو. نامەکەمان بە لێدوانێکی مامجەلالەوە لە ژمارەی چوارەمی مارتی ١٩٧٩ ی «هەوالنامە» دا بەمجۆرە بلاو کرد بوەوە:

سێ ئەستێرەی تری ئاسمانی خەباتمان رادەکشێن

وا لە خوارەوە نامەکەی هەڤالانی قارەمان: وەستا ڕەسولی خەبات و کاک حسەینی شێوەلوکی و کاک ڕەقیبی ڕوستایی، کوتومت وەک خۆی بلاو دەکەینەوە کە نمونەیەکی گیانی فیداکاری و خۆبەخت کردن لە پێناوی کورد و کوردستان و ی ن ک دا خۆی تێدا دەنوێنێت. منیش بەڵێن ئەدەم کە لە ژمارەی داهاتودا ئاواتەکەیان بهێنمە دی و وتارێکی شایستەیان لە سەر بنوسم. هەروەک بە ناوی ی ن ک و هێزی پێشمەرگەی کوردستانەوە بەڵێن بۆ ئەو ٣ قارەمانە و سەدان قارەمانی شەهیدی تری ئەکەینەوە کە تا سەرکەوتن یا مردن بۆ تۆلەسەندنیان، بۆ هێنانەدی ئامانج و داخوازی یەکانی کۆمەلانی خەلکەکەیان کە گیانی پاکیان لە پێناودا بەخت کردوە، درێژە بە خەباتی پیرۆز بدەین و ئالا شەکاوەکەی شۆرش و ی ن ک هەر لە سەر سەر ڕاگرین.

جەلال تالەبانی

*

بە ناوی خوای گەورە و میهرەبان

یەکێتی نیشتمانی کوردستان

بۆ هەڤالانی سەرکردایەتی

سلاوێکی شۆرشگێرانەی گەرم

لەو کاتەی کە لە ژێر پەتی سێدارە ڕاوەستاوین چاوەڕوانی مردن ئەکەین لە پێناوی مافی گەلی کوردمان، ئەو گەلەی کاروانی خەباتی سورە بە خوێنی هەزاران شەهیدی قارەمان وە ئێمەش شانازی ئەکەین بەو ڕێگەیەی کە لە پێناوی شەهید بوین، بەلام ئێمە داوا

لە ئێوە و هەمو پ م ئەکەین کەوا هەر کاتێک گەلی کورد گەیشتە ئاواتی خۆی لە بیرمان نەکەن وە منال و دایک و باوکی هیچ شەهیدێک لە بیر نەکەن وە خوێنی ئێمە ئەکەوێتە سەرشانی ئێوە بۆ تولە سەندن لەو دوژمنانەی وەک سمکۆی حاجی خورشید، محەمەد ئەمین رشاشچی، عەبدوللا ماوێلی، ئەنوەر شێخ ، مستەفا روستایی. پەیوەستە ئێوە تولەمان بسێنن. تکایە دەستی یارمەتی بۆ کەسوکارمان درێژ کەن. تکا ئەکەم مام جەلال مەقالەیەکمان دەربارە بنوسی بۆ ئەوەی کەسوکارمان زیاتر شانازی بە خۆیانەوە بکەن.

ئیتر بۆ پێشەوە لە ژێر ئالای یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان.

سەرکەوتن بۆ کورد و کوردستان. مردن و سەرشۆری بۆ دوژمنانی گەلەکەمان

شەهیدان:

رەسول عومەر خەیات حسین عومەر شێوەلوکی رەقیب عوسمان روستایی

رۆژی ١٩٧٩/٢/٢.

*

ئەو کاتەی ئەم نامەیەمان بلاو کردەوە، عەولا ماوێلی هێشتا ئامیر «مەفرەزە خاصە» ی جاش بو. عەولا ماوێلی دوای ئەوەی بوبو بە جاش چەند پێشمەرگەی تریشی راو کرد بو، وەکو ئەیانوت: هەندی پێشمەرگەی گیراوی لە هالیکوپتەرەوە فری دابوە خواری.

هاتنی عەولا بۆ لای حشع و، سورانەوەی بە بەرچاوی پێشمەرگەکانی بالەکایەتی و، هاوری و ناسیاوەکانی وەستا رەسول و حسین و رەقیب، تورە بونێکی زوری لە ناودا دروست کرد بون. ئەم گلەییە گەیشتە سەرکردایەتی و، هەرەشەیان کرد بو کە ئەگەر لەو ناوچەیە دوری نەخەنەوە بۆ ناوچەیەکی تر، لە تولەی خوێنی هاوریکانیان دا، ئەیکوژن.

بۆ ئەوەی ئەم گرژییە برەوێتەوە، مامجەلال داوای لە حشع کرد بو لەو ناوچەیە دوری بخەنەوە و بیگوێزنەوە بۆ شوێنێکی تر. حشع بانگیان کرد بۆ لای خۆیان بۆ ناوزەنگ، بەلام دوای چەند روژی ریگایان دا بو بروانەوە بۆ بارەگاکەی خۆیان لە وەرتێ. رۆژی ٤ ی ئەیلول پێشمەرگەکانی یەکێتی لە دەرگەلە توشی ئەبن. کەوت بونە دوای، خۆی لە مالێک دا قایم کرد بو، دەوری مالەکەیان دابو، داوایان لی کرد بو بیتە دەرەوە. ترسا بو بیکوژن خۆی لە مالەکەدا عاسی کرد بو. بوبو بە تەقە. ئەم بەزمە ماوەیەکی خایاند بو سەرەنجام کوشت بویان.

لێپرسراوەکانی حشع لە ناوچەکەدا لەمە زور تورە ئەبن. یەکێتی کی بە و ئەوان کین، تا بتوانن دەستدرێژیان بکەنە سەر و، هاوری ی حیزب بکوژن. ئەوانیش بیریان لە تولە کرد بوەوە، بەلام نەک لەوانەی کە ئەو کارەیان ئەنجام دابو، بەلکو وەکو خێلە دواکەوتوەکانی کورد، لە هەر یەکێتییەکی کە بەر دەستیان بکەوی.

روژێک دوای ئەم روداوە، فەرماندەی بەتالیونێکیان بە ناوی عەلی حەمە عەزیز، کە بە عەلی کلاشینکوف ناسرا بو، لە گوندی فەقێیان ئەبی، چەند پێشمەرگەیەکی یەکێتی بش کە خەلکی ناوچەکە بون لە هەمان گوند ئەبن. بۆ گفتوگۆ ئەنێری بە دویان. ئەوانیش: وەسمان بەگی گەرموانی، فەرماندەی کەرت، لە گەل کادریک بە ناوی حەمە لاو و چوار پێشمەرگەی کە، بی سل کردنەوە ئەچن بۆ مزگەوتەکە کە عەلی لی ئەبی. عەلی لە ناو مزگەوتەکەدا دەسبەجی هەر شەشی کوشت بون.

وسمان بەگ، جوتیارێکی هەژاری خەڵکی گەرموان و، پیاوێکی بەڕێزی ناوچەکە بو. لە شۆڕشی ئەیلول دا پێشمەرگە بو. لەم شۆڕشەیش دا هەر لە سەرەتاوە دەستی دابوەوە چەک و بوبو بە پێشمەرگە. کە یەکەم تاقمی حشع گەیشتە ناوزەنگ، ئەوسا کە ئەم بارەگایەکی پچوکی لە کەورگێک دا بە وشکە کەڵەک لە ناوزەنگ دروست کرد بو، سەرکردایەتی یەکێتی ئەشکەوتەکەیان پێ چۆڵ کرد بۆ ئەوەی فاتیح رەسول و مەلا ئەحمەدی بانیخێلانی و شیوعیە تازە راکردوەکان وەکو نوایەکی زستانە بچنە ناوی.

لەو کاتەدا کە وسمان بەگ کوژرا بە ئیجازە بۆ سەردانی منالەکانی چوبوەوە ناوچەکە.

ئەم دەستدرێژییە نارەوایە پێشمەرگەکانی یەکێتی لە باڵەکایەتی وروژاند. ئەوانیش کۆبونەوە چونە سەر بارەگای بەتالیونەکەی حشع لە ومرتێ. شیوعیەکان دایانە چیای کاروخ و، دامەزران. لە شاخەکە گەمارۆیان دان. حشع ئاگاداری مامجەلالیان کرد، ئەویش فەرمانی دا کە دەسبەجێ دەوری شیوعیەکان بەر بدەن و، هەر کەسە بچێتەوە جێگای پێشوی خۆی. شەڕەکە کوژابوەوە، بەڵام گڕژی ئەرموی بوەوە.

*

وەکو ئەمان بیستمەوە لە ناو حشع دا لە سەرەتاوە دو بیروڕای جیاواز هەبو بەرامبەر ناکۆکی پارتی - یەکێتی، دواییتریش لەو بەڵگانەدا کە دەس یەکێتی کەوتن، هەندێ لە مەحضەرەکانی کۆبونەوەکانیان ئەم هەواڵەیان سەلماند:

١. هەندێکیان لایان وابو کە پارتی خەتەر نیە بۆ سەر حشع، چونکە حیزبێکی خێڵەکی ناسراوە بە کۆنەپەرستی و نۆکەرایەتی ئێران و ئیمپریالیزم، بەڵام یەکێتی خەتەرە چونکە بە ناوی مارکسیزم و پێشکەوتنخوازییەوە لاوانی کورد فریو ئەدا و، لە جەماوەری حشع ئەخوا. لە بەر ئەوە لەو ناکۆکییەکەدا چاکتر وایە لایەنی پارتی بگرن.

٢. هەندێکی تریان لایان وابو ناکۆکییەکانی نیوان لایەنەکانی جود - یەکێتی ناکۆکی نیوان باڵەکانی بزوتنەوەی نەتەوەیی بورجوازی کوردە، چەندێ بە یەکەوە خەریک بن زوورتر یەکتری لاواز ئەکەن و، هەڵوێستی حشعی پێ بەهێز ئەبێ. لە بەر ئەوە چاکتر وایە کە حشع خۆی لەو ناکۆکییانەوە نەگلێنێ و لێ بگەڕێ یەکتری بخۆن.

سەرەنجام بیروڕای ئەوانەی یەکەم سەری گرت کە بە لای پارتی دا دابشکێن، وەکو ئەبانوت: لە سەرەتاوە مەلا ئەحمەدی بانیخێلانی لەم باوەڕەدا بو، دواتریش کەریم ئەحمەد چوە سەر باوەڕەکەی ئەو.

*

کە پێشمەرگەکانی حشع بارەگای بەتالیونەکەیان چۆڵ کرد بو، پێشمەرگەکانی یەکێتی هەندێ کاغەز و دەفتەریان لە ناو بارەگاکە دەرهێنابو دواییتر بۆ منیان هێنا. یەکێکیان دەفتەرێک بو بە عەرەبی ناوی پێشمەرگەکانی بەتالیونەکە و، ساڵ و شوێنی لە دایکبون و پلەی پێشمەرگایەتییان و هەندێ زانیاری لەو بابەتانەی تێ دا نوسرا بو. ئەوەی سەرنجی راکێشام ئەوە بو: لە تەنیشت ناوی زۆربیانەوە لە خانەیەک دا نوسرا بو «متعهد». من وامزانی مەبەستیان لە «متعهد» قونتەراتچی و «مقاول» ە. سەرم سوڕما بو لەوەی ئەو هەمو قونتەراتچییە لە حشع کۆ بوبێتەوە. لە چەند کەسێکم پرسی. یەکێ لە هاورێکانم شارەزا بو وتی: «مەبەستیان لە - متعهد ئەوەیە کە پاکانەی بۆ بەعس نوسیوە و بەڵێنی

پی داون ریزی حشع به جی بهیلی!»

*

لەشکرکیشیەکەی سەید کاکە

سەید کاکە زۆر جار لای سەرکردایەتی حیزبەکەی خۆی هەلکیشا بو کە ئەگەر ئەوان لی ی بگەرین یەکیتی لە کوردستان دا تەواو ئەکا. ئەوانیش باوەریان پی کرد بو. کە روداوەکەی شیرکۆ بو، فەرمانیان دا بە سەید کاکە، بچیتە سەر هیزەکانی یەکیتی. سەید کاکە، کە خوی هەمیشە بە دوای بیانودا ئەگەرا بۆ پەلاماردانی یەکیتی، هەلی بۆ هەلکەوت. لەو کاتەدا لە دوورویەری وەرتی و مەلەکان بو. کەوتە کوکردنەوەی پیشمەرگەکانی حسک. لە قسەکانی دا کە بۆ دانیشتوانی دیهاتەکانی کرد بو، وت بوی: «ئیمە چوار حیزبین و ئەوان تەنیا یەک حیزبن. بریارمان داوە جاشەکانی شەستوشەش بکەینەوە بە تەویلەکانی یەکرەجۆدا!»

سەید کاکە رۆژی ۲۳ ی ئابی ۸۱ لە خوشناوەتیەوە کەوتە کیومال بە دوای پیشمەرگە و کادرەکانی یەکیتی دا. هەر پیشمەرگەیەکی بەر دەس کەوت چەکی کرد و، هەر تاقمیکی بینی چوە سەریان. لە چیوە و دولی نازەنین و دۆلی سماقولی زیاتر لە ٥٠ کادر و پیشمەرگەی بە تاک و بە کۆمەل چەک کرد و هەندیکی کوشت و هەندیکی زامار کرد.

*

بۆلی و کۆمەلە

رۆژی ۲ ی ئەیلول سەید کاکە دەوری مەفرەزەیەکی یەکیتی گرت لە گوندی میوژەی بناری کوسرەت. پیشمەرگەیەکی کوشت و دوانی بریندار کرد. یەکیکیان فەقی بایزی لیپرسراوی مەفرەزەکە بو، ئەوانی تریشی گرت. یەکی لە گیراوەکان ئەنوەر بۆلی بو. سەید کاکە لی ی پرسی بو سەر بە چ ریکخستنیکە وت بوی: «کۆمەلە». سەید کاکە بە گۆچان تی ی بەر بوبو. هەتا توانی بوی لی ی دابو. زۆریشی جنیو پی دا بو، وت بوی: «ئیوە هەمو شوانن، بۆلی و کۆمەلە کوجا مەرحەبا!». بۆلی تیرەیەکی پچوک بون لە بیتوین ئەژیان. خۆیان بە بەشی لە تاکۆ دائەنا. تاژەلدار و نیوە رەوەند بون. کاتی خۆی لە نیوان قەندیل و دەشتی کۆیەدا گەرمیان و کویستانیان کردوە.

هەرکەس ئەم قسەیەی بکردایە، نەئەبو سەید کاکە قسەی وەها بکا، چونکە ئەویش بە هەرزەکاری شوان بوە و، پلەی خویندەواری خوی و رادەی تیگەیشتنی لە هی ئەنوەر بەرزتر نەبو. لە کاتیک دا ئەم خوی بە سەرکردەی حیزبیکی سوسیالیستی ئەزانی، ئەنوەر ئەندامیکی سادەی کۆمەلە بو. بۆ بەدبەختی کورد، بە هۆی هەلومەرجی ناتاسایی جولانەوەی کوردەوە زۆر جار لە ناو هەمو حیزبەکان دا کەسانی لە بابەتی سەید کاکە ئەگەیشتنە ناوەندی بریاردانی سیاسی.

*

فەخرەدین

لە مزگەوتەکەی گوندی ناومالی دەشتی کۆیە دەوری چەند پیشمەرگەیەکی یەکیتی گرت. پیشمەرگەکان دەستیان کردوە. یەکیکیان کوژرا ناوی فەخرەدین و، دەرچوی کلیەی علومی زانکوی موسل بو. کادری ریکخراوەیی کۆمەلە بو.

*

حاجی قادری مالومه

سەید کاکە لە دۆلی جافەتی چو بۆ، سەرگەلو، هەلەدن، یاخسەمەر، چۆخماخ، مالومە.. لە چەند شوێنێ تەق و تۆقلی لە گەل پێشمەرگەکانی یەکیتی دامەزراند بو. ئازاری دۆستەکانی یەکیتی داهو. هێزەکانی یەکیتی لە وێ کە تازە فەرماندەکەیان و، چەند فەرماندەی کەرتیکیان کوژرا بو، خەمبار و سەرگەردان بون، کە بیست بویان هێزەکانی حسک هاتوتە سەریان، پاش تەقوتوقیکی کەم کشا بونەوە دۆلی سەفرە و زەروێن.

حاجی قادری مالومە کە بە ناوی: «دیگەل» توورەیان ئەکرد، یەکێ بو لە پیاوە ناسراوەکانی ناوچەکە. پیاویکی کوردپەروەر و بەریز و، تەمەنی سەرو ٦٠ سال و، لە شۆرشی ئەیلول دا ماوەیەکی درێژ پێشمەرگایەتی کرد بو. مامە عەزەی برایشی سەرەتای دەس پێکردنەوەی شۆرشی نوی پێشمەرگەی یەکیتی بو، لە هێرشی جەیش دا کوژرا بو. حاجی قادر بە خوی دا راتەپەرمو لە رووی هەمو کەسیک دا قسە بکا. هەندی مشتومری لە گەل سەید کاکە کرد بو. سەید کاکە بو شکاندنی حاجی قادر لە بەر چاوی خەلک، لە حەوزی مزگەوتەکەی مالومەی هەلکیشا بو.

*

دلشاد تۆفیق

لە گوندی شارستینی دۆلی جافەتی، کە دوا قوناغی لەشکرکیشیەکەی بو دلشاد توفیق کوژرا. دلشاد نەوەی شاعیری کوردپەروەر: حاجی باقی بەنگینە و، خوێندکاری زانکۆ بو دەستی لە خوێندن هەلگرتبو. ماوەیەک لە قەندیل و ماوەیەک لە ناوزەنگ لە گەل من پێشمەرگە بو. گەنجیکی ژیر و بیدەنگ و ئازا بو. کادری ریکخراوەیی کۆمەلە بو.

*

د. مەجید

هەر لە درێژەی ئەم لەشکرکیشیەدا رۆژی ٦ ی ئەیلول تاقمیکی تری هێزەکەی سەید کاکە جاریکی تر چونە سەر هێزیکی یەکیتی لە چیوەی سەرو پێشمەرگەیەکیان کوشت بە ناوی هاشم و دوانیشیان بریندار کرد یەکیکیان د. مەجید عەبدوللا بو. د. مەجید تازە خوێندنی پزیشکی تەواو کرد بو. هاوری ی کۆمەلە و، گەنجیکی روح سوک و روشنبیر و روخۆش بو. بو خزمەتی پێشمەرگە و خەلک لە گەل پێشمەرگەکانی دەشتی هەولیر مابوەوە. گوللەیەک لە کەللەی سەری داهو توشی بیهۆشی و شەلەلی کرد. هاوریکانی بە بریندارێ دەربازیان کرد بو. ماوەیەک لە چیا و ماوەیەک لە گوندی وەری شارد بویانەوە. پاشان بو تەداوی نیردرا بو سوید. بەلام هەرگیز چاک نەبوەوە و ئیتر نەیتوانی پزیشکی بکا.

*

هێزەکەی سەید کاکە زورتر نەبو لە هێزەکانی یەکیتی، بەلام هێزەکانی یەکیتی وەکو جاران بە بێ ترسی دەستدرێژی حسک بە تاقمی پچوک و لە یەک دابراو بە ناوچەکانی چالاکی خۆیان دا ئەسورانەوە. سەرکردایەتی یەکیتی هیچ جورە بریاریکی نەبو بو شەری حسک، حشع و پاسوک. هەر لە بەر ئەوە ئاگاداری پێشمەرگەکانیش نەکرا بو

وریایی خۆیان بکەن و، کۆ ببنەوە بۆ بەرپەرچدانەوەی هێرشەکانی سەید کاکە. سەید کاکە نەیتوانی غافلگیریان بکا و، دەستی کتوپڕیان لێ بوەشێنێ و، بە جێیان بهێڵێ.

*

ئەم هەواڵانە کە گەیشتەوە ئێمە زۆر نارەحەتی کردین. ئەم لەشکرکێشیە لە سنوری تۆڵە دەرچو بو، بوبو بە شەڕی دەرپەراندن. سەید کاکە لە نامەیەکیش دا کە بو مەکتەبی سیاسی خۆیانی نارد بو، داوای لێ کرد بون هێزێک بنێرنە سەر مامەندە بۆ ئەوەی ئێمەش لە شێنێ، زەلێ، ناوزەنگ، تۆژەڵە.. دەربکەن. وتبان: «ئەگەر وا بڕوا ئەبێ کوردستانی بۆ بە جێ بهێڵین.» بۆ هەڵسەنگاندنی بار و دوخەکە کۆبونەوەیەک کرا ئەندامانی م س و زۆری سەرکردایەتی بەشدار بون.

لە پێشەوە رەخنەی زۆرمان لە مەلا بەختیار گرت لە سەر کارەکانی ئەو دوایەی و، لە سەر بە جێ هێشتنی پێشمەرگەکان و ناوچەکە. داوامان لێ کرد سەر لەنوێ بچێتەوە بۆ سەرپەرشتی و رێکخستنەوەی هێزەکانی هەرێمی چوار. هەرچی لە گەڵی مان وت، کەڵکی نەبو، ئامادە نەبو بچێتەوە بو ناوچەکە. بڕیارمان دا:

١. مستەفا چاورەش بچێ بۆ کۆکردنەوە و رێکخستنەوەی هێزەکانی هەرێمەکانی ٣ و ٤ و، تێن بو سەید کاکە و هێزەکانی حسک بهێنێ بەری مەرگە و دوڵی جافەتی بە جێ بهێلن بەرەو کوسرەت و، لەویش گوشاریان بو بهێنن تا ئەیانکەنەوە بە خزشناوەتی دا.

٢. من، هێزێک لە گەڵ خۆم بەبەم بە ناوچەی مەنگورایەتی دا بەرەو دوڵی خانەقا و، دەس بگرین بە سەر ناوچەکانی وەرتێ، دوڵی مەلەکان و، دوڵی بالیسان دا. لەوێ لە گەڵ هێزەکەی مستەفا یەک بگرینەوە، هێزەکانی حسک بخەینە «ناو کەماشە» وە.

٣. مەلازم عومەریش، ئەگەر پێویستی کرد، بە دوای من دا هێزێک بهێنێ لە قەلاتوکان دابمەزرێ بۆ پاراستنی رێگاکانی پشتەوەمان لە کومتان - دوڵی خانەقا.

لەو کاتەدا بەشێکی هێزەکانی هەرێمی ٧ ی بالەک و هەرێمی ١٤ ی ئاکۆ لە سەرکردایەتی بون. هەموویانم ئاگادار کرد خۆیان بۆ جولان کۆ بکەنەوە. سەید کەریم لە باتی م ع هات. چەند مەفرەزەیەکی گەرمیان لەوێ بون ئەوانیشمان ئاگادار کرد خۆیان ئامادە بکەن.

مستەفا لە سەردەشت بو ئاگادارمان کرد بە ڕێ بکەوێ بۆ جێبەجێ کردنی ئەرکەکانی.

*

رووداوەکانی قەقلیان و کاروخ، لە نێوان حشع و یەکێتی دا تازە قەوما بو. هەردولا بڕیاریان دابو کە پەیوەندیەکانیان لە ناوچەکەدا ئاسایی بکەنەوە. یەکێتی ئەم کارەی بە من و، حشع بە مەلا ئەحمەدی بانیخیلانی سپارد بو.

بەیانی رۆژی ٨ ی ئەیلولی ٨١ هێزەکەمان کەوتە ڕێ، مەلا ئەحمەدیش لە گەڵ ئێمە هات، بەلام لە رێگا سڵی لێ ئەکردین. لە قەلاتوکان لامان دا. لە کاتی نان خواردن دا عەلی حەمەی شاسوار، کە ئەوسا گەنجێکی تازە پێگەیشتو بو، تفەنگەکەی لە سەر پێ ئەبێ، گوللەیەکی لە دەس دەرچو رانی پێشمەرگەیەکی مەفرەزەکەی خۆیانی پێکا. ناوی هیدایەت و خەڵکی ئاوایی بندکەی گەرمیان بو. د. شالاو لە گەڵ هێزەکە بو. گەیشتە سەری. دەمارە گەورەکەی رانی توشی نەزیف بوبو. چەندی خەریک بو نەزیفەکەی

بوەستینی و، چەند کەسیکیش خوێنیان دابە، کەلکی نەبو، هەمان ڕۆژ مرد و، لەوی ناشتمان. ئەمە ڕوداوێکی ناخۆش بو، هێشتا هیچمان نەکرد بو یەکێکمان بە خۆرایی کوژرا.

گورستانیکی زور گەورە لە قەلاتوکان بو. گەورەیی گورستانەکە لە گەل کەمیی ژمارەی دانیشتوانی قەلاتوکان و ئاوایییەکانی دەوروبەری دا نەئەگونجا. هەندی لە گورەکان هەلبەسترا بون. نیگاری گول و خەنجەر و مەلیکی لە بابەتی کەلەشیر لە سەر کیلەکانی هەلکەنرا بو. نوسینیان لە سەر نەبو، یان من نەمبینی. نەمزانی هی چی سەردەمیکە.

ڕۆژی دوایی کەوتینە ڕێ گەیشتینە دولی خانقا. پێشمەرگەکانی دەشتی هەولیر و خوشناوەتی کە لە ناوچەکەدا مابونەوە تا ئەو کاتە خوێیان حەشار دابو، بە هۆکی تۆزکی دوزرانەوە و خۆیان دەرخست. د. مەجیدیش، کە چەند ڕۆژ بو بە بریندارێ حەشاریان دابو، لە دارمەیتیک دا گەیشتە دولی خانقا. سەرەرای سەختی برینەکەی و پەریشانی حالی، وەی زور بەرز بو. لە گەل مەلا ئەحمەد چەند جاری دانیشتین و، نوینەرانی هەردولامان دانا و، ئەو چەکانەی لە یەکتریان گرت بو وەرمانگرتەوەو دامانەوە بە یەکتری. ئەبو نیوانی هیزەکانی هەردولا لە ناوچەکەدا بگەرێتەوە دوخی جارانی.

بەلام وەکو دوایی بۆمان دەرکەوت ئەمە بۆ خاوکردنەوەی ئیمە بو، چونکە سەرکردایەتی جود بریاری دابو: یەکێتی تەمێ بکا.

*

هیزەکەمان بە ڕێ کەوت بەرەو مەلەکان. بەیانی زو بو گەیشتین. پیاوەکانیان کە بە هاتنی ئیمەیان زانی بو هەمویان لە ترسان خۆیان لە چیا شارد بوەوە. ئەو ڕۆژە هەینی بو، لە بەر ئەوەی پیاوەکانیان ئاوایییەکەیان بە جی هێشت بو، نوێژی هەینی تی دا نەکرا. هیزەکەمان زور بو هەموی لە مەلەکان جیێیان نەئەبوەوە، لە بەر ئەوە دابەشمان کردن بە دریژایی دولەکە لە گوندەکانی: کەندول، بلەی سەرو، بلەی خوارو، ئالانە.. دابمەزرین.

کادرەکانی یەکێتی، هەوالی ناراستیان لە سەر ژمارە و شوێنی هیزەکانی حسک هەبو. پێیان وت بوین کە دولەکە چولە و، هیزی حسکی تی دا نەماوە. بەلام کە هیزەکانی ئیمە چون بۆ بلێ، لە چیاکانی پشتەوە: سەری جوانەگا، دارە هیشک، گەلی بیجان، کە بەشیکی زنجیرەی چیای کورەکە.. بویان دامەزرا بون، دایاننە بەر دەسڕێژی گوللە. یەکێکیان لی کوشتین و چەند کەسیکیشمان بریندار بون.

هیزیکمان ناردە سەریان. شوێنەکانیان زور قایم بو. خەلکی ناوچەکەش بە نهینی هاوکاریان ئەکردن. بەرەنگارییەکی سەختیان کرد. سەرەنجام هەلکەندران و بلاوەیان لی کرد و خۆیان شاردەوە. بۆ ئەوەی نەتوانن بینەوە ناو گوندەکان بە دریژایی دولەکە لە ناو هەمو گوندەکان دا بنکەمان دانا و، لەو شوێنانەش کە ئەیانتوانی هاتوچوی لیوە بکەن بوسە و ڕەبیەمان دانا.

زنجیرەیەک چیای زور سەخت کەوتوتە نیوان دولی شاور و دولی مەلەکان و دولی بالیسانەوە، چەند کویرە ڕیگایەکی هەیە بۆ هاتوچو باریک و بەرز و ڕک و ڕژدن، خۆیان پێیان ئەلین: «دەرە»، وەکو: دەرە هەرتەل، دەرە زیوە کە ڕیگایە بۆ دولی شاور و، دەرە شیر کە ڕیگایە بۆ سەرچاوەی مەلەکان و، ڕیگای سەرپاری خەتی. هەمو ئەم شوێنانەمان بە پێشمەرگە تەنی، چونکە چاوەڕوانی گەڕانەوەی سەید کاکەمان ئەکرد کە لە دولی جافەتیەوە

راو نرا بو بەرەو کوسرەت و، ئەبو بە یەکی لەم ریگایانە دا تی بپەری بو ئەوەی بگەرێتەوە بارەگای سەرکردایەتییان لە ‌:ەواری دولە تو.

روژانەیش مەفرەزەکانمان ئەچون بو گەرانی گوندەکانی دولی بالیسان.

هەمان روژی گەیشتینە مەلەکان، دوای ئەوەی تیگەیشتن نیازی هیچ دەستدریژی و کاریکی خراپمان نیە بو ئیوارەکەی، هەمو ئەوانەی هەلات بون هاتنەوە ناو مالەکانی خویان. دوا بە دوای یەک هەندی لە پیشمەرگە و مەفرەزەکانی حسیک، کە خەلکی ناوچەکە بون ئەوانیش لە مەکوکانیان ئەهاتنە دەری و، ئەهاتنە ناو یەکیتیەوە. هەندی لەوانە پیشمەرگەی باش و ریکوپیکبان لی دەرچو، تا سەر لە گەل یەکیتی مانەوە.

*

دیموکرات

یەکی لە پیشمەرگەکانی دەستەکەی خوم ناوی جەمال بو. هاوری ی کومەلە بو. بەرپرسی کاروباری لوجستیکی مەفرەزەکەمان بو. سەرپەرشتی خواردن و دابەشکردنی ئەکرد. کابرایەکی مەلەکی داریکی هەرمی و دو بن دار گویزی بو خواردنی خومان بەرەو رو کرد بوینەوە. جاروبار گویز و هەرمێیان لی ئەکردە و ئەیانخوارد. جەمال سەرپەرشتی چنین و رنین و دابەشکردنی ئەکرد. لە باتی ئەوەی بلی: وەکو یەک بە سەرتان دا دابەش ئەکەم، ئەوەندە وت بوی: بە دیموکراتی دابەشی ئەکەین. ناویان نا: «جەمال دیموکرات» دوای ئەوە ئیتر ئەم ناوەی بە سەردا دابرا و، هەتا ئیستایش هەروای پی ئەلین.

*

قەل

لەو سەردەمەدا دەزگای بیتەل مان نەبو. تەنیا هوی پەیوەندی مان چەند دانەیەک هوکی توکی بو. بو ئەوەی لە گەل یەک پەیوەندی بکەین ئەبو بچوینایەتە لوتکەی بەرزاییەکان. ئەو مەفرەزانەی لە بوسەی سەر ریگاکان دا دامناپون هەمویان هوکی توکییان پی بو، بو ئەوەی ئەگەر شتی هاتە پیشەوە بە تایبەتی شوینەکانیان ئەیروانی بە سەر دولی بالیسان دا ئاگادارم بکەن.

شاخەوان فەرماندەی ئەوانە بو کە لە سەر باری خەتی و، فاروقی عەلی مەولودیش هی ئەوانەی لە سەر دەرە شیر بون. بو ئەوەی بە ئاسانی لە پەیوەندییەکانمان تی نەگەن، هەندی لە ناوەکانمان گوری بو، لەوانە: وشەی «قەل» مان بو حسک دانا بو.

لە پر شاخەوان بە هوکی توکی هاواری کرد: «ئەری وەللا ئەوە قەلەکانن! ئەوە قەلەکان لە ئوتومبیل دابەزین. ئەوە قەلەکان خەریکن بە سەر باری خەتی دا هەلئەگەرین. ئەوە قەلەکان بەرەو لای ئیمە دین...» بەمجورە، بە بی پسانەوە، دریژەی ئەدا بە قسەکانی ئەتوت مونەیەد بەدریە و لە سەر روداوەکانی تویتوپین ئەدوی. فاروقی عەلی مەولودیش هەمان قسەی شاخەوانی بە هوکی توکییەکانی تر ئەگەیاند. چەندی هەولم دا شاخەوان بە بیدەنگی چاودیری قەلەکان بکا، تا ئەگەنە ژیر ئاگری ئەوان، کەلکی نەبو.

تومەز قەلەکان سەید کاکە و هیزەکەی بون و، ئەیانویست لە ریگای سەرباری خەتی بینە دولی مەلەکان و بگەرینەوە بەرەو سەرکردایەتی، لەم هات و هاوارەی شاخەوان هوشیار بونەوە. ئەوانیش بە هوکی توکی قسەکانیان گوی لی بوبو، زانی بویان بوسەیان بو دانراوە. بە هەمان ئوتومبیلی پی ی هات بون، سوار بون و گەرانەوە بو دواوە بەرەو چیای هەوری،

واتە بەرامبەر بەو چیایەی هێزەکانی ئیمە بوی دامەزرا بون.
ئیتر ئیمە لە کولی نەبوینەوە. هێزەکانمان نیشتنە سەریان. لە لای چیوە و لە لای سەردزلەوە بە هەوری دا بویان سەرکەوتن. سەید کاکە بە هوکی توکی قسەی لە گەل عەولا سور کرد بو داوای لی کرد بو دەربازی بکا. شوینیکی بۆ دیاری کرد بو بچیتە ئەوی تا بە تراکتور بیگوێزیتەوە. سەید کاکە هەندی لەوانەی لە گەلی بون خەریکی کردن بە شەری هێزەکانی یەکیتیەوە، خویشی بە دزییەوە مەیدانی بە جی هیشت بو بەرەو ئەو شوینەی عەولا سور بوی دیاری کرد بو.
هیچ کەسی لە فەرماندەکانی پیشمەرگە بە ئەندازەی سەید کاکە لە خو دەربازکردن دا زیرەک نەبو، شەرەکەی داتەمەزراند، گەرمی ئەکرد، تاقمی لە پیشمەرگەکانی تیوە ئەگلاند، خویشی بە بیدەنگی ئەکشایەوە بۆ شوینیکی سەلامەت. لە چەندین شەردا ئەم تاکتیکەی بە کار هینا بو. لە «شەری دەشتیو» یش دا وەها دەرباز بوبو.

*

شیر و ریوی
ئەم شەرە زیاتر لەوەی شەرە تفەنگ بی، شەرە قسە بو.
کە باسی ئازایەتیەکانی خوی ئەکرد، سەید کاکە قولی هەلئەمالی و، گیرانەوەکانی تیکەلاو ئەکرد بە هاژوهوژ و فیشال و خو هەلکیشان، بەلام قسە و فشە و هەرەشەکانی خوش بون، زور جار لە ناخوشی دا پیاوی ئەهینایە پیکەنین.
سەید کاکە هەمو فەرماندە ناسراوەکانی یەکیتی ئەناسی و، لە گەل هەندیکیان دوست و ناسیاو بو. لەم شەرەدا بە هوکی توکی قسەی لە گەل هەندیکیان ئەکرد، لە سەرەتادا کە هیشتا مەترسی لە سەر نەبو جنیوی پی ئەدان و گەففی لی ئەکردن. قەنناسەیەکی پی بو، هەرەشەی لی ئەکردن بە قەنناسەکەی، میشکیان ئەپرژینی! سەید کەریم و قادر خەیات و عەزیزی داود پیاوی زور ئازا بون هەرەشەکانی سەید کاکەیان بە فشە وەرئەگرت و گالتەیان پی ئەکرد. خەریک بون ئەگەیشتنە سەری.
لە چەند لاوە بە هوکی توکی بانگیان ئەکرد: «سەید ریوی لە کوی ی؟»
سەید کاکە ئەیزانی ئیتر خەریکە مەترسی لی نزیک ئەبیتەوە وتی: «شیر کە پیر بو ئەبیتە مسخەرەی سەگان!» یەکیکی کە پی ی وت: «سەید ریوی! تو قەت شیر نەبوی، هەر ریوی بویت و، هەمو جار خەلکی لە شەرەوە ئەگلینی و خویشت هەلدی ی!» قادر خەیات گورانیەکی خوشی بە ناوی: «هو ریوی - ریوی...» بۆ ریکخست بو، بە ئاوازیکی خوش لە هوکی توکیەکەدا بوی ئەوت.
ماوەیەک سەید کاکە دەنگی نەما. زوریان گالتە بە خوی و بە قەنناسەکەی ئەکرد. ئەیانویست شوینەکەی بدوزنەوە بەلام ئەو دەنگی لە خوی بری بو. تومەز خەریکی خوٚدەربازکردن بو. سەید کەریم چەند جاری بانگی کرد: «سەید ریوی قەنناسەکەت دەنگی نەما چی لی هات؟»
سەید کاکە گەیشتە تینی، وتی: «چو بە .... دایکتا!»
سەیرە کورد لە ناو گیانداران دا، جگە لە شیر و پلنگ، ئەوانی کەی بە لاوە سوکە. سەید کاکە بە ناوی ریوی زور تورە ئەبو. نەیئەزانی رۆمیل سەرکردەی هێزەکانی ئەلمانیا لە سەرەوی ئەفەریقا، کە هێزەکانی بەریتانیای بە سەرکردایەتی مونتوگومەری بە گیر هینا

بو، لە بەر زیرەکی لە بەربوەبردنی شەرەکەدا ناویان نا بو: ڕێوی بیابان.
ئیتر بە یەکجاری نا دەنگی قەنناسەکەی و نە دەنگی خوی لە هوکی تورکی دا نەما.
بۆ ڕوژی دوایی بیستمان کە عەولا سور لە ڕێگای سەرکەپکانەوە تی ی پەڕاند بو.

*

لە هەوری یەکیٚ لە هیزەکەی سەید کاکە کوژرا، ناوی حەسەن وەرتی بو، تەرمەکەی
بە جی مابو. پیشمەرگەیەکیشیان بە بریندار گیرا ئازادمان کرد. بەلام سەید کاکە خوی
دەرباز بو و، ئەوانی تریشیان بە تاقمی پچوک بلاوەیان لی کرد.
جموجولی ئاشکرای چەکدارەکانی حسک نەما و، ناوچەکە کەوتە ژیر دەسەلاتی
هیزەکانی یەکیتییەوە.

*

بۆ ڕوژی دوایی، بۆ هەلسەنگاندنی هەلومەرجی ناوچەکە و، دانانی بەرنامەی کاری
داهاتو، لە بیراوا کوبوینەوە. پیویستی ئەوە نەمابو هیزەکان هەمویان لەو ناوچانەدا بە
کوکراوەیی بمیننەوە. هیزەکان ڕیگا دران هەریەکەیان بچیتەوە ناوچەی چالاکی خوی. لەویوە
نامەیەکم بە ڕیگای ناوشار نارد بۆ فەرماندەی پیشمەرگەکانی بنکەی قەلاتوکان. ئاگادارم
کرد کە سەید کاکە لەو ڕیگایەوە ئەگەڕیتەوە بوسەیەکی باشی بو بنینەوە.-محەمەدی حاجی
عەبدوللا فەرماندەی پیشمەرگەکان بو، بە چاکی بۆیان دامەزرا بون، بەلام کە سەید کاکە
گەیشت بوە نزیکی، بە هەندی قسەی لوس فریوی دابو، ڕیگەی پی دابون بە سەلامەتی
تی بپەڕن.
کوسرەت بوشایی تی دا دروست بو. ناوچەیەکی گرنگیش بو بۆ پیکەوە بەستنی
ناوچەکانی هەردو بەری زیٚ. شەمال کە ئەو کاتە فەرماندەی پیشمەرگەکانی دەستەکەی خوم
بو، حەمزی کرد بچی بۆ کوسرەت. تاقمیک لە پیشمەرگەکانی خومم بۆ جیا کردەوە و، لە
گەل هەندی پیشمەرگەی تر بە ری مان کرد و، فەرماندەیی هیزەکەی ئەوی مان پی سپارد.

*

گەلەکومەکیٚ ی چوار قوزلی جود
پەیوەندی یەکیتی و لایەنەکانی جود چو بوە قوناغیکی ترسناکەوە. لە نیوان
یەکیتی و پارتی دا لە سەرەتاوە حالەتی شەر بەردەوام بو. دوای ئەو ڕوداوانەش شەر لە
نیوان یەکیتی و حسک دا هەلگیرسا بو. بە هوی ڕوداوەکانی دەرگەلە و فەقییان و
کاروخەوە پەیوەندی یەکیتی لە گەل حشع بش گرژ بو بو، لە گەل پاسوکیش لە ڕوداوەکەی
مامەخەلان و گەرەدی تیکچو بو. بە واتەیەکی تر هەر چوار براکەی جود لە سەنگەردا بون
لە یەکیتی. سەرکردایەتی ئەم حیزبانە بە نهینی لە ناو خویان دا ڕیک کەوت بون
گەلەکومەکینەکی پیشمەرگەیی بکەن، یەکیتی لە مەیدان دەربەرینن، یا هیچ نەبی تەمی
ی بکەن.
ئیمە هیشتا بەممان نەزانی بو. من بەرەو دوا گەڕامەوە بۆ مەلەکان و، دوای چەند
ڕوژی چومە دولی خانەقا بە نیازی ئەوەی بە یەکجاری بگەڕیمەوە بۆ ناوزەنگ لە بەر ئەوە
هیزەکەم کەم کرد بوەوە. هەر ٤٠ کەسیکم لە گەل بو. چەند ڕوژی لە گوندەکانی دولەکەدا
مایەنەوە. ڕوژانە شیوعیيەکان تاقمیک و دوان و سیان بە ناوی کڕینی ئازوقە و کەلوپەل و
پیویستی ترەوە بە لای ئیمەدا ئەهاتن، وەکو پیشمەرگەکان چاودیریبان کرد بون، لەم سەر

به كەمی ئەرۆیشتن، بەڵام لەو سەر بە زۆری ئەهاتنەوە. گومانیان وابو هێزێكی بێگانە، وردە وردە و بە شێنەیی، ئەگوێزنەوە بۆ شوێنەكانی پشتی ئێمە.

*

## چاوەش

مەكتەبی سیاسی چەند جارێ بە رادیۆ پەیامی مەجفوریان بۆ ئەناردم، كەوا عەولا سور ڕێگای كومەتانی بەستوە، هەركەس لەوێوە ئەروا، ڕێگای پێ ئەگرێ و لێكۆڵینەوەیان لە گەڵ ئەكا. چەند پێشمەرگەیەكیشی چەك كرد بو. داوایان لێ ئەكردم هێزێك بنێرمە سەری لە ڕێگاكە دوری بخەمەوە.

جارێكیان تاقمی هونەرمەندی هەولێری لەوێوە تێ پەڕی بون. سەید كاكەش لەوێ ئەبێ. یەكێ لە هونەرمەندەكان كەمان، یا ئالەتێكی موسیقی ترێ، پێ ئەبێ. سەید كاكە لێ ی ئەپرسێ: «بۆ كوێ ئەچی؟» ئەڵێ: «ئەچم بۆ ئاوزەنگ» سەید كاكە ئەڵێ: «مامجەلال كەسی بە دەستەوە نەماوە خەریكە چاوەش كۆ بكاتەوە!»

*

سوار ئاغا، عەولا سوری بانگ كرد بو لە سەر دەرباز كردنی سەید كاكە سەرزەنشتی كرد بو. بۆی باس كرد بو كە یەكێتی و حسك لە شەردان، پارمەتیدانی ئەوان واتە دوژمنایەتی یەكێتی. چەند جارێ قسەی لە گەڵ كرد بو كە یان بگەڕێتەوە ناو یەكێتی یان ناوچەكە بە جێ بهێڵێ و بچێ بۆ سەركردایەتی حسك. چەند ڕۆژێ ئەم مشتومڕەیان بەردەوام ئەبێ. مەلا عوسمانی پڵنگان، عەزیز صدیق، ڕەئوف سلێمان و مامەندی حاجی صدیق لە هەندێ لەم دانیشتنانەدا بەشدار ئەبن. زۆر لە فەرماندەی كەرتەكانی هەرێمەكەش كە خەڵكی ناوچەكە و هەندێكیان خزمی خۆی بون هەر لە گەڵی خەریك ئەبن. ئەم هەولانە نەك هەر هیچی سودی نابێ، بەڵكو بەوپەڕی بێ باكی و بێ منەتیەوە سور ئەبێ لە سەر هەڵوێستی خۆی و، پێیان ئەڵێ: «چیتان پێ ئەكرێ بیكەن!» تومەز ئاگادار بو كە هێزێكی گەورەی جود بە ڕێگاوەیە.

*

## كۆڵانی فاتە

«خانەقا» گوندێكی بچوك بو، دوڵەكەیش بە ناوی ئەم گوندەوە ناو نرا بو دوڵی خانەقا. جادەیەكی قیری بە ناودا تێ ئەپەڕی سەنگسەری ئەبەست بە جادەی هامیلتونەوە. لەمبەر و ئەوبەری جادەكە گوندەكانی: بەرگردكە، سەرنەوس، بن نەوس، گوزجار، ڕەژێكەریان، چۆم ڕێخن.. هەبو. ڕێگایەك لەم جادەیەوە ئەبوەوە ئەچو بۆ قسری، یەكێ لە پێچەكانی ناوی: «كۆڵانی فاتە» بو.

لە گەڵ پێشمەرگەكانی باڵەكایەتی نیوانم زۆر خۆش بو هەندێ جار گاڵتەوگەپم لە گەڵ ئەكردن. عەزیزی داود پیاوێكی قۆزشمە و قسە خۆش بو، لە لاسایی كردنەوەدا زۆر وریا بو. ئەگەر لە ولاتێكی كە بوایە ئەیتوانی ببێ بە ئاكتەرێكی گەورە. ڕۆژێكیان وتم: «عەزە گیان ئەم فاتەیە چیتە؟» وتی: «فاتە خەڵكی سلێمانی بوە. ئەو زەمانەی بارەگای بارزانی لێرە بو هاتوە لەو شوێنەدا كەتنێكی كردوە. لەوساوە ئەم ناوەیان لەم شوێنە ناوە!»

ئەوبەرمان چیای مامە ڕوت و پشتمان چیای درە بێ بو. كاتی خۆی «شێخ ئەبێ ماوێلیان» لەم خانەقایەدا ئیرشادی كردوە و، گۆڕەكەیشی هەر لەو نزیكانە زیارەتگای ئەهلی

مراز بو. شیخ نەبی زوری ژن هیناوە. حاجی قادری کویی هیرشی زوری کردوتە سەری و، لە چەندین شیعری دا ناوی هیناوە و هەجوی کردوە.

*

شەوەکەی ئیمە لە بەرگردکە لە مالی شیخ ئەورەحمان بوین. خیزانیکی هەژار بەلام تەبیعەت دەولەمەن بون، کوردپەروەر و تیگەیشتو بون. زوریکی خوشیان لە نهومی دوەمی خانوەکەیان دا بو میوان تەرخان کرد بو ئیمە لەوی دا بوین. پیش ئەوەی دنیا تاریک بی، هەرچی ریبوار و کاروانچیەک ئەگەیشت، ئەیوت هیزیکی زوری پارتی لە سەر جادەکە کوبونەتەوە. تا ئەوسا ئیمە نەمانزانی بو هیزی پارتی دابەزی بی. کەوتینە پەیجوری راستی هەوالەکە. دەرکەوت هەوالەکە راست بو.

شەوەکەی بو بە وەیشومەیەکی زور بەهیز. رەشەبایەکی وا هەلی کرد مالەکەی تەهەژاند و، بارانیکی بە خوروەم دایکرد و، هەوا ساردی کرد بو. هەمومان چاوەری بوین ها ئیستا ها تاویکی تر خویان بکەن بە ناو گوندا و ببی بە شەری تەنبەتەن، چونکە باوەرمان نەئەکرد لەو چولەدا بەرگەی ئەو وەیشومەیە بگرن، بەلام دیارە مروڤ هەندی جار لە دارودەون قایمترە.

*

بو روژی دوایی هەندی لە هیزەکانی هەریمی ۷ ی بالەکم کو کردەوە و، لە گوندی «کەلیت» ەوە بە بناری کاروخ دا بو سەرگەلی و ئینجا بو زارگەلی کیومالیکی وردمان کرد. نە لە دور و نە لە نزیک هیچ نیشانەیەکی هەبونی هیزی پارتی مان هەست پی نەکرد. هیزەکانیان شەوی پیشو پاشەکشەیان کرد بو بو دەورووبەری پشت ئاشان.

لە چەند سەرچاوەی جیاوازەوە هەوالم بو هات بو، ئیتر گومانم نەمابو لەوەی بەو نزیکانە هیزەکانی جود پەلامارمان ئەدەن. لە بەر ئەوە ئیتر مانەوم لە دولی خانەقا بە چاک نەزانی. پیشم باش نەبو بگەریمەوە بو ناوزەنگ. بە ناو وەرتی دا لە زینی ئەستیروکانەوە چوم بو دولی شاور. لە وەرتی بە دەم ریگاوە لە ناکاو بو چاکوچونی چوم بو سەردانی بارەگای حیزبی شیوعی. زور گیر نەبوین رویشتین. پیشمەرگەکانی لە گەلم بون چاویان هەلئست بو. وتیان لە ژورەکانی کەدا خەلکی تری لی بو کە نەیانئەویست ئیمە بیانبینین. دوایی دەرکەوت هەندی لە هیزەکانی پارتی بون بە دزیەوە هینا بویانن پشتمان لی بگرن. بەلام هیشتا ژمارەیان بایی ئەوە نەبو پەلامارمان بدەن.

*

شەو گەیشتینە پلنگان. چوینە مالی مەلا عوسمان. مەلا عوسمان پیاویکی کوردپەروەر بو لە کونەوە بەشداری جولانەوەی کورد و، دوستی یەکیتی بو. هیشتا نەحەسابوینەوە هەوالیان بو هینام کە ئەمرو عەبدوللا سور سەری سوارئاغا و هەندی لە فەرماندەی کەرتەکانی هەریمەکەی داوە، پی ی وت بون کە: «هیزیکی گەورەی جود لەو روژانەدا دیتە خواری بو دەرکردنی یەکیتی لە ناوچەکە، ئەم چونکە خوی بە خزمیان نەزانی لە پیشەوە هاتوە پییان بلی: ئەگەر ئەمان هاوکاریان بکەن ئەوا باشە، ئەگینا ئەمانیش دەرئەکەن!» ترسی ئەوەم هەبو پیش وەخت و، پیش کوبونەوەی هیزەکانی یەکیتی، دەسکیشیی هیزەکانی جود بکا بو ناوچەکە. لەو کاتەدا هیزیکی ئەوتوم لە بەر دەس دا نەبو بەری هیرشی جودی پی بگرم. هیزەکانم نارده چوار دەوری.

*

بەیانی ڕۆژی ۱۸/ ی تشرینی یەکەمی ۸۱ هەواڵم بۆ نارد کە: «یان بیتەوە ڕیزی یەکیتی، یان بیلایەن لە ماڵی خۆی دابنیشی بەو مەرجەی هاوکاری جود نەکا ئیمەش دەستی لی نەدەین، یان دەسبەجی ناوچەکە چۆڵ بکا» بەڵام ئەویش هەر کە بە هاتنی ئیمەی زانی بو هەر شەوی چو بوە شاخی بیرمکە لە پشتی دولە ڕەقە، هیزەکانی خوی بە چەند ڕیزی دامەزراند بو.

*

قادر خەبات دۆستی عەولا سور بو بەیانی زو چو قسەی لە گەڵ بکا. قسەکانی منی پی بلی. تەقەیان لی کرد گوللەیەک لە ڕانی دا و، لە شوینیکی کراوەدا بە بریندای تا بە لاداخستنی شەرەکە کەوت بو خوینی لە بەر ئەرزیشت نەیتەتوانی سەر دەربهینی.

دو لە خزمەکانی عەبدوللا سور، کە فەرماندەی کەرت بون لە هەریمەکەی: حاجی ئاغا حامید و خالصی حەقی ئاغا، هاتنە ناو یەکیتیەوە. هەمان پەیامەکەی بەیانیم بە مانیش دا بۆ نارد. بەڵام پیم وتن ئەم پەیامە تا ئەو کاتە بر ئەکا کە لیمان نەکوژراوە، ئەگەر لیمان بکوژی ئیتر لە کولی نابینەوە.

خوم لە گەڵ سوار ئاغا چومە بەرزاییەک بەرامبەر بیرمکە هەمو شاخەکەمان ئەبینی. شوانیک هاتە لای سوار ئاغا ڕاسپاردەی عەولا سوری بۆ هینا بو. بە شوانەم وت: «ئەتوانی نامە یا ڕاسپاردەی منی پی بگەیەنی؟» وتی: «بەلی» وتم: «نامەیەکی بۆ ئەنوسم بۆی ببە!» نامەیەکی کورتم بۆ نوسی هەواڵەکەی بەیانیم تی دا دوبارە کردەوە و بۆم نوسی: «تا شەر و پیکادان نەبوە لە یەک گەیشتن ئاسانە، ئەگەر بو بە شەر و لیمان کوژرا ئەوسا وازی لی ناهینین.» سوار ئاغاش نامەیەکی بۆ نوسی. شوانەکە نامەکانی برد و ڕویشت. نازانم پی ی گەیاند یا نە. زوری نەخایاند لە بەردەمی دولە ڕەقە دا بو بە تەقە.

*

محەممەدی برای عەولا سور پیشمەرگە نەبو. تا ئەو کاتەش تیکەڵاوی شەر نەبو. کە تەقە گەرم بو کوژراو و بریندار کەوتن. یەکی لە هۆزکی تورکیەکان ئاگاداری کردم: «محەممەد تفەنگی پی بە و، خەریکە بە بیرمکەدا هەڵئەگەری تەقەی لی بکەین؟» وتم: «تەقەی لی مەکەن!» لام وابو براکەی لە تەنگانەدایە ئەچی بۆ یارمەتیدانی. ئەرکی برایەتی بە جی ئەهینی. بەڵام محەممەد ترسابو داخی عەولا سور بەو بریژین، دابویە شاخ خوی دەرباز بکا نەک یارمەتی براکەی بدا. محەممەد بەشداری شەر نەبو. دوای ئەوە چوە لای حسک لە جیگەی براکەی بو بە فەرماندەی هەریم و، ماوەیەکیش لای هەباسی بایز بو بە جاش.

*

کابرایەکی مەردار لە دولە ڕەقە بو ناوی حاجی پلنگ بو. ئەوە یەکەم جار بو ناوی وەها ببیستم. ئاژەڵەکەی گل دابوەوە نەی برد بو بۆ شاخ. لە گەرمەی شەرەکە دا ئەیویست بەرەڵلایان بکا بۆ ئەوەی لە گەڵ بەردانی ئەوان دا بۆ ئاو خواردنەوە، گەمارو دراوەکان خۆیان دەرباز بکەن. ئەمە تاکتیکیکی زیرەکانە بو.

*

دو کەس لە پیشمەرگەکانی ناوچەکە کوژرا بون: یەکیکیان، فەقی مستەفای حاجی

خدری دوله رەقە، برازای عومەری حاجی برایم بو. کادریکی جوتیاری هەلکەوتوی کومەلە و، ئەندامی کونفرەنسی یەکەم بو، لە ناوچەکەدا زور خوشەویست بو، خوی و مامی و کەسوکارەکانیشی لە شەرە کەدا بون. ئەوی تریان ناوی باپیر بو برازای کویخا مینەی نوزە بو. جگە لەم دوانە پیشمەرگەیەکی گەرمیانیش کوژرا بو، لە بەر خوشەویستی هەر بە ئاموزا بانگیان ئەکرد.

٣ پیشمەرگە کوژرا بون و قادر خەیاتیش بریندار بو. ئاگاداری ئەو هیزەم کرد کە لە دەوری ئەوان دام نا بو، پەلاماری سەرچاوەی ئەو تەقانە بدەن. هەلمەتیکی کتوپریان بۆ بردن، زوری نەخایاند کپیان کرد. هەندیکیان کوژران، یەکیکیان مستەفا کەلیتەیی بو. ئەوانی تریان گیران. سامان کە بە بیرمکدا هەلگەرا، بە هوکی توکی ریگاکانمان بۆ دیاری ئەکرد، ئەویش پاشماوەی هیزەکەی دوژیەوە، عەولا سوریشیان لە گەل بو. ئەوانیش گیران.

کە چومە شوینی شەرەکە، خزمەکانی فەقی مستەفا بە ژن و پیاو و منالەوە وروژا بون، چەکدارەکانیان ئەم بەر و ئەوبەری تفنگەکەیان لە پیشمەرگەکانی یەکیتی گرت بو. ژن و منالیش لە گیراوەکان و حەرسەکانیان وروکا بون بە بەرد و تیلا تیهان بەربوبون. ئەیانویست هەمو گیراوەکان بکوژن. چەندی خەریک بوم خاویان بکەمەوە، کەلکی نەبو، کەوتنە جنیودان و میل راکیشان لە منیش، خەریک بو ببی بە شەری خوبەخو. لەم هەرایەدا عەولا سور کوژرا و ئاژاوەکە کوژایەوە. دیمەنیکی راستەقینەی شەری پشت شکینی براکوژی. زوری پیشمەرگەکانی هەردولا ئاکو و، خەلکی هەمان دۆل و هەندیکیان خزمی یەکتری بون.

*

عەولا سور، رەنگی سور نەبو، بەلکو کابرایەکی رەشتالەی رەقەلە بو، وەکو ئەیانوت: شاخەوانیکی زور وریا و، تفەنگچییەکی دەسراست و، پیشمەرگەیەکی ئازا بو. لە ناخی دلەوە پیم ناخوش بو بکوژری، بەلام چون بۆ رزگارکردنی ژیانی مروڤی لە مردن جاری وا هەیە دکتور خوشەویستترین ئەندامی لەشی نەخوشەکە ئەبری، نەخوشەکەیش خوی بە ناچاری رازی ئەبی، یان بۆ کوژاندنەوەی ئاژاوەی خویناوی نیوان دو بنەمالە یەکی ئەکری بە قوربانی، کوشتنی ئەویش ناچارییەکی لەو بابەتە بو.

بیگومان عەولا سور وەکو هەمو شەهیدەکانی کەی شەری ناوخو قوربانیەکی بی گوناه بو.

*

## ئاکویەتی

ئاکویەتی بەو ناوچەیە ئەلین کە عەشیرەتی ئاکوی تی دا ئەژی. ئاکو لە لای روژهەلاتیەوە لە گەل مەنگور و، لە لای روژئاوایەوە لە گەل خوشناو و، لە لای سەرویەوە لە گەل بالەک و، لە لای خوارویەوە لە گەل سن، رەمەک و پیران (٣ تیرەن لە بلباس)، هاوسنورە. لە روی ئیداریەوە بەستراوە بە قەزاکانی رانیە و پشدەرەوە. لە قەزای رانیە بەشیکە لە ناحیەی مەرکەز و، لە قەزای پشدەریش بەشیکە لە ناحیەی ناودەشت کە مەرکەزەکەی سەنگەسەرە.

لە روی خیلەکیەوە لە چەند بەش پیک هاتون:

باشئاغایی، بنەمالەی فەرمانرەوای عەشیرەتەکەن، لە گوندی سەرکەپکانی رانیە

دانیشتون.

ناودەشتی، ئەژانن کە لە ناوچەی ناودەشتی پشدەر دا دانیشتون و، لە چەند تیرەیەک پێک هاتون: شاروشی، کە لە داوێنی قەندیل دا لە ٨ گوندا ئەژیان.

رەژیکەری، ئەوانیش ئەبن بە ٣ هۆزەوە: پاوەیی، خەیلە، مەندەمەرە. مەندەمەرە، لە چەند گوندێک دا: گرتک، دوگزمان، جەلک، مەمک، پیرانە رەشە، ماخوێزنان.. ئەژیان لە نێوان چیای زێرنەکێو و ئاوی کاڕفێن دا. بەم ناوچەیە ئەڵێن پشدەرە رەقە و، بە ئاکۆی ئەم ناوچەیەشیان ئەوت: ئاکۆ رەشکە. ئاوایییەکانیان کەم ئاو و کەم دەرامەتە و ناخۆشە. بە ئاژەڵداری ئەژیان و بە هاوینان ئەچون بۆ کوێستانەکانی قەندیل. هەباسی بایزی بالو سەرۆکایەتی ئەکردن. لە سەرەتای دەس پێ کردنەوەی شۆڕشەوە هەباس بوبو بە جاشێکی دڕ لە ناوچەکەدا.

ئاکۆی بەردەر، ئەوانەن کە لە دولەرەقە، دولی پڵنگان، دولی شاوردا ئەژیان.

بۆلی، لە دەشتی بیتوێن و، باپۆلی، لە بناری کۆسرەت ئەژیان و، بۆ هاوین ئەچون بۆ حاجی هۆمەران

*

عەشیرەتی ئاکۆ لە سەردەمی شۆڕشەکانی شێخ مەحمودا دوبەش بون: بەشێکیان لایەنی شێخ مەحمودیان گرتوە و، بەشێکیان لایەنی ئینگلیزیان گرتوە لە دژی شێخ مەحمود و تورک بون.

هەباسی مامەند ئاغا، کە لە بەر خۆشەویستی پێیان وتوە کاکەباس، پیاوێکی کوردپەروەر بوە، لە سەردەمی پاشایەتی دا هاوکاری لە گەڵ سەرانی پارتی و حشع کردوە، دوای گەڕانەوەی مەلا مستەفا بۆ عێراق یەکێ لە لایەنگرە نزیکەکانی بو، لە کۆکردنەوەی خێڵەکانی ناوچەکە و، هەڵگیرساندنی شۆڕشی ئەیلول دا دەورێکی کاریگەری هەبو. جماعەتی مەکتەبی سیاسی دوای گەڕانەوەیان لە ئێران لە لای ئەم دەس بە سەر دانرا بون و، بە ئاگاداری ئەم هەڵاتن. لە ساڵەکانی دوایی دا نێوانی لە گەڵ مەلا مستەفا خۆش نەبو. توشی نەخۆشییەکی سەخت بو، هەتا لی ی پیس نەکرد، مەلا مستەفا رێگەی نەدا بچی بۆ تەداوی، کە گەیاندیانە نەخۆشخانە لە بەغداد مرد (١٩٦٦). لە پاش خۆی چەند کوڕێکی بە جی هێشت بو: بایز، سوارە، مامەند، هەمزە، کوردە و ئاکۆ.. ئەم برایانە دایکیان و، عەشیرەتەکانی دایکیان جیاواز بو، لە بەر ئەوە لە ناو خۆیان دا کۆک نەبون.

مەلا مستەفا رێزی منداڵەکانی هەباس ئاغای نەئەگرت و، ئەوانیش وەکو باوکیان پێ نەئەکرا. لە ئاکۆکی مەلایی و جەلالی دا بە لای جەلالی دا داشکان و، بە هۆی ئەوەوە توشی تالانکران و دەربەدەری بون. لە سەرەتای دەس پێ کردنەوەی شۆڕشی حوزەیران دا بایزئاغا بو بە پێشمەرگە و، لە گەڵ ئەو ژمارەیەکی زوری خەڵکی ناوچەکە بون بە پێشمەرگە. لە هێرشەکانی سەرەتای ٧٨ دا کە ناوچەکەیان داگیر کرا و، زوری خێزانەکانیان گیران، زوریان تەسلیم بونەوە. بایز ئاغایش رویشتەوە. پاش چەند روژێ لە روداوێکی ئوتومبیل دا مرد.

*

ناوچەکە، یەکێکە لە ناوچە شاخاویە هەرە عاسێیەکانی کوردستانی عێراق. شاخەکانی زێرنە کێو، مامەروت، دەرەبی، کاروخ، کورەک، هەندرین، کێومرەش، ماکوک،

بیرمکە و، لایەکی گوندەکانی دۆڵی خانەقا بو کە سەر بە قەزای چومان و، لایەکی گوندەکانی دوڵ ئاکۆ و دوڵی مەڵەکان بو کە سەر بە قەزای رەواندز و، لایەکی گوندەکانی دوڵی شاور و دوڵە رەقە بو کە سەر بە قەزای رانیە بون.

دوای ئاشبەتاڵ هەندێ جادەی قیر و هەندێکی خاکی تی دا کراوەتەوە، بەڵام هەر نەیتوانیوە شوێنەکانی بە تەواوی بە یەکەوە ببەستێ. لە لەشکرکێشییەکانی ٧٧ دا جەیش دەستی بە سەر شوێنە گرنگەکان دا گرت بو، «رەبیە» ی تی دا دانا بو. دوای هەڵگیرسانی جەنگی عیراق - ئیران زۆری چۆڵ کرد بو. دانیشتوانی ناوچەکە بە گشتی کوردپەروەر و دۆستی شورش بون و، یەکیتی نفوزی باش و بەهێزی هەبو لە ناویان دا. گەلێ پێشمەرگە و فەرماندەی لە ناو خەڵکی ناوچەکەدا هەبو، دۆست و لایەنگریشی زۆر بو.

*

ناوچەکە وەکو مەنجەڵ کەوتوتە نیوان چەند چیایەکی بەرز و بە یەکەوە بەستراوەوە: کێوەرەش، بیرمکە، کاروخ، ماکۆک و، ناو مەنجەڵەکەیش چەند دوڵێکی تی دایە: دوڵە رەقە، دوڵی پڵنگان، دوڵی شاور و، لە ناو ئەم دوڵانەیش دا چەند گوندێکی تی دا بو: سیدیرە، گوێچکەلان، شەکەڵە، ناوەزینان، گولان، کەرەک، بیردێ، بەردانگە، نۆزە، دیرە..

ناوچەکە شاخاوی و، زەویوزاری کشتوکاڵیان کەم بو، هەندێ باخی هەنار و میوە، هەندێ دانەوێڵە و سەوزە و، بەرهەمی سەرەکیبان ئاژەڵداری و توتن بو. توتنی ئەم ناوچەیە پی ی ئەڵێن: «توتنی شاور»، وەکو توتنی شوێنەکانی تر ناکری بە چەرداخ دا، بەڵکو لە شیشی داری ئەدەن و، بۆ وشک بونەوە لە سەر ئەرز دایئەنێن. جۆری توتنەکەیان باش و بۆنداره. بە زوری لە بازاری قاچاخ دا ئەفرۆشری و، تەسلیمی دائیرەی حکومەتی ناکەن.

*

من لە گولان دامەزرام. گولان: ناوە بو چەند گوند، بۆ چەند شاخ و، بۆ یەکی لە مانگەکانی ساڵی کوردی و، بۆ ئەو شورشە «وەهمی» یەی پارتی دوای ئاشبەتاڵ هەڵی گیرساندۆتەوە.

هەواڵەکانی بۆم ئەهات وایان تەگەیاند لەشکرکێشی جود نزیک بوتەوە. نامەم بۆ م س نوسی، روداوەکەم بۆ گێڕانەوە و، هەندێ بانگەوازم نوسی بو کە بە مەجفوری لە رادیو بیخوێننەوە داوام لە هێزەکانی ناوچەکە کرد بو کۆ ببنەوە. داوام لە مولازم عومەر کرد هێزێک بهێنیتە قەلاتوکان و، نامەیەکیشم بۆ سەید کەریم نوسی، کە بە بێ دواکەوتن خۆی و هێزەکەی لە گەلی بو بگەڕێنەوە دوڵی شاور.

*

ئیمە لەم کەین و بەینەدا بوین بەیانیی روژی ٢٥ ی تشرینی دوەمی ٨١ هێزی هاوبەشی جود پەلاماری دوڵی خانەقا و وەرتی یان دا. ناوچەکەیان گرت. هێزەکانیان گەیشتنە زینی ئەستیروکان و، لە لای روژهەڵاتی سەری ئەحمەدە و، لە لای روژئاوای سەری هەڵمەتیان گرت و، رەبیەیان تی دا دامەزراند.

نزیکەی ٥٠ پێشمەرگەی یەکیتیبان بە تاک و بە کومەڵ چەک کرد بو، لەوانە: حاجی ئەحمەدی بۆلی، کە پیاوێکی بە ساڵاچو و، براگەورەی بولیبەکان بو. چەند ساڵی لەوەوبەر کوریکی پێشمەرگەی کوژرا بو، ئەمجارەش خۆی و کورەکەی و چەند خزمێکی

بەر چەک کردن کەوت بون. زۆری ئەم پێشمەرگانە بە ژمارەی کەم لە بارەگا پچوک و بلاوەکانی ناو وەرتی دا بون. بارەگای حشع یش لە ناو وەرتی دا بو. پێشمەرگەکانی حشع چاوساغی هیزەکانی جودیان کرد بو بۆ سەر بارەگاکانی یەکێتی و، ئەوان داوایان لی کرد بون لە سەر شەرەفی حیزبی شیوعی چەک داینین و تەسلیم بن. مستەفا ناوپردانی خۆی و کەرتەکەی کە لە مامەروت گیریان خوارد بو، لە ئیمە دابرا بون، نائومید بون بە کۆمەل تەسلیمی بەعس بونەوە.

بۆ ئەوەی هیزەکانی جود نەتوانن پێشرەوی زیاتر بکەن، بە هاوکاری کەرتەکانی هەریمی ٧ ی بالەک و ١٤ ی تاکۆ هەندی سەرشاخ و جیگای گرنگمان قایم کرد، بە هیوای گەیشتنی هیزەکانی یەکێتی. «گولان» م کرد بە بنکەی فەرماندەیی.

هەندی وشەی جوگرافی

زین: ئەو رارەوەی کە بە بەرزایی دا بە نیوان دو ریزە شاخی بەرزدا تی ئەپەری، وەکو: زینی ماخویزنان، زینی ئەستیروکان، زینی رات، زینی سەران. لە هەندی شوینی تر بۆتە زینو، زینۆ، وەکو: زینوی شیخ، زینوی خەلان. زین، لە زینی ولاخ وەرگیراوە کە لە چەرم دروست ئەکری و، ئەخریتە سەر پشتی ولاخ، لە کاتی سواری دا لە سەری دائەنیشتن (لە پەهلەوی و لە فارسی دا: زین).

چەقەل: بەرزاییەکی قوتی بەردەلان، وەکو: چەقەلی ریگران، چەقەلی گزرانان. سەیر ئەوەیە لەم ناوچەیەدا «گزران» بە واتای ریگر بە کار ئەهینن.

ئەستیرۆک: پچوککراوەی: ئەستیر، ئەستیل، واتە حەوزی ئاو کە بۆ کۆکردنەوەی ئاوی کانیەکی پچوک دروست ئەکری.

گەلی، یان گەلی: ئەو شوینە تەسک و تەنگەبەرەی کەوتوتە نیوان دو چیای گەورەوە، وەکو: سەرگەلی، زارگەلی، گەلی بەدران، گەلی بیجان، گەلی عەلی بەگ. لە هەندی شوین بۆتە گەلو، وەکو: سەرگەلو، بەرگەلو. لە هەندی شوینی تر بە گەرو ماوەتەوە، وەکو: گەروی مەنجەل، گەروی عومەرئاغا، گەروی بیشە، گەروان (گەرووان).

گەلی، گەلو، گەرو: هەرسیک لە یەک ریشەن، لە کوردی دا: گەرو، قورگ، ئەوگ (لە پەهلەوی دا: گەروک. لە فارسی دا: گلو).

ناوی هەندی لە شاخەکانی

کاروخ: زەینەفون لە «ئاناباسیس» دا کە باسی گەرانەوەی دەهەزار سەربازی یونانی ئەکا بە ناو کوردستان دا ناوی دانیشتوانی ئەوسای کوردستان بە کاردوخ ئەبا. بلی ی لە نیوان ئەم دو ناوەدا هیچ پەیوەندییەک نەبی.

هەلمەوت: شوینی سەخت و عاسی. یەکیکە لە لوتکەکانی کاروخ. ئەو شوینە عاسییەی حەسەن صەبباح کرد بوی بە مەلبەندی خۆی ناوی «ئەلەموت» ، کە هەمان مەعنای هەلمەوتی هەیە و، عەرەب بە هەلە کردویانە بە «ئەلەموت».

کورەک: کەچەل، سەری بی مو.

بۆت (بۆتی، گزرە بۆت، کانی بۆت): بەچکە، هەروەها بودقە، ئەو گلینەیەی زیر و زیوی تی دا تویندراوەتەوە.

*

رادیوی پارتی ئەم پێشرەوییەی وەکو مژدەی سەرکەوتنیکی گەورە بلاو کردەوە،

رادیوی یەکیتی یش کەوتە بلاوکردنەوەی بانگەواز و ئاگاداری بۆ هیزەکانی خۆی. هیزەکانی دەشتی هەولیر، خۆشناوەتی، کۆسرەت کە لە گەل سەید کەریم چو بون بۆ «جەمولە» گەیشتنەوە لای من لە گولان. لە گەل خۆیان دو کارکەری ئەلمانیشیان هینا بو کە تازە گیرا بون.

لەو ماوەیەدا چەند جاری کارکەری ئەلمانی کە لە عیراق کاریان ئەکرد، گیرا بون. حکومەتی ئەلمانی کەمال فوئادیان هەلپێچا بو، ئەویش سەرکردایەتی یەکیتی تەنگاو کرد بو. مامجەلال لە گەلیان ریک کەوت بو کە ئیتر ئەلمانی نەگیرین. ئەلمانیەکان زور ماندو بون، هەندی قسەم لە گەل کردن و، وتم پیشمەرگەکان ئیوەیان بە هەلە هانیوە لە زمانی یەکتری تی نەگەیشتون، بۆ هەرجیەک ئەتانەوی برۆن ئازادن. ناردمن بۆ سەرکەپکان دوای پشودان نارد بویاننەوە رانیە.

*

کەوتینە کۆکردنەوەی دەنگوباسی هیزەکانی جود و، ئۆزینی شوینەکانیان. هیزیکی بی سەرو بەر و یەک نەگرتو بو. وەکو «مالی فرە ژن و، ئاشی فرە وەستا و، گوندی فرە کویخا» ئەوانیش «هیزیکی فرە سەرکردە» بون: محەممەدی مەلا قادر فەرماندەی هیزی پارتی و، سەید کاکە فەرماندەی هیزی حسک و، ئەبو عائید فەرماندەی هیزی حشع و، کەریم سەلام فەرماندەی مەفرەزەکەی پاسۆک. کەسیان کاغەزی ئەوی تریانی نەئەخویندەوە. شوینە لاوازەکانمان دۆزینەوە. محەممەدی مەلا قادر، کە لیپرسراوی هیزەکەی پارتی و، وەکو سەرگەورەی هەمو هیزەکانی جود بو، کابرایەکی کویرموشەی چاو کتوکویر بو. ئەبە رۆژ و ئە پەشەو بە پاشی بەرپیی ی خوی ئەئەبینی. لە دوای ئاشبەتالەوە ئەوە یەکەم جار بو بگەریتەوە کوردستان. لە خوی رانەئەدی پیشرەوی زیاتر بکا بۆ ناو قولایی کوردستان. ئەترسا ریگای گەرانەوەی ئیرانی لی ببەستری. هەمویان لە وەرتی دایان کوتا.

*

نەخشەی دەرکردنی جودمان دانا. هەوا ساردی کرد بو. هیزەکانی جود بە شەو هەندی جیگای گرنگیان چول ئەکرد و، بەیانیان زو ئەیانگرتەوە. لەو شوینە گرنگانە: هەلمەوت لە چیای کاروخ و سەری ئەحمەدە لە چیای بیرمکە لەم بەر و ئەوبەری زینی ئەستیروکان.

هیزیک لە گەل حەسەن کویستانی و رەحمان سەیدە لە سیا و سیوەکەوە بە کاروخ دا هەلبگەرین و شور ببنەوە بو ناو وەرتی و کەلیتە.

هیزیک لە گەل شەمال و ئەحمەد مەولود هەلمەوت بگرن و دابەزن بۆ مەکی.

هیزیک لە گەل سەید کەریم و عەلی نەبی پەلاماری زینی ئەستیرۆکان بدەن.

هیزیکی هەریمی ١٤ ی ئاکز سەری ئەحمەدە بگرن.

ملازم عومەریش کە لە قەلاتوکان بو شەر بە هیزەکانی پشتەوەیان بفرۆشی.

سەرەتای مانگی کانونی یەکەم دەسمان کرد بە جیبەجی کردنی.

حەسەن و هیزەکەی لە کاروخ دابەزین بەرەو وەرتی. حاجی برای حەسەن کویستانی لە پشتی وەرتی کوژرا.

حاجی یەکی بو لە پیشمەرگە کۆنەکانی یەکیتی لە ناوچەی گەلالە. گەنجیکی تازە پیگەیشتوی زیرەک و وریا بو. لە پیشمەرگایەتیەوە پیگەیشت بو تا بویو بە فەرماندەی

کەرتی گەلالە لە هەرێمی ٧ ی پالەک.

لەو قۆڵەوە تەنگیان پە هێزەکانی جود هەڵچنی بو. سەید کاکەی فەرماندەی ئەو قۆڵە، کە زانی بوی تێنیان بۆ هاتوه و، مەترسیان کەوتوتە سەر، بە پێشمەرگەکانی وت بو :«بکشێنەوە!» یەکێکیان وت بوی: «ئەگەر ئێرە چوڵ بکەین ناوچەکەمان لێ ئەگرن.» وت بوی: «جا با بیگرن ئێرە چی لێ یە؟ نە بیرە نەفتی لێ یە و، نە مارەیی دایکم لە سەر داناوە. لەم شاخە تا لە شاخێکی ترا» قسەکەیشی راست بو، ئەمە یەکێ بو لە سەرەتا بنەرەتییەکانی جەنگی پارتیزانی کە بە سەلیقە فێری بوبو.

عەلی ئەبی گەیشتە زێنی ئەستیروکان. تەنیا ڕیگا لە رانیەوە بە دولی پلنگان دا بە زێنی ئەستیروکان دا ئەچو بۆ سەرگەلو. یەکێ لەو فەرماندانەی گەیشت بوە سەر زێنی ئەستیروکان وەکو مژدەی گەیشتنیان بە هوکی توکی بە منی وت: «دمایەکە گەیشتە سەر زێنی ئەستیروکان» رادیوی پارتی بە درۆ ئەوندەی باسی هاوکاری یەکێتی و بەعس کرد بو، شیوعیەکان بە هوکی توکی کە گوییان لە وە بوبو، دمایە گەیشتە زێنی ئەستیروکان، باوەڕیان کرد بو، ئەوەندەی تر وورەیان بەردا بو. یەکێکیان هاواری لێ هەستا بە هوکی توکی وتی: «شەرم ناکەن دمایەتان هێناوە؟» برادەرەکەی ئێمە لە «دمایە» مەبەستی عەلی ئەبی بو، کە پیاوێکی کەتەی چوارشانە. بەڵام لە سەرکەوتنی شاخ دا زور گورج و گۆل و، لە هەڵمەت دا ئازا و چاونەترس بو. دوای شەڕێکی کەم جود شکان. هێزەکانی جود کشانەوە ناو وەرتی. دەوری وەرتی مان دا.

ئێوارەی ٢ ی کانونی یەکەمی ٨١ بو، ئەمانویست بۆ بەسەربردنی شەو بچینە وەرتی. بە هوکی توکی ویستمان قسە لە گەل لێپرسراوێکی حشع بکەین. شەمال چەند جاری بانگی کردن، یەکێکیان وەڵامی دایەوە. پێمان وتن: «ڕیگای سۆڵتەمان بە چولی بۆ بە جێ هێشتون، هەموتان ئەتوانن لەویوە برون و وەرتی بە جێ بهێلن.» لە پێش دا وایان تەزانی فێڵیان لێ ئەکەین، دوایی کە زانییان بە راستمانە هەمو هێزەکانی جود لە ڕێگای سۆڵتەوە کشانەوە دولی خانەقا و، بەرەو پشتاشان بە ڕێ کەوتن. ئێمەش دابەزین هەندێکمان بۆ ناو وەرتی و هەندێکمان بۆ دولی خانەقا.

ئوتێلی سیاحی

شیوعیەکان بە دەزگای بیتەڵ مەکتەبی ئیقلیمیان لە ناوزەنگ ئاگادار کرد بو، کە وەزعیان خراپە و، داوایان لێ کرد بون: هەوڵی راگرتنی شەڕ بدەن لە گەل یەکێتی. مەلا ئەحمەدی بانیخێلانی و مامجەلال، پێکەوە بانگەوازێکی هاوبەشیان دەرکرد و، داوایان لە هێزەکانی هەردولا کرد بو دەستبەجێ شەڕ رابگرن و، هەر لایە لە شوێنی خوی دا هەڵویستی دیفاعی وەربگری. هەمان ئێوارە چەند جاری لە رادیوی یەکێتی دا خوێندرایەوە. لە کاتی بیستنی ئەم بانگەوازەدا، شەڕ بە قازانجی ئێمە بە لادا کەوت بو، بەڵام من هێشتا لە کوێستانی مەکۆی بوم لە پشتی وەرتی. دنیا بەفر و هەوا زور سارد بو. حەمە سەعید کە گوێ ی لە بانگەوازەکە بو، وتی: «ئەم کابرایە - مەبەستی مامجەلال بو - زور سەیرە وا ئەزانی لە ئوتێلی سیاحی دانیشتوین هەر کەس لە ژوورەکەی خوی نەیەتە دەرەوە! ئێمە خەریکە رەق ئەبینەوە»

مەکۆ، کوێستانێکی تەخت و بەرین و بەر کراوەیە کەوتۆتە بناری کارۆخ و روبەروی قەندیلە. دەیان کانی سارد و سازگاری لێ هەڵئەقوڵی و، سەدان دارگوێزی گەورەی

لی بو. شوێنێکی خۆش و دلڕفێنە. بۆ گوندی توریستی لە بارە.

*

ئەمجارەش سەید کاکە لە پێش ئەوانی کەدا هەلات بو. بە ڕێگاوە بوبو بەرەو پشتئاشان، هەندی کاروانچی پی گەیشت بو. کاروانچییەکان سەید کاکەیان بە شپرزەیی دی بو لێیان پرسی بو: «خاڵە سەید چی قەوماوە؟» وت بوی: «چوزانم مامجەلال وا ئەزانی حوکمی زاتی لە گیرفانی من دایە، هەرچی منال و تاڵی سلێمانی هەیە ناردویەتیە سەرم!»

*

دەوروپشتی خۆمان قایم کرد. هێزێکمان نارد بو زارگەلی و هێزێک بۆ دوڵی خانەقا و، هێزێک بۆ سەران. «قوەتی مەرگە» مان نارد بچی بۆ سەران کە گەیشت بونە ئەوی بیست بویان هێزێکی جود گەیشتوتە گەرەوان. هێزەکەی یەکێتی زێروی عەبدوللا ڕێوی و، هێزەکەی جود عەریف عەلی فەرماندەیان بو. عەریف عەلی کە بیست بوی هێزێکی یەکێتی گەیشتوتە سەران دەستبەجی کشا بوەوە وای زانی بو ئەچی بۆ سەر ئەو. زێروش کە زانی بوی هێزێکی جود گەیشتوتە گەرەوان دەستبەجی کشا بوەوە وای زانی بو ئەچی بۆ سەر ئەو. هەردوکیان وەکو ئەڵێن: «دزاودز کەوت بون» لە ترسی هێرشی یەکتری کشا بونەوە بۆ دواوە.

ماوەیەک لە وەرتی ماینەوە. ڕاگرتنی شەڕ هیچ جورە ڕێککەوتنێکی سیاسی بە دودا نەهات. بار و دوخی ژیانی هێزەکانی جود لە پشتئاشان و دەوروبەری زور ناخۆش بو. پشتئاشان هیچ ئاوەدانییەکی تی دا نەبو تیا بحەوینەوە. هێزەکانی پارتی نەیانئەتوانی لە قەندیلەوە بگەرێنەوە بۆ ئێران. شیوعیەکان، ئەیانویست هێزەکانی پارتی لە کول خویان بکەنەوە، بۆ ئەوەی خویان ئازادی گەرانەوەیان هەبی بۆ ناوچەکانی ژێر دەسەلاتی یەکێتی. بەفر ڕێگاکانی قەندیلی بەست بو. داوایان لی کردین ڕێگا لە کشانەوەیان نەگرین. ڕێگامان دان. هێزەکانی پارتی لە کەلەکی باڵەیانەوە بەرەو ڕۆژئاوای ڕێگای هامیلتون و، لەوێوە چونەوە بۆ ئێران. بە ڕویشتنی ئەوان گرێیەکی کێشەکە کرایەوە. هێزەکانی حشع، حسک، پاسوک ئەیانتوانی بە ئازادی بە ناوچەکانی ژێر دەسەلاتی یەکێتی دا هاتوچۆ بکەن.

شەڕی ئیبقلیمگیری ئەمجارەی جود - یەکێتی برایەوە، بەلام هۆکانی هەلگیرسانەوەی هەر ما بون.

*

لە گەل هێزەکەی قەلاتوکان یەکمان گرتەوە. مولازم عومەر و هاوڕێکانی هاتن بۆ لامان لە وەرتی.

ئەبو عائیدی لێپرسراوی حشع داوای کرد بو بۆ ڕێکخستنی هەندی کاروبار یەکتری ببینین. لە سەر جادەی خانەقا لە گەل ئەبو عائید یەکتریمان بینی. هەندی قسە و باسمان کرد دەربارەی شەڕەکان. وتی: «وەرتی، ورطه بوا» یەکی لە کارەکانی ئەوە بو ئەیویست هەندی لە هێزەکانیان بە ناو هێزەکانی یەکێتی دا بە سەلامەتی بنێری بۆ ڕوسیا. هێزەکەیان بە ڕی کرد و، ئێمەش چی پێویست بو لە نامە و ڕاسپاردە بۆمان ئامادە کردن.

وەرتی

گەورەترین گوندی ناوچەکە وەرتی بو. بە هوی تەنگیی دولەکە و، قولی ڕوبارەکەوە گوندێکی درێژ بو، چەند گەرەک: سوڵتە، بەرزۆژ، سول و، پینج بەرمباب و، پینج مزگەوتی

تی دا بو.

پیاوەکانی وەرتی نمونەی کوردی رەسەن بون. هەمیشە پوزەوانەیان هەلکیشا بو، خەنجەریکیان بە قەدەوە و، تفەنگیکیان بە شانەوە بو، تەنانەت کە ئەچون بو مزگەوتیش بەو جورە ئەچون. یەکی لە پیشمەرگەکان ئەیوت: «ئەمانە لە کوردی ئەتلەس ئەچن» مەبەستی لە نیگاری ئەو کوردە بو کە لە سەر پشتی ئەتلەسی عیراق کرا بو.

یەکیتی لە ناو وەرتیەیەکان دا بنکەیەکی جەماوەریی فراوانتری هەبو لە چاو حیزبەکانی کەدا. زیاتر لە سەد کەسیان پیشمەرگە بون. ئەندام و پیشمەرگەی حیزبەکانی تریشی تی دا بو. هوی ئەم دابەشبونە سیاسیە لەم شوینە شاخاوییە داپراوەدا بیروباوەری سیاسی نەبو، بەلکو ناکوکی شەخسی و ململانی ی نەوان بنەمالەکانی بو. لەوەدا رەنگی دابوەوە.

## تەگبیرەکەی مام موزرتک

مام موزرتک لە لای وەرتییەکان کسایەتییەکی زیرەک و زانا و، زور بەریز بو. بە تەگبیر و رای ژیرانە ناوی دەرکردوە. زور نوکتە و قسە و تەگبیر لە زمانی ئەوەوە ئەگیرنەوە. شانازیی ئەکەن کە پیاویکی وایان تی دا هەلکەوتوە. یەکی لەو قسانەی ئەیگیرنەوە ئەم تەگبیرە بوە:

میری سوران چەند کەسی ئەکاتە سەر دانیشتوانی وەرتی بو مردوانە و باجی تری لەو بابەتە. پارەکەی داوای ئەکەن زور ئەبی. خەریک ئەبی مان بگرن لە دانی. پرس بە مام موزرتک ئەکەن کە چی بکەن. مام موزرتک ئەلی: «ئەگەر مان بگرن نیردراوەکانی میر بە شکاتەوە ئەرونەوە، میر هیزیکی گەورە ئەنیریتە سەرتان باجەکەتان لە سەر زیاد ئەکا و بە زوریش لیتان ئەسینی و ئازاریشتان ئەدا. چاک وایە باجەکە کو بکەنەوە و بیاندەنی و میوانداریەکی شاهانەیشیان بو بکەن، بەلام لە رویشتن دا چەند کەسی بنیرنە سەر ریگایان، روتیان بکەنەوە و باجەکەیان لی بسیننەوە و هەمویان بکوژن یەکیکیان نەبی، ئەویش بە سەر و دەستی شکاوەوە ئیزن بدەن بروات هەوالەکە بباتەوە بو میر، بلی: وەرتییەکان زوریان ریز لی گرتین، میوانداری چاکیان کردین، باجەکەیشیان کو کردەوە و دایانینی، بەلام لە ریگای گەرانەوەدا جەردە هاتە سەرمان روتیان کردینەوە و ئەوانیان کوشت و منیشیان ئاوا لی کردا»

*

لەم شەرانەدا (هاوین و پاییزی ٨١) وەرتی و، دانیشتوانی ئازاری زوریان دی بو. چەند کەسی لە گەنجە ئازاکانیان کوژرا بو، چەند کەسیکیان لی گیرا بو. ئەرکیکی زوریشمان بە سەریانەوە بو. ویستم دلیان بدەمەوە. بەر لە گەرانەوەم نیوەرویەک هەمو پیاو ماقولەکانیانم بانگهیشت بو نانخواردن، بو ئەوەی هەندی قسەیان بو بکەم، ئینجا خوا حافیزییان لی بکەم.

لە هولی مزگەوت کو بوینەوە. هەندی قسەی گشتیم بو کردن. لە ناو بانگراوەکان دا تیبیان دا بو سەر بە لایەنەکانی تر بون. نەمویست هەستی کەسیان بریندار بکەم. بە داخەوە باسی شەری ناوخوم کرد و سپاسی هەموریانم کرد کە پیمانەوە ماندو بون. ئیتر کەوتینە قسە و باسی ئاسایی. گفتوگو لە گەل خەلکی وەرتی زور خوش بو. یەکیکیان لی ی پرسیم: «چەند منالت هەیە؟»

زور جار ئەم پرسیارەیان لی کردبوم، لە ناو ئەو کومەلانەدا بە گەنجی ژنیان ئەهینا و، ئەگەر یەکی لە تەمەنی من دا بوایە و هیشتا سەلت بوایە پییان سەیر بو. ئەبو ناتەواوییەکی هەبوایە، ئەگینا چۆن ئەبی ژن و مندالی نەبی؟

وتم: «هیچ!»

بە سەر سورمانیکەوە وتی: «بوچی هیچ منالت نیە»

وتم: «چونکە ژنم نەهیناوە»

وتی: «بوچی ژنت نەهیناوە؟»

وتم: «کەسم پی رازی نەبوە»

وتی: «چۆن کەست پی رازی نەبوە؟»

وتم: «ئەوەی من پی ی رازی ئەبم ئەو بە من رازی نابی و، ئەوەیش کە بە من رازی ئەبی، من پی ی رازی نابم.»

کابرا هەر لە سەری رویشت. ئەیویست موجامەلەی من بکا و منیش ئەمویستم ئەم باسە کوتایی پی بهینم وتم: «مام کویخا کچت هەیە؟»

وتی: «بەلی»

وتم: «باشە، کچەکەی خوتم بدەری!»

وتی: «ئەو سەگە بە کەلکی تو نایەت، بوت ئەدەم بە خوین»

وتم: «بوچی بوم ئەدەی بە خوین، من بە خوی رازیم»

وتی: «کچەکەی من مانگادوشین ئەزانی، تو پیاویکی خویندەواری ئەبی ژنیکی خویندەوار بهینی!»

وتم: «ئەوەتا توش پیم رازی نابی!»

زور جار ئەم پرسیارەیان لی ئەکردم، نەمئەزانی چۆنیان وەلام بدەمەوە. بو ئەوەی لەم «محاکمە» یە نەجاتم بی، لە بەهاری داهاتودا ژنم هینا.

*

لە گەل ملازم عومەر و عەبدولرەحیم و سامان .. بەری کەوتین بەرەو قوناغی داهاتومان لە قەلاتوکان. شەومان بە قسە و باس لە گەل کویخاکانی مەنگور بە سەر برد. بەیانی بەری کەوتین، ئیوارەیەکی درەنگ گەیشتینەوە ناو زەنگ. برادەران بە بونەی سەری سالەوە لە «هولی شەهید شەهاب» ئاهەنگیکیان ریک خست بو.

*

# سالی ١٩٨٢

## شیرکۆ و چلورەفرۆشەکان

بنکەکەمان تاقمێکی تێکەڵی سەیری شاری و لادێیی، گەنج و کامڵی خوێندەوار و نەخوێندەوار بو. جگە لەوانەی کە بە دایمی لەوێ بون، زۆرجار پێشمەرگەی خەڵکی سلێمانی ئەهاتن، چەند مانگ یان چەند هەفتە ئەمانەوە، تا چاویان ئەکرایەوە، ئینجا ئەچون بۆ یەکێ لە تیپەکان.

دو لە پێشمەرگەکان: مامە قالە و مام شێرکۆ. هەردوکیان لە ئەرکی رۆژانەی بارەگاکە، وەکو چێشت لێنان، قاپ شتن، نان هێنان، بازار کردن، ئێشکگرتنی شەوانە.. بەخشرا بون. مامە قالە و مام شێرکۆ نمونەی دو کەسایەتی جیاواز و خۆش بون.

شێرکۆ، ناوی مام قادر و خەڵکی گوندی بیمۆش و ماڵی لە ژاراوە بو. ژن و منالی نەبو. لە شۆرشی ئەیلول دا لە لقی مامەرەزاییەکان پێشمەرگە بو. دوای ١١ ی ئازار بویو بە «حەرەس حدود». لە ئاشبەتاڵ دا گەرابوەوە کوردستان و، لە گەڵ عەلی عەسکەری هات بوە دەرەوە و، هەر لە گەڵ ئەو بو. کاک عەلی کە بە ری کەوت بەرەو برادۆست ٤ کەسی لە پێشمەرگەکانی: مام قادری بیمۆشی، مام ساڵحی مالومەیی، مام ئەحمەدی سیکانیانی، خالە حەمە.. لە بەر پیری لای ئێمە بە جێ هێشت. هەر چواریان «حەقە» و «مامە رەزایی» بون، زۆر بە دڵسۆزی دوای کاک عەلی کەوت بون. بە درێژایی ماوەی قەندیل لە گەڵ ئێمە مابونەوە و، هەر چواریان پیکەوە بون. پێشمەرگەکانی تر بۆ خۆشیی ناویان لێ نابون: «العصابە الاربعە». دوای فەوتانی کاک عەلی ئیتر شتێک نەما بو پیکەوەیان کۆ بکاتەوە. خالە حەمە و مام ئەحمەد تەسلیم بونەوە. مام ساڵح چوە لای مامجەلال و مام قادر هاتە لای من. پێشمەرگەکانی لای من هەمو شاری و گەنج بون، ئەمیش بە هاندانی پێشمەرگەکان ناوی خۆی گۆری بە شێرکۆ و، بۆ نازداریش جاروبار پێیان ئەوت: «شێرە!».

شێرکو هەتا بڵێ ی پاک و خاوێن و، ریشی تاشراو و سمێڵێکی قنجی هەبو. سەر و سمێلی بۆیە ئەکردەوە بەلام نەیئەهێشت کەس پێ ی بزانی، دەمیشی تاقمی تێ دا بو، بەلام کەس نەی دی بو. کە خورما و رۆنیان دروست ئەکرد، شێرکۆ نەیئەخوارد ئەیوت: «دانم دێشێنێ». هەمیشە خۆی بەست بو و تفەنگەکەی بە شانەوە بو. حەزی لە میوانداری و هاتوچۆی ماڵەکانی شێنی ئەکرد. لە گەڵ مامە قالە ناکۆک و، زۆر جار شارییەکان تورەیان ئەکرد. کە سێخورمەی تیوە بۆەنرایە یا کتوپر تەقەیان لە شتی هەڵبسانایە، رائەچڵەکی و یەکسەر جنێوێکی ئەدا. زۆری حەقەکان وا بون.

کە تورەیان ئەکرد، زۆر جار قسەیەکی بە من ئەوت و، ئەیوت: «بە تەمایە بە چلورەفرۆشەکانی سلێمانی کوردستانم بۆ رزگار بکا!» لای وابو گەنجەکانی سلێمانی هەمو چلورە فرۆش بون و، چلورە فرۆشتنیش کارێکی ناشیرینە.

مامە قالەیش، خەڵکی سەنگسەر بو. لە داربرین و دار شکاندن دا زۆر شارەزا و بەکار بو، داری هەمو زستانەکەی بارەگاکەی ئێمە ئەم ئەیبری و ئەیشکاند. هەرچی ئاژەڵ و

ولاخیکیشمان هەوایە ئەم خەمی جیگا و لەوەری ئەخواردن. هاوینانیش بیستانی تەماتە و سەوزەی بۆ ئەکردین. بەشیکی گرنگی پیویستیەکانی بنکەکەمان ئەم دابینی ئەکرد. شیرکو خوی لەم کارانە نەئەگەیاند، لە بەر ئەوە مامە قالە زۆر جار تانەی لی ئەدا و ئەچو بە گژی دا.

مەسئولی تەور

بەیانییەکیان شازاد لە بەزمیکی سەیر خەبەری بوبوەوە. ئەژدەر، لە سلیمانی زەرەنگەر بوبو، ماوەیەک بو لە بارەگەکەی ئیمە میوان بو. ئەژدەر، بی پرسی مامە قالە، ناشیبانە دەسکاری تەوریکی کرد بو، دەمەکەی کول کرد بو، ئەویش بە توندی پیا هەلشاخا بو. ئەژدەریش پی ی وت بو: «بۆ تورە ئەبی خۆ تۆ مەسئول نیت؟» مامە قالە زیاتر هەلچو بو، تیرو پر جنیوی بە ئەژدەر دابو وت بوی: «چۆن مەسئول نیم من مەسئولی تەورم!»

شازاد ئەیوت دیارە وشەی مەسئول ئەوەندە خۆشە تەنانەت ئەگەر هی تەوریش بی هەر خۆشە و گرنگە.

*

دەوەن بە ئاش

هەندی لەو پیشمەرگانەی بۆ ئیشوکار ئەهاتن بۆ سەرکردایەتی زۆر جار میوانی من ئەبون. جاریکیان غەفور دەرشیشی و نەبی چالاک میوانم بون. هەردوکیان ئەندامی کۆمەلە و، فەرماندەی کەرت بون. ئەویان خەلکی هەورامان و ئەمیان خەلکی بالەکایەتی بو. هەر لەو کۆرەدا: خەجی، ریبەری «ئالای رزگاری» و، یا حەلیم، ژنیکی بالەکایەتی، میوانم بون.

غەفور شارەزای بنیشت کردن بو، هەمو سالی خوی و پیشمەرگەکانی کەرتەکەی لە لیرەوارەکانی هەورامان بنیشتیان ئەکرد. زۆرجار خەرجی چەند مانگیکی خۆیان و خیزانەکانیان دەرئەهینا. هەندی پرسیارم لی کرد لە سەر جۆری بنیشت کردن و، کەرەستەکانی و، بەرهەمی ئەوسالەیان.

ئینجا لە نەبی م پرسی: «ئەمسال لە هیچ لایەک چون بۆ کەوشان؟» غەفور پیاویکی قسەخۆش و زیرەک، بەلام لە رەوشت و خوی کۆمەلایەتی دا «محافظ» بو، پرسی: «کەوشان چیە؟» نەبی وتی: «لە بەهاران دا کە گول ئەگەشیتەوە و، کوارگ و ریواس و کنگر و.. پەیدا ئەبی، گەنجەکان: کور و کچی گوند یا چەند گوندی، بەیانییان کۆ ئەبنەوە، ئەیکەن بە شایی و رەشبەلەک، دوای ئەوە، بە کۆمەل و بە جوت، بۆ کۆ کردنەوەی گژ و گیا، بە دەشت و چیادا بلاو ئەبنەوە. عەسر بە چارۆکەی پر لە گیا و کوارگ و گولی بۆنخۆش و جوانەوە لە چیا دائەبەزن، دیسان کۆ ئەبنەوە شاییەکی رەشبەلەک ئەکەن و، بلاوەی لی ئەکەن هەر کەس بۆ مالی خوی.»

ئەم سەیرانە بەهارەیە نەریتیکی باو و دیرینەی ناوچەی بالەکایەتیە. گۆرانیەکی بە ناوبانگی حەسەن زیرەک لە سەر «کەوشان» ، کە ئەلی:

کیژان دەچنە میرگولان،
بە عام دەچن هەلالان
عارەق لە هەنیەی دەتکی، تەر دەکا وردە خالان

کیژان دەچنە میرگولان،
بە عام دەچنن ڕەنەوشان
عارەقی سنگ و مەمکی، تەر دەکا پاژنەی کەوشان

نەبی زۆر بە گەرمی و خۆشیەوە باسی ئەکرد. غەفور تورە بو، وتی: «چۆن ڕێگە ئەدەن خوشک و دایکتان شتی وەها بکەن..؟» نەبی چوەوە بە گژی دا، وتی: «خوشک و دایکی ئێوەش لەوی بونایە ئەچونا» خەریک بو دەمیان لە یەک بگیری. مشتومڕەکەیان چیرۆکی «دەوەن بە ئاش» ی بیر هێنامەوە.

ئەگێڕنەوە: دو ڕێبوار لە ڕێگا بە یەک ئەگەن. یەکەمیان لە ئاش ئەهاتەوە و دوەمیان ئەچو بۆ ئاش. هەردوکیان باراشیان پێ بو. دوەم لە یەکەم ئەپرسی: «ئاشەکە چۆل بو یا قەلەبالغ بو؟»

یەکەم ئەلی: «زۆر قەرەبالغە، ئەبی سەرە بگری، ڕەنگە بە ٣ ڕۆژی تر سەرەت نەگاتێ»

دوەم ئەلی: «دەسا من لەوی بومایە سەرەم نەئەگرت و، لە پێش هەموتانەوە باراشەکەم ئەهاڕی»

یەکەم ئەلی: «نەتئەتوانی!»

دوەم ئەلی: «ئەمتوانی!»

وا ڕێک ئەکەون، دەوەنێک کە لە سەر ڕێگاکەیان دا ئەبی بکەن بە ئاش و، بزانن کامیان ئەتوانێ نۆرەبڕێ بکا و باراشەکەی لە پێش ئەوی کەدا لی بکا. لە ئەنجامی ئەم مشتومڕەدا باراشەکانیان ئەرێژن بە سەر دەوەنەکەدا و یەکتریش ئەدەنە بەر خەنجەر.

هەمو ناوچەی بالەکایەتی ڕاگوێزرا بو، جەیش لوتکەی شاخەکانی بە «ڕەبیە» تەنی بو، کێ ئەیتوانی بچی بۆ «کەوشان»؟ کەچی ئەمان خەریک بون لەم ژورەدا هەمان بەزمی «دەوەن بە ئاش» دوبارە بکەنەوە. بە ناچاری هەردوکیانم بێدەنگ کرد و، باسێکی ترم لە گەل دامەزراندن.

غەفور لە سەر «وورەی مرۆڤ» قسەیەکی نەستەقی هەبو: «ئەیوت ئەگەر کێوی شەنروی بروخی بە زەلام ئەگیرێتەوە، بەلام ئەگەر زەلام بروخی بە هیچ شتی ناگیرێتەوە!»

*

میتەرولوجی

شێنی بیەکان لایان وابو: هەر هاوینی زەردەزیرە زۆر بی، ئەوساڵە زستانەکەی سەخت ئەبی. ساڵی ١٩٨١ هاوینەکەی زەردەزیرە زۆر و، زستانەکەی سەخت بو. بەفرێکی زۆر باری. سەیر ئەوەبو لە گەل کریوەی بەفردا هەورە تریشقە و هەورە گرمەی زۆری لە گەل بو. ئەم دیاردە سروشتییەم هەر لەوی دی بو. ئەو زستانە کەوتمە کۆکردنەوەی هەندی لەو وشانەی پەیوەندییان بە دۆخی ئاسمان و گۆڕانی کەش و هەواوە هەبو. وشەکان هەمویان ئاشنا و ناسراون، بەلام کۆکردنەوە و لە یەک دانیان وەکو ریزە زاراوێکی میتەرولوجی ڕەنگە بی کەلک نەبی، بە تایبەتی کورد هێشتا هیچ دەزگایەکی تایبەتی بۆ لێکۆڵینەوەی لەم بابەتەی نیە.

*

هەوا کە سارد ئەکا، تا ئەندازەی ژێر سفر، ئەرز و ئاو ئەیبەستی( :رچیان،

جەمەدین). توێژی سەرەوی ئاوی گۆم و زەلکاو ئەبێ بە سەحۆلْ (:بەستەڵەک، شەختە، جەمەد، بوز) و، ئاوی سەر ئەرز ئەبێ بە زوقم(: خوسار، سپخوار) و، چۆراوگە ئەبێ بە چلورە.

هەوا کە گەرم ئەبێ، هەڵم لە ئاو، هالاو (:هۆق) لە ناو کشتوکاڵ و، گرە و سەهۆن لە دەشت هەڵئەکا.

ئەگەر هەور ئاسمانی گرت، هەورەکە گەواڵْ گەواڵْ (:پەڵە پەڵە) ئەوەستێ، یا هەموی دائەگرێ. هەور تیرە و تاریک، چڵکن، سپی ئەبێ.

ئەگەر هەور لە ئاسمان رەوییەوە (:هەلی هورنگاند)، بە رۆژ شینایی ئاسمان و، بە شەو ئەستێرەکانی دەرکەوتن، بە رۆژ ساماڵْ یا هەساو و، بە شەو سایەقە ئەبێ. شەوی سایەقە لە زستان دا سارد ئەبێ ئەرز و ئاو ئەیبەستێ.

ئەگەر هەور لە ئاسمان دا بەستێ لە شێوەی باران، بەفر، تەرزەدا ئەبارێ.

باران نم نم، یا بە تاو، یا بە خوڕ، یا بە خوڕەم ئەبارێ. بارانی بە خوڕ، رەهێڵە، لێزمە، لەنگبزە ئەکا. زۆرجار بروسکە (:هەورە تریشقە، چەخماخە) و، هەورە گرمەی لە گەڵ ئەبێ.

کە باران بەهاری و، لە هەمان کات دا هەتاو بێ، گورگەزێ بە و، کە ماوەیەک بە خور بباری و خۆش بکاتەوە تاوە، کە سەرانسەری وڵات بگرێتەوە ئیقلیمگیرە، کە لە گەڵ بەفر بباریْ شڵێوەیە.

لە سەرەتای پایزدا پەڵە ئەدا. پەڵە بارانێکی نەرمە چەند شەو و رۆژ لە سەر یەک خۆش ناکاتەوە تا ئەرز تێرئاو ئەبێ، ئاوی لە سەر رائەوەستێ.

دوای بارانی پەڵە چەن رۆژێ هاوینە پچکۆلەیە، هەوا خۆش و دنیا گەرم ئەبێ.

بەفر (:بەرف، بەور) ئەگەر زۆر بباری کەرپوە و، ئەگەر کەم بباری پروشە ئەکا. بستێک، قولانجێک، ئەژنۆیەک یا گەزێک و زیاتری تێ ئەکا. لە شوێنێکی بەرزەوە کە با بەفر ئەبا بۆ شوێنێکی قوڵتر و پری ئەکاتەوە باپزوە. لە لێژایی چیا بەرزەکانەوە هەرەس (:رنو) دێ. لە کۆتایی بەهار دا بەفر ئەچێتەوە، کوێستان خاڵْ خاڵْ ئەبێ.

بەفرەلوکە، بەفرێکی خاوە کلوەکانی بە تەواوی نەیبەستوە زو ئەتوێتەوە.

بەفرخۆرکە، بەفرێکی نەرم و وردە لە کۆتایی بەهاردا بە سەر بەفری زستان دا ئەباری و، ئەیتوێنێتەوە.

تەرزە (: تەرزە، گلێرە، تەگرەگ، تەورگ) بە دەنکی رەقی گەورە یا پچوک ئەباری. کەلا و گوڵ ئەکوتێ.

تەرزەلوکە، نەوەکو تەرزە رەقە و نەوەکو بەفر نەرمە زو ئەتوێتەوە.

بارانی زۆر ئەتوانێ لافاو (:سێلاو، لێمشت، لێشاو، لەهی)ی لێ هەڵبستێ.

لە کۆتایی زستان دا ئەرز تێر ئەبێتەوە، کە باران ئەباری نایێْ بە قوڕ و لیتە.

لە کۆتایی بەهار و لە هاوین دا شەو دڵۆپی ئاو لە سەر گژوگیا و گەلا شەونم (:ئاونگ، خوناو) دروست ئەکا.

لە ناوەراستی تەموزدا تاوێک باران ئەباری بۆنێکی خۆش لە ئەرز هەڵئەستێ.

بە درێژایی ساڵ و، لە هەمو وەرز و لە هەمو رۆژێک دا با ئەتوانێ بوەزێ (:هەڵ بکا)، بای وەشت بارانی بە دوادا ئەباری، بای دارناوس لە کۆتایی زستان دا هەڵئەکا و دار

و درەخت گۆپکە و چرۆ ئەکا. بای خەزان کۆتایی پایز هەڵئەکا گەڵای زەردی درەخت هەڵئەوەرێنێ.

بای شەماڵ لە لای سەرووەوە ئەوزێ و، فێنک و نەرمە، بارەش یا رەشەبا لە لای خوارووەوە هەڵئەکات توندە، لە هاوین دا گەرمە دوای نیوەڕۆیان ئەبێ بە گڕە و شەرا و، لە زستان دا ساردە ئەبێ بە کزە، کە لە گەڵ بەفر و باران بێ، یا لە گەڵ یەکیکیان بە پێ ی توندی و نەرمی ئەبێ بە زریان، زەلان، وەیشومە، فەرتەنە، باسریشک، تۆفان.

هەندێ ڕۆژی زستان هەور دائەبەزێ، سەر ئەرز ئەبێ بە تەم (:تەمومژ، تەمتومان).

هەندێ ڕۆژی هاوین هەور تەپوتۆزی بیابان ئەهێنێ، ئەبێتە خۆڵ بارین.

تێکچوونی دۆخی هەوا، ناوچەی گوشاری بەرز و نزم دروست ئەکا، گێژەلوکە لە ئاسمانەوە بەرەو زەمین و گەردەلول لە زەمینەوە بەرەو ئاسمان (:گەرەپێچ، باهوز، باهەلیسک) ی لێ پەیدا ئەبێ.

*

کورد ناوی مانگەکانی ساڵی بە گوێرەی کەشی ئەو مانگە ناو ناوە: خاکە لێوە. بانە مەڕ. جۆزەردان. پوشپەڕ. گەلاوێژ. خەرمانان. ڕەزبەر. خەزەلوەر. سەرماوەز. بەفرانبار. ڕێبەندان. ڕەشەمە.

لە هەندێ شوێنی کە بە مانگی مارت ئەڵێن: هەرمێ پشکوان و، بە نیسان: شەستە و، بە مایس: بەختەباران و، بە حوزەیران: بارانبڕان و، بە تشرینی یەکەم: گەڵاڕێزان و، بە تشرینی دووەم: سەرپەلە.

*

هەمو ناوچەیەک کۆمەڵی لەم زاراوانەیان هەیە، هەندێکیان لە گەڵ ئەمانەدا هاوبەشن، بەڵام هەندێکیان ناوی دیاردەیەکی سروشتە لەوانەیە لە ناوچەکانی ترا نەبێ. نوسینەوە و بەکارهێنانی ئەم وشانە زمان دەوڵەمەن ئەکەن.

*

پێشینان وتویانە: «ئەگەر با بێ و ئەگەر باران، لە عومری زستان کەم ئەبێتەوە»، هەروەها: «لە زستان شەوێ، لە پیران تەوێ»، هەروەها: «لە هەمو هەوری باران نابارێ». هەروەها: «باران بەهاری ئاشی ئەگەڕێ، باران نەبارێ جوتی ئەگەڕێ»، هەروەها: «بەفری بەهارێ، تا پێ‌یەی دارێ، ئاگاتە ئێوارێ»، بۆ یەکێ کە تەمێ خواردو نەبوبێ لە تەجروبەکانی ڕابوردو ئەڵێن: «نە بای دیوە و، نە باران». بۆ مشور خواردنی بێ سودی دوای لێقەومان، ئەڵێن: «لە پاش باران کەپەنک».

*

## هەوڵی ئاشتبونەوە

دوای ئەو شەڕانە هەموومان هەستمان بەوە ئەکرد، کە لەم شەڕانەدا هێزو توانای گەلەکەمان دائەچۆڕێ. لە زۆر لاوە بە هەمان مەعنا نامەمان بۆ ئەهات بە تایبەتی لە ئەدیب و نوسەر و پیاوە ناسراوەکانی شارەوە. لە ناو خۆمان دا بە دوقۆڵی و سێ قۆڵی و، لە چەندین کۆبونەوەی مەکتەبی سیاسی و کۆمیتەی سەرکردایەتی دا باسی چارەسەری ئەم بەڵا کوشندەیەمان ئەکرد و، ئەگەڕاین چارەیەکی بۆ بدۆزینەوە. بڕیارمان دا هەوڵێکی زۆر بدەین

بۆ ئەوەی کوتایی پی بهێنین. یەکەمینیان لە ڕێگای دەزگاکانی ڕاگەیاندنەوە: وتارەکانی ڕادیو و بڵاو کراوەکان، زەمینەی بۆ خۆش بکەین. دوەمینیان بکەوینە پەیوەندی ڕاستەوخۆ لە گەڵ هەمو لایەنەکانی پەیوەندیدار.

*

من و شەڕی ناوخۆ!

ئەوسایش و، هەتا ئیستایش هەندی لە سەرانی پارتی و حشع و لایەنەکانی تر لە ناو هاوڕیکانم دا من بە یەکی لە توندڕەوەکان دائەنین، بەشێکی شەڕی پڕوپاگاندەیان لە دژی من بوە. ڕاستیەکەیشی چەند جارێ من سەرکردایەتی لەشکرکیشیەکانی یەکیتیم کردوە. لیرەدا چەند وتاری دەقاودەق دوبارە ئەنوسمەوە کە لە کاتی خۆی دا دەربارەی شەڕی ناوخۆ، دوای گەڕانەوەم لە شەڕەکان، وەکو سەروتاری کۆمەڵە لە ژمارەکانی کانونی دوم و شوباتی ١٩٨٢ دا بە ناوی ناوەندەوە نوسیومە. ڕەنگە خوێنەوار تا ئەندازەیەک لە بیروبۆچونەکانم بگا.

*

وتاری یەکەم:

گەلەکۆمەکێ ی چەکدار - سیاسی لە خزمەتی کێ دایە؟

هاوین و پایزی ساڵی پار، هەندی شوینی پاریزگاکانی هەولیر و سلیمانی بون بە مەیدانی زۆرانبازییەکی چەکدار - سیاسی توندوتیژی خویناوی لە بەینی پیشمەرگەکانی ی ن ک و چەکدارەکانی هەندی حیزبی تردا.

زۆرانبازی چەند مانگی ڕابوردو، دریژە کیشانی ڕوداوە پچرپچرەکانی چەند مانگ و بگرە ساڵی پیشوتر بو، بەڵام ئەمجارەیان چەشنیکی بەرینتر، فراوانتر، توندوتیژتر و نەخشە کیشراوی بە خۆیەوە گرت بو، کە خۆی نواند لە گەلەکومەکی ی چەکدار - سیاسی ٤ قۆڵی چەند حیزب و ڕیکخراوی جۆراوجۆری جیاواز لە ڕوی ڕیبازی ئایدیولوجی و سیاسیەوە. وە پیشتریش بە ژاوەژاویکی پڕوپاگاندەیی خەست و فراوانی ناڕاست، لە بارەی «ڕیککەوتنی نهینی» ی ن ک لە گەڵ ڕژیمی صەددام بو لیدانی «هیزە نیشتمانییەکان» و ڕیگرتن لە «چالاکی شۆڕشگیرانەیان دژی ڕژیم» زەمینەی بۆ خۆش کرا بو.

ڕوداوەکانی ئەم دواییەیش، وەکو هی جارەکانی تر، مایەی پەژارە و جیگەی پرسیاری کۆمەلانی خەلک بون، چونکە ڕەوتی بەرەو پیشەوە چونی شۆڕشی کوردستان و ئاقاری خەباتی سیاسی و پیشمەرگەیی لە شا ری ی ئاسایی خۆی لا ئەدا و، لە شەڕی کوردەوە دژی هیزی حکومەتە داگیرکەرەکانی کوردستان، ئەیگۆڕی بە شەڕی هیزەکانی کورد لە گەڵ یەکتری ڕو بە «کورداندنی شەڕەکە»، بە تایبەتی لە کاتیک دا کە لە ئەنجامی گەرمبونی ئەبەردەکانی جەنگی عیراق - ئیران دا لە بارترین هەلی میژویی، لە دو دیوی نیشتمانەکەی دا، بۆ بزوتنەوەی ڕزگاری نیشتمانی گەلی کوردستان - لە سەر ئاستی ستراتیجی بۆ جولانی سیاسی، وە بۆ دەسومشاندنی کاریگەر و کوشندەی هیزە شۆڕشگیرەکان لە دوژمنانی داگیرکەر - لە سەر ئاستی تاکتیکی، هەلکەوت بو.

*

لە گەڵ کۆمەلانی خەلکی کوردستان دا، ئیمەش لە پەژارەدا بوین، چونکە هەفتە نەبو بە ناڕەوا چەن هاوولاتیەکی کوردستان لە شەڕی ناوخۆدا، لەوانە چەندین هاوڕی ی

هەلکەوتو و هەڤالی دلری نیمە، نەکوژرین..
لە گەل کۆمەلانی خەلکی کوردستان دا، ئیمەش ئەمانپرسی: بۆ؟ ئەم شەرە لە پای چی؟ بۆ سودی کی؟ قوربانیەکانی ئەم شەرە کین؟ بۆچی و لە بەر چی.. هەرچەند هەلومەرجی دەسپیکردنی کاریکی جیددی یا کاتی وەشاندنی گورزیکی کوشندە لە دوژمن ئەگات؟ تەقاندنەوەی ناکۆکی لاوەکی و هەلگیرساندنی شەری ناوخۆ و کوردانەنی شەر و خەریک کردنی هیزی پیشمەرگەی ی ن ک کە بە دریژایی شەش سالی رابوردو هەر ئەو هیزی سەرەکی و کاریگەری بە گژا چونەوەی رژیمی عیراق و دەزگا دامرکینەرەو، جەهەننەمیەکانی بوە لە کوردستان دا، لە دوا شیکردنەوەدا بە قازانجی کی یە؟
گوایە دنیای کورد ئەوەندە بە خیرایی لە گوران دایە، کە تەرازوی هیزەکانی ناوی و سروشتی سیاسی و چینایەتیەیان و، بیروباوەر و بۆچون و ریباز و، ئوسلوبی کار.. یان وەها زو بگوری؟
- ئەوانەی کە ئاشبەتالیان رەفز کرد و بە چەکی شر و توانایەکی کەمەوە ریگەو چیاکانی کوردستانیان گرت و لە ناخۆشترین هەلومەرجی نایەرامبەری تەرازوی هیزەکانو رژیم و هیزەکانی سەرجەم ئۆپۆزیسیونی عیراق دا، بە توانایەکی کەمەوە، دژی دوژمنیکو بەهیز و در، خەباتی چەکدارانەیان دەس پی کردەوە..
- ئەوانەی ئالای چەسپاندنی گیانی پیکەوەژیانی دیموکراتی بیروباوەر و حیزب و ریکخراوی جیاجیایان هەلکرد، بە جۆریک کە بۆ گالتە پی کردن، بە بارەگاکانو سەرکردایەتیان ئەگوتن: دژلی ئەحزاب!
- ئەوانەی کە ئالای روخاندنی رژیمی صەددام و دامەزراندنی رژیمیکو دیموکراتیان لە عیراق دا هەلکرد و، نەک جاری بەلکو سەدان جار، بانگی هەمو هیز و حیزبەکانی عیراقیان ئەکرد، کە هیز و توانای خۆیان لە بەرەیەکی یەکگرتودا دژی رژیمو صەددام یەک بخەن و خەباتی چەکدار لە روی سەرکردایەتی کردنی و پیکهاتنی هیزەکانو و مەیدانی چالاکیەوە بکەنە شورشی هەمو عیراق..
بەلی ئەوانەی کە بە رەنج و ماندوبونی چەند سال و بە خوینی سەدان شەهیدا راستیی ئەم دروشمانەیان سەلماند و بناغەکەیان دارشت، لە کاتیک دا کە زۆر کەس و زۆ لای تر ئەمەیان بە خەیال و سەرەرویی و پیلانگیران و نۆکەرایەتی ئەم و ئەو لە قەلە ئەدا..
تۆ بلی ی دنیای کورد ئەوەندە زو بگوری؟. ئەمانە هەمو بونە نۆکەری هەمان رژیمو کە لە ماوەی شەش سالی خەباتی پر کویرەوەری و مەینەت و تالی دا، زیاتر لە هەزار هەڤاا و هاوری ی بە نارەوا لە شەری نایەرامبەر و، لە ژیر ئازار و ئەشکەنجە و، لە پای قەنارەد کوشتون و، دەیان هەزار کەس لە خوشک و برا و دایک و باوک و خزم و خیزانی ئیمەا کردون و ئازار داون و لە زیندان و گرتوخانە و سەربازگەکان دا توند کردون و، زیاتر ل هەزار گوند و دیبان کاول و لە گەل خاک دا یەکسان کردون؟
کورد گوتەنی: سەیرە لە کویدا!
تۆ بلی ی ئەوانەی لە سەردەمی ئەو تراجیدیە سامناکە ناخۆشەدا خۆیان لە جەنگەو تراجیدیاکەدا زیاون و بەرگەیان گرت و هیچ نەبی ئەوساکە لە کوردستان دا هەر ئەوان بو، کە هیزی سەرەکی سیاسی و چەکداری بە گژا چونی رژیم بون، ئیستا بونە نۆکەری رژیم

پاریزەری صەددام و هێزە داگیرکەرەکانی، وە ئەوانەش کە ئەوسا تەماشاچی و رەخنەگر و سەیرکەر و توهمەت بە پالدەر و گیرەشێوێن و ریز تێکدەر.. بون، بوینە پاریزەری شۆرش و قازانجەکانی جەماوەری کوردستان و ریبازی شۆرشگێرانە؟
لە گەل کۆمەلانی خەلکی کوردستان دا، ئێمەش ئەپرسین بۆ؟
ئاخۆ ئەو گەلە کۆمەکی بەی لێبیان کردبێ و ئەو شەرەی پەیمان فرۆشتبێن لە سەر ئەوە بو کەوا ئێمە لە بیروباوەری خۆمان هەلگەراوینەتەوە و لە دروشمەکانی خۆمان پەشیمان بوینەتەوە و «ئەمانەوێ چارەنوسی خۆمان ببەستینەوە بە چارەنوسی رەشی رژێمە خوینریژە رزیوەکەی صەددام»؟ و، ئەمانەش گەرەکیان بو بە رێگەی گەلەکۆمەکی ی چەکدار - سیاسی، لە مەیدان دەرمان بکەن و بمانکەنەوە بە ناو رژیم دا، یان بە زۆر بمانهێننەوە سەر رێگای راستی شۆرش و قازانجی جەماوەرا

*

هەمو زۆرانبازیەکی سیاسی بێگومان زەمینەیەکی مادی هەیە و لە راستی دا نواندنەوەی ململانی ی چینایەتی بەینی چین و توێژە کۆمەلایەتیە جیاوازەکانی ناو کۆمەلە، کە هەر یەکەیان بە پی ی دەسکەوت و قازانجی چینایەتی خۆی، لە روانگەی تایبەتی خۆیەوە سەیری روداوەکان ئەکا، هۆکانی دەس نیشان ئەکا، رێگەی چارەسەر کردن و ئوسلوبی کار بۆ کردنی دیاری ئەکات.
لە دۆخێکی وەکو ئێستای رۆژهەلاتی ناوەراست دا، کە یەکێکە لە ناوچە هەرە گرنگەکانی دنیا، وە یەکێکە لە ناوچە هەرە ئالوزەکانی دنیا و، شوێنی پەنگ خواردنەوەی چەندین کێشە و گیروگرفت و ناکۆکی قول و گرنگ و کاریگەرە - لە ناو هەر دەولەتێکیان دا، لە بەینی دەولەتانی ناوچەکەدا، لە بەینی گەلانی ناوچەکە و هێز و دەولەتە گەورەکانی دنیادا.. بەمجۆرە روداوەکانی هیچ قوژبنێکی ئەم ناوچە ئالوزاوە گرنگە، چەن پچوک و چەپەک و پشت گوێ خراویش بی، ناتوانی رەوتی ئاسایی خۆی بگری بە دابراوی و دور لە دەستێوەردان و گوشاری ئەم و ئەو، ناکۆکییەکانی ناوی لە ئەنجامی کامل بونی هەلومەرجی مێژویی خۆی دا، لە لایەن خودی خاوەن مەسەلەکەوە، لایەلا بکری.
جا مەسەلەی نەتەوەی کوردیش، وەکو یەکێک لە گیروگرفتە هەرە ئالوز و گرنگ و بریاردەرەکانی ناوچەکە، دەمێکە سەرنجی بایەخی هێزە کۆنەپەرست و دەولەتە داگیرکەرەکانی کوردستان و دەولەت و هێزە زلەکانی دنیای راکێشاوە و هەر یەکەیان لە لای خۆیەوە، بە جۆرێک، چاوی تی بریوە و هەولی داوە جی پی ی خۆی بکاتەوە و پایەی کۆمەلایەتی لە ناو چین و توێژەکانی کۆمەلی کورد و نوینەرە سیاسیەکانی دا بدۆزیتەوە و قورسایی خۆی بخاتە سەری. لە ناو بزوتنەوەی کوردیش دا لە مێژە دو جۆرە بۆچون هەیە بۆ لێکدانەوەی رەگی گیروگرفتەکانی گەلی کورد و دۆزینەوەی چارەسەر کردنی، کە لە دو سەرچاوەی ئایدیولوجی جیاواز، یەلکو لە دو جیهانبینی جیاوازەوە دەردێن:
یەکێکیان - لای وایە کە بزوتنەوەی رزگاری نیشتمانیی گەلی کوردستان ئەبی پشت بە هێزی لە بن نەهاتوی کۆمەلانی خەلک ببەستی و، کۆمەلانی خەلک خۆیان خاوەنی مەسەلەکەی خۆیان بن و چارەنوسی خۆیان بریار بدەن بە بی دەستێوەردانی بێگانە، بناغەی ستراتیجی گشتی جولانەوەکەی لە سەر بنچینەی دابین کردنی پێویستیەکانی گۆران و گەشە کردنی کۆمەلایەتی، ئابوری، سیاسی و فەرهەنگی.. کۆمەلی کوردستان

داپرژێ، نەک بە پێ ی قازانجەکانی هێزەکانی دەرەوە و ململانێ و زۆرانبازیەکانی بەینی ئەوان.

ئەوی تریان - هەول ئەدا جێگە بۆ جولانەوەی کورد بدۆزێتەوە لە ناو چوارچێوەی ستراتیجی زلهێزەکان و لە ناو کون و کەلەبەری ناکۆکیەکانی بەینی دەولەتەکانی ناوچەکەدا، هەر لە بەر ئەوە پشت بە دەرەوە ئەبەستێ و هەول ئەدا بە هێزی دەرەکی و ناکۆکیەکانی ئەوانەوە بیبەستێتەوە، وە بە گوێرەی هەلکەوتنی هەلومەرجی چاک و خراپی «دەولی» مەسەلەی کورد بجزوێنێ و بمرێنێ، وە بیخاتەوە مەیدانی وازیی ناو دەولەتانەوە.

هەولدان بۆ بەستنەوەی مەسەلەی کورد بە ناکۆکیەکانی هێزەکانی دەرەوە جارێک لە گۆشەی راست و جارێکی کە لە گۆشەی چەپەوە، وە خەبات کردن بۆ ڕێ برین لەم پیلانە، خۆی لە خۆی دا زۆرانبازیەکی سیاسیە، ناودانەوەی ململانێ ی چینایەتی چین و توێژە کۆمەلایەتیە جیاوازەکانی ناو کۆمەلە، هەریەکەیان لە روانگەی قازانجی چینایەتی خۆیەوە، بەلام بە گوێرەی گۆرانی هەلومەرجی خاوبونەوە و توندوتیژبونی ناکۆکیەکان، ئەمیش ئەگۆرێ: چەک دائەنێ یا چەک هەلئەگرێ.

سر بونی هەندی هێز لە وەرزی سارد بونی مەناخی ناکۆکیەکانی بەینی عیراق و ئیران دا، پاشان زیندو بونەوە و سەردەرهێنانەوەیان سەرلەنوێ لە وەرزی گەرمبونەوەی مەناخی ناکۆکیەکان دا وینەیەکی دزیوی بۆچونی دوەمە، لە کاتێک دا کە مەسەلەی کورد لە حالەتی ڕێکی و ناڕێکی، ئاشتی و شەر، کۆکی و ناکۆکی دەولەتانی ئیران و عیراق دا، وەکو مەسەلەیەکی بابەتیی مێژوکرد هەر هەبوە.

هەلگیرسانی جەنگی عیراق - ئیران هەلومەرجێکی نوێ ی لە سەرانسەری ناوچەکەدا خولقاند، لە لایەکەوە - هەلی بۆ هێزە شۆرشگێرەکان هەلخست کە سود لە شەری ئەم دو دەولەتە داگیرکەرە وەربگرن، بۆ زیادکردنی رادەی چالاکی و جەزرەبەی پێشمەرگەیی و بە دەسهێنانی سەرکەوتنی گەورە و کاریگەر لە چوارچێوەی ستراتیجیەکانی خۆیان دا. بەلام لە لایەکی تریشەوە، هەلی بۆ هێزەکانی تریش رەخساند کە سەرلەنوێ بینەوە مەیدان بۆ بەستنەوەی مەسەلەی کورد بە ناکۆکیەکانی ئەو دو دەولەتەوە.

بەو پێ یە، لە سەر ئەرزی کوردستان ڕیزبونێکی نوێ ی حیزب و هێزە سیاسیەکان هاتەوە گۆرێ. لایەکیان ئەیویست و هەولی ئەدا سەربەخۆیی ڕێبازی شورشگێرانەی بزوتنەوەی رزگاری نیشتمانیی گەلی کوردستان، لە گەمە و پیلانی دەولەتەکانی عیراق و ئیران بپارێزێ و لە هەمان کات دا کەلک لە هەلگیرسانی جەنگ وەربگرێ، بۆ زیادکردنی هەرچی زۆرتری چالاکی شۆرشگێرانەی سیاسی و چەکدار و راپەراندنی کۆمەلانی خەلک. لایەکەی تریش ئەیویست و هەولی ئەدا کە خەباتی رەوای گەلی کورد لە عیراق دا بکات بە بەشێک لە ئەبەردەکانی جەنگی دەولەتی ئیران دژی دەولەتی عیراق و، لە چوارچێوەی ئەو ئەخشەیەدا ئەیزوت، کە بەشێکی لەو گەلە کۆمەکی چەکدارە سیاسیە ٤ قۆلیەدا خۆی ئەنواند، کە لە چەند مانگی رابوردودا دژی پێشمەرگەکانی ی ن ک کرا.

*
گەلەکۆمەکی کەی ئەمجارە، ئەگەرچی لەو دیو سنورەوە، بە توانایەکی زۆرەوە ئەخشەی بۆ کێشرا بو، وەکو هەمو جارەکانی تر ئەمیش لە بەرامبەر باوەری پتەو و خۆراگریی دلێرانەی پێشمەرگەکانی ی ن ک دا شکا و سەری نەگرت. بەلام هەر وەکو

هیرشەکەی ئەمجارە، لە هەمو ئەوانی پێشو، بەربلاوتر و توندتر و ڕێکخراوتر بو، هەروەها شکاندنەکەشی بە هەمان ئەندازە گەورە بو، بگرە لە قەوارەی هیرشەکەش زلتر بو، چونکە سەرلەنوی چەند ڕاستیەکی بە زەقی ساخ کردەوە، لەوانە:

- دەرکەوت کە پێشمەرگەکانی ی ن ک لە ماوەی چەن ساڵی ڕابوردودا، لە سەختترین هەلومەرجی خەبات دا، چۆن بەرگەی هیرش و پەلاماری درندانەی هێزی داگیرکەری ڕژیمی فاشیستی عیراقیان گرتوە و، چونکە لە ناو باوەشی کۆمەڵانی خەلک و لە گەڵ ئیش و ئازارەکانی ئەوان دا ژیاون، لە گەشە کردنیکی چونایەتی و چەندایەتی شینەیی و بەردەوام دا بون، لە بۆتەی خەباتی شۆرشگێرانەی خویناوی و سەخت و دژواردا قال و پەروەردە بون، بۆیە بە هیچ هێزیکی خۆماڵی و خۆولاتیەش لە شکاندن و بەزاندن نایەن و بە ئاسانی لە مەیدان دەرناکرین، بگرە هەروەکو چۆن بە درێژایی ساڵانی پێشو، هێزی سەرەکی و کاریگەری بەربەرەکانی ی ڕژیم بون لە کوردستان دا، هەر بەو جۆرە پارێزگاری هەمان ئاستی بلند و شوینی بەرز و سەربەرزانەی خۆیان کرد چ لە بەرامبەر هیرشەکانی ڕژیم دا و، چ لە بەرامبەر پەلاماری نارەوای هێزی چەکداری حیزبەکانی تردا.

- دەرکەوت هەر ئەو سیاسەتە سەرئەکەویت و لە ویژدانی خەلک دا جیگیر ئەبیت و سەرنج و بروای خەلک بە دەس ئەهێنی، کە لە سەر بناغەی ڕاستی و ڕوداو بنیات نراوە، نەک ئەوەی لە سەر بناغەی پیلانگێران و پروپاگاندەی ناڕاست و ژاوەژاوی دروستکراو و هاشە و هوشەی درۆ و هەلگیرانەوەی ڕوداوەکان و چەواشە کردنی گەل و تەفرەدانی خەلک و فیل و تەلەکەبازی.

ئەوانەی پەنایان بردە بەر شەری پروپاگاندەی درۆ، زۆری نەخایاند، درۆکانیان ئاشکرا بو، بوختانەکانیان دەرکەوت، دەستەکەیان کورتە ڕو.. خۆیانی پێ سوک و ڕیسواتر بون.

- دەرکەوت کێ لە خزمەتی پیلانەکانی داگیرکەرانی کوردستان دایە و بە کردەوە، بە نهێنی و بە ئاشکرا، نەخشەکانی ئەوان جیبەجێ ئەکات، لە پەنای ئەودا و بە بەرماوەی ئەوان ئەژی و بە پێی ی قازانج و دەسکەوتەکانی ئەوان ئەجولێتەوە و، بە فەرمانی ئەوان پێشرەوی و پاشەکشە ئەکا، سەر دەرئەهێنی و سەر ئەباتەوە کون. ئەگینا ئەوی بەهوی شەری ڕژیمی عیراق بکات، ئەگەر لە بیانو نەبی، مەیدانیکی بەرین و فراوانی نەبەردی چەکدار و چالاکیی سیاسی لە بەردەم دایە، سەدان سەربازگەی گەورە و پچوک و ڕەبیەی هێزی داگیرکەری دوژمنی لە بەر چاو و لولەی تفەنگ دایە و ڕیگەی لیدانی هێزەکانی ڕژیمیش هەر بە سەر سنگی پێشمەرگەکانی ی ن ک دا تی ناپەری.

- دەرکەوت کێ لە هەمو لایەک زیاتر بە تەنگ بەجیبەینانی فرمانی نیشتمانی و لیپرسینەوەی میژویی و جیبەجێ کردنی خواست و داواکانی جەماوەرەوەیە و سورە لە سەر شکاندنی پیلانی «کورداندنی شەر» و نەهیشتنی شەری ناوخۆ و، تەرخان کردنی هەمو وزە و تواناکان بۆ شەری ڕژیمی عیراق. ڕوداوەکان ئیسپاتیان کرد، کە لەم ڕوانگەیەوە ی ن ک هەر وەکو سەر بۆ «زۆری چەک» و گوشار و گەلەکۆمەکی دانانەوینی، بەلام ئەگەر ئازادی هەلبژاردنی شیوەی لابەلا کردنی گیروگرفتەکان بە ڕیگای سیاسی یا چەکدار، بەند بی بە دەسەلات و ئارەزوی یەکیتیی نیشتمانییەوە، ئەوا ی ن ک مەگەر هیچ ڕیگایەکی تری خۆپاراستنی لە بەردەم دا نەمینی، جگە لە بە کار هینانی چەک، ئەگینا هەمیشە ڕیگەی گفتوگۆی هیمن و دیموکراتی ئەگری و، ڕیگەی سیاسی چارەسەرکردنی گیروگرفتەکان

هەڵنەبژێری.

*

ڕووداوەکان کۆن ئەبوون و لە بیر ئەچوونەتەوە، هۆکانی تەقینەوەی وەزعەکە هەر ماون، گیروگرفتەکان بە چارە نەکراوی هەڵپەسێردراون، کەواتە مەترسی هەڵگیرسانەوەی شەڕی ناوخۆ هێشتا لە گۆڕێ یە، بەڵام هێشتا هەلی بە لادا خستنی هێمنانە و سیاسی گیروگرفتەکان، لە هەلی لابەلا کردنی چەکدارانەیان، زۆرترە.

هێشتا لە قۆڵی ی ن ک یەوە دەرگای چارەسەرکردنی سیاسی مەسەلەکان بە کراوەیی، لە سەر گازی پشتە. (کۆمەڵە، کانوونی دووەمی ۱۹۸۲)

*

وتاری دووەم:

شەڕی ناوخۆ یا شەڕی ڕزگاری نیشتمان؟

گەشەکردنی بزووتنەوەی ڕزگاری نیشتمانی گەلی کورد لە کوردستانی عێراق دا دوابەدوای شۆڕشی ١٤ ی تەمموزی ١٩٥٨، پاشان دەستپێکردنی خەباتی چەکدار و هەڵگیرسانی شۆڕشی ئەیلول و وەرگرتنی چەن ساڵەی، کاریگی وەهای کرد کە کوردستانی عێراق ببێتە مەڵبەندێکی گرنگی بزووتنەوەی ڕزگاری نیشتمانیی گەلی کورد لە سەرانسەری کوردستان دا. بگرە ببێتە ناوەندێکی ئەوتۆ کە تێکرای تێکۆشەرانی کورد لە پارچە جیا جیاکانی کوردستان دا چاوی هیوای تی ببڕن و پشتی پێ ببەستن و پشتیوانی لێ بکەن، خەباتی خۆیان و تێکۆشانی حیزب و ڕێکخراوەکانی خۆیانی پێوە گرێ بدەن، بەڵکو بیخەنە ژێر چەتری ڕابەریی سیاسی و ئایدیۆلۆجی و ڕێکخراوەیی.. سەرکردایەتیەکەیەوە.

بارزانی کە سەرکردایەتی شۆڕش و پارتی لە ژێر دەس دا بوو، هەروەها جووڵانەوەی کوردیش لە سەرانسەری کوردستان دا کەوت بوە ژێر نفوز و دەسەڵاتی ئەوەوە ئەیتوانی دەوری سەلبی یا ئیجابی وازی بکا هەم لە جوولانەوەی کورد لەو پارچانەدا و هەم لە ناو حیزب و ڕێکخراوەکانیان دا، بە تایبەتی لەو قۆناغەدا، کە سەرەڕای پەرەسەندن و بەهێز بونی شۆڕشەکە خۆی، لە ناو ڕۆشنبیران و تێکۆشەرانی کوردیش دا ئەو باوەڕە زاڵ بوو: ئەگەر لە پارچەیەکی کوردستان دا شۆڕش هەڵگیرسا تا بە ئەنجام ئەگات، ئەبێ هەموو پارچەکانی تر لە خزمەتی ئەو شۆڕشەدا بن و لە سنووری دەسکەوت و قازانجەکانی ئەودا بجوڵێنەوە.

ئەم باوەڕە ئەگەر لە چوارچێوەی ستراتیجێکی گشتی دا داڕێژرابە و پەیڕەوی بکرابە و کاری پێ بکرابە، لەوانە بوو ئەنجامی کاریگەر و گەورەی هەبوایە، بەڵام بە شێوەیەکی خراپ لە لایەن سەرکردایەتی شۆڕشی ئەیلولەوە، بە تایبەتی لە لایەن بارزانیەوە، بە کار هێنرا، هەم بۆ کۆیخایەتیەکی ناڕاستی پارچەکانی تری کوردستان لە ڕوی سست کردنی جولانەوەکانیان و خۆ هەڵقورتاندن لە کاروباری ناوەکی حیزب و سەرکردایەتیەکانیان و تەرخان کردنیان بۆ خزمەتی جولانەوەی کوردستانی عێراق.. وە هەم بۆ پاساودانی دەستێکەڵاوکردن لە گەڵ دەوڵەتە داگیرکەرەکانی کوردستان. ئەوەش لە ڕەفتاری هەردو باڵەکەی پ د ک دا دەرکەوت و بە کردەوە سەلما.

هەرەس هێنانی کتوپڕ و خێرای شۆڕشی ئەیلول لە کوردستانی عێراق دا لە ئەنجامی ڕێککەوتنی شا - صەددام ساڵی ١٩٧٥ لە جەزائیر دۆخێکی نوێ ی لە ناوچەکەدا

خولقاند. ئەو ناوەندەی لە کوردستانی عیراق دا بۆ جولانەوەی کورد لە سەرانسەری کوردستان دا دروست بوبو هەرەسی هێنا. هەروەکو گەلی کوردی عیراق کەوتە گێژاوی مەینەتیەکی نەتەوایەتی دژوارەوە، هەروەها هەمو نەتەوەی کوردیش، لە ئەنجامی ئەوەدا، رەنجەڕۆ و دردۆنگ و بەدبین بو لە هەر ناوەندێکی تر لە بزوتنەوەی کوردا.

هەرچەندە خامۆشییەکی ترسناک، لە دوای ئاشبەتال، باڵی بە سەر کوردستان دا کێشا بو بەلام زۆری نەخایاند، جولە و بزوتن کەوتنەوە سەرانسەری نیشتمانەکەمان.

- لە کوردستانی عیراق، واتە لە کەلاوەی ئاشبەتال دا، خەباتی ژێرزەمینی دەستی پێ کردەوە و هەر زۆر زو چوەوە قۆناغی خەباتی سیاسی - چەکدار.

- لە کوردستانی تورکیا بزوتنەوەیەکی سیاسی - جەماوەریی پەرەی سەند.

- لە کوردستانی ئێرانیش جمەوجولی ڕێکخراو سەری هەڵدایەوە و لە گەڵ ڕوخانی شا بوە بزوتنەوەیەکی سیاسی - جەماوەریی فراوان و قوڵ و، زۆریشی پێ نەچو بوە جولانەوەیەکی سیاسی - چەکدار.

ئەگەر پێشتر کوردستانی عیراق بوبوە ناوەندی بزوتنەوەی کورد و بەشی زۆری حیزب و ڕێکخراوەکانی سەرانسەری کوردستان خۆیان پێوە ئەبەست یا لێ ی نزیک ئەکەوتنەوە و پەیرەوی ئامۆژگاری و ڕێنوێنییەکانیان ئەکرد، لە گەڵ تێکچونی شۆڕشی کوردستانی عیراق دا ئیتر نەک هەر ئەو ناوەندە تێکچو بو، بەڵکو ئەو تەجروبەیەش لە بەر چاوی زۆربەی حیزب و ڕێکخراوەکانی کوردستان دا شکا بو، ئیتر لە بزوتنەوەی ڕزگاری نیشتمانیی گەلی کوردا ناوەندێک نەما بو لە ڕوی توانای سیاسی - تیوری یان لە ڕوی توانای چەکدار - مادییەوە ئەو هێز و نفوز و دەسەڵاتەی هەبێ، حیزب و ڕێکخراو و تێکۆشەرانی کوردستان پورەی لێ بدەن و لێ ی کۆ ببنەوە. ئەگەر پێشتر کوردستانی عیراق بوبوە نمونەیەکی دیاری کۆکردنەوەی جەماوەری خەڵک لە تاقە حیزبێک دا و سیستەمی تاقە پارتی بە سەر خەڵکی دا سەپا بو، ئەم تەجروبەیەش لە گەڵ ئاشبەتالی سەرکردایەتی و داوودەزگاکانی پ د ک و تێکچونی شۆڕشە چەکدارەکەی کوردستانی عیراق، شکا و باوی نەما.

بەمجۆرە لە هەر پارچەیەکی کوردستان دا چەن حیزب و ڕێکخراو دەستیان کرد بە کارکردن و لە سەرانسەری کوردستان دا چەندین حیزب پەیدا بون. هی نوێ هاتنە مەیدانەوە و کۆنەکانیش بە خۆ کەوتنەوە.

دەرکەوتنی چەندین حیزب و ڕێکخراوی جۆراوجۆر، لە لایەکەوە ئەنجامی ئاسایی گۆڕان و گەشە کردنی کۆمەڵایەتی، ئابوری، سیاسی.. کۆمەڵی فرە چینی کوردستان و نیشانەی دەرکەوتنی سنوری چینایەتی بو لە بەینی چین و توێژە کۆمەڵایەتییەکان و تواندنەوەیان لە ڕێکخراوی سیاسی جۆراوجۆردا. لە لایەکی ترەوە دەرکەوتنی ئەم هەمو حیزب و ڕێکخراو و دەستە و تاقمانە.. کە هەندێکی شوێنی چینایەتی خۆی پێ نەدۆزرا بوەوە، یا لەم لا و ئەو لاوە قویان پێ دا ئەکرا، نیشانەی ئاڵۆزیی و پەراگەندەیی سیاسی و پەرت بون و بە فیڕۆ چونی وزە و هێزی کۆمەڵانی خەڵک بو، بگرە سەرەتای سەرهەڵدانی تەنگوچەڵمەیەکی قوڵ و ئاڵۆز بو لە بزوتنەوەی ڕزگاری نیشتمانیی گەلی کوردا، بە تایبەتی چونکە هەندێکیان بەرەو خۆ چەکدارکردنێکی لاسایی کەرانەوەی بێ بەرنامە ئەچون.

لەبەرئەوەی لە هیچ کام لەو دەوڵەت و وڵاتانەی کورد و کوردستانیان بە سەردا بەش کراوە ماوەی ژیانی دیموکراتی و خەباتی سیاسی هێمنانە نەبوە، لەوەتەی بزوتنەوەی ڕزگاری نیشتمانیی گەلی کورد، بە پێ ی تێگەیشتنی نوێ، پەیدا بوە، هەمیشە شێوەیەکی سەرەکی خەباتی چ بۆ مان و خۆپاراستنی وە چ بۆ دەربڕینی بیروڕا و داواکردن و سەندنی مافەکانی، بە ناچاری ڕێگەی خەباتی چەکدار و، هەڵپەی خۆ چەکدار کردن و بە کار هێنانی چەک بوە. هەر بۆیە زوربەی حیزب و ڕێکخراوەکانی کوردستان هەوڵی پێکهێنانی هێزی چەکداریان داوە. جا لە بەر ئەوەی ئەمانەش لە پەیڕەوی کردنی ڕێوشوێنی پێکەوەژیانی دیموکراتییانە و لە نەریتی پێکەوە هەڵکردنی سیاسی دا کەم تەجروبە بون و، هەمیشە داگیرکەران و ئیمپریالیزمیش لوتیان ژەندۆتە مەسەلەی کوردەوە، بۆیە زۆرجار ناتەبایی و ناڕێکییەکانی بەینی ئەو هێز و تاقمانە، لە کاتێک دا کە ئەبێ بە ڕێگەی سیاسی لابەلا بکرێن، ئەتەقێتەوە و ئەگاتە پلەی پێکادانی چەکدار و شەڕی خوێناوی، بە جۆرێکی ئەوتۆ کە لە هەندێ قۆناغ و لە هەندێ کات و شوێن دا بزوتنەوەی کوردی توشی مەترسییەکی زل ئەکا، چونکە خەباتی هێزە کوردیەکانی لە شاڕێ ی ئاسایی خۆی، واتە لە خەبات دژی داگیرکەران و ئیمپریالیزم و نۆکەرەکانیان، لا ئەدا و ناکۆکی نێوان هێزە کوردیەکان ئەتەقێتەوە و ئەوەندە توند ئەبێ بە جۆرێک لە باتی ئەوەی شەڕی قورس و خوێناوی بکەوێتە مەیدانی هێزەکانی کورد و داگیرکەرانەوە، کەوتۆتە ناو ڕیزەکانی کورد خۆیەوە.

لە بە سەر کردنەوەی شریتی ڕوداوەکانی ماوەی چوار - پێنج ساڵی ڕابوردوی نیشتمانەکەمان دا ئەبینین:

- لە کوردستانی تورکیا ئەگەرچی شۆڕشی چەکدار و لەشکری چەکداری تیا نەبوە و حیزب و ڕێکخراوەکانی ئەوێ لە خەباتی ژێرزەمینیی دا بون، کەچی لە گەڵ ئەوەش دا ناکۆکی ئایدیولوجی و سیاسی لە بەینی هەندێ حیزب و ڕێکخراوی ئەوێ دا تەقییەوە و کەوتنە کوشتن و تۆقاندنی کادر و ئەندام و دۆستی یەکتری، تا کودەتای سپایی و سەپاندنی حوکمی عورفی جێگەی بە هەمویان لێژ کرد و جموجوڵ و چالاکیی کەم کردنەوە و سەرکردە و کادر و ئەندام و لایەنگرەکانی گرتن و ڕاونان و دەربەدەر کردن.

- لە کوردستانی ئێران دا ئەگەرچی لە پاش ڕوخانی شا جەوێکی ئازاد و دیموکراتی کەم وێنەی خەباتی سیاسی و ملمڵانێ ی ئایدیولوجی خولقا بو، بەڵام لە گەڵ ئەستور بونی باسکی چەکداری ڕێکخراوی ئەوێ و لە گەڵ قوڵ بونەوەی ناکۆکییەکانی بەینیان، لەویش هەندێ لە گیروگرفتەکانیان، کە ئەکرا بە ڕێگەی سیاسی چارەسەر بکرێن، جاروبار ئەتەقییەوە و ئەگەیشتە پلەی پێکا هەڵپژانی چەکدار و خوێناوی.

هێشتا ئەم گیروگرفتانەی ناو خۆیان بە لایەک دا نەکەوت بو، هەمو هێزەکانی شۆڕشی کوردستانی ئێران کەوتنە بەر پەلاماری چەکداری هێزێکی تر کە گوایە یەکێکە لە هێزەکانی کوردستانی عێراق.

- لە کوردستانی سوریاش ملمڵانێ ی ڕێکخراوەیی و سیاسی لە بەینی حیزبەکان دا، هەندێ جار ئەوەندە توندوتیژ و قوڵ ئەبێ تا ڕادەی لە یەک دابڕان و بە گژ یەکا چونێکی وەها کە ئەگەر لەویش خەباتی چەکدار لە گۆڕێ بوایە لەوانە بو ئەویش بگاتە ڕادەی شەڕی خوێناوی و چەکدار لە بەینیان دا.

شەڕی ناوخۆ بۆتە یەکێک لە
- لە کوردستانی عێراقیش ئەوە چەند ساڵە
گەورەترین کۆسپەکانی ڕێگەی بۆ پێشەوە چوونی جوڵانەوەکە. لێکدانەوەیەکی بابەتیی
ڕەوتی ڕووداوەکان و نزیکبوونەوەیەکی گشت لایەنی دەری ئەخەن شەڕی ناوخۆی بەینی هێزە
کوردییەکان و خەریک بوونیان بە یەکترییەوە لە سەرانسەری کوردستان دا دیاردەیەکی
گشتییە، ئەگەرچی لە کوردستانی عێراق و لە کوردستانی ئێران دا لە چاو پارچەکانی تردا
گەرمتر و خوێناویترە. لە ڕاستی دا توێژینەوەی هۆ ڕاستەقینەکانی شەڕی ناوخۆ دەری ئەخا
کە جگە لە کەم تەجروبەیی ئەم حیزب و ڕێکخراوانە لە مەیدانی پێکەوە ژیانی
دیموکراتییانە و، جگە لە تاوانەوەی ململانێی بیروڕای جیاواز و قازانج و دەسکەوتی
چینایەتی جۆراوجۆر، قووڵکردنەوەی ئەم دیاردەیە و نانەوەی شەڕی ناوخۆ بە هیچ جۆر دوور
نیە لە فیتی داگیرکەرانی نیشتمانەکەمان و ئیمپریالیزمی جیهانیی و نۆکەرەکانیان، وە لە
نەخشە و پیلانەکانی ئەوان بۆ لادانی بزووتنەوەی ڕزگاری نیشتمانیی گەلی کوردستان لە شا
ڕێ ی مێژوویی خۆی واتە: شەڕی داگیرکەران و ئیمپریالیزم و نۆکەرەکانیان، بەرەو شەڕی
ناوخۆی هێزە کوردییەکان لە گەڵ یەکتری واتە «کوورداندنی شەڕەکە» لە کاتێک دا کە
هێشتا گەلی کورد لە قۆناغی شەڕی ڕزگاری نیشتمان دایە نەک لە قۆناغی شەڕی ناوخۆی

چینە جیاوازەکانی.
لە قۆناغی ئێستای خەباتی ڕزگاریخوازانەی گەلەکەمان دا، شەڕی ناوخۆ، لە دوو
دیوی کوردستان دا، لە دیوی عێراق و لە دیوی ئێران، خەتەرێکی گەورەی دروست کردووە
بۆ سەر بزووتنەوەی ڕزگاری نیشتمانیی گەلی کورد، بەشێکی گەورەی ڕەنج و فیداکاری
هێزە کوردییەکان لە شەڕی یەکتری دا بە فیڕۆ ئەچێ، هێزە کوردییەکان بە شەڕی سیاسی
و چەکدار و ئیعلامی یەکترییەوە خەریک ئەکا و ناتوانن بە چاکی خەریکی دوژمنەکانی
گەلەکەمان بن و گورزی کوشندەی تێ بسرەوێنن، کۆسپ و تەگەرەی زل لە بەردەمی ڕەوتی
بزووتنەوەی ڕزگاریخوازانەی کوردا دروست ئەبێ و ناتوانێ تەکانی بە تین و بە گوڕ بەرەو
بەدیهێنانی ئامانجەکانی بدا، دڵی کۆمەڵانی خەڵک لە تێکۆشان سارد ئەبێتەوە..
بۆیە ئەبێ لە ڕوانگەیەکی زانستییەوە، سەیری هەلومەرجی نوێ ی کوردستان
بکەین، ناکۆکییەکانی ئەم قۆناغە هەڵبسەنگێنین، سرووشتەکانیان، ڕێگەی چارەسەر کردن و
شێوەی لایەلا کردنیان دیاری بکەین، فرمانەکانی خۆمان، لەم قۆناغە گرنگەی خەباتی
گەلەکەمان دا دیاری بکەین.
ئەبێ زۆر بە وریایی و ژیری، زۆر بە هۆشیاری و پەرۆشەوە، بە دڵسۆزی و تین و
تاوی شۆڕشگێڕانەوە، بە لە خۆبڕانێکی تەواو و هەست کردنێکی قووڵەوە بە لێپرسنەوەی
مێژوویی، لە پلەی ئێستادا هەوڵ بدەین:
لە لایەکەوە - لە ڕووی سیاسی، ئایدیۆلۆجی، پێشمەرگەیی.. وە خۆمان تەیار و
ئامادە بکەین بۆ یەکخستنی هەر پیلانێکی دوژمنانە و بۆ بەرەنگاریی هەر ڕووداوێکی
ناڵەبار و نەویستراو و بۆ بەرپەرچدانەوەی هەر پەلامار و هێرشێکی ئەکرێتە سەرمان.
وە لە لایەکی تریشەوە - بەوپەڕی تواناوە هەوڵ بدەین کە چارەیەکی سیاسی بۆ
شەڕی ناوخۆ لە کوردستان دا بدۆزرێتەوە کە بزووتنەوەی ڕزگاری نیشتمانی گەلی کورد لە
بەڵای شەڕی لاوەکی لا بدا و تەحیلی لە شا ڕێ ی مێژوویی خۆی، شا ڕێ ی خەبات و شەڕ
کردن دژی داگیرکەران و ئیمپریالیزم و نۆکەرەکانیان لا بدا و بخرێتە سەر لاڕێ ی شەڕی

هێزە کوردییەکان لە گەڵ یەکتری. (کۆمەڵە، شوباتی ١٩٨٢)

*

وتاری سێیەم:

(مساوەمە) لە گەڵ داگیرکەران یا لە گەڵ هێزە ناکۆک و جیاوازەکانی کوردستان؟

عێراق و ئێران وەکو دو دەوڵەت کە هەر یەکێکیان پارچەیەکی کوردستانی داگیر کردوە و بەشێکی نەتەوەی کورد ئەچەوسێنێتەوە، لەوەتی دامەزراون، سەرەڕای ئەو ناتەبایی و ناڕێکییەی بە درێژایی مێژو لە سەر سنور و مەزهەب و ڕەگەز و، لە سەر کاروباری سیاسی و ئابوری.. هەیان بوە، هەمیشە لە کاتی مەترسی دا دژی بزوتنەوەی ڕزگاری نیشتمانی گەلی کوردستان ڕێک کەوتون، پێکەوە نەخشە و پیلانی کوژاندنەوەیان داناوە و تەقەلایان یەک خستوە. ئەگەر هەندێک جاریش، یەکێک لەم دو دەوڵەتە یارمەتی جولانەوەیەکی کوردییان لە شوێنێک دا دابێت، لە چوارچێوەی وازیی تاکتیکی دەرنەچوە بۆ بەکار هێنانی مەسەلەی ڕەوای کورد و خەبات و خۆ بەختکردنی، وەکو هێزی زۆر بۆ بردن و گوشار و ئاژاوە نانەوە، بۆ بە دەسهێنانی مەبەستێکی سیاسی، یا سپایی، ئابوری.. دژی دەوڵەتەکەی تر.

پەنجا ساڵی ڕابوردو چەندین نمونەی هاوکاری ئەم دو دەوڵەتەی تیا ئەبینرێ دژی گەلی کورد، کە دوایییەکەیان ڕێککەوتنەکەی شا - صەددام بو لە جەزائیر.

*

ڕوخانی ڕژێمی شا لە ئێران، زۆر مەسەلەی لە ناوچەکەدا گۆڕی، یەکێک لەوانە تێکچونەوەی پەیوەندی هاوکاری و تەبایی عێراق - ئێران بو، کە بە شەڕی پڕوپاگاندە و دەسوەردانە کاروباری ناوخۆی یەکتری دەستی پێ کرد، تا گەیشتە وردەشەڕی سەر سنور و لە دوایی دا هەڵگیرسانی جەنگ لە بەینیان دا.

هەڵگیرسانی جەنگ لە بەینی ئەم دو دەوڵەتەدا، کە بە هۆی زیاد بونی دەرامەتی نەوتەوە لە حەفتاکان دا، ماکینەیەکی سوپایی و پۆلیسی گەورە و خورتیان دروست کرد بو بۆ دامرکاندنەوە و داپلۆسینی گەلەکانی خۆیان و بزوتنەوە شۆڕشگێڕییەکانیان، هەلێکی لەباری ڕەخساند بۆ گەلانی ئەو دو دەوڵەتە بە گشتی، بۆ ئەوەی لە باتی ئەوەی لە شەڕی دو دەوڵەتی چەوسێنەردا، یەکتری شەق و پەق بکەن، هەوڵ بدەن بۆ ڕوخاندنی دەسەڵاتی زۆردارانەی چینە حوکمڕانەکان و ڕوخاندنی بنچینەکانی «ئیستیبدادی شەرقی» کە بە ناشیرینترین شێوەی لەم ساڵانەی دوایی دا هەم لە حوکمی صەددام و حیزبە فاشیستییەکەی دا و هەم لە حوکمی خومەینی و دەسەڵاتی ئاخوندەکانی ئێران دا، بە دی ئەکرێ.

هەڵگیرسانی جەنگ ئەگەر بۆ گەلانی هەردو دەوڵەت هەلێکی لە بار بوبێ بیقۆزنەوە، بۆ چاکتر کامل کردنی هەلومەرجی دۆخی شۆڕشگێڕانە و گۆڕینی بنەڕەتیی خەریتەی دەسەڵاتی سیاسی چینەکانی هەردو کۆمەڵ، ئەوا بۆ گەلی کورد هەلێکی مێژویی ئەوتۆ بو کە لە مێژوی نوێ ی دا بۆ یەکەمین جار بو شتێ وای لێ هەڵبکەوێ، کە لە ناو هەردو دەوڵەت دا دو بزوتنەوەی ئۆپۆزیسیونی خورت و دیموکرات و پێشکەوتنخواز، وە لە ناو هەردو بەشەکەی کوردستان دا دو جولانەوەی سیاسی - چەکداری فراوانی خاوەن پێگەی جەماوەریی تیدا بێ، کە هەر یەکەیان خاوەنی بەرنامە و سەرکردایەتی و ڕێکخراوی سیاسی

و چەکدار بی، لە سەر خاکی خۆی.

هەرچەندە هاوکاری هێز و حیزبەکانی هەردو دیو لە ئاستی پێویستیەکانی قۆناغەکەدا نەبو، بۆ قۆستنەوەی ئەو هەلە مێژوییەی، کە دو دوژمنی دێرینە و بە هێزی گەلی کورد، سەدان هەزار سەربازیان دژی یەکتری لە مەیدانی جەنگێکی قورس و درێژی مایەپوچ دا بەر دابوە گیانی یەکتری، بۆ ئەوەی بە پێ ی گۆڕانەکانی هەلومەرجی نوی ی نەتەوەیی و ناوچەیی و جیهانی.. چاو بگێرنەوە بە بەرنامەکانیان دا، بگرە بە ستراتیجی گشتی جولانەوەی کوردا لە هەردو دیو، بۆ دانانی ڕێوشوێنی ناوکۆیی کارکردن و، تەکاندانێکی نوی بە خەباتی کورد، لە روی دروشم و ڕێباز و شێوەی کارکردنی و هاوپەیمانیتیەوە.

لە کاتێک دا توانای ئەمە لە گۆڕی بو، بەلام بۆچونی زاڵ و ڕەوتی روداوەکان وەها رۆیشت کە هێزە سیاسی - چەکدارەکانی کوردستان هەر لایەنە لە دیوی خۆی دا و لە سنوری بەرنامە و ستراتیجی خۆی دا کەلک وەربگری لە هەلی خەریک بونی دەولەت و سوپای داگیرکەری ولاتەکەی خۆی بە جەنگێکی دەرەکی قورسەوە، بۆ گەشە پێدانی جولانەوەکەی و بەدەسهێنانی سەرکەوتنی سیاسی و سپایی.

هەلگیرسانی جەنگی عێراق - ئێران هەلێکی لەبار بو لۆ تێکرای ئۆپۆزیسیونی عێراق و دوژمنەکانی ڕژێمی صەددام، وە بە تایبەتی بۆ گەلی کورد و هێزە سیاسی - چەکدارەکانی کوردستان چونکە ئەیانتوانی کەلکێکی گەورەی لی وەربگرن بۆ هەلگێرانەوەی تای لاسەنگی تەرازوی هێزەکانی ڕژێم و گەلی کورد، بە تایبەتی کە صەددام و حیزبە فاشیستەکەی لە ئەنجامی جێگیربونی دۆخی ناوەوەی دا و لە ئەنجامی زیادبونی دەرامەتی نەوت و زیادبونی ژمارەی هێزە چەکدارەکانی و تفاقی جەنگی و دەسگرتنی تەواوی بە سەر هەمو شوێنە گرنگەکانی کوردستانی عێراق دا، لە دوای ئاشبەتالی ١٩٧٥، ناهاوتایەکی سپایی گەورە و نابەرامبەرییەکی بی وێنەی ئەوتۆ لە بەینی هێزی پێشمەرگە و هێزە چەکدارەکانی ڕژێم دا دروست بوبو، کە لە دابەشکردن و بەراوردکردنی ژمارەی هەردولادا، یەک پێشمەرگە زیاتر لە دوسەد چەکداری ڕژێمی عێراقی بەرئەکەوت. تەنانەت هەندێ جار جگە لە هێزی پیادە و جاش کە هێرشیان سەر مفرەزە یا کەرتێکی پێشمەرگە، ژمارەی ئەو هالیکۆپتەرانەی بەشداری هێرشەکە ئەبون، لە ژمارەی پێشمەرگە پەلاماردراوەکان زۆرتر بون.

لە باری نابەرامبەری ماددی و بەشەری دا، لە بەینی پێشمەرگە و ڕژێم دا، هەر هێزی مەعنەوی و باوەر بو بە ڕەوایی و ڕاستی مەسەلەکە، کەموکورییەکانی پێشمەرگەی پڕ ئەکردەوە و لاسەنگییەکەی هەردوتای تەرازوی هێزەکانی ڕاست ئەکردەوە. لە گەل ئەوەش دا بە درێژایی سالانی ٧٦ - ٨٠. ڕۆلە دلێرەکانی کوردستان نەک هەر بەربەری قارەمانەتیەوە بەرگەی دژوارییەکانی هەلومەرجی خەبات و هێرش و پەلامارەکانی دوژمنیان گرت و بەس، بەلکو لە زۆر مەیدان و شوێن دا جلەوی دەسپێشکەرییان لە دەس دوژمن دەرهێنا و دەیان داستانی قارەمانێتییان نوسیەوە و سەدان سەرکەوتنی دیاریان لە شەڕگەکان دا بە دەس هێنا.

هەلبەتە هەلگیرسانی جەنگی عێراق - ئێران بۆ پێشمەرگە شاییەکی خۆش بو، چونکە سپا و هێزە چەکدارەکانی عێراق، ئیتر نەیانئەتوانی بەو خەستیبە هێرش بهێنن و

بەو چریەیە لە کوردستان دا هیزەکانیان دابەش و جیگیر بکەن و بە گویرەی توندبونی شەر و پیکادان نەیوایە ئیتر هەندی لە هیزە داگیرکەرەکانی کوردستان بکیشنەوە و بیبەن بۆ مەیدانی جەنگ لە گەل ئیران و لە هەندی شوینی تریش دا هیزەکانیان تەنگ بکەن.

خەریک بونی هیزەکانی دوژمن بە شەری سپایەکی نیزامی هاوتای خۆیەوە لە جەبهەیەکی ترەوە، دەسەلاتی لە کوردستان دا لاواز ئەکرد و توانای شەرکردنی کەم ئەکردەوە و نوقتەی زەعیفی لە ناوچەکان و بازیر و نوردوگاکان دا ئەدا بە دەستەوە.. ئەمانەش هەموی زەمینەی لەباری بەرزکردنەوەی رادەی چالاکی و وشاندنی دەستی کاریگەریان لە دوژمن خوش ئەکرد. بەلام لە هەمان کات دا خەریک بونی هیزی پیشمەرگەش بە شەری ناوخۆ و ناکۆکی دروستکراوی لاوەکیەوە، پەکی هیزەکانی پیشمەرگەی ئەخست بۆ قۆزستنەوەی ئەم هەلە و بە گەر خستنی هەمو وزە و توانای دژی ریژیم و هیزە داگیرکەرەکانی لە کوردستان دا.

تەرخانکردنی هەمو تەقەلا و توانای هیزی پیشمەرگە و ریکخراوەکانی یەکیتیی نیشتمانی لە مەیدانی چەکدار، سیاسی، ئیعلامی.. دا بۆ ئەنجامدانی فرمانی سەرەکی لە بەگژاچونی ریژیم دا، لە هەلومەرجی ئەوسای کوردستان دا کە هێزکانی شەری لابەلا و تەقینەوەی ناکۆکی لاوەکی لە کایەدا بو، پیویستی بە چوارچیوەیەکی گشتی جولان و بزوتن بو لە سەر ئاستی کوردستان، عیراق و، ناوچەکە، بۆ کۆکردنەوەی هەمو هیز و تواناکان دژی ریژیم، یا هیچ نەبی خاوکردنەوەی گرژی نیوانیان، بۆ ئەوەی لە باتی ئەوەی بە یەکتریەوە خەریک بن هەر یەکەیان لە قۆلی خۆیەوە بە دوژمنەوە خەریک بی.

*

هەلگیرسانی جەنگی عیراق - ئیران دۆخیکی وەهای دروست کرد کە دەولەتەکانی عیراق و ئیران، وە هیزەکانی دژی عیراق و هیزەکانی دژی ئیران، هیز و دەولەتانی ناوچەکە تیکرا کەوتنە جولان و وەرگرتنی هەلویست و، ناچاری کردن ریزبونیکی نوی هەلبژیرن لە دۆستایەتی، دوژمایەتی، هاوکاری، نۆکەرایەتی، بیلایەنی..

لە لایەکەوە - دەولەتی عیراق و دەولەتی ئیران هەریەکەیان هەولی ئەدا بۆ ئەوەی سود لە خەباتی کورد وەربگری لە ململانی سپاییەکەی دا وەکو بەشیک لەو جەنگەی دژی ئەوی تر ئەیکرد، وە هەر یەکەیان بە پی ی تیگەیشتن و بۆچونی خۆی، هەولی ئەدا دەس بخاتە ناو هیزە سیاسی و تەنانەت هیزە عەشایەری و دینیەکانی کوردیشەوە، وە لە روی سپایی و سیاسیەوە کەلک لە جولانەوەی کورد وەربگری بۆ قورسکردنی تای تەرازوی هیزەکانی خۆی لە شەردا.

لە لایەکی تریشەوە - حیزب و هیزەکانی کوردستان، ئەوانیش هەر یەکەیان بە پی ی بۆچون و تیگەیشتنی خۆی، هەر یەکە لە لای خۆیەوە کەوتە وەرگرتنی هەلویست و هەولدان بۆ وەرگرتنی کەلک لە تەقینەوەی ناکۆکییەکانی بەینی عیراق و ئیران و گەیشتنی بەوپەری توندوتیژی واتە پلەی جەنگ، چ بە دروستکردن یا بەهیزکردنی پەیوەندی لە گەل ئیران و چ بە دروستکردنی (محور) لە گەل هیزەکانی تردا دژی ریژیمی عیراق.

بیگومان جمەوجول و هەولدانی هیچ کام لەو لایەنانەش، بە کاریکی سەیر و ناناسایی دانانری، بەلکو لە هەلومەرجیکی وەهادا شتیکی ئاساییە و چاوەروانکراوە.

حشع و حسک و قم کە لە هیزەکانی کوردستانی عیراقن و ریگەی ململانی ی

چەکداریان گرتوە دژی ڕژێمی عێراق.. هەر یەکەیان بە جۆرێک و بە شێوەیەک هەڵویستی خۆی دیاری کرد لە جەنگی عێراق - ئێران، وە هەر یەکەیان بە جۆرێک هەڵویستەکەی خۆی هەم بە داوودەزگا ڕەسمیەکانی ئێران ڕاگەیاند و دایە دەزگاکانی ڕاگەیاندنی ئێرانی (ڕادیو، تەلەفزیون، ڕۆژنامە)، وە هەم لە بەیان و بڵاوکراوەکانی خۆیان دا چەند بارەیان کردەوە. ئەگەرچی ئەمانە بە جیا هەڵویستی خۆیان دەربڕی بو، بەڵام ناوەرۆکی هەڵویستی هەر ٣ لاکەیان چەن حوکمێکی لە یەکچوی تیا ئەخوێنرایەوە کە بریتی بون لە:

أ. دەربڕینی نارەزایی توندوتیژ لە هەڵگیرساندنی شەر.
ب. توندکردنی مسئولیەتی هەڵگیرساندنی شەڕەکە لە ملی عێراق.
ج. پشتیوانیکردنی تەواو لە حکومەتی ئێران دژی حکومەتی عێراق.

هێزەکانی ئێمە یەکێک بو لەو هێزانەی ئەبوایە لە هەمو لایەک زیاتر سود لە ناکۆکی ئێران - عێراق و جەنگەکەی بەینیان وەربگری، بە تایبەتی چونکە لە چاو هێزەکانی تردا، ئەم گەورەترین هێزی شەڕکەر بو دژی عێراق لە سەر ئەرزی کوردستان. جگە لەمەش هێز و ڕێکخراوەکانی ئێمە و جەماوەری خەڵک.. لە ماوەی چەن ساڵ شەری نابەرامبەر و خەباتی سەخت و دژواردا ئازارێکی زۆریان لە دەس حکومەتی عێراق و دەزگا دامرکێنەرەوەکانی و هێزە داگیرکەرەکانی چێشت بو، کە لە هی ئەوانیتر زۆرتر بو، ئەمەش هەمو جۆرە هەوڵدان و هاوکاریەکی حەلال ئەکرد دژی ڕژێمی عێراق بۆ «هەق» لی کردنەوە و «هەق» لی سەندنی. لە مانەش هەمووی گرنگتر: ئەو کاتە چەندین بەرژەوەندی و قازانجی گرنگ و کاریگەری لە ناو ئێران و لە بەر دەسەڵاتی ئێرانیەکان دا بو، بە تایبەتی وەجبەیەکی گەورەی چەک، کە لە ولاتێکی دۆستەوە، یەک لە سەر پەیمان و بەڵێنی ئێرانیەکان، گواستبویەوە ناو ئێران بۆ ئەوەی لەوێوە بیگەیەنێتە کوردستانی عێراق.. لە گەڵ ئەمانەش دا هەمو، ئێمە ئامادە نەبوین لەو هەلومەرجەدا بە پێچەوانەی هەڵسەنگاندن و بۆچونەکانی خۆمانەوە هەلپەرستانە بجولێینەوە، یان هیچ مەرجێکی ئێرانیەکان قبول بکەین کە لە گەڵ سەرەتاکانی خۆمان یا قازانج و دەسکەوتە بنچینەییەکانی نەتەوەی کوردا نەگونجێ.

هەر لەم ڕوانگەیەوە هەم (عرض) ی ئێرانی و مەرجەکانی ئەوانمان دایەوە دواوە و پشتیوانیمان لە حکومەتی ئێران نەکرد، بەو جۆرەی ئەوان ئەیانویست، لەو شەڕەدا دژی عێراق. هەم (عرض) عێراقی و مەرجەکانی ئەوانیشمان ڕەت کردەوە و پشتیوانیمان لە حکومەتی عێراق نەکرد، بەو جۆرەی ئەوان ئەیانویست لەو شەڕەدا دژی ئێران. بەڵکو لامان وابو کە ئەبێ ئەو هەلە مێژوییە بقۆزرێتەوە و شەر توند بکری، مەک لە گێژاوی (مساومە) ی سوک و پروپوچ و کاتی دا لە گەڵ دەوڵەتی ئێران یان لە گەڵ دەوڵەتی عێراق دا بزر بکری و لە دەس بدری و، گەلی کورد بهاوێژرێتە داوی فروفێڵی تاکتیکیی یەکێکیانەوە و لە ئەنجام دا ببێتە قوربانیەکی سەربەراوی ڕێککەوتنەوەی ئەوان. وە ئەگەر (مساومە)ش هەر پێویست بێ، ئەوا ئەبێ لە گەڵ هێزە ناکۆک و جیاوازەکانی کوردا بکری نەک لە گەڵ داگیرکەرانی کوردستان. (کۆمەڵە، شوباتی ١٩٨٢)

*

ئەنوەر حەسەن و قازان

ئەنوەر حەسەن گەنجێکی هەڵکەوتوی کەرکوک بو. کە دوای ئاشبەتاڵ گیرا خوێندکاری کلیەی هندسە بو لە بەغداد. ئەویش وەکو هاوڕێکانی حوکم درا و لە زیندانی ئەبو غریب دا مابوەوە تا لە عەفوی ٧٨ دا بەر بو. هەر ئەو کاتە هاتە ریزی پێشمەرگەوە. لە گەڵ ٩ کادری تر نێردران بۆ لوبنان بۆ مەشقی جەنگی دوای گەڕانەوەی کرا بە فەرماندەی هەریمی ٢ ی کەرکوک.

لە رۆژی ٥ ی مارتی ٨٢ دا هێزێکی تێکەڵاوی جەیش و جاش بە پشتیوانی هالیکۆپتەر لە گوندی قازان هەڵی کوتایە سەر ئەنوەر و هاوڕێکانی کە بە هەمویان ٢٢ کەس بون. لەم شەڕە نابەرامبەرەدا ١١ کەس کوژرا: ئەنوەر حەسەن. رزگار جەلال (هێمن) ماموستا عەبدولخالق صالح (ئاسۆ). ماموستا عەبدوللا صالح (چیا). سوارە شیخ صدیق. کامەران مام عومەر. کەریم چەمچەماڵی (گۆران). نوعمان عەبدی. حەمە شوکر بلوکینی. نەجمەدین فاتیح (شیروان). موەفەق تەقی.

زۆری ئەم پێشمەرگانە کەرکوکی بون. راستیەکەی ئەمە زەرەرێکی گەورە بو. چونکە پاشەرۆژێکی باش لە ئەنوەر و هەندێ لە کادرەکانی تر ئەکرا.

*

یەکێتیی نوسەرانی کوردستان

حەمەی حەمە باقی لە زیندان بەربوبو، بەلام نەیئەویست خۆی پیشانی کەس بدات. حەمە پیش گرتنی لە چەند کۆڕێکی ئەدەبی دا شیعری خوێند بوەوە یەکیکیان بە ناونیشانی «بروخی بیدەنگی» شیعرەکانی رەمزی بون، بەلام دژی زوڵموزوری بەعس. یەکی لەو برادەرانەی، لە راگەیاندنی یەکیتی کاری ئەکرد، لە گەڵ هەندێ لە ئەدیبەکانی سلیمانی نیوانی خۆش بو. هات بۆ لام باسی حەمە و هەڵویستی ئازایانەی سیاسی بۆ کردم، داوای لی کردم نامەیەکی بۆ بنوسم. ئیمە پیشتر ناسیاویمان نەبو. نامەیەکم بۆ نوسی. برادەرەکە بۆی نارد و دوایتر خۆی بە نهینی چوەوە بۆ سلیمانی. چەند نامەیەکم پی دا نارد بۆ چەند کەسیکی تریش. حەمە بڕیاری دابو بیتە شاخ و ببی بە پێشمەرگە. لە شۆرشی ئەیلول دا ماوەیەک لیپرسراوی ناوچە بو لە هێزی رزگاری.

حەمە هاتە دەرەوە قسە و باسی سیاسی و ئەدەبی زۆرمان کرد. بە لایەوە چاک بو لە گەڵ ئەدیبەکانی کورد لە ناو شارەکان دا پەیوەندی دۆستانە دابمەزرێنین. لە سەر داوای ئەو، مامجەلال و من، چەندین نامەمان نوسی بۆ زۆری ئەدیبە کوردەکان لە سلیمانی، هەولیر، بەغداد.. خۆی نامەکانی بۆ بردن. ئەمە کارێکی باشی تی کردن. کە هاتەوە بیری دامەزراندنی یەکێتی نوسەرانی لە لا گەڵاڵە بوبو بە تایبەتی بەعس بڕیاری هەڵوەشاندنەوەی یەکێتی نوسەرانی کوردی دابو.

تاقمی ئەدیب و نوسەر رویان کرد بوە شاخ، بەلام بە سەر حیزبەکان دا دابەش بوبون، لە مانەش هەندێکیان خۆیان خۆیانیان بە ئەدیب و نوسەر ئەزانی، ئەگینا بە پیوانەی ئەدەبی بە «کۆلکە ئەدیب» یا بە «کۆلکە نوسەر» یش دانئەنران.

هەڵویستی یەکێتی لە یەکێتیی نوسەران بە مجۆرە بو: یەکێتیەکەیان دور بی لە دەستیوەردانی حیزبەکان و، «نان و ئازادی» و پێویستیەکانی چاپ و بڵاوکردنەوەی بەرهەمەکانیان بۆ دابین بکری.

هەندی لە نوسەرەکان چەند کۆبونەوەیەکیان کرد و، بە هاودەنگی لە گەڵ ژمارەیەکی زور لە نوسەرانی شار، «یەکیەتی نوسەرانی کوردستان» یان پیک هینا و، گۆڤاری «نوسەری کوردستان» یان بلاو کردەوە

لەم گۆڤارەدا بەرهەمی ئەدەبیی نوسەرانی شاخ و چەندین کەس لە نوسەرانی ناسراوی شار، وەکو: شیرکو بیکەس، حسین عارف، مستەفا سالح کەریم، رەوف بیگەرد، دلشاد مەریوانی، تایەر سالح سەعید.. لە ژێر ناوی نهێنی دا، بلاو کرایەوە.

هەروەها چەندین کومەڵەی شیعر، لەوانە: کومەڵە شیعری حەمەی حەمە باقی، شیرکۆ بیکەس، حسین مەولود، جەمیل رەنجبەر و، کومەڵە چیروک و بابەتی تر لە کتیبی سەربەخۆدا بلاو کرایەوە.

*

## هەولیکی سەرنەکەوتو لە گەڵ حسک

حەمەی حەمە باقی کە هات بوە شاخ، هەولی ئەدا بە هاوکاری لە گەڵ نوسەرانی کە دابەش بوبون بە سەر لایەنەکانی جودا، یەکیتیی نوسەرانی کوردستان گەشە پی بدا. لە هەمان کات دا لەو ریگایەوە زەمینەی جۆری لە ئاشتبونەوە خۆش بکا. حەمە و زۆر کەسی تریش زۆر جار باسی هەولی ئاشتبونەوەیان لە گەڵ ئەکردین و، ئامادەیی خۆیان دەرئەبری بۆ ناوبژی و هینان و بردنی نامە و پەیام.

حەمە لە گەڵ حاجی حاجی برایم دۆستایەتی کۆنیان هەبو. بە هەولی ئەو دانیشتنیکی لە شینی ریک خست لە یەکیتی عومەری حاجی عەبدوللا و من و، لە حسیک تایەری عەلی والی و حاجی بەشدار بون.

پاش هەندی قسە و باس هاتینە سەر باسەکان. حاجی لە میانەی قسەدا وتی: «مامجەلال برا گەورەی ئیمەشە..» من زو قسەکەم پی بری، وتم: «کاک حاجی با واز لەم جۆرە موجامەلانە بهێنین. نە ئیوە مامجەلال بە براگەورەی خۆتان ئەزانن و، نە ئەویش خۆی بە براگەورەی ئیوە ئەزانی. ئەوە چەند سالە ئیوە قسەی پی ئەلین. چاکتر وایە بە راشکاوی باسی هۆی ناکۆکییەکان بکەین.»

هەردو لامان ئارەزویەکی قولمان بۆ ئاشتبونەوە و ئاسایبکردنەوەی پەیوەندیەکانمان دەربری. لە بەر ئەوەی لە دەس پی کردنەوەی شورشەکەدا لە گەڵ ئەمان پیکەوە بوین و، سالانیکمان لە ناو یەکیتی دا پیکەوە بە سەر برد بو. لە ناو ریکخراوەکانی تردا ئەمانمان لە هەموان بە نزیکتر دائەنا لە خۆمان. ئیمە باری سەرنجی خۆمان بۆ رون کردنەوە. زۆر لە میژ بو ئیمە لامان وابو هۆکانی هەلگیرسانی شەری نیوان ریکخراوە کوردییەکان: فرە - لەشکری و، حوکمرانی و، پارەیە.. پیشنیارمان بۆ کردن: هەر ریکخراوە لە کاروباری ئایدیولوجی، سیاسی، ریکخراوەیی دا سەربەخۆ بی، بەلام داوودەزگاکانی جولانەوەکە، بە تایبەتی پیشمەرگە و راگەیاندن و دەسکەوتی دارایی، وەکو نمونەیەک بۆ دەسەلاتی پاشەرۆژی کورد، یەک بخەین.

لەو کاتەدا توانای یەکیتی زۆر زیاتر بو لە هی ئەوان. ژمارەی پیشمەرگەی زۆرتر و، سەرچاوەی دەسکەوتی دارایی فراوانتر و، دەزگای راگەیاندنی: رادیو و چاپخانە، گەورەتر بو. لە هەمو ئەو شتانەدا ئەبوین بە هاوبەش. ئەوان وەکو حیزب قازانجیکی زۆرتریان ئەکرد. بۆ ئەوەی دلنیایان بکەین کە ئەوە بۆ هەللوشینی ئەوان نیە، پیشنیارمان

کرد فەرماندەی گشتی پێشمەرگە و زۆری فەرماندەی هەرێمەکان لەوان بێ، کەسێکی وەکو کاک تاهیر دابنێن، چ ڕێوشوێنێکی تریش بە (ضمان) ئەزانن بۆ دڵنیایی ئەوان ئێمە ئامادەین بیکەین.

نوێنەرەکانی حسک بیرەکەیان لا پەسند بو، داوایان لێ کردین بیروراکانی خۆمانیان بۆ بکەین بە پرۆژەیەکی نوسراو بۆ لێکۆڵینەوەی لە مەکتەبی سیاسی حیزب دا بۆیان بنێرین.

*

ئێمەش لە ڕۆژی ۹ ی مارتی ۱۹۸۲ دا پێشنیارەکانی خۆمان لەم پرۆژەیەدا بۆ ناردن:

*

یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان دوای هەڵسەنگاندنی باری سیاسی و هەلومەرجی کوردستان و عیراق و بە ڕەچاو کردنی دەسکەوتەکانی بنەرەتیی خەڵکی کوردستان و عیراق و دژی شۆڕشە عیراقیە دیموکراتیەکەمان بە چاکی زانی بەم یادداشتە هەوڵ و تەقەلای باشکردنەوەی پەیوەندییەکانی هەردولامان و پێکهێنانی هاوخەباتیەکی چەسپاو لە نێوانمان دا بهێننە قۆناغی پێویست، قۆناغی دارشتنی پەیوەندی و هاوخەباتیمان لە سەر چەند سەرەتایەکی چەسپاو کە ئەتوانی تا سەر بێت و بە ڕاستی و بە جیددی برایەتی و هاوخەباتی نێوانمان پێک بێت و بچەسپێت.

بۆیە بە پێویستمان زانی پێشنیارەکانمان بۆ دو قۆناغ کە پێکەوە بەستراوە بخەینە بەرچاوتان، بە هیوای ئەوەی ئێوەش بە چاوی پەرۆش و کیانی هەست کردن بە بەرپرسیاریتی نیشتمانییەوە هەڵیان بسەنگێنن و لە ڕەئی و پێشنیارەکانی خۆتان بە نوسین ئاگادارمان بکەنەوە تا لە کۆبونەوەی داهاتوی نوێنەرانی دەسەڵاتداری هەردولا گفتوگۆیان لە سەر بکرێت.

قۆناغی یەکەم:

پنک و حسکع بەڵێن ئەدەن بە یەکتری کە:

۱. هیچ کامیان لە گەڵ حیزب و لایەنێکی دیکەدا هاوکاری سیاسی و ئیعلامی و سەربازی نەکات دژی ئەوی دیکەیان بێت.

۲. هیچ کامیان لە سەر حسابی ئەوی دیکەیان، یان بۆ دژایەتی سیاسی و سەربازی و ئیعلامی ئەوی دیکەیان داخلی هیچ جەبهە یان لیژنەی تەنسیق یا ڕێککەوتنێکی دوقۆلی نەبن لە گەڵ هیچ حیزب و لایەنێکی دیکە.

۳. هەردولا ئازادی کاری سیاسی و ئیعلامی و سەربازی دژی ڕژێم و داوودەزگاکانی و، ئازادی گەشەکردنی تەنزیمی و پێشمەرگەیی، بەو مەرجەی بۆ زەرەردانی نەبی لەوی دیکە، لە هەمو شوێنەکانی کوردستان بۆ یەکتری بسەلمێنن.

٤. هەردولا نابی پەنا بەرنە بەر ڕێگەی هێرشی چەکدار یا هێرشی ئیعلامی دژی ئەوی دیکەیان بۆ چارەسەر کردنی ناکۆکی و گیروگرفتەکانی بەینی هەردولا.

٥. هەردولا پەیرەوی ڕێگەی سیاسی و گفتوگۆی دیموکراتی دەکەن بۆ چارەسەرکردنی گیروگرفت و ناکۆکیەکانی بەینی هەردولایان.

٦. هەردولا حورمەتی بیروباوەڕ و ڕێکخستنی ڕیبازی یەکتری بگرن و، ئەندام و

پێشمەرگە و دزستەکانی خۆیان بە گیانی دزستایەتی و هاوکاری و پەیوەستی بە دەنگەوەچوونی یەکتری ئامۆژگاری بکەن.

٧. هەردولا هێزەکانی پێشمەرگە و ڕێکخراوەکانی خۆیان هان ئەدەن بۆ تەرکیز کردنە سەر ڕژێم و داوودەزگاکانی و بۆ کاری هاوبەش و بۆ دانانی نەخشە و پلانی هاوبەش.

٨. هەردولا هەول ئەدەن هەلویستە گشتیەکانیان لە ڕوداوە گرنگەکانی دێنە پێشەوە بە ڕێگەی گفتوگۆ یەک بخەن، لە کاتی پەلاماردانی لایەکیان دا لە لایەن لایەکی دیکەوە بە ناڕەوا، لایەکەی دیکە داکۆکی لێ ئەکات.

٩. هەمو ئەو بڕیار و ئامۆژگاریانەی پێچەوانەی ئەم ڕێککەوتنەن و پێشتر لە سەرکردایەتی و دەزگاکانی هەر کام لەم دولایەنەوە بە نهێنی یا بە ئاشکرا دەرچوە، هەلئەوەشێتەوە ئیتر کاریان پێ ناکرێت.

تۆزناغی دوەم:

١. ینک و حسکع پەلێن ئەدەن کە ئازادی ژیانی حیزبایەتی بۆ خۆیان و هەمو حیزب و ڕێکخراوە سیاسی و دیموکراتیەکانی کوردستان ئەسەلێنن و، لە سنوری دەسەلاتی خۆیان دا ئەیپارێزن.

٢. ینک و حسکع پەلێن ئەدەن کە هەولی خۆیان یەک بخەن بۆ ئامادەکردنی هەلومەرجی یەکخستنی هەمو داوودەزگا گرنگەکانی شۆرش لە ڕوی سەرکردایەتی و بەرنامەی گشتی و هێزە چەکدارەکانی و شێوەی کارکردنی و بەڕێوەبردنی ناوچەکانەوە بە:

یەکەم: یەکخستنی هێزی پێشمەرگە لە ڕوی سەرکردایەتی و شێوەی ڕێکخستن و شێوەی شەڕکردنیەوە، بە جۆرێک ببێتە سەرپای یەکگرتوی هەمو گەلی کورد لە کوردستانی عیراق دا کە هەمو حیزب و ڕێکخراوەکان بە جیاوازی بیروباوەڕیان بەشداری تێ دا بکەن.

دوەم: پێکهێنانی بەڕێوەبەرایەتی یەکگرتو لە ناوچەکان دا کە نوێنەری دەسەلاتی کۆمەلانی خەلک و شۆرش بێ لە ناوچەکان دا بۆ ڕێکخستنی پەیوەندیەکانی نێوان دانیشتوان.

سێیەم: یەکخستنی دەرامەتی مالی، چ ئەوەی لە ناوەوە دەس ئەکەوی و چ ئەوەی بە یارمەتی لە دزستەکانی دەرەوە وەرئەگیری، بۆ سەرف کردنەوەی بە سەر داوودەزگاکانی شۆرش دا.

چوارەم: یەکخستنی سیاسەتی ئیعلامی شۆرش و توانای لایەنە بەشدارەکانی لە داوودەزگای ئیعلامیی یەکگرتودا لە ناوەوە و دەرەوە.

*

مەیدانی ئازاد

لە کاتێک دا حشع لە ژێر سایەی بەعس دا سەرکردایەتیی حیزبی بەعسی لە ژیانی سیاسی عیراق دا لە حوکمرانی و لە جبهەدا سەلماند بو، ڕێکخراوە دیموکراتیەکانی خۆی هەلوەشاند بووە، هیچ جۆرە چالاکیەکی لە ناو هێزە چەکدارەکانی عیراق دا نەنواند، لە کوردستان بە پێچەوانەوە ئەجولایەوە. ئامادە نەبو دەس لە پچوکترین دەسکەوتی حیزبی خۆی هەلبگری. ئەیویست ئەوەی لە لای بەعس دۆڕاند بوی لێرە مایەکەی دەر بهێنێتەوە. لە بەرامبەر ئەم بیرەی ئێمەدا: بیری یەکخستنی داوودەزگاکانی شۆرش، یەکخستنی پێشمەرگە

و دارایی و راگەیاندن، حەشع لەوەتی گوێزابویەوە بۆ شاخ بیرێکی پێچەوانەی هێنا بوە کایە: کوردستان مەیدانێکی ئازاد بێ بۆ چالاکی سیاسی و پێشمەرگەیی هەمو حیزبەکان بە بێ جیاوازی بیروباوریان. حیزبەکانی تریش ئەم بالۆرەیەیان دوبارە ئەکردەوە.

مەبەستیان لە مەیدانە ئازادەکە، ناوچەکانی چالاکی یەکیتی بو، ئەگینا هیچ لایەکیان باسی بادینانیان نەئەکرد کە پارتی پاوانی کرد بو بە تەنیا بۆ خۆی.

مەبەستیشیان لە چالاکی سیاسی و پێشمەرگەیی، حوکمڕانی ناوچەکان و، کۆکردنەوەی گومرگ و باج و سەرانە و، گرتن و بەردانی خەلک بو، نەک شەر کردن لە گەل هێزە چەکدارەکانی بەعس. لە ناو ئەو هێزانەدا زۆر کەس هەبون، دەیان ساڵ چەکیان بە شانەوە بو، بەلام تەنیا یەک جار توشی شەر نەبوبون لە گەل هێزەکانی حکومەت.

خۆپەرستی لە ناو سەرانی رێکخراوە کوردییەکان دا زۆر قول بو، زۆربیان ئەوەیان پێ گەورەتر و خۆشتر بو، کە سەرکردەی حیزبێکی ۱۰ کەسی بێ، نەک ئەندامی سەرکردایەتی یەککگرتوی جولانەوەیەکی ۱۰ هەزار کەسی. بۆ پاساودانی ئەمەش زۆرجار «تەنگوچەلەمەی باوەر» یان ئەکرد بە بیانوی یەک نەگرتن و، یەک نەخستنی داووودەزگاکانی جولانەوەکە. تەنگوچەلەمەی بێ باوەرییان ئەوەندە قول کردبو، هەر لایەک هەمو قسە و پرۆژە و کرداری لاکەی تری، ئەگەر بە نیازی باشیش بوایە، بە جۆرێکی تر لیک ئەدایەوە. لای وابو ئەو ماستە بێ مو نیە و، لە بن ئەو شتە باشەدا پیلانێک یا نیازێکی خراپ و دوژمنانە حەشار دراوە.

هەر بۆ ئەو بێ باوەرییە دروستکراوە، لیرەدا دو نمونە ئەهێنمەوە:

- ملازم محەممەد شەوقی، یەکی لە سەرانی پاسۆک، لە هاورێکانی بزر بو. سەرانی پاسۆک گومانیان لە یەکیتی بو لە پەناوە لە ناویان برد بێ. چەندی پاکانەمان بۆ ئەکردن نەیانئەویست باوەر بکەن. تا خۆیان روداوەکەیان بۆ رون بوەوە. لە کاتی گەرانەوەی دا لە ناوچەی سلیمانی، بە ناو ئیران دا تی پەری بو. لەو کاتەدا شەر لە کوردستانی ئیران گەرم بو. ئەو ناوچەیەی ئەوی لێ تی پەری بو، کەوت بوە بەر هیرشی هالیکۆپتەری ئیرانی و، لەوی کوژرا بو.

- عەلی هەژار و کوردو گەلالی، دو کادری سەرکردایەتی حسک، لە ناو شار بێ سەر و شوین بزر بون. لیپرسراوەکانی حسک ماوەی چەند ساڵ یەکیتییان تاوانبار ئەکرد بە فراندنیان. چەندی پاکانەمان بۆ ئەکردن نەیانئەویست باوەر بکەن تا خۆیان دوای راپەرین لە ناو فایلەکانی «ئەمن» ی هەولیردا، چارەنوسی هاورێکانیان بۆ رون بوەوە.

سەرانی حسک ئەم پرۆژەیەیان وەکو پیشبینیمان کرد بو وا لیک دابوەوە کە ئەوە بۆ هەڵلوشینی ئەوان و، تیکدانی ریزەکانی جودە. لە چەند دانیشتنیک دا لە گەل سەرانی پاسۆک، پیشنیارێکی لەو بابەتەمان بۆ ئەوانیش کرد، ئەوانیش قبوڵیان نەبو. بە دوای ئەوانیش دا شیخ قادری سۆتکە «لەشکری ئیسلامی کورد» و سامی سنجاری «پارتی دیموکراتی گەلی کوردستان» و شیخ محەممەد خالیدی بارزانی «حیزبوللا» یان دامەزراند.

کوردەکانی موکریان قسەیەکیان هەیە ئەلی: «شەندە لە مەندە کەمتر نیە!» ئەم حیزب و رێکخراوانە هیچیان خۆی لەوی تر بە پچوکتر نەئەزانی. هەمو ئەمانە سور بون لە سەر ئەوەی: هێزی چەکداری تایبەتی خۆیان، دەزگای راگەیاندنی خۆیان، پەیوەندی تایبەتی خۆیان لە گەل دەولەتان، دەزگای تایبەتی پارە کۆکردنەوە و پارەسەندنی خۆیان، دادگا و

زیندانی تایبەتی خۆیان هەبی.. ئەوانەیان بە نیشانەی سەربەخۆیی حیزب و، گەورەیی سەرکردە و سەرکردەکانیان ئەزانی.
سالی ۱۹۸۲ سەرەرای هیزەکانی یەکیتی، ئەو هەمو لەشکرە بی دیسپلینەی: پدک، حشع، حسک، لاک، گەل، حیزبوللا.. لە کوردستان دا تەراتینیان ئەکرد. بە ئارەزوی خۆیان پارەیان لە خەلک ئەسەندو راوورووتیان ئەکرد، بیگاریان بە لادییی ئەکرد، خەلکیان ئەفراند و ئەکوشت، لیبان ئەبو بە جاشی حکومەت و ئەهاتنەوە ئەبونەوە بە پیشمەرگە، داڵدەی گومانلیکراو و نۆکەرانی بەعسیان ئەدا. حشع چونکە خۆی حیزبیکی پچوک بو، بە خۆشیەوە سەیری پارچە پارچە بونی جولانەوەی کوردی ئەکرد و، حەزی ئەکرد سەدان وردە حیزب و ریکخراو لە سەر ئەرزی کوردستان دا دروست ببی، بەشکو ئەو خۆی ببی بە گەورەترینیان.

*

## خۆپیشاندانی شارەکان

سالی ۷٤ ژمارەیەکی زۆری مامۆستا و خوێندکارەکانی زانکۆی سلیمانی چونە ریزی شۆرشەوە. سەرکردایەتی شۆرش بریاری دا زانکۆی سلیمانی لە قەلادزی دابمەزرینیتەوە. مامۆستا و خوێندکارەکانی لەوی کۆ کردەوە. هیزی ئاسمانیی عیراق لە رۆژی ۲٤ ی نیسانی ۷٤ دا شاری قەلادزەی بۆردومان کرد. نزیکەی ۲۰۰ کەس کوژران. هەندیکیان خوێندکار بون. لە ناو خوێندکارەکان دا ۳ ئەندامی کۆمەلە کوژران.
لە بەر ئەوەی تا ئەو کاتە بە کۆمەل لە یەک رۆژدا ئەوەندە نەکوژرا بو، سەرکردایەتی شورش بریاری دا ئەم رۆژە بکا بە «رۆژی شەهید».
بۆ زیندوکردنەوەی ئەم یادە دانیشتوانی قەلادزە بە هاندانی ریکخراوەکانی یەکیتی لە بەهاری ۸۲ دا کەوتنە خۆسازدان. رۆژی ۲٤ ی نیسان ژمارەیەکی زۆر لە دانیشتوانی قەلادزە لە سەرقەبران کۆبونەوە و، چەند لایفتەیەکیان بەرز کردەوە و کەوتنە ریپیوان بەرەو ناوشار. خۆپیشاندانەکە گەورە بو. هیزەکانی بەعس تەقەیان لی کردن دو ئافرەت کوژرا: سنەوبەر مەحمود، مامۆستای سەرەتایی. ئامینە سور، کەیبانو. ۷٤ کور و ۱۱ کچ گیران. دانیشتوانی شار دوکان و بازاریان داخست و دائیرەکان مانیان گرت. پشیوی و ناارامی تا ۳۰ ی نیسانی خایاند.
رادیۆکەی یەکیتی ریپورتاجیکی دەنگداری لە سەر ئەم روداوە بلاو کردەوە. هاوریبانی ریکخستن روداوەکەیان بە ریکۆردەر تۆمار کرد بو، وینەی زۆریشیان لی گرت بو. رادیۆکەمان کەوتە هاندانی خەلک بۆ خۆپیشاندان دژی بەعس. داوا لە هەمو ریکخراوە نهینییەکانی یەکیتی بش کرا خۆیان ساز بدەن بۆ خەبات و کاری جەماوەری.
کوژرانی ئەو دو ئافرەتە ئاوی بە ئاگردا نەکرد، بەلکو زیاتر خەلکی وروژاند. هەلومەرجی ناو شاری قەلادزە ئالۆزا بو. لە چلەی ئەو دو شەهیدەدا خۆپیشاندانیکی گەورەتر ساز کرا. ئەم جارش هیزەکانی بەعس لیبان دا بەلام پیبان سەرکوت نەکرا و، ناارامی دریژەی کیشا و تەنییەوە.
بۆ هاودەنگی لە گەل خۆپیشاندەرانی قەلادزی ئۆردوگاکان راپەرین. جادەکانیان بە تایەی سوتاو داتەخست و، کۆبونەوەی فراوان ئەکرا. هوتافیان بە ژیانی پیشمەرگە و روخانی بەعس ئەکیشا. رۆژانە ریپورتاجی دەنگدار و تۆمارکراوی ئەم روداوانە ئەگەیشتە

دەزگای ڕاگەیاندن و، ڕادیۆکەیش بۆ هاندانی زیاتری خەڵک بە لیدوانەوە بڵاوی ئەکردەوە. لە زۆر جیگا ڕادیۆکەی یەکیتیمان ئەخستە سەر میکرۆفۆنی مزگەوتەکان. ڕیکخراوەکانی سلیمانی کەسوکاری شەهیدانیان لە گۆڕستانی شەهیدان سازدا و، بە ڕیپیوان لە گردەکەوە بەرەو ناوشار بە ڕی کەوتن. خۆپیشاندانەکە گەورە بو. هیزەکانی بەعس تەقەیان لی کردن و چەند کەسیکیان کوشت. ناو کۆلانەکانی سلیمانی بوبو بە جیگەی کۆبونەوەو خۆپیشاندانی بەردەوام. بە دەس پیشکەری ڕیکخراوەکانی هەولیر، خویندکارانی زانکۆی سەلاحەدین خۆپیشاندانیکی گەورەیان ڕیکخست. لەویش چەند کەسی گیران و چەند کەسی کوژران. بۆ پشتیوانی لە خۆپیشاندانی شار و ئوردوگاکان، جگە لەوەی بە ڕادیو ئەکرا، پیشمەرگەش ڕادەی چالاکیەکانی لە دژی هیزەکانی بەعس زۆر زیاد کرد و، چەندین جار چونە ناو سلیمانی و هەولیرەوە.

نائارامی سەرانسەری ناوچەکانی سۆرانی گرت بوەوە. بەردەوام لە شار و ئوردوگاکان دا خۆپیشاندان و کۆبونەوە بۆ دەربڕینی نارەزایی لە ڕژیم هەبو. بەلام ئەمە لە ناوچەیەکی دیاریکراودا قەتیس ما بو:

- ئیمە نەمانتوانی بادینان بجولینین. پارتی و حشع یش کاریکیان نەکرد بۆ جولاندنی. لەو کاتەدا سەرکردایەتی پارتی لە ڕاژان بون لە نزیک ورمی ناگایان لەم زوداوانە نەبو، مەگەر لە ڕیگای ڕادیۆی لایەنەکانی ترەوە.
- لە بەغداد خویندکارانی کورد لە چەند زانستگایەک کەوتنە مانگرتن و خۆپیشاندان، بەلام خویندکارانی عەرەب بە دەنگیانەوە نەهاتن.

کاربەدەستانی بەعس لە زۆر جیگا لە دۆستەکانی خۆیان و لە پیاوماقولانی ناوچەکەیان ئەپرسی ئەمانە چییان ئەوی؟

هەر لە سەرەتاوە بۆ ئەوەی باری ئەم کارە شۆرشگیرانەیە لە توانای خۆی زیاتر قورس نەکەین و، بە تەدریج لە گەل گەورەبون و تەنینەوەی ڕاپەڕین دا دروشمەکانی بگۆڕی، ئەمان هیشت داواکاری زل و قەبە بکەن بە درشمی خۆپیشاندانەکان. داواکارییەکان بریتی بون لە:

- بەردانی گیراوە سیاسییەکان.
- گیرانەوەی جوتیارەکان بۆ دیهاتەکانی خۆیان.
- نەمانی تیرور تۆقاندن لە شارەکان دا.

لایەنەکانی جود، بە تایبەتی حشع، لە ڕادیۆکەیان دا داوایان لە خەلک ئەکرد، تا ڕوخاندنی ڕژیم بەردەوام بن. بەلام خەلک بایەخیکیان بە قسەکانی ئەوان نەئەدا.

لەو کاتەدا باروودۆخی عیراق لە مەیدانی جەنگ دا باش نەبو. تەرازوی شەر بە قازانجی ئیران داشکا بو. عیراق بۆ دامرکاندنەوەی ئەم نارەزاییە هەندی لەو داوایانەی جیبەجی کرد:

- زۆری گیراوەکانی بەردا.
- چاوپۆشی لە دانیشتوانی هەندی ناوچە کرد بگەڕینەوە سەر گوندەکانی خۆیان.
- زەبروزەنگ لە ناو شارەکان دا لە جاران کەمتر بوەوە و، هەندی لە جەللادەکانی لە بابەتی مولازم موحسینەکەی سلیمانییان گویزایەوە.

ئیتر ئیمەش هەم ئامۆژگاری ڕیکخراوە نهینیەکانمان کرد بە شینەیی کۆتایی پی

بهێنن و، له رادیوکەیشمان دا زمانی هاندانمان گۆڕی.
کاکەمین قادر، که یەکێ بو له هاندەرە چالاکەکانی خۆپیشاندانەکانی قەلادزە، هەر ئەو کاتە وتارێکی درێژی له سەر خۆپیشاندانی قەلادزە بە ناوی «زەریا» وە بۆ گۆڤاری کۆمەلە نوسی.

*

یەکەمین جار بو کوردستان بەو جۆرە بشلقێ. دەزگا سەرکوتکەرەکانی رژێم زۆر بە توندی کەوتنە دامرکاندنەوەی. د. فاضل بەرپاک ئەوسا بەرپوبەری «ئەمن» بو راپۆرتێکی درێژی له سەر روداوەکان بۆ صەددام نوسیبوە. صەددامیش بە خەتی خۆی هەندی پەراوێزی لێ نوسیبوە. بە پێ ی ئەو راپۆرتە ژمارەی کوژراو و گیراوەکانی خۆپیشاندانەکان بەمجۆرە بوە:

| | | | |
|---|---|---|---|
| سلێمانی | ١١ کوژراو | ٢٣ برینداز | ١٣١ گیراو |
| کەرکوک | ٦ کوژراو | ٩٥ برینداز | ٢١٠ گیراو |
| هەولێر | ٧ کوژراو | ٢٠ برینداز | ٤١٠ گیراو |

دهۆک خۆپیشاندانی تێ دا نەبو، له بەر ئەوە قوربانیان نەبوە.

*

قاسملو و ناوبژی
له بەهاری ٨٢ دا لەو کوبونەوانەدا که د. قاسملو له گەل سەرکردایەتی یەکێتی ئەکرد، چەند جاری باسی گفتوگۆی له گەل بەعس ئەهێنایە پێشەوە. هەمان باسی له گەل سەرانی حشع کرد بو.
ئێمە له ناوخۆمان دا لەم باسەمان کۆلیبوە. مامجەلال هیچ باوەرێکی بە بەعس و بە گفتوگۆ نەبو له گەلی. بەلام ئێمە هەموومان لامان وابو: ئەگەر بەعس لایەنی کەمی مافەکانی کورد بسەلمێنی، بۆچی له گەلی رێک نەکەوین، بە تایبەتی لەو هەلومەرجە ئالوزەدا که ئەوسا جولانەوەی کوردی تێ کەوت بو؟
ئەو کاتە هەلومەرجی سیاسی رۆژهەلاتی ناوەراست گۆڕانێکی قولی بە سەردا هات بو:
یەکێتی و، رێکخراوە کوردییەکانی تر له عێراق له شورش دا بون.
حدکا و، رێکخراوە کوردییەکانی تر له ئێران له شورش دا بون.
هەمو حیزب و رێکخراوە کوردییەکان له تورکیا دژی خونتا و کودەتاکەی راوەستا بون و، پێ کا کا خەریکی خۆ ئامادە کردن بو بۆ کاری چەکدار.
عێراق له جەنگ دا بو دژی ئێران، نیشانەی بە لاداکەوتنی بە شەر یا بە رێگای سیاسی له ئاسۆدا دیار نەبو. بەلکو ئێران هێزەکانی خۆی رێک خست بوەوە، له چەند شوێن جەیشی عێراقی شکاند بو.
سوریا لولەی نەوتی عێراقی راگرت بو، له هەولێکی جیدی دا بو بۆ روخاندنی عێراق و، عێراق سوریای بە هاوکاری ئێران و بە خائینی نەتەوەی عەرەب دائەنا.
حوکمی عسکەری خونتا له تورکیا، ئێران و سوریای بە دەستێوەردان له کاروباری ناوخۆی تاوانبار ئەکرد.
هەلومەرجێکی کوردی و ناوچەیی ئالۆز و تێکەل و پێکەل خولقا بو. روداوەکانی

ئێران و جەنگی عێراق - ئێران هۆی سەرەکی ئەم ئالۆزانە بو. حکومەتی عێراق، ئەگەر پێویستایە ئەیتوانی رۆڵێکی گەورە لە ناو جولانەوەی نەتەوەیی کوردا بە قازانجی خۆی بگێری و، هەموجولانەوەی نەتەوەیی کورد، لە سەرانسەری رۆژهەلاتی ناوەراست دا، بکاتە پشتیوانی خۆی. عێراق ئەیتوانی یارمەتی شۆرشی کوردەکانی ئێران بدا و، یارمەتی رێکخراوە کوردییەکانی سوریا و، یارمەتی کوردەکانی تورکیایش بدا. جولانەوەی کورد لەم پارچانەدا جولانەوەی رەسەن بون، حیزبی سیاسی و داوودەزگای تا ئەندازەیەک پێشکەوتویان هەبو. ئەم هێزە کوردییانە ئەیانتوانی لە ناکۆکی عەرەبی - ئێرانی و، لە ناکۆکی عەرەبی - تورکی دا، قولایییەکی ستراتیجی بۆ عێراق و عەرەب دروست بکەن. ئەویش تەنیا بەوە ئەکرا کە مافی نەتەوەیی کورد لە عێراق دا بسەلمێنێ و، کورد لە دەزگای بریاردانی سیاسی عێراق دا بکا بە هاوبەش. لەمە ئەگەر هیچی دەس نەکەوتایە کوردی عێراقی ئەکرد بە پشتیوان و یارمەتیدەرێکی بەهێز لە ململانێ ی خۆی و ئێران دا.

*

گفتوگۆ، بەلکو پەیوەندی روت، لە نێوان یەکێتی و بەعس دا، لە سەر یەکێتی زۆر ئەکەوت:

- هەمو هێزە کوردییەکانی نەیار و ناحەزی یەکێتی، ئەیانکرد بە-کەرەستەیەکی بە پێزی شەری پروپاگاندە بۆ شکاندنی یەکێتی.

- هەمو هێزە عێراقییەکانی موعارەضەی عێراقی، ئەیانکرد بە بەهانەی پەلاماردانی یەکێتی.

- ئێران ئەیکرد بە بیانو بۆ زیاتر دوژمنایەتی کردنی یەکێتی و، سوریا و لیبیا ئەیانکرد بە بیانو بۆ تەنگ هەلچنینی زورتر بە یەکێتی و، برینی ئەو یارمەتیە کەمەی ئەیان دایە.

لە بەرامبەر ئەم هەمو زیانە سیاسی و مەعنەوییەی یەکێتی دا بەعس چی بۆ ئەکرد و، چۆن زەرەرەکانی بۆ ئەبژارد؟

رەنگە یەکی لەو لایەنانەی بەعس، وەکو بیروباوەر و حیزب و وەکو سەرکردە و زەلام، لە هەمو لایەن و کەسێکی تر باشتر بناسی یەکێتی و سەرکردەکانی بێ. ئاشنایی لە گەل بیروباوەری بەعس و، ئاسیاوی لە گەل هەندی لە سەرکردەکانی ئەگەرایەوە بۆ ماوەیەکی درێژ پێش ئەوەی حوکمی عێراق بگرنە دەس.

*

خواستەکانی یەکێتی

هەر لە سەرەتای دەسپێکردنەوەی شۆرشەوە حکومەت هەرچەن یەکێکی ئەنارد بۆ گفتوگۆ، ئەیپرسی: چیتان ئەوێ؟

هەلبەتە کاربەدەستانی حکومەتی عێراق و حیزبی بەعس ئەیانزانی کە سەرکردایەتی یەکێتی هیچ داواکارییەکی عەشیرەتی، یا شەخسی، یا تەنانەت حیزبایەتیشی نیە و، ئەیزانی کە داواکانی، بریتیە لە داواکانی گەلەکەمان و مافە نەتەوایەتی و دیموکراتیەکانی. ئەم جارەیان کە حکومەت لە رێگەی د. قاسملووەوە لە ئێمەی پرسی: چیتان ئەوێ؟ داواکانی خۆمان بۆ چارەسەرکردنی(هەمیشەیی، قونڕاغی، جوزئی) کێشەی نەتەوایەتی گەلی کورد لە عێراق دا لە ٣ چوارچێوەدا دارشت:

یەکەمیان - ڕێککەوتنێکی گشتی و ڕیشەیی بۆ ئێستا و پاشەڕۆژ لە چوارچێوەی هاوپەیمانییەکی ستراتیجی دا کە خۆی ئەنوێنی لە پێکهاتن و ڕێککەوتنی نەتەوەی کورد و نەتەوەی عەرەب لە ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست دا لە سەر بنچینەی دانانان بە مافی یەکتری دا لە ئازادی بڕیارداتی چارەنوسی خۆی دا. کورد وەکو نەتەوەیەکی دابەشکراو و چەوساوە لە ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست دا و، عەرەبیش وەکو نەتەوەیەکی دابەشکراو و چەوساوە لە ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست دا. هەر یەکەیان ئامانجی خۆی هەیە لە یەکگرتنەوە و ڕزگاری دا وە لە پێشکەوتنی کۆمەلایەتی دا، کە ئەتوانن پێکەوە پەیمانی هاوکاری ستراتیجی ببەستن بۆ دانانی ڕێوشوێنی ناوچەکە و جۆری پێکەوە ژیانیان.

بەم پێ یە بەعس ئەبێ لە مەیدانی سەلماندنی مافی نەتەوەیی گەلی کوردا، نەک هەر مافی ئۆتۆنۆمی بسەلمێنی، بەلکو ئەبێ دان بە مافی ئازادی بڕیارداتی چارەنوسی دا بنێ.

دووەمیان - ڕێککەوتنێکی قۆناغیی سنوردار، لە چوارچێوەی دەولەتی عیراق دا لە سەر بنچینەی سەلماندنی ئۆتۆنۆمی ڕاستەقینە، بە چەشنێک کە تەنیا کاروباری: «دیفاع و مالیە و خارجیە» لە دەسەلاتی حکومەتی مەرکەزی بێ و کاروبارەکانی تر لە دەسەلاتی حوکمی ئۆتۆنۆمی بێ.

لە گەل ئەوەش دا:

- ناوچە ڕاگوێزراوەکانی سنور بە گوێرەی پلانێکی گشت لایەنە (شامل) بگەڕێنەوە شوێنەکانی خۆیان.

- ئەو شار و ناوچانەی کوردستان کە لە سنوری حوکمە زاتیەکەی ئێستا دەرهێنراون، بخرێنەوە سەر کوردستان.

- تۆقاندن و دەسەلاتی دەزگا دامرکێنەرەوەکانی لە کوردستان دا نەمێنێ و ئازادی دیموکراتی بدرێ بە هەمو لایەنە جیاوازەکان.

سێیەمیان - ڕێککەوتنێکی جوزئی و وەقتی بۆ ڕاوەستاندنی تەقە لە بەینی هێزە چەکدارەکانی یەکێتی و هێزە چەکدارەکانی حکومەت دا بۆ ماوەیەکی دیاریکراو، تا مەترسی جمهوریەتی ئیسلامی ئێران هەم لە سەر عیراق و هەم لە سەر هەردو دیوی کوردستان دور ئەخرێتەوە و لەو ماوەیەش دا هەلی گفتوگۆ لە سەر چارەسەرکردنی مەسەلەی کورد ئەڕەخسێ.

*

## شورشی بێ موسیقا

ڕۆژێکیان خەریکی شتنی قەمسەلەکەم بوم. تەشتێکی گەورەم دانا بو قەمسەلەکەم تێ خست بو، خەریک شوردنی بوم. حەمەی حەمە باقی بە هەلە داوان هات کردی بە هەرا، وتی: «ئێوە ڕێزی هونەرمەند ناگرن! ئێوە ڕێزی نوسەر ناگرن! ئێوە هەر چەک و چەکدارتان بە لاوە گرنگە!..»

وتم: «کاکە حەمە هێواش! چیە؟»

وتی: «دلێریان نارد حەبسی بکەن!»

وتم: «دلێر کێ یە؟»

وتی: «دلێر موسیقارێکی گەورەی کوردە!»

وتم: «کی ناردویەتی حەبسی بکا؟»
وتی: «ئەرسەلان»
وتم: «دانیشە ئیستا ئەنێرم بە دویا بیهێنن بۆ ئێرە، دڵی ئەدەینەوە و لە گەڵ ئەرسەلان ئاشتیان ئەکەینەوە!»
ئەرسەلان کاروباری راگەیاندنی یەکیتی ئەکرد. ناردم بە دوای دلێر دا هات. چیروکەکەم لێ پرسی وتی: «من تازە هاتومەتە دەرەوە. لە شار لە ریکخستن دا بوم. ئەرسەلان ناردمی بۆ فلان بەش لە راگەیاندن لە بەر ئەوەی لە گەڵ زەوقی من نەئەگونجا وتم ناچم. وتی ئەبی هەربچی. وتم ناچم. وتی ئەگەر نەچی ئەتنێرم بۆ زیندان. وتم هەر ناچم. لە سەر ئەوە ناردمی حەبسم بکەن»
دیار بو دلێر چاوەروانی پیشوازی گەرم و نازکێشانی زوری کرد بو، ئەم رەفتارەی ئەرسەلان پیچەوانەی چاوەروانییەکانی ئەو بو، زور دلگیر بوبو. من دلم دایەوە و، ویستم تورەبونەکەی خاو بکەمەوە و تی ی بگەیەنم کە یەکی دیتە دەرەوە ئەبی بە گوێرەی پیویستییەکانی جولانەوەکە لیرە یا لەوی دابنری، نەک بە ئارەزوی خوی، ئەگینا کارەکان نارون و، تۆ پیاویکی تیکوشەر و هونەرمەندی، ئەو شتانە لە خەلکی تر باشتر ئەزانی، ئەرسەلانیش پیاویکی تیکوشەرە و، تازە لە زیندان هاتوتە دەری و، شارەزای کاروباری راگەیاندنە و، بۆ قازانجی راگەیاندن ئەو داوایەی لی کردوی، ئەبوایە قوبولت بکردایە یان بە خوشیی و بی تورە بون رەتت بکردایەتەوە. هەرچی لە گەلم وت دلی بهێنمەوە جیگای خوی گەلکی نەبو. ویستم لە گەڵ ئەرسەلان دایان بنیم و لە یەک نەگەیشتنەکەیان چارە بکەم دیسان گەلکی نەبو، بیئەندازە لاسار بو، سور بو لە سەر ئەوەی ئیتر بە لای موسیقا دا ناچی و، پیشمەرگایەتی ئاکا، منیش گەیشتە تینم، وتم: «کاک دلیر عاجز مەبە، شۆرش بە بی موسیقایش ئەکری!»
دلێر ئەم قسەیەی منی لە دل گرت بو، هەرگیز لە بیری نەئەچوەوە، لای چەندین روشنبیر و موسیقار بە گلەییەوە باسی کرد بو.
دلێر لە گەڵ ئەرسەلان ئاشت بوەوە. تیپیکی موسیقای دامەزراند. تیپەکەی ناو نا بو: «تیپی موزسیقای شەهید کارزان». لام وایە وشەی شەهید: کە نیشانەی مردنیکی پیروزە و لە کوردەواری دا شیوەن بە دوای خوی دا ئەهینی، لە گەڵ تیپی موسیقا: کە خوشیی ئەدا بە ژیان و لە کوردەواری دا شایی بە دوای خوی دا ئەهینی، دو شتی نەگونجاو بن. هەر لە بەر ئەوەی لە سەرەتاوە بەم جۆرە تیگەیشتنە تیپەکەیان دامەزراند و بەریوە برد، ئەگەرچی هەمو پیویستییەکانی کاری داهینەرانەیان بۆ دابین کرا بو، لە ماوەی ۸ سال دا نەیانتوانی تەنها یەک سرود یان یەک گورانی داهینن بکەویتە سەر زمانی خەلک و، لە موسیقای کوردی دا، لە پال سرودەکانی: ئەی رەقیب، گەرچی توشی رەنجەرویی و، دەمی راپەرینە و، نەوروز.. دا بهینیتەوە.

*

## ریککەوتنی ینک - پدک

هەر لە مانگەکانی مارت و نیسان دا حەمەی حەمە باقی بە هۆی حشمەوە دو جار چو بۆ سەردانی پارتی لە تیهران بۆ ئەوەی پەیام و نامەی یەکیتییان پی بگەینی سەبارەت بە ئارەزوی ئاشتبونەوە.

مەسعودی نەدی بو، لە راژان فەلەکەدینی دی بو، راسپارەکانی پی گەیاند بو. وەلامیکی دیاریکراویان نەدابووەوە، پییان وت بو وەلامی نامەکە بە هێزی حشعەوە ئەنێرنەوە. لە مانگی تەموزدا لە بارەگای حشع لە پشتاشان نوینەرانی یەکیتی و پارتی کۆبونەوە.

نوینەرانی یەکیتی: فەرەیدون عەبدولقادر و د. خدر مەعصوم و، نوینەرانی پارتی: محەممەدی مەلا قادر، مەغدید ئەحمەد، روژی ۲۸ ی تەموزی ۱۹۸۲ لە بارەگای حشع لە پشت ئاشان دانیشتن. لەم دانیشتنەدا ریککەوتنیکیان ئیمزا کرد، نوقتە گرنگەکانی ئەوەبو:

- گیروگرفت و ناکوکی نیوان هیزە سیاسیەکان بە گفتوگوی سیاسی، بی ئەوەی پەنا بەرنە بەر چەک، چارسەر بکری.

- کوردستان لە خانەقینەوە تا زاخو مەیدانیکی ئازاد بی بو چالاکی سیاسی و پیشمەرگەیی هەمو لایەنەکان.

- هیزەکانی پارتی و یەکیتی بە ئاگاداری و هاوئاهەنگی یەکتری ئەچنە ناوچەکانی ژیر دەسەلاتی یەکتری و، تا شیوەیەکی تر ئەدوزریتەوە جاری حوکمرانی ناوچەکان وەکو خوی ئەمینیتەوە.

توخنی هیچ مەسەلەیەکی سیاسی نەکەوت بون. لەمەیش پارتی نیازی گیرانەوەی هەندی لە هیزەکانی هەبو بو کوردستان. گوشاری ئیرانییان لە سەر بو کاری چەکدار بکەن لە ناو کوردستانی عیراق دا، بە بی رەزامەندی یەکیتی پش نەیانئەتوانی هیزەکانیان بنیرنەوە بو کوردستان.

پارتی هیزەکانی ناردەوە بو هەمو ناوچەکانی ژیر دەسەلاتی یەکیتی. مەلا محەممەد بارەگای لە وەرتی دانا و، نادر هەورامی، قادر هیزەکانیان هینایەوە ناوچەکانی سلیمانی.

روژی ۲۱ ی تشرینی دوەمی ۸۲ دەستەیەکی نوینەرایەتی یەکیتی کە پیک هات بو لە: د. کەمال خوشناو، د. خدر مەعصوم، ئازاد هەورامی لە بارەگای حشع لە پشتاشان لە گەل نوینەرانی حشع: عومەری عەلی شیخ، مەلا ئەحمەدی بانیخیلانی، فاتیح رەسول بو باسی کیشەکانی هەردولا دانیشتن لەو کوبونەوەیەدا، حشع ئاگاداری یەکیتییان کرد کە پارتی قەبول ناکا یەکیتی هیز بنیری بو بادینان چونکە (اتفاق) ەکەی پشتاشان (اتفاقیکی محلیە) بادینان ناگریتەوە و، لە بادینان لە نیوان یەکیتی و پارتی دا (اتفاق) نیە.

پیشینان وتویانە: «بەشی خوم بو خوم، ئەوەی توش ئەخوما» پارتی وەهای ئەکرد، ئەمەیشیان بو ئەچوە سەر، چونکە کەس بە دەنگ نەئەهات. لەو ریککەوتنەدا حشع ناوبژیکەر و شایەت بون، لە بارەگاکەی ئەوانیش دا ئیمزا کرا بو. لە سەر ئەم پەیمانشکینییەی پارتی هیچ نارەزاییەکیان دەرنەبری. بەلکو بە «روحی ریاضی» وەری گرت و داوای لە یەکیتی ئەکرد لە سەر ئەم وردە، شتانە گیروگرفت دروست نەکا.

*

لاک هیچ کام لەو بەلینانەی بە یەکیتی دابو بە جی نەهینا. سەرەتا کە هیشتا لاواز و جیگەی خوی نەگرت بو، بە نەرمی ئەجولانەوە، کە بە هیز بون و، زیادیان کرد ئیتر گوییان نەئەدایە یەکیتی و، بەرەو ئەوە ئەچون خویان حوکمرانیی ناوچەکان بکەن. چەند جاری قسەیان لە گەل کرا کەلکی نەبو. پشت ئەستور بون بە ئیران و، ئیران هانی

ئەوان لاملی بکەن. ئەگەر لەوە زیاتر چاوپۆشیان لی بکرایە ئەبون بە هێزێکی ئەوتو چارەکردنیان دژوار ئەبو. بریارمان دا تا مەترسیەکەیان زلتر نەبوە چارەیان بکەین. پلانی چەککردنیان دانرا. بۆ جێبەجی کردنی ملازم عومەر چو بۆ بەری مەرگە و، هێزەکانی کۆیە، کۆسرەت، گەرمیان، قەرەداغ و ناوچەکەیان لە سەر کۆ کرایەوە.

لە ۳ جێگا پارەگایان دانا بو، هێزیان لی کۆ کرد بوەوە: بەری مەرگە، سەرگەلوی دولی جافەتی، حاجی مامەندی شارباژێر.

لە تەموزی ۸۲ دا لە ماوەیەکی کورت دا هەمو چەک کران. بەرگریەکی کەمیان کرد. لە بەرگەلو کور و برازاکانی حاجی شیخ قادر هەندی بەرگریان کرد. چەند کەسی لەوان کوژرا و، لە یەکیتی یش سەلاحی حاجی رەفیق، فەرماندەی تیپی ٤٧ ی پیرەمەگرون کوژرا. سەلاح موهەندیس و هاوری ی کۆمەلە و، لە بنەمالیەکی دەولەمەن بو. پیاویکی ئازا و چاونەترس و، سەرکردایەتی دەیان شەر و بۆسەی کرد بو. یەکی بو لە باشترین فەرماندەکانی پیشمەرگە.

لاک هەلوشا و ئیتر خۆی بۆ ریک نەخرایەوە.

*

## دوەمین کۆنفرەنسی کۆمەلە

لە مانگی ئابی ۸۲ دا دوەمین کۆنفرەنسی کۆمەلە بە ئامادەبونی ۲۲۲ نوینەر لە هۆلی شەهید شەهاب لە ناوزەنگ بەسترا. بەشداریی نوینەرانی ریکخراوە نهینیەکانی شارەکان لەم کۆنفرەنسەدا زۆرتر بو لە چاو کۆنفرەنسی یەکەم دا.

بەشیکی کاتی کۆنفرەنس تەرخان کرا بۆ باسی ریکخستنەوەی کاروباری ریکخراوەیی و پیشمەرگەیی یەکیتی و، بەشیکی تریشی تەرخان کرا بۆ دانانی بەرنامەی کۆمەلە: بۆ پیشکەوتنی کۆمەلایەتی و، چارەسەرکردنی کیشەی نەتەوایەتی کورد.

کۆنفرەنس بە هەلبژاردنەوەی سەرکردایەتی نوی ی کۆمەلە کۆتایی هات. مامۆستا جەمال تاهیر ئەگەرچی لە ناو شار بو ئەویش هەلبژیردرا بە ئەندامی سەرکردایەتی.

*

## پیکهینانی یەکیتیی شورشگیران

لە ۱۵ ی ئابی ۱۹۸۳ کادرە پیشکەوتوەکانی ریکخستنەکانی خەتی گشتی و بزوتنەوە لە تۆژەلە کۆبونەوە و بریاریان دا: هەردولا لە ریکخراویکی تازەدا یەک بگرن و، هەمو ریکخستنەکانیان تیکەلاوی یەکتری بکەن. پروگرامەکەی یەکیتیی نیشتمانی بکەن بە پرۆگرامی خۆیان. سەرکردایەتیەکی تیکەلاویان هەلبژارد و، مامجەلالیان کرد بە سکرتیری ریکخراوەکەیان.

ئیمە لە کۆمەلەدا ئەم یەکگرتنەمان پی هەنگاویکی باش و بە کەلک بو. بەلام بونی مامجەلال بە سکرتیری ئەم ریکخراوە، کە ئەبو هاوتای کۆمەلە بی لە ناو یەکیتی دا و، لە هەمان کاتا مونافیسی بی، لە گەل ئەوەدا نەئەگونجا کە مامجەلال سکرتیری گشتی یەکیتی یش بی. مامجەلال بۆ راگرتنی هاوسەنگی نیوان کۆمەلە و شورشگیران، وازی لە سکرتاریەتی شورشگیران هینا.

*

د. قاسملو داوای کۆبوونەوەیەکی بە پەلەی کرد بۆ لە گەڵ مامجەلال و عەزیز محەممەد. ڕۆژی ١٥ ی تەمموزی ١٩٨٢ لە بارەگای هاوینەی مامجەلال لە سەرچاوەی توژەڵە کۆبوونەوەکە کرا. منیش بەشداری کۆبوونەوەکە بووم. لە کۆبوونەوەکەدا د. قاسملو دەستی کرد بە قسە کردن، وتی: «ئێوە هەردولاتان دوستی حیزبی دیموکراتن، ئەمرو من هاتوم دوستەکانی دیموکرات تاقی ئەکەمەوە، پیویستیمان بە یارمەتی هەیە هاتوم داوای یارمەتییان لی بکەم!»

لێمان پرسی: «پیویستیتان بە چ جورە یارمەتییەک هەیە؟»

وتی: «سوپای پاسداران هێرشێکی زور گەورەیان دەس پی کردوە بۆ سەر بارەگاکانمان. هێزەکانی دیموکرات بە تەنیا ناتوانن بەری ئەم هێرشە بگرن. هێزەکانمان زور ماندون و زەرەری زوریان لی کەوتوە. ئەگەر فریامان نەکەون دەفتەری سیاسی و بنکەکانی ترمان لە مەترسی گرتن دایە و، ئەبی رویکەینە قەلادزە. پیویستیمان بە پیشمەرگەکانی کوردستانی عیراق هەیە»

راستیەکیشی هێرشێکی گەورەیان لە سەر بو، هێزەکانی ئیران لە هەمو لایەکەوە لە پیشرەوی دا بون و، هێزەکانی دیموکراتیان ئەشکاند و، شوینەکانیان لی ئەگرتن. پەشوکان بە د. قاسملوەوە دیار بو.

عەزیز محەممەد وتی: «ئیمە ئەبی ئەم داوایە دراسە بکەین، ئینجا ئەتوانم جوابت بدەمەوە!»

د. قاسملو وتی: «کاک عەزیز من خوم لە ولاتانی سوسیالیستی ژیاوم، شارەزای شیوەی کارکردنیان بوم، کە وتیان (دراسەی ئەکەین) یەعنی ئەو داوایە جیبەجی ناکەن. من ئیستا پیویستیم بە پیشمەرگەی حیزبەکەی ئیوە هەیە، تا کومیتەی ناوەندی حشع کۆ ئەبیتەوە و بریاریک ئەدا، شوینەکانی ئیمە ئەگیرین!»

کاک عەزیز نەچوە ژیر باری هیچ جورە بەلێنیکی یارمەتیدانەوە. د. قاسملو لە حشع نائومید بو روی کردە مامجەلال وتی: «ئیوە ئەڵین چی؟»

مامجەلال وتی: «ئیمە لە سەر بریاری پیشوی خومان ماوین، ئەوەی لە توانای ئیمەدا بی بۆ یارمەتیتان ئامادەین، تەنانەت ئەگەر لەو پیناوەدا شورشی کوردستانی عیراق شەهیدیش بی»

*

لە ماوەی ٣ سالی رابوردودا چەند جاری هەولمان دا بو دەمان بگا بە ئیمام خومەینی و سکالای خومانی لە لا بکەین. کاربەدەستانی ئیرانی ریگەیان لی ئەگرتین. لەو کاتەدا ئیمە هیچ پەیوەندییەکمان لە گەڵ ئیران نەمابو. هیچ هیوایەکیشمان بە یارمەتی و پشتیوانی ئیران بۆ یەکیتی یان بۆ موعارەزەی عیراقی نەبو. بەلکو گەیشت بوینە ئەو باوەرەی ئیران لە یارمەتیدانی موعارەزەدا بۆ روخاندنی رژیمی بەعس نەک هەر جیدی نیە و بەس، بەلکو ئەیەوی عیراق بە دار و بەرد و، شیعە و سوننە و، کورد و عەرەب و، موعارەزە و رژیمەوە.. ورد و خاش، یا هیچ نەبی لاواز و زەلیل بکا.

١. هیچ جیدیەتیک لە کاربەدەستانی ئیران دا نەئەبینرا بۆ یارمەتی موعارەزەی عیراقی، تەنانەت بۆ ئە ریکخراوانەش کە دینیی بون و سەر بە ئیران بون. بۆ ئەوەی

ناکۆکیەکانیان لە ناودا قوڵتر بکا، بە جیا رەفتاری لە گەڵ نەکردن و، لە چوارچێوەی ستراتیجی خۆی دا هەڵی ئەسوراندن.

۲. هەمو ئەو حیزب و لەشکرانەی لە کوردستانی عیراق دا تەراتێنیان ئەکرد لە ژێر سایەی ئێران دا دامەزرا بون، یا بە یارمەتی ئەو بوژابونەوە. بە چەک و پارەی ئەوان ئەژیان. بە کردەوە جولانەوەی کوردی لەت و پەت کرد بو.

۳. وەجبەیەکی گەورە چەک و تفاقی جەنگ بۆ یەکێتی هات بو، کە زیاتر لە ٥ هەزار کلاشینکۆف و ۱ هەزار ئارپیجی و سەدان هاوەن و ساروخی تی دا بو. کاربەدەستانی ئێران بەڵێنیان دابو ریگە بدەن بە یەکێتی ئەم چەکانە بە ناو ئێران دا بگوێزێتەوە بەلام کە گەیشتە ناو ئێران دەستیان بە سەرا گرت و، بردیان بۆ خۆیان.

لەو کاتەدا هەلومەرجی جەنگی عیراق باش نەبو، جولانەوەی کورد ئەیتوانی بەم چەکانە تا رادەیەکی باش تەرازوی جەنگی لە کوردستان دا بە قازانجی خۆی بگۆری. بەلام ئەم ری لی گرتنە زەرەریکی گەورەی لە یەکێتی دا.

*

د. قاسملو داوای هێزیکی پچوکی کرد مامجەلال بەڵێنی دایە هەر ئەو رۆژە مشوری ناردنیان بخوات. هێزیکی پشدەر لە ری بون، ئەوانەی لە گەڵ عەلی پچکول نارد.

د. قاسملو پێشنیاری کرد کە مەلازم عومەر، بۆ ئیعتیبارەی عەسکەریە، سەردانیکی مەیدانەکانی شەر بکا و فەرماندەکانیان ببینێ بۆ ئەوەی بزانێ کەموکوریەکانیان چیە. رۆژی دوایی عومەریش چو بۆ سەیری مەیدانەکانی شەر و هێزەکانیان. زۆری هێزەکانی دیموکرات هەلوشا بون و، وورەی شەریان نەمابو، تەنانەت لە هەندی شوێن بەشی شارەزایی و چاوساغی هێزەکانی یەکێتی پشیان نەما بو. ناچار داوای هێزی مەڵبەندەکانمان کرد. مامجەلال بۆ ئەوەی گور و تین بخاتە بەر هێزەکانی یەکێتی خۆی چوە ساوین بارەگای دانا و، راستەخۆ سەرکردایەتی هێزەکانی یەکێتی ئەکرد، کە ژمارەیان لە ۲ هەزار تی پەری بو.

حدکا ناویان لە هێزەکانی یەکێتی نابو: «هێزی پشتیوان». هێزی پشتیوان لە چەند جێگا توشی شەر بو و، هێرشەکانیان دوا خست. چەکدارەکانی پارتی شان بە شانی هێزەکانی ئێران بەشداری شەر بون و، چەند کەسیکیان لی بە دیل گیرا. رادیوی حدکا بە ستایش و شانازیەوە هەواڵی شەرەکانیانی بلاو ئەکردەوە.

د. قاسملو ئومێدی بەوە نەمابو کە ناوچەی ئازادکراو بپارێزن، هەوڵەکەی بۆ ئەوە بو بە شێنەیی کەلوپەلی دەفتەری سیاسی و، بارەگاکانی تریان و، دەزگای رادیو و، دیلەکان، بە سەلامەتی بگوێزنەوە بو ناوچەی بێتوش لە سەر سنور. لە ماوەی چەند حەفتەیەک دا ئەم کارەیان ئەنجام دا.

*

پارتی بە ئاشکرا شەری دژی حدکا راگەیاند بو، لە لەشکرکێشیەکانی ئێران دا بەشدار ئەبون. لایەنەکانی تر جود، ئەوانەی کە خۆیان بە دۆست و هاوپەیمانی حدکا ئەزانی وەکو: حشع، حسک، پاسوک، بۆ ئەوەی دلی ئێرانیان لی نەرەنجی، ئامادە نەبون هیچ یارمەتیەکی بدەن. بەلکو هێرشیکی گەورەی پروپاگاندەیان لە دژی هاوبەشی یەکێتی دەس

پی کرد، به بیانوی ئەوەی یەکیتی مەیدانی راستەقینەی خەباتی چول و، بۆ رازی کردنی دلی کاربەدەستانی بەعس ئەم کارەی کردوە. دەزگای پروپاگاندەی حشع، لەم مەیداندا، لە هەمویان چالاکتر و دەم هەراشتر بو. لە ناو یەکیتی یش دا نارازییەکان، بە تایبەتی ئەوانەی دوایتر «ئاش» یان پیک هینا، بۆ دروستکردنی گومان لە سەرکردایەتی یەکیتی و، ساردکردنەوەی پیشمەرگە بە توندی کەوتنە پروپاگاندە.

کاربەدەستانی ئیران، ئەم هاوکارییەی یەکیتییان لە گەل حدکا، بە «کاریکی لە بەخشین نەهاتو» دائەنا، چونکە لایان وابو ئەگەر ئەم پشتیوانییە نەبوایە ئەوان تەواویان ئەکردن و، ئەیانکردن بە دیوی عیراق دا.

ریزبەستنیکی تازە دروست بوبو لە لایەک ئیران و پارتی و لایەنەکانی جود، لە لاکەی تر حدکا و یەکیتی. پارتی، لە ژیر گوشاری ئیران دا، شەری راگەیاندنیان دەس پی کردەوە، لە رادیوکەیانەوە بە ئاشکرا کەوتنەوە هیرش بۆ سەر یەکیتی. بۆ وەلامدانەوەی ئەم هیرشانە زنجیرەیەک وتارمان بۆ رادیوی یەکیتی ئامادە کرد لە ژیر ناوی: «مەسەلەی کورد یەک مەسەلەیە، یا چەند مەسەلەیەکە؟»

سەرباسەکانی ئەمانە بون: ئەرک و فرمانی نیشتمانیی و سیاسەت و هەلویستی شورشگیرانە. چەند تیبینییەکی میژویی دەربارەی مەسەلەی کورد. کین دۆستەکانی کورد و کامانەن دوژمنەکانی؟ ئالوزاندنی پەیوەندی بەینی لایەنە چەکدارەکانی کوردستانی عیراق بە قازانجی کی یە؟ پەیوەندی ناوخۆیی جولانەوەی رزگاری نیشتمانیی و پەیوەندی لە گەل خەباتی شورشگیرانەی گەلانی ناوچەکە. پروپاگاندەی درۆ دژی یەنک خزمەتی داگیرکەرانی کوردستان ئەکا. دیسانەوە مەسەلەی دۆست و دوژمن و سۆشیال دیموکراتەکان. تاکرەوی نەتەوایەتی و سەربەخۆیی یا رەدوکەوتن. لە ناو بردنی جولانەوەی کورد لە بەشیکی تری کوردستان دا لە قازانجی کی و لە زەرەری کی یە؟

لە گەل فەرەیدون پیکەوە بیرەکانی وتارەکانمان گەلالە کرد و، هەندیکی ئەو و هەندیکی من نوسیم. سەرەرای ئەوەی بە رادیو بلاو کرایەوە، کرایە نامیلکەیەکی تایبەتی و چاپ کرا.

تا ئەو کاتە هەندی لە لق و ناوچەکانی پارتی لە کوردستانی عیراق لە ناوچەکانی ژیر دەسەلاتی یەکیتی دا مابون، ئەوانیش کەوتنە گیچەل بە هیزەکانی یەکیتی. رووداوەکان وایان ئەگەیاند کە دیسان شەری پارتی - یەکیتی هەلئەگیرسیتەوە، پارتی بۆ بیانویەک ئەگەرا.

*

هەلویست وەرئەگرن، بەلام هەلویست دەرنابرن!

لە هەمو ئەو کۆبونەوانەدا کە لە نیوان حشع و یەکیتی دا بە دو قولی یان بە بەشداری لایەنەکانی تریش ئەکرا، یەکی لە باسە سەرەکییەکانی، باسی دەسوەردانی پارتی بو لە کاروباری کوردستانی ئیران دا، یان وردتر باسی هاوکاری چەکدارەکانی پارتی بو لە گەل هیزە چەکدارەکانی ئیران دژی کوردەکانی ئیران، بە تایبەتی حدکا. لە هەمو کۆبونەوەیەک دا حشع ناڕەزایی خۆی دەرئەبری دژی ئەم هەلویستەی پدک. لە یەکی لە کۆبونەوەکان دا بەلینیان دابو کە ئەگەر پدک جاریکی تر ئەو رەفتارەیان دوبارە کردەوە، هاوکاری ئیرانیان کرد دژی حدکا ئەوان بە ئاشکرا هەلویست وەربگرن لە دژی پدک.

پدک چەند جارێکی تریش، بەڵکو بە قورساییەکی زۆرتر، لە شەڕەکان دا بەشدار بو. مامجەلال لە کۆبونەوەیەکدا بە گیری هێنا بون، کە بۆچی هەڵویستی خۆیان بە ئاشکرا لەو روداوانە لە ناو دەزگاکانی راگەیاندنی خۆیان دا باس ناکەن. مەلا ئەحمەدی بانیخیلانی وت بوی: «ئێمە وتومانە هەڵویست وەرئەگرین، نەمانوتوە هەڵویست دەرئەبرین»

پدک لە دەوی ئێران پەلاماری حدکای ئەدا حشع هەرگیز رەخنەیەکی بە ئاشکرای لی نەگرت، کەچی کە یەکێتی چو بۆ یارمەتیدانی حدکا هەمو توانای پروپاگاندەیی خۆی لە دژی یەکێتی خستە کار.

*

ئەم بڕیارەی یەکێتی، کە منیش تیا بەشدار بوم، زوورتر شتێکی «عاطیفی» بو تا لێکدانەوەی سیاسی و هەڵسەنگاندنی روداوەکان. هێزەکانی حدکا تێک شکا بون، هەر ناوچەیەکیان لی ئەگیرا بە یەکجاری چۆڵیان ئەکرد. پێشمەرگەیان تی دا نەئەهێشتەوە بۆ درێژەدان بە شەڕی پارتیزانی. یەکێتی بەم کارە نەیتوانی حدکا هەڵبسێنێتەوە، بەڵام ئێرانی لە خۆی ووروژاند و، ئەو «ئاشتیە لەرزۆک» ەی لە نیوان پارتی و یەکێتی دا بو سەر لە نوی تێک چوەوە. یەکێتی کەوتە ناو مەترسیەکی گەورەترەوە لەو مەترسیەی هەڕەشەی لە حدکا ئەکرد. مەترسی شەڕ لە ۳ مەیدانی جیاوازدا: عیراق کە شەڕی لە گەڵ رانەگیرا بو، ئیران کە لە بەر خاتری حدکا شەڕی لە گەڵ دەس پی کرا بو، جود بە سەرکردایەتی پارتی کە لە ژێر گوشاری ئیران دا خەریکی خۆ سازدان بو بۆ پەلاماردانی یەکێتی.

## پێکهێنانی مەڵبەندەکان

دەیان هەزار لاو لە سەربازی هەڵات بون و، لە گوندەکان دا دانیشت بون، هەندێکیان ئەبون بە پێشمەرگە. هەرێمەکان زور قەبە بوبون، هەندێکیان بوبون بە ٤٥ تا ٥٠ پێشمەرگە. سەرکردایەتی هێزێکی وا گەورە لە توانای زور لە فەرماندەی هەرێمەکان دا نەبو. فەرماندەی هەرێم و فەرماندە و کادرەکانی تر دەستیان ئەخستە ناو کاروباری خەڵکەوە. گلەیی زورمان پی ئەگەیشتەوە لە سەر رەفتاری هەندی لە کاربەدەستەکانی پێشمەرگە. ئەندامەکانی سەرکردایەتی لە ناوزەنگ کۆبوبونەوە، هەندێکیان کارێکی دیاریکراویان نەبو.

رێکخستنی هەرێم ئیتر لە چاو پێشکەوتن و پەرسەندنی جولانەوەکەدا نەئەگونجا. ئەبو شێوەیەکی تر بو رێکخستنی پێشمەرگە و کاروباری خەڵک بدوزینەوە. ماوەیەک بو لە ناو خۆمان دا ئەم باسەمان ئەکرد. هەندێکیان دژی هەمو جۆرە ئالوگۆڕی بون لە رێکخستنەوەی هەرێمەکان دا، هەندێکیان وا تی گەیاند بو کە ئێمە بۆ لیدانی ئەوان و، کەمکردنەوەی دەسەلاتی ئەوانە. راستیەکەی بۆ چاکتر رێکخستنەوەی کاروباری ناوچەکان و پێشمەرگە بو، نەک بۆ لیدانی کەس.

کاروباری جولانەوەکە هەر شەڕ نەبو لە گەڵ هێزەکانی بەعس، بەڵکو بوبو بە جۆرێک لە حوکمرانی، دەسەلاتی حکومەت لە زور ناوچەدا نەما بو، یا کز بوبو، خەڵک بۆ بەلاداخستنی کێشەکانیان رویان لە داوودەزگاکانی شۆڕش ئەکرد. بڕیارمان دا کە هەرێمەکان هەڵبوەشێنینەوە و، تیپیان لی دروست بکەین و، هەر چەند تیپێک بەرەو روی دەزگایەکی بالاتر بکرێتەوە، کە تێکەلاو بی لە چەند لیپرسراوێک و، هەریەکەیان کاری دیاریکراو و دەسەلاتی دیاریکراوی هەبی بە ناوی مەڵبەندەوە.

مەلبەند پێک ئەهات لە:
١. لێپرسراوی یەکەم، کە سەرپەرشتی هەمو کاروبارەکانی مەلبەندەکەی ئەکرد.
٢. لێپرسراوی کاروباری پێشمەرگە، سەرکردایەتی تیپەکانی ئەکرد.
٣. لێپرسراوی کاروباری کۆمەلایەتی، سەرپەرشتی ئەنجومەنی ئاوایییەکان، قوتابخانە، نەخۆشخانە، دادگا و زیندان.. ی ئەکرد و، کێشەکانی ناو خەلکی چارەسەر ئەکرد.
٤. لێپرسراوی کاروباری سیاسی، سەرپەرشتی رابەرە سیاسیەکانی ئەکرد.
٥. لێپرسراوی کاروباری دارایی، سەرپەرشتی دەرامەت و خەرجی مەلبەندەکەی ئەکرد و، موچەی پێشمەرگە و، مەسرەفی بارەگا و شەرەکانی رێک ئەخست.
٦. لێپرسراوی راگەیاندن، هەوالی پێشمەرگە و چالاکییەکانی و، دەنگوباسی ناوچەکەی ئەنارد بۆ دەزگای راگەیاندن، بە تایبەتی بۆ رادیو.
ناوچەکانی ژێر دەسەلاتی یەکێتی، پاش لێکولینەوەی لایەنی جوگرافی، ئیداری، کۆمەلایەتی.. دابەش کرا بە سەر ٤ ناوچەدا و، ٤ مەلبەند بۆ سەرپەرشتی کردن و بەرێوەبردنیان پێک هێنرا.

### مەلبەندی یەک

بارەگای مەلبەند لە حاجی مامەند دانرا دوایی‌تر بە هۆی شەری ئێران - عێراقەوە برایە بەلەکەجار لە ناوچەی قەرەداغ.
تیپەکانی: ١٥ ی هەورامان، ١١ ی شارەزور، ٣١ ی بەرزنجە، ٣٣ ی سلیمانی، ٣٧ ی شابازێر، بەستران بە مەلبەندی یەکەوە.

### مەلبەندی دو

بارەگای مەلبەند لە سەرگەلو دانرا.
تیپەکانی: ٢١ ی کەرکوک، ٢٣ ی سورداش، ٤٧ ی پیرەمەگرون، ٥٧ ی سەگرمە، ٥١ ی گەرمیان، ٤٣ ی تاسوس، ٦٨ ی مامەندە، ٤٤ ی چەکوچ، ٦١ ی جوتیاران، بەستران بە مەلبەندی دوەوە.

### مەلبەندی سێ

بارەگای مەلبەند لە وەرتێ دانرا.
تیپەکانی: ١٢ ی سوران، ١٤ ی ئاکو، ٧٤ ی بالەک، ٧٧ ی کوزو، ٧٨ ی کاروخ، تیپی کورەش، بەستران بە مەلبەندی سێ وە.

### مەلبەندی چوار

بارەگای مەلبەند لە بالیسان دانرا.
تیپەکانی: ٨٦ ی دەشتی هەولێر، ٨٣ ی هەوری، ٩١ ی سەفین، ٩٣ ی کوسرەت، ٩٩ ی بیتوێن، بەستران بە مەلبەندی چوارەوە

*

له پێکهاتنی مەلبەندەکان دا هاوسەنگی کومەلە و بالەکانی تری یەکێتی لێک دراپووەوە.
هەر مەلبەندە نەخۆشخانەیەکی هەبو پزیشک سەرپەرشتی ئەکرد و، دادگایەکی هەبو چەند کەسێکی قانونی کاریان تێ دا ئەکرد، دەزگای بێتەلی هەبو بۆ پەیوەندی لە گەڵ م س.
مەلبەند لە راستی دا حکومەتێکی پچکولانە بو، لە ماوەیەکی کورت دا جێگیر بون و، بون بە جێگای باوەر و رێزی دانیشتوانی ناوچەکان.
رێکخراوەکانی کومەلەیش سەربەخو کاریان ئەکرد. راستەوخۆ بەسترا بون بە دەزگای ناوەندی رێکخستنی کومەلەوە.
بە گوێرەی پێویستی ئالوگۆر لە ئەندامانی مەلبەند و، سەرتیپەکان دا ئەکرا.

*

یەکێتی و حکومەت

د. قاسملو پێشنیارەکانی ئێمەی گەیاند بە کاربەدەستانی عیراق. تا چەند مانگی هیچ هەواڵێکی نەبو. شەرەکانی کوردستانی ئێرانی بە سەردا هات. د. قاسملو لەو ماوەیەدا بەرزان تکریتی و صەددام حسێنی بینی بو. وەلامی پێشنیارەکانی ئێمەیان داپووەوە:
پێشنیاری یەکەم - خوا بوە لاوە بە بیانوی ئەوەی هێشتا هەلومەرجی رێککەوتنێکی ستراتیجی لەو بابەتە، لە نێوان عەرەب و کوردا، نەگەیشتوە.
پێشنیاری دوەم - کە بریتی بو لە ئۆتۆنۆمی، موافیق بون بۆ ئەوەی بکرێ بە بنچینەی دەسپێکردنی گفتوگۆ.
پێشنیاری سێیەم - کە بریتی بو لە راگرتنی شەر، ئامادە بون بۆ جێبەجێ کردنی دەسبەجێ.
کاربەدەستانی عیراق رێزێکی زۆریان لە د. قاسملو و بیروراکانی ئەگرت. لەو کاتەدا لە نێوان یەکێتی و حکومەت دا ئەو دەوری «وسیط» ی ئەبینی. کاربەدەستانی عیراق داوایان لێ کرد بو کە کۆبونەوەیەک رێک بخا بۆ ئەوەی نوێنەرانی یەکێتی روبەرو بیبن و، وەلامەکانی بەعس بۆ پێشنیارەکانی یەکێتی بە دەمی خۆیان تەئکید بکەنەوە.

*

رۆژی ۱۳ ی تشرینی یەکەمی ۸۲ د. قاسملو لە گوزە شێر کۆبونەوەیەکی رێکخست بۆ یەکتر بینین. لە باتی یەکێتی: مامجەلال و من و، لە باتی حکومەتی عیراق: ئەبو ئەحمەد، ئەبو عودەی، ئەبو محەممەد، ئامادە بون. د. قاسملویش وەکو «وسیط» و میواندار بەشدار بو.

*

ئەبو ئەحمەد (عەقید روکن خەلیل محەممەد شاکیر)، ئەفسەرێکی موسلاوی بو، یاریدەدەری سەرۆکی «جیهازی موخابەرات» و، ئەبو عودەی (عەقید ئیحسان) لێپرسراوی ناوچەی سەروی موخابەرات لە کەرکوک و، ئەبو محەممەد لێپرسراوی موخابەراتی هەولێر بو.
«جیهازی موخابەرات» یەکێ لەو دەزگایانە بو، بەعس دوای ئەوەی هاتە سەر کار دای مەزراند. حیزبی بەعس بەر لەوەی بێتە سەر کار رێکخراوێکی پچوکی بۆ کۆکردنەوەی

دەنگوباس و کوشتنی ناحەزەکانی، بە ناوی زیکخراوی «حنین» دروست کرد بو، صەددام خوی سەرپەرشتی ئەکرد. کە هاتە سەر کار گەورەتری کرد و، بودجەیەکی زلی بو تەرخان کرد، ماوەیەک سەعدون شاکیر و، دوای ئەو تا ١٩٨٤ بەرزان تکریتی سەروکی بو. ئەم دەزگایە بە ناو بو کاروباری دەرەوە دامەزرینرا بو، بەلام دەستی وەر ئەدایە ناو هەمو کاروباریکی ناوخوی عیراقەوە و، لە گەل دەزگاکانی: ئەمن و ئیستیخبارات، لەم بارەیەوە بوربوربنی ئەکرد. ئەمیش، وەکو دەزگاکانی کە، راستەوخو بە دیوانی سەروکایەتی واتە بە صەددامەوە بەسترا بون. لە ناو هەر ٣ دەزگا ئەمنییەکان دا: ئەمن، ئیستیخبارات، موخابەرات دا، بەشیکیان بو مەسەلەی کورد تەرخان کرد بو. لە هەر سیکیان دا ناوی: «شوعبەی ٣» بو.

*

ئەبو ئەحمەد لە قسەکانی دا وتی: «ئیمە لە لایەن سەروکەوە نەردراوین. سەروک سلاوتان لی ئەکا. ئیمە دەسەلاتی گفتوگومان نیە، ئەرکی ئیمە ئەوەیە بیرورراکانی سەرکردایەتی بو ئیوە بهینین و، بیرورراکانی ئیوەیان بو بهینینەوە. سەرکردایەتی ئامادەیە: بو چارسەرکردنی کیشەی کورد لە سەر بنچینەی بەیانی ١١ ی ئازار بە ریگەی گفتوگوی هیمنانە و ریککەوتن لە گەل یەکیتی. هەروەها بو دانانی ریوشوینی وەستاندنی شەر لە بەینی یەکیتی و حکومەت دا. ئیوە عیراقین، چاکتر وایە مامجەلال و نوینەرانی یەکیتی بین بو بەغداد بو ئەوەی سەروک ببینن و گفتوگوی راستەوخو دەس پی بکا.»
مامجەلال بە گەرمی بە خیرهاتنی کردن. سوپاسی د. قاسملوی کرد بو هەول و تەقەلاکانی. ئامادەیی یەکیتی دەبری بو چارسەرکردنی کیشەکان بە ریگای سیاسی. بە دریژی باسی سیاسەتی چەوتی بەعسی کرد بەرامبەر گەلی عیراق بە گشتی و، گەلی کورد بە تایبەتی. ئوبالی هەمو روداوەکانی عیراقی خستە ئەستوی بەعس. خواستەکانی بزوتنەوەی کوردی بو رون کردنەوە و، داوای لی کردن کە ئەگەر بە تەمای گفتوگویەکی راستەقینە و سەرکەوتو بن پیویستە هەمو لایەنەکان بەشدار بن. مامجەلال لە قسەکانی دا توندوتیژ بو.
ئەبو ئەحمەدیش ئوبالی هەمو روداوەکانی خستە سەر کورد. وتی ئەگەر ئەتانەوی گفتوگو سەرکەوتو بی سەروک ئەلی: «ئەبی چارەی بنەرەتی هەمو گیروگرفتەکان بکری و، ریککەوتنیکی ستراتیجی بی نەک تاکتیکی، با مامجەلال زیاد تەکتەکە نەکا!»
«تەکتەکە»: وشەی بە عەرەبی کراوی «تاکتیک» ە. مەبەستی لە تەکتەکە فرو فیل بو. لای صەددام و سەرانی بەعس وا باو بو: مامجەلال، ستراتیج ئەکا بە قوربانی تاکتیک و، زورتر تاکتیکزانە وەک لەوەی شارەزای کاری ستراتیجی بی. مامجەلال لەم قسەیە توندتر بو، وتی: «ئیمەی فەقیر لەم شاخ و داخە چوزانین تەکتەکە چیە؟ صەددام حسین خوی خوای تەکتەکەیە!»

*

لە وەفدی حکومەت پرسرا: کە ئاخو حکومەت ئەیەوی چارسەری گیروگرفتی کورد بکا، یاخود ئەیەوی یەکیتی بکا بە گژ لایەنەکانی ترا؟ هەلبەتە وەفدەکە وتیان کە حکومەت ئەیەوی گیروگرفتی کورد بە جوریکی بنەرەتی چارسەر بکا و، ئەیەوی شەر لە کوردستان دا نەمینی. لە بەر ئەوە ئیمەیش داوامان لی کردن کە هەول بدەن پەیوەندی لە

گەل حشع و پارتی پش بکەن بۆ هەمان مەبەست و هەول بدەن کورانی بەرزانی رازی بکەن.
لە وەلام دا وتیان: «لە گەل پارتی گفتوگۆمان هەیە» بەلام بۆ حشع وتیان: «ئیمە حشع لە چوارچێوەی جولانەوەی کوردا نابینین، هەول ئەدەین لە شوینی تردوە قسەیان لە گەل بکرێ».
لە ناو قسەکان دا منیش هەندێ «مداخلە» م کرد، بەلام گفتوگۆی سەرەکی لە نێوان ئەبو ئەحمەد و مامجەلال دا بو.

*

مامجەلال گفتوگۆکانی ناو کۆبونەوەکەی بە نامە بۆ عەزیز محەممەد نوسی، داوای لێ کرد سەرانی پارتی پش ئاگادار بکا، بۆ ئەوەی هیچ لایەک توشی کاری یەکلاتە نەبێ و، هەلویستێکی یەکگرتویان هەبێ، یا هیچ نەبێ خواستەکانیان لە یەک بچێ.
عەزیز محەممەد لەو کاتەدا بە ناو تەهران دا بە رێگاوە بو بۆ سوریا. بەن بۆنەیەوە سەردانی پارتی کرد بو لە رازان. لە پاش ماوەیەک وەلامی مامجەلالی دایەوە، لە نامەکەی دا سوپاسی کرد بو کە ئاگاداری کردوە و، ئەویش ئاگاداری پارتی کرد بو، پێشنیاری بۆ کرد بو لە سەری بروا و، ئەگەر شتێکی تازە هاتە پێشەوە ئاگاداری بکا.

*

وەفدی عێراقی لە دانیشتنەکە ئاسودە و خۆشحال نەبون، چاوەروانی شوکرانە بژاردنێکی زورتر بۆ صەددام و خواستی کەمتر و قسەی نەرمتر، بون. وایان ئەزانی ئەم «عەرض» ە منەتێکی گەورەی صەددامە بە سەر یەکێتیەوە! ئەلێن کابرایەکی لە خۆیایی و لوتبەرز هەبوە، هەرکەسی، لە کاتی چاکوچۆنی دا بۆ پیشاندانی تەواضوع، پێ ی وت بێ: «ئاغا موخلیسم!» لەوەلام دا وتویەتی: «واجیبی خۆتە!» صەددام، لە بابەتی ئەم کابرایە بو، لای وابو هەر کەسی دلسوزی بێ، یا خزمەتی بکا، واجیبی خۆی بە جێ ئەهێنێ، نابێ چاوەروانی سوپاس و پاداش و دانەوەی چاکە بێ، چونکە «رسالە خالدە» ی «امە عربیە واحدە» بە مرۆڤایەتی رائەگەیەنێ. دوای ئەم دانیشتنە هیچ جۆرە پەیوەندیەک لە نێوان یەکێتی و بەعس دا نەما.

*

## سوشیال دیموکرات

یەکێ لە هەولەکانی هەمو لایەنەکانی جود بۆ زراندنی ناوبانگی یەکێتی، بەشداری نوێنەرانی یەکێتی بو لە کۆنگرەی حیزبی سۆسیالیستی فەرەنسی و، دەرچونی بریاریک بو بە قازانجی کورد. لایەنەکانی جود، بە تایبەتی حشع، ئەمەیان بە پیلانی ئیمپریالیزم دائەنا دژی جولانەوەی کورد. یەکێتی سۆڤیەت هیشتا هەرەسی نەهێنا بو، شەری سارد هیشتا کۆتایی نەهات بو، زۆر لە لایەنەکانی جولانەوەی کورد نەیانئەزانی سوشیال دیموکرات چیە و، هەندێکیان هەر نەیان بیست بو.
جود ئەم مەسەلەیەی لە دەزگاکانی راگەیاندنی خۆی دا، لە وتارەکانی رادیو و، لە بلاوکراوەکانیان دا، ئەوەندە گەورە کرد بو لە ناو خۆیشمان دا خەریک بو بە خراپ دەنگی ئەدایەوە. هەندێ لە ئەشارەزاکانی ناو کۆمەلە بیست بویان لینین، لە سەردەمی خۆی دا، دژی سوشیال دیموکرات راوەستاوە، لە بەر ئەوە ئەوانیش ئەمەیان بە کارێکی خراپ ئەزانی.

فەرەیدون کە وتارەکانی بۆ رادیۆ ئامادە ئەکرد زاتی نەئەکرد لەم مەسەلەیە بدوی، ئەوەکو لە ناو توندڕەوەکانی کۆمەڵدا بە سۆشیال دیموکرات تاوانبار بکری. ناچار بوم خۆم ئەم ئەرکەم گرتە ئەستۆ. لە ریزی ئەو زنجیرە وتارەدا کە لە ژێر ناوی: «ئایا مەسەلەی کورد یەک مەسەلەیە یا چەند مەسەلەیەکە؟» وتاریکم بۆ ئەم باسە تەرخان کرد کە لیرەدا دوبارە کتومت ئەینوسمەوە:

## دیسانەوە مەسەلەی دۆست و دوژمن و سۆشیال دیموکراتەکان

چەند جاریکە لیرە و لەوی، بە دزی و بە ئاشکرا، بە نوسین و ئیستگە هەندی لایەن بۆ مەبەستیکی دیاریکراو باسی ئیشتیراکییەتی دەولی یاخود سۆسیال دیموکراتەکان و مەسەلەی کورد دینتە ناوانەوە کە گوایە پیلانیکی ئیمپریالیستی لە کایەدایە بۆ تیکەڵاوکردنی مەسەلەی کورد بە نەخشەکانی ئیمپریالیزم بە هۆی سوسیال دیموکراتەکانەوە، وە هەمو جارەکانیش بە چەشنیکی راستەوخۆ یا ناراستەوخۆ پەنجەی تاوانبار کردن بۆ ئیمە دریژ ئەکری کە گوایە ئیمە ئەوە جیبەجی ئەکەین..

جا با بزانین سوسیال - دیموکراتەکان کین و راستە پیلانی وا لە کایەدایە و ئیمەیش بوین بە جیبەجیکەری؟ یاخود ئەم بوختانە لە کویوە هاتوە؟

سوسیال - دیموکراتەکان چەند حیزبیکی سیاسی گەورەی ئەوروپای غەربیین کە لە چوارچیوەی ئیشتیراکییەتی دەولی دا پەیوەندییان لە گەڵ یەک هەیە، ئەمانە لە دەوروبەری جەنگی جیهانیی یەکەم دا لە گەڵ لینین و کۆمۆنیستەکانی ئەو سەردەمە تیکچون لە سەر مەسەلەی شۆرشی چەکدار و دیکتاتوریەتی پرولیتاریا و چەند مەسەلەیەکی بنچینەیی و گرنگی مارکسیزم - لینینیزم.

بیگومان لە ماوەی ٦٠ - ٧٠ سالی رابوردودا دنیا توشی گۆرانی زۆر گەورە و قوڵ بوە، نە حیزبەکەی لینین وەکو سالی ١٩١٨ ماوە و، نە سوسیال - دیموکراتەکانیش حیزبەکانی سالی ١٩١٨ ن، ئیمە ئیستا لە کۆتایی ١٩٨٢ داین، کە نەخشەی دنیا و زۆر لە بۆچون و تیکەیشتنەکانی ئەو زەمانە گۆرینیان بە سەردا هاتوە.

ئیستا لە ئەوروپای غەربی دا چینیکی کریکاری بەهیز و پیشکەوتو، گەشەکردو لە روی چۆنایەتی و چەندایەتیەوە هەیە کە قورساییەکی گەورەی هەیە لە ژیانی سیاسی و ئابوری و کۆمەلایەتی ئەوی دا. چینی کریکاری ئەوروپای غەربی هەم لە روی گەلالە بونی هەستی چینایەتی و هەم لە روی مەیینی لە قالبی ریکخراوەیی دا چەندین هەنگاوی ناوە بۆ پیشەوە.. زۆر لەو گیروگرفتانەی کە بەر لە سەد سال یا لە پەنجا سالا هەی بوە، ئیستا نەی ماوە و هەندیک لەو مافانەی بەدی هیناوە کە ئاسودەیی و خۆشگوزەرانی تا ئەندازەیەکی زۆر تەئمین کردوە.

لە کوردستان دا گەشەکردنی ئابوری، کۆمەلایەتی، سیاسی، فەرهەنگی لە چاو ئەوروپادا زۆر بە هیواشی بۆ پیشەوە چوە، لە کاتیکا لەوی زۆر بە خیرایی رۆیشتوە، لە گەڵ ئەوەش دا هەر کسی وا بزانی وەزعی ئیستای کوردستان و چینە کۆمەلایەتیەکانی و هیزە سیاسیەکانی وەکو پەنجا سال لەمەوبەر وایە، بیگومان بە هەڵەدا ئەچی و بە کابرایەکی بی خەبەر لە دنیا لە قەلەم ئەدری، هەڵبەتە ئەوی لای وابی وەزعی ئەوروپای ئیستاش و چینە کۆمەلایەتیەکانی و هیزە سیاسیەکانی وەکو پەنجا سال لەمەوبەرە، بیگومان کابرایەکی لە دنیا بی خەبەرە.

سوسیال - دیموکراتەکانی ئەورووپا ئێستا بەشێکی گەورەی چینی کرێکار و نەقابەکانیان لە ژێر دەس دایە. لە سەرانسەری ئەورووپای غەربی دا: لە فەرەنسا، ئیسپانیا، ئەڵمانیا، نەمسە، سوید، نەرویج، هولاند، بەریتانیا، ئیتالیا.. تەنانەت لەم وڵاتانەدا حوکمیان گرتۆتە دەست هەڵبەتە نەک بە ڕێگەی ئینقیلابی عەسکەری یا بە زەبری لولەی تفەنگ، بەڵکو بە ڕێگەی هەڵبژاردنی ئازاد و ئەو ڕیفۆرمانەی لە بەرنامەکانیان دا هەیە.

سوسیال - دیموکراتەکان ئێستا لە فەرەنسا و سوید و نەمسا حوکمیان بە دەستەوەیە و تا چەند هەفتە لەمەوبەر حوکمی ئەڵمانیای فیدرالیشیان بە دەستەوە بو.

سوسیال - دیموکراتەکان ئێستا لە پەیوەندییەکانی ناو دەوڵەتان دا قورساییەکی ئەوتۆیان هەیە نە یەکیەتی سۆڤیەت و نە چین و نە دەوڵەتانی سوسیالیستی تر، وە نە ئەمەریکا و نە وڵاتانی دنیای سێیەم ناتوانن پشت گوێیان بخەن. بۆیە هەر هێزێکی کوردستانی بیەوێ مەسەلەی کورد، یا هەر مەسەلەیەکی تر بە بەرووای گشتی ئەورووپا بناسێنی و هەوڵ بدا پشتیوانی گەلانی ئەورووپی بە دەس بهێنی، ناتوانی سوسیال - دیموکراتەکان پشت گوێ بخا کە جگە لەوەی چەندین حیزبی گەورە و فراوانن، ملیونەها کرێکار و سەدان نەقابەی کرێکارییان لە گەڵە. سەدەها ڕۆژنامە و گۆڤار و ئیستگەی ڕادیو و تەلەفزیون و سینەما و نوسەر و فەیلەسوف و هونەرمەندیان هەیە.

حیزبی سوسیالیستی فەرەنسە کە ئێستا حوکمڕانە چەند ئەندامێکی حیزبی شیوعی وەزیرن لە وەزارەتەکەیان دا و نوێنەری چەن حیزبی شیوعی لە کۆنگرەکانیان دا بەشدار بون.

یەکێک لە دائیرەکانی چالاکیی ڕێکخراوی ڕزگاری فەلەستین ناو حیزبە سوسیال - دیموکراتەکانە و هەر کات بە میوانی بانگ کرا بن بۆ کۆنگرە یا کۆبونەوەیەکیان بە خۆشیەوە چون و لە کاتی ئاڵوگۆڕەدانی فەلەستینییەکان دا لە بەیروتی غەربی، هەڵویستی حیزبی سوسیالیستی فەرەنسی و حیزبە سوسیال - دیموکراتەکانی تری ئەورووپا مەعلوم بو کە چیە و لە چاو هەڵویستی هەندێ دەوڵەتی عەرەبی دا چۆنە بەرامبەر بە مەسەلەی فەلەستین.

جا با لێرەدا بپرسین: ئەگەر بەشدار بونی نوێنەرانی حیزبی شیوعی لە کۆنگرەی سوسیال - دیموکراتەکان دا بۆ حیزبی شیوعی حەڵاڵ بێ و، بەشدار بونی وەزیری شیوعی لە وەزارەتی سوسیال - دیموکراتەکان دا بۆ حیزبی شیوعی حەڵاڵ بێ و، پەیوەندی و دۆستایەتی لە بەینی ڕێکخراوی ڕزگاری فەلەستین و سوسیال - دیموکراتەکان دا بۆ فەلەستینییەکان حەڵاڵ بێ، ئەبێ بۆچی بۆ ئێمەی کوردی دابەشکراو و زۆرلێکراو، کە دوژمنەکانی دەستیان ناوەتە بینی بیخنکێنن، پەیوەندی کردن لە گەڵ سوسیال - دیموکراتەکان و پشتیوانی کردنی ئەوان لە مەسەلەی ڕەوای گەلەکەمان ئەبێ بۆچی تاوان و پیلانگێران بێ؟

یاخود پێشینان گوتەنی: بانیکە و دو هەوا؟

سوسیال - دیموکراتەکان، کە هەندێ لایەن بۆ مەبەستێکی تایبەتی خۆیان و بە درۆ کردویانە بە خوێنی سیاوش و، بە درۆ وای دەرئەخەن کە ئەوە پیلانێکی زلە لە مەسەلەی کورد، لە ڕاستی یەکێکن لەو لایەنانەی کە جولانەوەی شۆڕشگێرانەی کورد ئەبێ هەوڵ بدا کە پشتیوانی و لایەنگرییان بە دەس بهێنی و هەوڵی ئەوە بدا لە مەسەلەی ڕەوای

کورد بکەن و دژستایەتی بکەن، بێ ئەوەی جوڵانەوەی کورد و هێزە شۆڕشگێڕەکانی سەربەخۆیی سیاسی و ئایدیۆلۆجی خۆیان لە دەس بدەن.

ئەوی جێگەی سەرسوڕمانە ئەوەیە: هەر ئەو لایەنەی - مەبەست پارتی بو - کە ئیستا تاوانی دژستایەتی سوسیال - دیموکرات ئەدەنە پاڵ ئیمە، خۆیان لە ساڵانی ٧٤ و ٧٥ و ٧٦ەوە تا ساڵی ٧٩ بە ئیمزای سەرۆکەکەیان چەندین عەرزوحاڵی پیشکەش بە ئینتەرناسیۆناڵی سوسیالیست و سەرۆکەکەی ئەوسایان پێتەرمان کردوە بۆ قوبوڵکردنیان بە ئەندام لە ئینتەرناسیۆناڵی سوسیالیست دا.

ئیمە هەرگیز ئەرزوحاڵمان نەداوە بە ئینتەرناسیۆناڵی سوسیالیست کە بەکەمتی بە ئەندام وەربگری.

ئەوەی ساڵی ٧٤ وەفدێکی رەسمیی ناردە ڤییەننا و داوایەکی رەسمیی پیشکەشی پێتەرمانی سەرۆکی ئینتەرناسیۆناڵی سوسیالیست کرد، ئەوە ئیمە نەبوین و حیزبێکی تر بو.

ئەوەی کە چەندین وتاری بە کوردی و بە عەرەبی بۆ ماستاوکردن لە گوفتاری نەظەری حیزبەکەیان دا لە سەر ئینتەرناسیۆناڵی سوسیالیست نوسی ئیمە نەبوین، بەڵکو حیزبێکی تر بو.

ئەوەی داوای ئەندامەتی کرد و قوبوڵ نەکرا و رەت کرایەوە، ئیمە نەبوین و حیزبێکی تر بو. هەر کەسێکیش ئەیەوی بە چاوی خۆی ئەو بەڵگانە ببینی، ئەتوانی لە ئارشیفی مەرکەزیی ئینتەرناسیۆناڵی سوسیالیست تەماشایان بکا.

ئەوانەی دیواری ماڵەکەیان شوشەبەندە با بەرد لە خەڵکی تر نەگرن چونکە خۆیان زەرەر ئەکەن.

حیکایەتی ئەو درۆ زلەی هەندی لەو تاقمانە بۆ سەر لی شێواندن و ساختەچێتی ئەیکەن بە بەڵگە لە سەر پیلانگێرانی سوسیال - دیموکراتەکان دژی جوڵانەوەی کورد و بەشدار بونی ئیمەش لەو پیلانەدا بەمجۆرەیە:

ئەمساڵ حیزبی سوسیالیستی فەرەنسی کۆنگرەی ئاسایی خۆی بەست. بە میوانیی کۆنگرە، دەیان حیزبی شیوعی و سوسیالیستی و دیموکراتی بانگ کرد بو، یەکێک لەو رێکخراوانە یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان بو، کە هەڤاڵان عومەر شێخموس و ئەحمەد بامەرنی لە ناو وەفدێکی کوردیی نوێنەری پارچەکانی ئێران و تورکیا و سوریادا بەشداری کۆنگرەکە بون. جگە لە نوێنەرانی یەکێتیمان، نوێنەری چەند حیزبێکی کوردستانی و نوێنەری رێکخراوی رزگاری فەلەستین و دەیان حیزب و رێکخراو و جوڵانەوەی رزگاریخواز، بەشدار بون.

لە ئەنجامی هەوڵدانی وەفدەکەی کوردستان لە کۆنگرەکەدا، کۆنگرە بڕیارێکی دەربارەی پشتیوانی کردن لە خەباتی میللەتانی فەلەستین و ئەرتیریا و پۆلیساریۆ و کوردستان لە پێناوی بەدیهێنانی مافی چارەنوس دا لە وڵاتەکانی خۆیان دا. مەسەلەی ئەم چوار میللەتە پێکەوە لە پرۆژەی یەک بڕیاردا پاس کراوە.

بێگومان میللەتی فەلەستین ئەمەی بە سەرکەوتن دانا بۆ خۆی کە گەورەترین حیزبی فەرەنسە ئەم مافەی پێ رەوا دیوە.

هەروەها میللەتی ئەرتیریا و پۆلیساریۆش ئەمەیان بە سەرکەوتن دانا بۆ خۆیان کە گەورەترین حیزبی فەرەنسە مافی چارەنوسی پێ رەوا دیون.

کەچی هەندێ کوردی داخ لە دڵ بۆ مەبەستێکی دیاریکراو کەوتنە هات و هاوار و هێرش کردنە سەر ئەو بڕیارە و سەر ئەو وەفدەی بەشداری کۆنگرەکە بوە و، سەر یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان کە ئەو وەفدەی ناردوە و، هەندێ کوردی نەزان پیاوەتی ئەو بڕیارەیان بە گرتنی هەندێ عالمی فەرەنسی دایەوە و داریەرویان پێ ئەقلیشاندن.

ئێمە لە مەسەلەی ناسینی دۆست و دوژمن دا بەرچاومان رونە، نە لەبلایی دەسکەوتی حیزبایەتی و عەشیرەتی و، نە تاریکایی تعصبی کوێرانە و، نە بە هۆی خۆ هەلواسینەوە بەم لا یا ئەولا دا بەری چاوی لێکدانەوەمان ناگیرێ. بەلکو وەکو رێکخراوێکی سەربەخۆ، چەکدار بە تیوری زانستی کە رێباز و سیاسەتی گشتی و هەلوێستەکانی لە دۆست و دوژمن لە ئەنجامی شیکردنەوەی واقیعی بابەتی دا بە سەنگ و تەرازوی زانستی دیاری ئەکات.

ئێمە ناساندنی مەسەلەی کورد و بلاوکردنەوەی هەواڵ و دەنگوباسەکانی و سەلماندنی عەدالەت و رەوایی ئامانجەکانی بزوتنەوەی رزگاریخوازانەی گەلی کورد لە سەر ئاستی جیهان، بە گەلانی دنیا و حیزب و رێکخراوە سیاسی و نەقابی و ئینسانییەکانی و، بە دەزگاکانی ئیعلام و بیروڕای گشتی، لە ناو ئەوانیدا بە سوسیال - دیموکراتەکان بە یەکێک لە ئەرکەکانی هەڵاپاتی دەرەوەی وڵاتمان ئەزانین، کە خۆشبەختانە تا ئێستا ئەنجامی باش و سەرکەوتنی باشمان تێ دا بە دەس هێناوە. ١٩٨٢/١١/٢

*

تۆڕی پەیوەندی بێتەل

یەکێتی لە روی پەیوەندییەوە زۆر دواکەوتو بو. پەیوەندی نێوان دەزگا سەرکردەییەکانی و هێز و رێکخراوەکانی بە نامە و تەتەر بو. لە هەندێ شوێن هوکی توکی بە کار ئەهێنرا، بەلام بەمە نەئەتوانرا هەمو ناوچەکان بە یەکەوە ببەستێ. هەندێ جار کەلک لە رادیۆ وەرئەگیرا.

بەختیاری برام چەند جاری پێشنیاری بۆ کردم. هەوڵی دامەزراندنی تۆڕی پەیوەندی بدەین و، ئامادەیی خۆی دەربڕی بۆ ئەنجامدانی. من ئەمەم زۆر پێ باش و پێویست بو، بەلام پێم وانەبو ئەکرێ.

هاوینی ٨١ هەوڵی دامەزراندنی تۆڕێکی ٣ لایی دا. بە دەزگای بێتەلی «پی ئار سی» ناوزەنگ و مەرگە و وەرتی پێکەوە بەستران. بەلام ئەمە لە زستان دا درێژەی پێ نەئەدرا چونکە ئەبو بێتەلەکە لە بەرزایی شاخەکان دابنرێ. لە کۆتایی ٨١ دا داوا لە هەمو هێزەکان کرا هەرچی بێتەل و شتێک پەیوەندی بە بێتەلەوە هەبێ بێنێرن بۆ سەرکردایەتی. لە هەندێ شەڕدا بێتەل گیرا بون. بەختیار کەوتە پەیجوری. هەرچی هەبو ناردیان. هەندێکیان گوللەیان بەر کەوت بو. بە هەمووی دوانی لێ چاک کرایەوە. یەکێکیان لە سەرکردایەتی دانرا و یەکێکیان نێردرایە وەرتی. دوای ئەوە ئیتر تیپەکان هەندێ شەڕیان ئەکرد بە تایبەتی بۆ گرتنی دەزگای بێتەل. چەند دانەیەک گیرا و، خۆشمان بە هۆی رێکخراوێکی ئێرانییەوە ٤ دانە بێتەلی «کنود» مان لە ئەوروپا کڕی. لە پاییزی ٨٢ دا تۆڕێکی پەیوەندی باشمان دامەزراند. هەر چوار مەلبەندەکە و زۆری تیپەکانی بە یەکەوە بەست بو. بەلام بێتەلەکان هەریەکەیان مارکەیەکی جیاواز بو: بیل، راکال، تومسن، کنود. ئەم تۆڕە کەلکی زۆری هەبو. هەواڵ و دەنگوباسەکان بە تازەیی ئەگەیشتن. ئاگامان لە هەمو

هێزەکان ئەبو. زۆرجار کە نەمانئەتوانی کوبەینەوە بە بیتەل قسەمان لە گەڵ یەکتری ئەکرد و، بیروڕامان ئەگۆڕیەوە.

لە سەر هەمان مەسەلە کەریم ئەحمەد وتارێکی درێژی بە عەرەبی لە گۆڤاری «الثقافه الجدیده» دا نوسی.

دانانی سۆسیال دیموکرات بە دوژمنی کورد و، پشتیوانیەیان لە کێشەی کورد بە پیلانی ئیمپریالیزم و، هاوکاری لە گەڵیان بە تاوان و خیانەت، بێگومان نیشانەی بەرچاوتەنگی حشع و، نزمی ئاستی تێگەیشتنی سەرکردایەتی حیزبە کوردییەکان بو.

*

تەفسیری قورئان

من کە منال بوم، بۆ ئەوەی بەرەڵلا نەبم، باوکم لە پشتوی هاوینەدا ئەیبەردم بۆ حوجرە، بە زۆر قورئانی پێ ئەخوێندم، بێ ئەوەی تێ ی بگەم. دوایی خۆم لە بەغدا کە بوم بە قوتابی زانستی سیاسی و، هەندێ لە بابەتەکانی خوێندنەکەمان پەیوەندی بە ئیسلامەوە هەبو وەکو: بیرکردنەوەی سیاسی عەرەبی - ئیسلامی، مێژوی سیاسی ئیسلام و، قانونە گشتییەکانی ناودەوڵەتان، ناچار بوم بە دوای هەندێ کتیبی تەفسیر و فیقهی ئیسلام دا بگەڕێم. بە کوردی هیچ سەرچاوەیەکم بەر دەس نەکەوت، بەلام بە عەرەبی ئەوەندە زۆر بو لە ژماردن نەئەهات. لە ناو تەفسیرەکان دا دوانم هەڵبژارد بۆ خوێندنەوە و پیداچونەوە، یەکێکی کۆن: «تەفسیری جەلالەین» و، یەکێکی نوێ: «فی ظلال القران» لە نوسینی سەید قوطب.

کورد یەکێکە لەو میللەتانەی زۆر لە زوەوە موسوڵمان بوە و، لە پێناوی ئیسلام دا شەڕی زۆری کردوە و، زانای گەورەی لە بواری نوسینی: فیقه، تەفسیر، کەلام، زمان.. تی دا هەڵکەوتوە و، کەم دێ هەیە مزگەوتی تی دا نەبی، کەچی مەلاکانی کورد بە زمانی کوردی، جگە لە چەند «عەقیدەنامە» یەکی کورت و چەند «مەولودنامە» یەکی، شوێنەوارێکی ئەوتۆیان بە جێ نەهێشتوە. تەفسیری قورئان و لێکدانەوەی حەدیسەکانی پێغەمبەر و، دانانی کتیب لە سەر فیقهی ئیسلام، بە کوردی نەنوسراوە. تەنانەت دوعایەکیان بە کوردی نەخوێنیوەتەوە. لە کاتێک دا لە ئیسلام دا شتێک نیە رێگەی لەمە گرتبی.

قورئان، بە فارسی زۆر زو و، بە تورکی لە سەردەمی دەسەلاتی عوسمانی دا تەفسیر و تەرجومە کراوە. بە کوردی ئەوەی من بیستومە و، دیومە تەنیا ۳ تەفسیرە: تەفسیری مەلا محەممەدی چەلی زادە کە لە چلەکان دا نوسیویتی، تەفسیری نامی و، تەفسیری خال، کە هەردوکیان لە حەفتاکان دا نوسیویانە.

هاورێکانی شارم، هەمو ئەو کتیبانەیان بۆ ئەناردم کە لە بەغدا بە کوردی و عەرەبی دەرئەچون، هەروەها حەفتەنامەی «هاوکاری» و مانگنامەی «بەیان» و وەرزنامەی «روشنبیری نوێ». هەندێ لە نوسەرەکان خۆیان کتیبەکانیان بە دیاری بۆ ئەناردم. رۆژێک لە گەڵ بەریدی شاردا، جزمی دوەمی «تەفسیری خال» و «چاپی دوەمی «پەندی پێشینان» م پێگەیشت. مامۆستا شێخ محەممەدی خال بە خەتی خۆی هەردوکیانی پێشکەش کرد بوم.

شێخی خال و من، لە دو تەمەنی جیاواز و، لە دو شوێنی سیاسی جیاواز و، لە سەر دو بیروباوەڕی جیاواز بوین.. لە ژیانم دا زۆر جار دیاری جۆراوجۆرم لە بۆنەی جیا

جیا دا بۆ هات بو، بەلام هیچیان ئەوەندەی ئەم دیارییە خۆشحالی نەکردم.

لە گەل شێخی خال هەرگیز رووبەڕو دانەنیشت بوم، بەلام دو ناسیاوی قولم لە گەلی هەبو: یەکەمیان، وتارەکانی لە گۆڤارەکانی: گەلاوێژ و رۆژی نوێ و، کتێبەکانی: فەرهەنگی خال و، ژیننامەکانی: مەلا عەبدوللای بیتوشی، موفتی زەهاوی، شێخ مارفی نۆدێ، مەولودنامەی ئەوئەشەر، تەفسیری جزمی عەمما.. دوەمیان، ئەختەری کچی و خەسرەوی برازای.. کە لە گەل هەر یەکەیان لە قۆناغێکی خوێندن دا و، لە گۆڕێکی خەباتی سیاسی دا ئاشناو ناسیاو بوین. هەر بە هۆی د. خەسرەوی شێخ مستەفای برازای و زاوایەوە، لەو هەلومەرجە سەخت و نالەبارەدا منی خوێند بوەوە و کتێبەکانی بۆ نارد بوم.

ئەم پیاوە گەورەیە چەندین بەرهەمی بە نرخ و گرنگی پێشکەشی گەلەکەی کردبو، لە ناو بەرهەمەکانی دا دوانیان جێگای تایبەتییان هەیە: فەرهەنگی زمانی کوردی و، تەفسیری قورئان.

نامەیەکی کورتی پیزانینم بۆ نوسی، سپاسم کرد بۆ دیارییە بە نرخەکانی، لە خوای گەورە لەشساخی و تەمەنی درێژم بۆ بە ئاوات خواست... من زۆر جار لە ناو جاف دا «دەس مۆچینم» کرد بو و، دەستی زۆر ژنی لە خۆم گەورەتر و پچوکترم ماچ کرد بو، بەلام لە هەمو ژیانم دا ئەوە یەکەمین جار بو بۆ کەسی بنوسم: «دەستە پیرۆزەکانت ماچ ئەکەم».

لە ناو ئیمەدا حەسەن کوێستانی لە هەمومان زیاتر سۆراخی کتێبی کوردی ئەکرد، هەمو ئەو کتێبانەی بۆم ئەهات، بە وانەیشەوە کە نوسەرەکانی بۆیان ئەناردم، ئەم دا بەو لە کتێبخانەکەی دا هەلیان بگری، یەکی لەو کتێبانە ئەم تەفسیرە بو.

ماوەیەک ئەمویست شارەزاییی پەیدا بکەم لە سەر جۆری بیرکردنەوەی دینی و سیاسی و کۆمەلایەتی.. هەندێ لە نوسەرە گەورەکانی کورد لەوانە: مەلا ئەبوبەکری موصەنیف. زۆری کتێبەکانی ئەم بیرکەرەوە گەورەیە لە کتێبخانەکەی خال دا هەبو. جارێک بە هۆی د. خەسرەوەوە هەوالی هەندێکیانم پرسی و، داوام لی کرد بو ئەگەر رێگە بدا فۆتۆکۆپی هەندێکیانم بۆ بنێری. مامۆستا خال ئەم هەوالەی ئەوەندە پی خۆش بو، دەسخەتی کتێبەکەی بۆ ناردم. کتێبەکە بە فارسی و بە خەتێکی رەوانی جوان نوسرا بوەوە. ویستم سەر لەنوێ بینوسمەوە. ماوەیەک خەریکی بوم، بەلام کە لە شەرەکانی جودەوە گلام ماوەی ئەو جۆرە کارانەم نەما و، ترسام خۆم شتێکم لی بی و کتێبەکە بفەوتی، لە بەر ئەوە وازم لە پرۆژەکەم هێنا و، بە سپاسەوە بۆم ناردەوە.

*

جیا دا بۆ هات بو، بەڵام هیچیان ئەوەندەی ئەم دیارییە خۆشحاڵی نەکردم.

لە گەڵ شێخی «ا» هەرگیز ڕووبەڕو دانەنیشت بوم، بەڵام دو ناسیاویی قوڵم لە گەڵی هەبو: یەکەمیان، وتارەکانی لە گۆڤارەکانی: گەلاوێژ و ڕۆژی نوێ و، کتێبەکانی: فەرهەنگی خاڵ و، ژیننامەکانی: مەلا عەبدوللای بیتوشی، موفتی زەهاوی، شێخ مارفی نودێ، مەولودنامەی نەوتەئەر، تەفسیری جزمی عەمما.. دوەمیان، ئەختەری کچی و خەسرەوی برازای.. کە لە گەڵ هەر یەکەیان لە قۆناغێکی خوێندن دا و، لە کۆڕێکی خەباتی سیاسی دا ئاشناو ناسیاو بوین. هەر بە هۆی د. خەسرەوی شێخ مستەفای برازای و زاوایەوە، لەو هەلومەرجە سەخت و ئاڵەبارەدا منی خوێند بوەوە و کتێبەکانی بۆ نارد بوم.

ئەم پیاوە گەورەیە چەندین بەرهەمی بە نرخ و گرنگی پێشکەشی گەلەکەی کردبو، لە ناو بەرهەمەکانی دا دوانیان جێگای تایبەتییان هەیە: فەرهەنگی زمانی کوردی و، تەفسیری قورئان.

نامەیەکی کورتی پێزانینم بۆ نوسی، سپاسم کرد بۆ دیارییە بە نرخەکانی، لە خوای گەورە لەشساغی و تەمەنی درێژم بۆ بە ئاوات خواست... من زۆر جار لە ناو جاف دا «دەس مۆچینم» کرد بو و، دەستی زۆر ژنی لە خۆم گەورەتر و پچوکترم ماچ کرد بو، بەڵام لە هەمو ژیانم دا ئەوە یەکەمین جار بو بۆ کەسی بنوسم: «دەستە پیرۆزەکانت ماچ ئەکەم».

لە ناو ئێمەدا حەسەن کوێستانی لە هەمومان زیاتر سۆراخی کتێبی کوردی ئەکرد، هەمو ئەو کتێبانەی بۆم ئەهات، بە وانەیشەوە کە نوسەرەکانی بۆیان ئەناردم، ئەم دا بەو لە کتێبخانەکەی دا هەڵیان بگرێ، یەکێ لەو کتێبانە ئەم تەفسیرە بو.

ماوەیەک ئەمویست شارەزایی پەیدا بکەم لە سەر جۆری بیرکردنەوەی دینی و سیاسی و کۆمەڵایەتی.. هەندێ لە نوسەرە گەورەکانی کورد لەوانە: مەلا ئەبوبەکری موصەنیف. زۆری کتێبەکانی ئەم بیرکەرەوە گەورەیە لە کتێبخانەکەی خاڵ دا هەبو. جارێک بە هۆی د. خەسرەوەوە هەواڵی هەندێکیانم پرسی و، داوام لێ کرد بو ئەگەر ڕێگە بدا فۆتۆکۆپیی هەندێکیانم بۆ بنێرێ. مامۆستا خاڵ ئەم هەواڵەی ئەوەندە پێ خۆش بو، دەسخەتی کتێبەکەی بۆ ناردم. کتێبەکە بە فارسی و بە خەتێکی ڕەوانی جوان نوسرا بوەوە. ویستم سەر لەنوێ بینوسمەوە. ماوەیەک خەریکی بوم، بەڵام کە لە شەڕەکانی جودەوە گلام ماوەی ئەو جۆرە کارانەم نەما و، ترسام خۆم شتێکم لێ بێ و کتێبەکە بفەوتێ، لە بەر ئەوە وازم لە پرۆژەکەم هێنا و، بە سپاسەوە بۆم ناردەوە.

*

# سالی ١٩٨٣

## ریککەوتنی ١٩ قۆلی

سوریا و لیبیا هەولیکی زۆریان دا بۆ کۆکردنەوەی موعارەضەی عیراقی. جەنگی عیراق - ئیران هیوای لای هەموان دروست کرد بو کە ئەم شەرە سەری صەددام بخوات. زۆر کۆسپ لە ریگای پیکهینانی بەرەیەکی فراوان دا بو. یەکیکیان ناکۆکی نیوان پارتی و یەکیتی بو. چەند مانگی بو ئیمە بریارمان دابو ئەوپەری نەرمی بنوینین و، هەولمان دابو لە گەل پارتی کۆتایی بە ناکۆکییەکانمان بهینین. د. فوئاد مەعصوم بە نوینەرایەتی یەکیتی و، ئیدریس بارزانی بە نوینەرایەتی پارتی لە پەیوەندی و کۆبونەوەکان دا، لە شام و طەرابلوس بەشدار ئەبون.

رۆژی ٦ ی شوباتی ٨٣ لە طەرابلوسی لیبیا ١٩ ریکخراوی عیراقی لەوانە یەکیتی، پارتی، حسک، حشع، ریککەوتنیکی کورت و پوختیان ئیمزا کرد. بەندە سەرەکیەکانی بریتی بو لە:

١. پیکهینانی بەرەیەکی فراوانی کراوە بۆ هەمو لایەنەکان.

٢. بەرنامەی سیاسی بەرە:

أ. روخاندنی ریژیمی عیراق.

ب. دامەزراندنی رژیمیکی دیموکراتی.

ج. جۆری هەلبژاردنی رژیم ئەدریتە دەس گەلی عیراق.

د. سەلماندنی ئۆتۆنۆمی کوردستانی عیراق و دابینکردنی مافی تورکومان.

هـ. ریکخستنی کۆبونەوەیەک لە ٢٥ ی شوبات دا بۆ دانانی بەرنامە و پیرەوی ناوخۆی بەرە.

٣. لە ماوەی مانگیک دا بەرە پیک بهینری.

٤. لەمرۆوە ئەبی:

ا. دەسبەجی شەری راگەیاندن رابگیری.

ب. ناکۆکی چەکداری ناوخۆ رابگیری.

بریار درا بو کۆبونەوەی داهاتو لە شام بکری و، لەو کۆبونەوەیەدا چۆنیەتی و جۆرد یەک بخرین. بەلام پیش کۆبونەوەکە حشع لە ریکەوتنەکەی تەرابلوس پەشیمان بوەوە و، کۆبونەوەکەی شامی تیک دا.

*

هاوزەمان لە گەل ئەم کۆبونەوانە کۆبونەوەی دوقولی یەکیتی و حشع لە رۆژانی ٥ - ٦ ی شوباتی ٨٣ لە ناوزەنگ کرا. ئەگەرچی لەم کۆبونەوانەدا ریککەوتنیکی سیاسی بۆ کۆتایی هینان بە ناکۆکییەکانی ناوخۆ و پیکهینانی بەرەی فراوان و، هاوکاری دوقولی ئیمزا کرا، بەلام چونکە هەلومەرجی کوردستان ئالوزاو و، لە چەند جیگایەک وردە شەر لە نیوان پیشمەرگەکانی یەکیتی و، لایەنەکانی جودا قەوما بو، زۆر بە راشکاوی بە دەستەی

نوینەرایەتی حشع: کەریم ئەحمەد، عەبدولرەزاق صافی، ئەحمەد بانیخیلانی، وترا: کە ئەگەر جود لە ناوچەکانی خوارەوە شەر بە هێزەکانی یەکێتی بفرۆشن، ناهێلین ئەوان لە سەرکردایەتی بە ئاسودەیی دابنیشن فەرمانی شەر دەربکەن.

*

لەو رۆژانەدا کە ئەم هەولانە لە شام، طەرابلوس، ناوزەنگ.. بۆ یەکخستنی تەقەلای سیاسی نەیارەکانی بەعس و، کاری هاوبەش، ئەدرا، چەند روداوی نالەبار کە لەگەڵ ئەم هەولانە تێکدەرانەی ئەوان تەدا:

١. هێزەکانی پارتی لە شوباتی ٨٣ دا بە سەرکردایەتی حسو میرخان ژاژۆکی و، بە یارمەتی ئێران هاتنە نزیک بارەگاکانی سەرکردایەتی یەکێتی لە ناوزەنگ و، بەرزاییەکانی بەرامبەریان گرت و، هەرەشەی داگیرکردنی ناوچەکەیان ئەکرد. محەممەدی وەقان، فەرماندەی تیپی ٦١ ی کوردش، نامەی دۆستانەی بۆ حسو نوسی و، بە نوێنەرایەتی یەکێتی محەممەدی وەقان و عەلی وەیس، لە گەڵ دو کەسی حشع رۆژی ١٣ ی شوبات چون بۆ بینینی، بۆ خاوکردنەوەی گرژی لە ناوچەکەدا. هەولەکە سەری نەگرت، وەکو دوایی لە نامە گیراوەکانی ناو هەگبەکەی حسۆ دا دەرکەوت مسعود نارازی بوبو لە بینینی نوێنەری یەکێتی و، فەرمانی پی کرد بو جاسوسان و ناوچەکە بەر نەدا.

مسعود بەمجۆرە وەلامی حسوی داوەتەوە:

برای عەزیز حسو میرخان ژاژوکی

پاشی سەلامان

کاغەزەکەت گەیشت و هەرچیەکی نوسی بوت زانیم. بە هیچ شێوەیەک هەق نەبو ئێوە لە گەڵ ئەوان دانیشن. قەیدی نەبو بۆ ئەبو شوان و محەممود، بەلام ئەوی تر مەبەستی نوێنەرەکەی یەکێتی: محەممەدی وەقانە - ئێمە رازی نەبوین و بروسکەیشمان بۆ کردی کە نابی لە گەڵ ئەوان دابنیشن. ئایا ئەم دانیشتنە چۆن کراوە؟

من چاوەروانی کاک ئیدریس ئەکەم، ئەگینا من خوم ئەهاتم بۆ ئەو ناوچەیە و، ئەو هێزەی لە گەڵ خۆمم هیناوە هەمویم ئەهینا، ئەمسال هەمو هێزەکانی خۆمان ئەخەینە ناوچەی قەلادزی و رانیە. ئیستا گرنگ ئەوەیە حەراسەتێکی باشتان هەبی لە شوینە حساسەکان و، بۆ عەمەلیات و پێشرەوی من خوم دیم ئینشاللا.

گرتنی نوقتەی سەری جاسوسان پشتی دوژمنی شکاند - مەبەستی یەکێتیە - و من سوپاسی هەمو ئەوانە ئەکەم زەحمەتیان کیشاوە، ئینشاللا مەشایخ مەرتەبەیان بەرز ئەکا.

هەروەکو وتم باشترین هێزی خۆمان ئەخەینە ئەو ناوچەیەوە لە بەر ئەوە پێویست ناکات زیاتر بچمە ناو تەفصیلاتەوە.

دوعای خۆشیتان لە خوا ئەخوازم   براتان   مسعود بارزانی   ٨٣/٢/٢٨

٢. حشع هەندی بیانوی داتاشی و، پاش چەند رۆژی لە ریککەوتنە ١٩ قۆلیەکەی طەرابلوس پەشیمان بوەوە. لە ناو سەرکردایەتی ئەو بەرەیەدا هەمو لایەنەکان وەکو یەک یەک دەنگیان هەبو. حشع لە پێش دا ئەمەی قبوڵ کرد بو، بەلام لی ی پەشیمان بوەوە بە

بیانوی ئەوەی هەندێ لەو لایەنانەی ڕێککەوتنەکەیان ئیمزا کردوە هێزی پچوکن و، نابێ هێزە گەورەکان و هێزە پچوکەکان وەکو یەک بن.

٣. لە ڕۆژانی ١١ - ١٢ ی شوباتی ٨٣ دا لە دەشتی هەولێر و دەشتی کۆیە هێزەکانی جود بە کۆمەڵ لە گەڵ هێزەکانی یەکێتی دا بە گژ یەکا چون و، جود ئەمەی کرد بە بیانو، لە ١٦ ی شوبات دا بە ناوی لیژنەی هەولێریانەوە بەیانێکی توندوتیژی پڕ لە هێرشی دژی یەکێتی دەرکرد و، ڕادیوی پارتی چەند ڕۆژێ لە سەر یەک خوێندیەوە. قسەکەری یەکێتی پش ڕۆژی ٢٠ ی شوبات وەلامی دایەوە.
ڕۆژی ٢٤ ی شوبات سکرتاریەتی جود بەیانێکی توندوتیژی دژی یەکێتی دەرکرد و، حشع پش یادداشتێکی توندی دا بە یەکێتی.

*

بە کردەوە ناوەرۆکی ڕێککەوتنەکەی طەرابلوس پوکایەوە. هەلومەرجی کوردستان گەیشت بوە ئەوپەڕی ئالوزی. پێشمەرگەکانی یەکێتی و لایەنەکانی جود لە یەکتری ئەمین نەبون. وەکو ئەمان بیستەوە سەرانی جود، باسی «تأدیب» و «لوت شکاندن» ی یەکێتییان ئەکرد.
پەلگە کیراوەکان دەریان خست: سەرکردایەتی جود، لە ناو خۆیان دا پێک هات بون کەلەکۆمەکێیەکی چوار قۆلی سیاسی - چەکدار بکەن بۆ گرتنی بارەگای مەلبەندی ١ لە حاجی مامەند و گرتنی بارەگای مەلبەندی ٤ لە بالیسان، ئینجا گرتنی جادەی کۆمتان - خانەقا و، لە دوا قۆناغی لەشکرکێشیەکەدا بارەگاکانی سەرکردایەتی لە ناوزەنگ. دیارە لە هەلسەنگاندنی هێزەکانی خۆیان دا توشی ژێر - هەلسەنگاندن و لە هی هێزەکانی یەکێتی دا توشی ژێر - هەلسەنگاندن بوبون.

*

## ئەندامەکانی لەش و شکان

مەسعود لە نامەکەی دا باسی «پشت شکاندن» و سەرانی تری جودیش لە هەمو جێگایەک باسی «لوت شکاندن» یان ئەکردین. من خۆم دو جار لوتم شکا بو جارێکیان بە منالی و جارێکیشیان بە گەورەیی. جارێکیش قاچم شکا بو. ئەو ماوەیەش بڕبڕەی پشتم توشی دیسک بوبو، ئەویش جۆرێکە لە پشت شکان. ئەمزانی ئازاری پشت و لوت و قاچ شکان چیە؟
شکان و شکاندن، بە ڕوتی چەند مەعنایان هەیە وەکو: ورد کردنی شتی ڕەق. دابەزینی نرخی پارە و کەلوپەل. ڕیسوا بون. بەلام لە گەل ئەندامەکانی لەش دا ڕیزی وشەگەلی نوێ ی لێ ئەکەویتەوە هەم «مەعنای حەقیقیی» ان هەیە و هەم «مەعنای مەجازی» وەکو:
سەر شکان: ئیشکان، وەکو ئەلێن: «پەلاماری دا پەلام بە سەری شکاو و جلی دڕاوەوە گەڕایەوە»
زمان شکان: لە قسە کەوتنی کاتی سەرەمەرگ. یان وەکو دوعای شەڕ: «زمانت بشکێ!»
دەس شکان: دەسخەرۆ کردن. یان وەکو ئەلێن: «دەستی شکاوم..» بۆ مردنی

کەسێکی خۆشەویست یا لە دەس دەرچونی هەلێکی بە نرخ.
ئەژنۆ شکان: ئەو پەری ورە بەردان و داروخانی دەرونیی.
رو شکاندن: تەریق کردنەوە.
لوت شکاندن: تەمی کردن، شکاندنی غرور و بایی بون.
چاو شکاندن: توقاندن و ترساندن.
دەم شکاندن: وەلامدانەوەی قسەیەک بە قسەیەکی رەقتر. یان وەکو دوعای شەر: «دەمت بشکی!»
مل شکاندن: هەلنان بە فێل بۆ گلاندنی. یان وەکو دەرکردن بە سوکایەتیەوە: «ملت بشکێنە!»
پشت شکاندن: تی سرەواندنی جەزرەبەیەکی کوشندە.
دل شکاندن: رەنجاندن.
قاچ شکاندن: هەرەشەیە، وەکو ئەلێن: «بێیت بەم ناوەدا قاچت ئەشکێنم!»
ئەبو بە خۆمان بکەوین بۆ ئەوەی توشی ئەم هەمو شکانە نەبین!
*

## سەید صادق و بالاتەران

مانگی شوباتی ٨٣ جارێکی کە بەعس بە هۆی حدکاوە جوابیان بۆ ناردین کە هەمان وەفدی حکومەت ئەیانەوێ لە گەل مامجەلال و نوێنەرانی یەکێتی دابنیشن. داوای لی کردن کە ئەگەر ئەیانەوێ بیبینن با خۆیان بێن بۆ ناوزەنگ. حەزیان ئەکرد لە جێگایەکی نزیک قەلادزە بی، بەلام ئیمە پیمان داگرت کە بێنە ناوزەنگ. وەفدی عیراقی بە ئوتومبیل هەتا نزیک سونی هاتن، ئیمەش دەستەیەک پێشمەرگەمان نارد پێشوازییان بکا و بیانهێنی بۆ ناوزەنگ. لە نزیک پارەگاکەی من لە زێنوی سور جێگا و رێگامان بۆ ئامادە کردن.

رۆژی ١٣ ی شوباتی ٨٣ نوێنەرەکانی حکومەت جارێکی تر هاتنەوە. وەفدی حکومەت، هەمان وەفدی پێشو: ئەبو ئەحمەد، ئەبو عودەی، ئەبو محەممەد بو. رێگای سونی - ناوزەنگ بەفر گرت بوی، بەفرەکەیش بەست بوی، ولاخ نەیئەتوانی هاتوچۆی بە سەردا بکا. بۆ یەکی نەشارەزای رویشتنی سەر بەفر بوایە زۆر ناخۆش بو. بە پی هات بون تا گەیشتن زور ماند بون. بەرەوپیریان چوین و زۆر بە گەرمی پێشوازیمان کردن و، بردمانن بۆ ئەو شوێنەی بۆیان تەرخان کرا بو تا بحەسێنەوە. ئەبو ئەحمەد، دیار بو شەکەت بوبو، بە گلەییەوە بە منی وت: «کاکە ئەتانەوێ ئەشکەنجەمان بدەن وا ئیمەتان هێنا بۆ ئیرە؟» وتم: «ئەبو ئەحمەد! ئیمە لیرە ئەژین و هیچ بە ئەشکەنجەیشی نازانین، تۆ عەسکەریت هەق نیە باسی ماندوبون بکەی. حەزمان کرد جێگاورێگاکەمان ببینن و ئیمە بناسن!»

راستیەکەی ئەمانویست ئەو قسانەی صەددام لە سەر دواکەوتویی و بی ئاگایی ئیمە کرد بوی بە درۆ بخەینەوە. جگە لەوەی میوانداری باش و، چەندین جۆر خواردن و خواردنەوەمان بۆ دانان، چەندین گۆڤار و رۆژنامەی نوی و کتێبی تازە چاپکراومان بە زمانی جیاجیای عەرەبی، فارسی، ئینگلیزی، ئەلمانی.. پیشان دان.

ئیوارەکەی مشروباتمان پیشکەش کردن نەیان خواردەوە. لە بەر ماندو بون زور کەم نانیان بۆ خورا. داوایان کرد شەو دابنیشین بۆ ئەوەی روژی داهاتو بگەرینەوە بۆ قەلادزە. قسەکەی جاری پیشویان وتەوە، کە ئەوان تەنیا قسە ئەهێنن و قسە ئەبەن، دەسەلاتی گفتوگۆ و بریاردانیان نیە. باسەکانی جاری پیشو دوبارە بونەوە. نوینەرەکانی حکومەت پییان لە سەر ئەوە دائەگرت کە مامجەلال سەردانی بەغداد بکات و، ئەیانوت: یەک دانیشتنی مامجەلال لە گەل سەروک هەمو کیشەکان چارسەر ئەکا. باسی ئەوەیشیان کرد کە پیوەندییان لە گەل پارتی پیش کردوە و، لە گەلیان دانیشتون و لە گفتوگوکەدا چونەتە پیشەوە. بەلام نەیانوت باسی چییان لە گەل کردون و بە چی گەیشتون.

مامجەلال هەوالی ئەم کۆبونەوەیشی بە نامەیەکی تایبەتی بۆ کەریم ئەحمەد نوسی.

*

شارەزور لە زۆر کونەوە مەلبەندی مەلاریا بوە. هەمو سال زۆر کەس بە لەرز و تا مردون. جاریک کابرایەکی شارەزوری کورەکەی لەرز و تا ئەگری. زۆر نەخوش ئەبی. باوکی کورەکەی زۆر خوش ئەوی ئەترسی بمری. بریار ئەدا خیر بۆ کورەکەی بکا بەلکو لەو نەخوشیە هەلسیتەوە. سەید صادق و بالانتەران دو شاخن بەرامبەر بە یەک، بە سەر لوتکەی هەر یەکیکیانەوە مەزاری پیاوچاکیکی لی یە. کابرا گیسکیک ئەکا بە خیری سەید صادق و ئەچیتە بەرامبەری، ئەلی: «بە گیسکی چاکی ئەکەیتەوە باشە، نایکەی بالانتەران بە کەلشیری کرە ئەکا»

ئیمە ئەمانتوانی ئەم دانیشتنە بە نهینی بگرین، نەمانئەویست کەس پی بزانی، بەلام خومان بە ئەنقەست بە ئاشکرا بە جوریک ریکمان خست، کە هەمو لایەک: لایەنەکانی جود، حکومەتەکانی ئیران، سوریا و لیبیا پی بزانن. لەوەیش مەبەستمان ئەوەبو، وەکو چیروکی گیسک و کەلەشیرەکەی کابرای شارەزوری تی یان بگەیەنین، کە ئەگەر ئیران و جود ئامادە نین شەرمان لە گەل رابگرن، ئەوا بەعس مەمنونە شەرمان لە گەل رابگری. ئەوسا هیزی سەرەکی لە سەر ئەرزی کوردستان کە تەنگی بە عیراق هەلچنی بو، هیزەکانی یەکیتی بو، نەک هیزەکانی جود. بە راگرتنی شەری یەکیتی - بەعس یەکردەوە شەر نەئەما، ئەوسا دەستی یەکیتی بەتال ئەبو بۆ ئەوان.

*

### کەمینیکی کویر

چونی هیزەکانی یەکیتی بۆ بارمەتی دانی حدکا و، هاوبەشی هیزەکانی پارتی لە هیرشەکانی ئیران دا بۆ سەر بنکەکانی حدکا و هیزی پشتیوان، گرژی خست بوەوە پیوەندییەکانی یەکیتی - پارتی و، چاوەروانی ئەوە ئەکرا ئەو ئاگرەی بی ریککەوتنی سیاسی لە نیوان هەردو حیزب دا ئیمزا کرا بو، ئیتر بر نەکات. لە پر لە شارباژیر روداوی قوما، بە یەکجاری ئاگری شەری سەرانسەری هەلگیرساندەوە.

جەزای عەلی کاتب ماوەیەک بو هات بوە شاخ. بوبو بە لیپرسراوی ناوچەی سلیمانی پارتی. جەزا هەوالی بۆ من و عومەری حاجی عەبدوللا نارد کە: «باوەری بە حیزبایەتی نەماوە، بویە هاتوتە دەرەوە لە سلیمانی ترساوە یەکیتی لە پەناوە بیکوژی، کاتی خوی بە هوی سیاسەتەوە دوژمنایەتی لە نیوان ئەو و کوکوییەکان دا دروست بوە، ئەگەر ئیمە لە گەل مەحمودی حاجی فەرەج کە ئەوکاتە سەرتیپی هەورامان بو، ریکی بخەینەوە، باری

دارایی باشه، واز له ناوچه و پارتی ئەهینی، به یەکجاری سەفەری ئەوروپا ئەکا.»
جەزا له کاتی شەری ناوخۆی جەلالی - مەلایی دا، له کۆتایی شەستەکان دا له سەر داوای عەبدولوەهاب ئەتروشی گەورە فەرماندەی پارتی له ناوچەی هەلەبجە، خالیدی حاجی فەرەجی کۆکۆیی کوشت. خالید گەنجێکی روشنبیر و به نرخ و، لێپرسراوی ناوچەی هەلەبجەی بالی جەلالی بو. له تۆلەی ئەمەدا کۆکۆییەکان له سلیمانی برایەکی جەزایان کوشتەوە. کوشتنی خالید، له سەر شتی تایبەتی و ناکۆکی شەخسی نەبو، بەلکو هۆی سیاسی بو. خالید هاورێیەکی نزیکی من بو. ناردم به دوای مەحمودی حاجی فەرەج دا. قسەم له گەل کرد و راسپاردەکەی جەزام بۆ باس کرد. مەحمود جوامێرانە هاتە پێشەوە یەکسەر وتی: «ئێمە له گەل ئەوانە ناکۆکی خێلەکی و تایبەتی مان نەبوە، ناکۆکی سیاسی مان له سەر حیزبایەتی هەبوە، ئێوە چی بە چاک ئەزانن من پێ ی رازیم». داوامان لێ کرد له گەلی دابنیشی و ئاشت ببیتەوە. رازی بو. مەحمودمان رێگە دا بگەرێتەوە هەورامان تا له گەل جەزایش قسە ئەکەین و، کات و شوێنی بە یەک گەیاندنی مەحمود و جەزا دابنێین.
ئێمە لەم کەین و بەینەدا بوین بە بێسەل هەوالمان بۆ هات رۆژی ۱ ی نیسان پێشمەرگەی یەکێتی جەزایان کوشتوە. بە راستی هەمومان زورمان پێ ی ناخۆش بو. لامان وابو ئەمە تاوانێکە نابی بێ سزادان تێ بپەری. بە رادیو رونکردنەوەیەکمان بلاو کردەوە، بە داخەوە روداوەکەمان باس کرد و، سەرەخۆشیمان له کەسوکار و هاورێکانی کرد، بەلێنمان دا کە لێکۆلینە لە گەل بکوژەکان بکەین و، سزای تاوانبارەکان بدەین. پارتی چونکە لە بیانو بون وا بە خێرایی دەستیان کردەوە و کەوتنە کوشتن، هەقەکەی خۆیان لە ئەنجامی زنجیرەیەک تاوان دا فەوتان.

*

## دارەکەی حسک

حسک له شارباژێر و شارەزور ناوبانگیان باش نەبو. بە نارەوا ئازاری خەلکیان ئەدا و پارەیان ئەسەند و خەلکیان ئەگرت. له سەر رێگای سلێمانی - چوارتا له نێوان وێلەدەر و دوکانیان دا دارێکی لێ بو، پێشمەرگەکانی حسک زۆر رۆژ لە بن ئەو دارەدا رائەوەستان و، هەر ئۆتۆمۆبێلێک ئەهات و ئەرۆیشت رایان ئەگرت پارەیان لە رێبوارەکان و بەنزینیان له شوفێرەکە وەرئەگرت. بەو هۆیەوە ئەم دارە ناو نرا بو دارەکەی حسک و، لە سەرانسەری ناوچەکەدا ناوی دەرکرد بو. لێپرسراوەکانی حسک هانی پێشمەرگەکانی یەکێتییان ئەدا چەک بفرۆشن و بچنە ناو ئەوانەوە. هەندێ جار پارەیان لە کەسوکاری پێشمەرگەکانی یەکێتی ئەسەند و، هەندێ جار کادر و پێشمەرگەی یەکێتیشیان ئەگرت ئەگەر سەری خۆیان نەقەبلاندایە بەریان نەئەدان.
نێوانی مەلبەندی ۱ و هەرێمەکانی حسک ناخۆش بو. حسک لە شارەزور چەند کادر و پێشمەرگەی یەکێتییان گرت بو. چەندی بە خۆشی هەولی بەردانیان درا کەلکی نەبو، ئەیانویست بە پارە و چەک بیانفرۆشنەوە. هاوزەمان لە گەل ئەمەدا چەند پێشمەرگەیەکی هەرێمی ۳۷ ی شارباژێریش چەند پارچەیەک چەکیان فراند بو، چوبونە لای عوسمانی قالەی مەنووەر. عوسمان فەرماندەی هەرێمی شارباژێری حسک بو.
کەرتەکانی تیپی ۳۷ کەوت بونە تەعقیبی عوسمان بۆ ئەوەی بیگرن. عوسمان

کابرایەکی وریا بو زۆر زو بۆنی مەترسی ئەکرد. ئیتر لە هاتوچۆ کەوت بو. ئەو رۆژە چەند پێشمەرگەیەکی یەکێتی لەو ناوەدا ئەبن. یەکێکیان تفەنگێکی لە دەس دەرئەچی چەند کەسی لە خۆیان بریندار ئەکا. جەزا ویست بوی پیاوەتیان لە گەڵ بکا بیانگەیەنێتە نەخۆشخانە لە چنگنیان. عوسمان ئوتومبیلەکەی خۆی ئەدا بە جەزا. جەزا بریندارەکان و یەکدو پێشمەرگەی خۆی سوار ئەکا و، ئەکەوێتە ریگا. کەمینەکەی تیپی ٣٧ کە لە دوورەوە ئوتومبیلەکەی عوسمان ئەبینن و، ئەیبان چەند چەکداریکی تی دایە، بی چاوەری کردن دایان گرت بونەوە. هەر لەوی دا جەزا و دو کەس لە پێشمەرگە بریندارەکان و ساخەکان کوژران. کە ئەچنە سەریان ئینجا ئەزانن چ کەتنێکیان کردوە.

*

ئاوات ئەیوت: «من مەلا بەختیار داوای لی کردوم عوسمان بگرم بۆ ئەوەی لە گەڵ گیراوەکانی هەورامان بیانگۆڕینەوە. پێشمەرگەکان لە باتی ئەوەی بیگرن بە نیازی کوشتنی تەقەیان لە ئوتومبیلەکەی کردوە وایان زانیوە عوسمانی تی دایە. بە هەڵە جەزا بەر کەوتوە، دو پێشمەرگەی خۆیشمانی لە گەڵ کوژراوە.» پێشمەرگەکان هەمان قسەیان دوبارە ئەکردەوە.

مەلا بەختیار ئینکاری ئەکرد کە داوای گرتنی عوسمانی لە ئاوات کرد بی.

هەندی کەسی کە رووداوەکەیان بە جۆریکی تر ئەگیرایەوە. چەند پێشمەرگەیەک چەند پارچە چەکێکی تیپی ٣٧ ئەفرینن و رائەکەن بۆ لای عوسمان. ئاوات نامەیەک بۆ عوسمان ئەنوسی داوای لی ئەکا دەسبەجی چەکەکانی بۆ بنێرێتەوە. عوسمان بە شێوەیەکی ناشیرین وەلامی ئەداتەوە. لە سەر ئەوە ئاوات کەمینی بۆ عوسمان داناوە و، بۆ بەدبەختی جەزای تی کەوتوە.

رووداوەکە هەر چۆنی بی، بیانوی دا بە جود و، لە ناو جودا بە پارتی، شەری سەرانسەری دەس پی بکاتەوە.

*

لە پیوەندی دا بوین لە گەڵ مەڵبەند بۆ گرتن و لێکۆڵینەوەی بکوژەکان، پارتی چونکە لە بیانو ئەگەرا، بی چاوەری کردنی ئیجرائاتی یەکێتی دو کاری تۆڵەسێنانەیان کرد:

– رۆژێک دوای رووداوەکەی جەزا، ٢ ی نیسان، لە گوڕەدیم بوسەیەکیان نایەوە لە ناو ئوتومبیلیک دا ٨ کادر و پێشمەرگەی یەکێتییان کوشت. ئەم پێشمەرگانە لەو رووداوەدا بەشدار نەبون و، نەیشیان بیست بو شتی وەها قەوماوە.

– لە کاتی شاردنەوەی تەرمی جەزا و هاوریکانی دا، هەڤالی ئەحمەد بەگ، کە خزمی جەزا بەڵام پێشمەرگەی یەکێتی بو، بی چەک چو بو بەشداری مەراسیمی ناشتنی بکا، هەر لەوی دا گرت بویان کوشت بویان.

ئیتر هەلومەرجی مەڵبەندەکە وا تیکچو. هێزەکانی هەردولا کۆبونەوە و سەنگەریان لە یەک گرت. هەر لایەک هەوڵی ئەدا لایەکەی تر بە شکاوی لە ناوچەکە دەربکا. ژمارەیەکی زور لە پیاوماقوڵ و ریش سپی و مەلا کەوتنە خۆ بۆ ناوبژی مەڵبەندی ١ و لقی سلیمانی پارتی و، خاوکردنەوەی گرژی و، گیرانەوەی ئاشتی. لێپرسراوەکانی پارتی بە لاساری و کەڵلەرەقییەوە ناوبژییەکەیان رەت کردەوە.

* لەو کاتەدا ئیمە ئابلوقە درا بوین لە هیچ لایەکەوە ریگای هاتوچومان نەبو بۆ دەرەوەی کوردستان. نەمانئەتوانی نامە و بلاوکراوەکانی یەکیتی بە ریکوپیکی بگەیەنین بە هەڤالەکانی دەرەوەمان. جاروبار پەیامەکانمان بە کزد و بە رادیو ئەخوێندەوە، لە شام وەریان ئەگرت. هەلومەرجی کوردستان بە تەواوی شیوا بو. شەری ناوخۆ خەریک بو هەمو ناوچەکان و هەمو لایەنەکانی ئەگرتەوە.

من بە تەمای سەردانی ناوچەکانی سلیمانی و، کۆبونەوە لە گەل مەلبەندەکان، سەرتیپەکان، ریکخراوەکان، کەرتەکانی ریکخستن.. بوم. لە گەل ئازاد هەورامی، قادری حاجی عەلی بەگ، رەحمان سەیدە، سلیمی حەمە ئاغا، مەحمود (کە بە ملازم مەحمود ناسرا بو)، بەختیاری برام... لە ناوزەنگەوە بە ری کەوتین. بەفر ناوچەکانی سنور و شاخەکانی گرت بو. لە شاخی سەخت و بەفراوی هومل مان دا و چوینە بیتوش. لەم ناوچەیەدا بە ماسی گەورە ئەلێن: «هومل».

دەفتەری سیاسی حدکا بارەگاکەیان لە بیتوش بو. ئەوان تەلەفونی سەتەلایتیان هەبو. ریگەیان دام بە تەلەفونەکەیان قسە لە گەل هەڤالانی ئەوروپا بکەم. ئەمویست سەرنجیان رابکیشم بۆ ئالۆزانی هەلومەرجی کوردستان و، هەندی راسپاردەی م س هەبو پییان بلیم، بە تایبەتی داوایان لی بکەم داوا لە سوریا و لیبیا و فەلەستینیەکان بکەن، کە تەشەریان لە سەر جود هەبو، هەول بدەن ریگەی تەنینەوەی ئاگری شەری ناوخۆ بگرن. عومەر شیخمۆس بەرپرسی کاروباری دەرەوە ئەو کاتە لە لەندەن ئەژیا. ژمارەکەی ئەومان لی دا کەس هەلی نەگرت. تەلەفونم بۆ مالی ئیبراهیم ئەحمەد کرد. هەلو هەلیگرت. وتم: «من فلانم قەلەم و کاغەزی بهینە هەندی شتت پی ئەلیم بینوسە و بیدە کاک هومەر، چونکە کاک هومەرم دەس نەکەوتوە!» یەکسەر وتی: «مەیارەک بی تۆیش گەیشتیتە ئەوی؟» جود، بە تایبەتی حشع، ئەوەندە بە درۆ باسی پەیوەندی نهینی و ژیربەژیری یەکیتیان کرد بو، ئەم جۆرە کەسانە باوەریان کرد بو. وایانزانی لە بەغدادەوە قسەی لە گەل ئەکەم. چی لە گەلی خەریک بوم تی ی بگەیەنم لە جیگایەکی ئەمینەوە لە کوردستانەوە قسە ئەکەم و، کارەکەم زور پەلە و پیویستە، ئەو هەر لە سەر ئەو قسە هەلەق مەلەقانەی رویشت. نائومید بوم جنیویکم پی داو تەلەفونەکەم داخستەوە.

لەویوە چوینەوە دیوی کوردستانی عیراق سەردانی کەلاوەکانی باوزی، رازان، تەشکەنمان کرد، کە تازە پیشمەرگە هەندیکیانی ئاوا کرد بوەوە و بارەگایان لی دانا بو. جەمال حەکیم، ناظم عومەر، ئەرسەلان بایز، یوسف زوزانی، ئەحمەدی دادی.. لەوی بون. دەزگای راگەیاندن گواستبویانەوە ئەوی، رادیوکەیشیان لەوی خست بوەوە کار. بە تەما بوین زوری بارەگاکانی سەرکردایەتی بهینە ئەو ناوچەیە.

بە گوریس لە ئاوی زیێ پەرینەوە بەری ئاسۆس. لامان دایە کەلاوەکانی سەرتەنگ. ناوچەکە نائەمین بو. مەفرەزەیەکی حسک لە مەرگە پیشمەرگەیەکی یەکیتیان کوشت بو. هیزیکی یەکیتی هات بو بۆ راونانی مەفرەزەکەی حسک. روژی ۱۰ ی نیسان شەریک لە بەینی مەفرەزەکەی حسک و هیزەکانی یەکیتی دا لە ئاسۆس قەوما بو. مەفرەزەکەی حسک دەستیان وەشاند بو پیشمەرگەیەکی یەکیتیان گرت بو، ناوی سەید برایم و، فەرماندەی کەرت بو لە تیپی ۲۱ ی کەرکوک. ئەوان شارەزای ناوچەکە بون خۆیان حەشار دابو. روژی

دوایی چوینە ناوەژێ. عەبدولرەحیم عەبدوللا فەرماندەی تیپی ٤٣ ی ئاسۆس بو. ماڵەکەی لەوێ بو. روستەم و هەندێ لە پێشمەرگەکانی تیپی ٢١ ی کەرکوکیش لەو ناوە بون.

*

شەماڵ و باداوان

شەو لە ناوەژێ ماینەوە. بەیانی ١٦ ی نیسان لە ماڵەکەی عەبدولرەحیم نوست بوم، شەهیتی هەڵیان ساندم. عەبدولرەحیم نامەیەکی پیشان دام لە ڕێکخراوەکانی ناوشارەوە بۆیان هات بو. لە نامەکەدا نوسرا بو کە ڕۆژی ١٥ ی نیسان هێزێکی تێکەڵاوی حشک و حشع لە باداوان بۆسەیەکیان ناوەتەوە ٥ پێشمەرگەی یەکێتی تێ دا کوژراوە، لەوانە: شەماڵ فەرماندەی تیپی کۆسرەت و، سەرباز ئەحمەد جێگری فەرماندەی تیپەکە. هەردوکیان پێشمەرگەی مەفرەزە سەرەتاییەکان و دو پێشمەرگەی هەڵکەوتو بون. تومەز مەفرەزەکەی حسک کە لە ئاسۆس کشا بونەوە، چوبونە کۆسرەت، لە باداوان لە گەڵ مەفرەزەیەکی حشع یەکیان گرت بوەوە. شەماڵ نازانێ ئەوان لە باداوانن، لە گەڵ سەرباز و شۆرش حاجی و چەند کەسی لە پێشمەرگەکانی تیپەکەی بە سواری ئوتومبیل ئەچی بۆ باداوان. هەر کە دائەبەزن یەکسەر دایان ئەگرنەوە، هەر لەوێ دا پێنجیان لێ کوشت بون و، کەوت بونە راونانی ئەوانی تر.

هەواڵم بۆ تیپی کۆسرەت نارد بێنە لای ئێمە لە مەرگە و هاتن.

*

شەر لە شارباژێر

سەرکردایەتی جود فەرمانی دابو بە هێزەکانی هەمو لایەنەکانی جود پێکەوە پەلاماری بنکەکانی یەکێتی بدەن. بەهادین نوری، لێپرسراوی قاطیعی سلێمانی و کەرکوک، ئەم فەرمانەی جێبەجێ نەکرد. تەنانەت مەکتەبی سیاسی حشع پێش داوایان لێ کرد هاوکاری هێزەکانی جود بکا دژی یەکێتی، بە قسەی ئەوانیشی نەکرد.

بەهادین لە کۆنەوە لە گەڵ سەرانی حیزبەکەی لە سەر کۆمەڵێ مەسەلەی گرنگ ناکۆک بو. بەرامبەر ناکۆکی نێوان حیزبە کوردییەکان ڕەشی وابو، ئەوە ناکۆکیە لە ناو باسکە جیاوازەکانی بزوتنەوەی نەتەوەیی کوردا، ئێمی حشع لەو ناکۆکیەدا بێلایەن بێ و، خۆی لەو شەرەوە نەگلێنێ. جگە لەمەیش، بەهادین ئەیزانی تەرازوی هێز بە قازانجی یەکێتیە، لەو ناوچەیەدا هەر شەرێ لە نێوان یەکێتی و لایەنەکانی جودا بێ، بە قازانجی یەکێتی بەلادا ئەکەوێ، ئیتر بۆچی خۆی تێکەڵاوی شەڕێکی دۆڕاو بکا! هەڵویستەکەی بەهادین هێزەکەی حشعی لەو ناوچەیەدا لە زەرەر و زیان پاراست.

*

ڕۆژی ١٩ ی نیسان شەر لە شارباژێر هەڵگیرسا. ڕۆژی ٢٠ ی نیسانی ٨٣ کۆتایی هات. هێزەکانی پارتی و حسک لە سورکێو ئاوا بون و بە شکاوی کشانەوە بۆ ئێران و، هێزەکەی حشع، بە سەلامەتی، کشایەوە بۆ بەری قەرەداغ. لەو کاتەدا من لە بەری مەرگە بوم.

*

هەواڵەکانی لە مەڵبەندی ٤ و تیپەکانی و ڕێکخراوەکانی ناوچەکەوە ئەهاتن و، نامەکانی لە دوستەکانمانەوە پێمان ئەگەیشتن، هەمویان وایان ئەگەیاند، هێزەکانی لایەنەکانی

جود: پارتی، حسک، حشع، پاسوک، له دەوروبەری بالیسان، که بارەگای مەلبەندی ٤ ی لی بو، کۆ بونەتەوە و نیازی پەلاماردانیان هەیە.
بە بیستنی ئەسەم لە گەڵ مامجەلال و مەکتەبی سیاسی کرد، ئەوانیش هەمان ئاگاداریەیان هەبو. وا ریک کەوتین:
١. هەمو هیزەکانی یەکیتی ساز بدەین بۆ بەرپەرچدانەوەی هەر دەستدریژییەکی بکریتە سەرمان.
٢. ئازاد هەورامی بچی بو سازدانی پاشماوەی هیزەکانی مەلبەندی ٣.
٣. منیش بەشی لە هیزەکانی مەلبەندی ١ و ٢ لە گەڵ خوم بیەم بۆ ناوزەنگ.
٤. ئەگەر لایەنەکانی جود پەلاماری مەلبەندی ٤ یان دا ئیمەش پەلاماری سەرکردایەتییان بدەین لە قرناقاو - پشتاشان.

*

ئازاد هەورامی کەوتە ری بەرەو بیتوین و لەویوە بۆ وەرتی. رەحمان سەیدەیش لە گەلی گەرایەوە. رەحمان حەزی ئەکرد ناوچەکانی سلیمانی ببینی، هەر بەو نیازە لە گەڵ من هات بو، ئارەزوەکەی نەهاتە دی. منیش ویستم لە دەشتی قەلادزەوە بە کورتترین ریگادا بگەریمەوە ناوزەنگ. بەلام هەوالیان بۆ هینابین جاش سەر ئاوی زی یان لی گرت بوین. جاشەکان هەندیکیان سەر بە لایەنەکانی جود بون. لەبەر ئەوە چومە شارستین و لەویوە بۆ سەرگەلو. هیزیکی چەند سەد کەسیم کۆ کردەوە و لە گەڵ خوم بردم بۆ چوخماخ و مالومە و بە دولی سفرە و زەرون دا چوینە هەرزنە بەرەو ناوزەنگ.

*

بە ریگاوە بوین بەرەو ناوزەنگ بیستمان هیزەکانی جود پەلاماری بالیسانیان داوە دولی بالیسان، دولی مەلەکان و، دول ئاکویان گرتوە و خەریکی گرتنی دولی خانەقا و دولی شەهیدانن بۆ ئەوەی ناوزنگ بە تەواوەتی لە ناوچەکانی هەولیر دابرن و، هیزەکانی یەکیتی کە لە دەرە شیرە - سەرچاوەی مەلەکان گەمارو درا بون بگرن.
لەم شەرانەدا ٧ پیشمەرگەی مەلبەندی ٤ کوژران، لەوانە: ئامیق محەممەد شوکر (پیشرەو)، ئەحمەد قەمبەری و، چەند کەسی بریندار بون، لەوانە: عەلی نەبی، شاخەوان، دلزار حەویزی.
پیشرەو کادریکی هەلکەوتو و رۆشنبیری کۆمەلە، خەلکی کەرکوک و دەرچوی (اقتصاد) بو. ماوەیەک بەرپرسیاری دەورەی پیگەیاندنی کادر بو. خۆی دەرسی ئابوری سیاسی ئەوتەوە. کتیبیکی گەورەیشی بە کوردی لە سەر ئابوری سیاسی نوسی بو. فریا نەکەوت چاپی بکا.
ئەحمەد قەمبەری یەکی لە پیشمەرگەکانی مەفرەزە سەرەتاییەکانی دەشتی هەولیر و، هاوری ی کۆمەلە بو. لە بەر ئازایەتی و زیرەکی بو بو بە فەرماندەی کەرت.
دلزار کوری بەکرئاغای حەویزی بو. بەکرئاغا یەکی بو لەو ئەفسەرە شورشگیرانەی کورد کە لە جمهوریەتی مەهاباد و لە شورشی ئەیلول دا بەشدار بو. دلزار لاویکی بەنرخ و تیگەیشتو، دەرچوی (کلیەی ادارە) بو. گوللەیەک لە میژەلاکی سەری دابو، هەردو چاوی کویر کرد و، چاوەکانی هەرگیز روناکییان تی نەهاتەوە.
کەلوپەلی مەلبەند و مالی ئەندامەکانی تالان کرا. شتومەکی سەید کەریم گیرا بو.

پاسپورتەکەی کە سوری بو، لە گەل نامەیەکی کە من بۆم نوسی بو، لە ناو شتەکانی دا، گیرا بون. دەزگاکانی راگەیاندنی لایەنەکانی جود چەند جاری ئەم نامەیەیان بلاو کردۆتەوە.
لە بەشێکی نامەکەدا بۆ سەید کەریمم نوسی بو:
«بە هۆی سوریا و لیبیاوە زەغتێکی زۆرمان بۆ ق م و تەهران بردوە بۆ ئەوەی شەرمان پێ نەفرۆشن و پەلاماری مەقەرەکانی ئیرە نەدەن، دواکەوتنی هێرشەکەیان بە رەئی من ئەگەرێتەوە بە زۆری بۆ ئەو زەغتە، چونکە هەرەشەی ئەوەمان لێ کردن کە ئەگەر وازمان لێ نەهێنن ئەوا مەجبورین شەری ئەملا رابگرین و خۆمان بۆ ئەوان تەرخان بکەین و تۆبالی ئەو مەسەلەیەش ئەکەوێتە ئەستۆی ئەوان. ئێستا برادەران لەوێ خەریکن کە زۆر لە تیهران بکەن هەڵوێستی خۆی بگۆری، هەرچەندە بروا ناکەم بە قەد مویەک هەڵوێست بگۆری»
پێشتر چەند جاری لە کۆبونەوەی دوقولی دا لە گەل حشع پێمان وت بون کە ئەگەر شەر لە خواری هەڵبگیرسێ، لێیان ناگەرێین ئەوانیش بە ئاسودەیی لە پشتاشان دابنیشن. شەر ئەخەینە ناو سەرکردایەتییانەوە.

*

بێگومان منیش وەکو هەمو کوردێکی تر لە ناخی دڵەوە ئەم شەرەم پێ ناخۆش بو. رەنگە بۆ من، کە لە پلەیەکی بەرزتری لێپرسراویتی دا بوم و، هەمو ژیانی خۆمم بۆ مەسەلەی گەلەکەم تەرخان کرد بو، ناخۆشتر بوبێ.
حشع و پارتی و، لایەنەکانی تری جود لە هەرشەکانیان دا بۆ سەر یەکیتی، پەنایان ئەبردە بەر موهاتەراتی زور نزم. بەو پێشمەرگە قارەمانانەی، کە رژێمی بەعسیان هێنا بوە لەرزە و، بەو پیاوە ئازایانەی جەللادەکانی موسل و ئەهو غریبیان سەرسام کرد بو، ئەوت: جاشەکانی شەستوشەش و جاشەکانی بەعس. ئەم جورە پروپاگاندە ناراستە لە پاتی ئەوەی بە قازانج بگەرێتەوە بۆ جود، لە ناو پێشمەرگە و جەماوەری یەکیتی دا، بو بو بە هۆی خولقاندنی داخێکی قول و رقێکی ئەستور لە جود.
– سەرکردایەتی حشع و کادرەکانی، ژمارەیەکی کەمیان نەبێ کە لە کوردستان بون، ئەوانی تریان لە سوریا و ئەوروپا نیشتەجێ بون.
– سەرکردایەتی پارتی و کادر و پێشمەرگەکانی، ژمارەیەکی کەمیان نەبێ کە لە کوردستان بون، ئەوانی کەیان هەمو لە ئیران دانیشت بون.
– سەرکردایەتی و کادر و پێشمەرگەکانی یەکیتی، چەند کەسێکی کەمی سەرکردایەتی نەبێ کە لە سوریا و ئەوروپا بون، ئەوانی کەیان هەمویان بە خاووخێزانەوە لە کوردستان بون.
لەو کاتەوە کە یەکیتی چو بو بۆ پارمەتیدانی حدکا، ئیران غەزەبی لە یەکیتی گرت بو، ئەیئەهیشت جود لە گەل یەکیتی ئاشتی بکا. دەرگای هەڵبژاردنی سیاسی، بۆ رێککەوتن لە گەل یەکیتی، لە ژێر گوشاری ئیرانی دا، لە لایەن جودەوە داخرا بو. ئێمە تەنیا دو هەڵبژاردنی سەختمان لە بەردەم دا بو، هەڵبژاردنی سێیەمان نەبو:
هەڵبژاردنی یەکەم، مەیدان چول بکەین بۆ جود، یان وەکو هەندێ لە لایەنەکانی جود ئەیانوت: بپێچینەوە بۆ تەویلەکانی یەکرجۆ.
هەڵبژاردنی دوەم، لە مەیدان دا بچەقین و، ئێمە ئەوان دەربکەین.

جـوود ئێـرانیـان هەمو داڵدەیان بدا، ئەو کـاتە ئێـمـە نە لە ئەرز و نە لە ئاسـمـان جـێگەیەکـمـان نەبو ڕوی تێ بکەین، ئەو ناوچە پچـوکـە نەبێ کـە بارەگـاکـانی خـۆمـان و مـەڵبەندەکـان و مـاڵ و خـێزانەکانماتی لێ بو، ئەویش کەوت بوە بەر مەترسی هێرشی جود. هێزەکانی پارتی بە سەرکردایەتی حەسۆ میرخان ژاژۆکی و، بە یارمەتی ئێران چوبونە سەر چیـای جـاسـوسـان، بەرامـبـەر بە ناوزەنگ، جـاروبار هاوەنی بە بارەگـا و مـاڵەکـانەوە ئەنا. ناوزەنگ کەوت بوە مەترسی گیرانەوە، ئەبو چۆڵی بکەین.

ناچار بوین شەر لە سەر مانی خۆمان بکەین.

*

هەمـو گـەنجێ لە سـەرەتای ژیانی دا کـە بیـر لە پاشـەڕۆژی ئەکـاتەوە هیـوای زۆر و ئاواتی جۆراوجۆر و ئارەزوی سور و مۆری لە لا دروست ئەبێ.

منیش وەها بوم. بەڵام هەمو جاری ژیان بەو ئاقارەدا ناڕوا کە بە تەمای بوی. ئاوات و ئارەزو و هیـواکـان لە گـەڵ ڕوداوەکـانی ڕۆژگـاردا ئەبن بە داڵغـەی ڕابوردو و، خـەیاڵی جیبەجێ کردن نەهاتو و، خەونی بە دی نەهاتو...

کـە خوێندنی سـانەویم تەواو کرد، زەمـانی عـەبدولکەریم قـاسم بو. لەو سـەردەمـەدا کـورد بە ئاسـانی ئەیتوانی بچـێتە کلیـەی عـەسکری. ئەگـەر بویستایە ئەوانە بو ئەو زەمـانە منیش لە کلیـەی عـسکری وەربگیرامایە. بەڵام خۆم هیچ ئارەزویەکم نەبو ببم بە ئەفـسـەر و حەزم لە ژیانی عسکەری نەئەکرد، ئەگەرچی ئەو زەمانە ئەفسەر پایەیەکی تایبەتیـان هەبو لە ناو کۆمەڵ دا، تەنانەت بە زەمانی کچانی خوازبێنی کراوی بەغداوە ئەیانوت: «لو مـلازم لو ملازم». من حەزم لە ژیانێکی تر ئەکرد کە هێمن و ئاسودە بێ.

کە بوم بە پێشمەرگە، لە هەمو ژیانم دا جگە لە چەند حەفتـەیەک مشقی «کـتـائب الشباب» هیچ دەورەیەکی تەدریبی عـسـکەریم نەدی بو، ئەویش لە بەرنـەوەی دوای جـەنگی شەش ڕۆژەی عەرەب - ئیسرائیل، هەرکسی لەراندەی خوێندنی جامیعەیان تەواو ئەکرد، ئەم مشقەی نەکردایە شەهادەیان نەئەدایە. ئەگینا بۆ ئەمەش نەئەچوم.

لە ئەدەبی کۆنی عـەرەبی و فـارسی دا لـە سـتـایـشی هەندی لە کـاربەدەسـتـەکـان دا نوسـیـویـانە: «صـاحب السـیف والقلم». من گـالتـەم بەم سـتـایـشـە ئەهات. لە ژیانی پێشـمـەرگـایەتیم دا هەرگـیـز خۆمم بە «ئـەهلی تفـەنگ» دانەناوە و، حـەزم ئەکرد لە ڕیزی «ئەهلی قـەلەم» دا حـسـابم بکەن. کـە ئەو شـەرانە بو. چەند نامـەیەکم لە لـێپـرسـراوەکـانی ڕێکخراوە نهێنیـەکان و، هەندی لە ڕوشنبیرەکـانی شارەوە بۆ هات. نارازی بون لەوەی من سـەرکـردایەتی هیچ شـەرێک بکەم. هەندێکیـان ئەترسـان من لە شـەرێک دا بکوژرێم و، کۆمەڵەیش توشی سەرگەردانی ببێ. لەو کاتەدا سەرم زۆر قاڵ بو، نەمئەپەرژا بە نامەی درێژ وەڵامیان بدەمەوە. لە وەڵامی یەکێکیان دا نوسیم:

«هاوڕێ! پەژارەکەت لە جێگای خۆیەتی. بەڵام پرسیارە بە ناوبانگەکەی شکسپیر: «هەبێ یا نەبێ؟ ئەوە مـسـئلەکـەیە!» چارەنوسی یەکـێـتی و کـۆمـەڵە وەکـو ڕێکخـراو و چارەنوسی خۆمان وەکو تێکۆشەر، لە مەترسی دایە»

کـە پەلامـاری بالیسـانیـان دا و گـرتیـان، ئێـمـەیش بڕیارمـان دا پەلامـاری سەرکردایەتییان بدەین لە قەندیل. ئیتر چوم بۆ سەرکردایەتی شەرەکان.

*

شەری یەکەمی جود

ئازاد هەورامی کارەکەی خۆی بە باشی ئەنجام دا بو. هیزەکانی وەرتی، دولە رەقە، دولی خانەقای ساز دا بو، ئامادەی کرد بون بۆ خەریک کردنی لای چەپی مەیدانی شەرەکە و، چاوەروانی ئەکرد بە رادیو ئاگادار بکری دەس پی بکەن.

ئیمەیش هیزەکانمان لە زەلی کۆ کردەوە. مامجەلال هات بۆ خواحافیزی و، وتاریکی بە سوزی بۆ دان و، داوای لی کردن ئەرکەکەیان بە چاکی بە جی بهینن و، بە پەلە بە ری بکەون بۆ رزگارکردنی هاوریکانیان لە مەلبەندی ٤ لە گەمارۆی جود.

رەمـــزی دەس پی کـــردنی پەلامـــاردان بانگەوازی بو، کـە ئەبو لە رادیۆ وە بلاو بکریتەوە، پەندیکی کۆنی کوردی بو: «تۆلە بە سەبرە، ئەما بە زەبرە!» رادیو دەستی کرد بە خویندنەوەی بانگەوازەکە.

ناوی خوامان لی هینا کەوتینە ری. بۆ نیوەرو گەیشتینە بەستی. داوام لی کردن بۆ حەسـانەوە لە بن دارەکـانی چەمـەکـەدا لا بدەن و نانی نیـوەرو بخۆن. من مـەفرەزەیەکی تیکەلاوم لە پیشمەرگەکانی بارەگاکەی خۆم و هەندی پیشمەرگەی گەرمیان پیک هینا بو، شاهۆ فەرماندەیان بو. شاهۆ بەتانیەکی لە بن داریک دا بۆ من داخست لە سەری دابنیشم. خواردنەکـەمـان سـەفەری بو: نان، هیلکەی کـولاو، تەمـاتە، خەیار و تەموزە بو. لە سـەر دەسریک دام نا بو. لەو کاتەدا فەقی حەسـەن پەیدا بو. فـەقی حەسـەن بارەگـاکەی لەو ناوە بو، خویشی خەلکی ناوچەکـە بو. من بە دوام دا نارد بو بۆ ئەوەی دەنگوباسی ناوچەکـە و شوینی سـەنگەر و قـایمکارییـەکانی جـودی لی بپرسم. چەند کـەسی لە گـەل من لە سـەر بەتانیـەکـە دانیـشت بون. من هەسـتـام بەرەو لای فـەقی حەسـەن چوم و بانگم کـرد بۆ بن داریکی تر بۆ ئەوەی گـویـیـان لە قـسـەکـانمان نەبی. کـە من رویـشـتم ئەوانی تریش چونکە خواردنەکـەیان بە دل نەبو لە سـەر بەتانیـەکـە هەسـتـا بون و رویشت بون. مـام سـالحی گورئەسپ گوی ی لە دەنگی هەندی هاوەنی دور بوبو، هاواری لی کرد بون: «پیـشـمـەرگە پلاوەی لی بکەن روحە هات!» کس گوی ی نەدا بویە.

*

روحە!

گۆرئەسپ گوندیکە لە گەرمیان. مـام سالح فـەرمـانـدەی کـەرت و، بە دەستی خۆی پیـاویکی ئازا و، هەتا بلی ی قسـە خۆش و جـوامـیـر و دلپـاک بو. هەمـو جـار ئەیوت: «مامجەلالیش بە پیشمەرگە بلی: برا تۆپەل مەبن، پلاوەی لی بکەن، پیشمـەرگە دامەزرین! بە قسەی ناکەن. بەلام کە فرەی کۆبیتەر و هاشـەی تۆپ هات، ئیـتر هەمو پلاوەی لی ئەکەن و لە شوینی قایم دا دائەمەزرین! مامجەلالیش ئەو مەرکەزییـەتەی نیـە کە روحە هەیەتی. مەرکەزییەت ها وەلای روحەوە!» مەبەستی لە «روحە» فـرەی هالیکۆپتەر و هاشـەی تۆپ بو. لەبەر ئەوە مام سالحمان ناو نابو: «روحە».

*

لە پر گوللە توپیکی گەورە هاشەی کرد و لە ناوی دابن بەر بەتانیـەکەی من کەوت، هەر لەوی دا ٤ لە پیشمەرگەکانی مەفرەزەکەی منی کوشت: کامیل وەستا ئەحمەد خەلکی کرپچنە، یاسین عەبدولکەریم خەلکی کفری، ئیبراهیم ئەحمەد خەلکی عەزیز قادر، ئەمین فەتاح خەلکی جامەریز. هەروەها بیستون جیگری فەرماندەی تیپی ٢١ ی کەرکوک و،

لەشکری چوارقورنەیی پێشمەرگەی تیپی ۹۹
بەدرخان صابیر پێشمەرگەی هەمان تیپ و، ی کۆسرەت، کوژران. دەزگای بێتەلەکەمان پارچە پارچە بوو. من بە ڕێکەوت بەر نەکەوتم.
هەمومان هەستاین و بە ڕاکردن ڕومان کردە بن شاخ و قولایی دۆڵەکە تا گەیشتینە نەدیو
بە هیلاک چوین. تۆپباران بەردەوام بوو. دیدەوانەکە لە بەرزاییەکی بەرامبەر بە ئیمە چاوی
لیمان بوو چاودێریی ئەکردین. تا ئێوارەیەکی درەنگ نەمانتوانی سەر دەر بهێنین.

*

پیستون (حەمید محەممەد) پێشمەرگەی مەفرەزە سەرەتاییەکان بوو. هاوڕێیەکی
کۆنی کۆمەڵە و، کادرێکی کرێکاریی ڕوشنبیر و پێشمەرگەیەکی ئازا و دڵسۆز بوو. سەیر
ئەوەبوو ڕۆژی پێشوتر کۆبونەوەی بە پێشمەرگەکانی تیپەکەیان کرد بوو. یەکێ لە پێشمەرگە
توندڕەوەکانی محاسەبە کرد بوو، ئەویش بە ناڕەوا تانەی لی دابوو، وت بوی: «ئەو هەمو ساڵە
تۆ پێشمەرگەیت، ئەگەر پێشمەرگەیەکی باش بویتایە ئەکوژرای یا بریندار ئەبوی!»

*

۷ کوژراو و ۲۲ بریندارمان هەبو. لاشەی کوژراو و بریندارەکان کۆ کرانەوە.
بەدرخان چەند پارچەیەکی کەمی لەشی مابو. هەمومان ڕەوانەی ناوزەنگ کردنەوە و
نامەیەکم بۆ نوسین ڕوداوەکەم بۆ باس کردن و، داوای دەزگایەکی بێتەلم لی کردن.
ئێوارەیەکی درەنگ بە تاریکی بە ڕێ کەوتین بەرەو قەڵاتوکان. پێشتر ئاگاداری
هێزێکی تێکەڵاوی تیپەکانی ئاسۆس و مامەندم کرد بو لە مەرگەوە بە دەشتی قەڵادزەدا
بچن بۆ قەڵاتوکان و بچنە سەری مۆڵی گەورە لە زنجیرەی چیای قەندیل. سەری مۆڵ کەوت
بوە نێوان قەڵاتوکان و قرناقاو، بە سەر هەمو سەنگەرەکانی جوددا زاڵ بو. من بە تەما بوم
خۆم سەر بکەوم بۆ سەری مۆڵ و شاخەو شاخ هێزێک بنێرم ڕێگاکانی قەندیل لە کشانەوەی
هێزەکانی جود بەرەو ئێران بگرن و، لەوێوە کە هەمو ناوچەکە بە چاکی ئەبینری شەڕەکە
بەرێوە ببەم. بەڵام تۆپباران دوای خستین و نەخشەکەی تێکداین.
بارەگایەکی حشع لە سەر ڕێگامان بو. پێشمەرگەکانم ئاگادار کرد بو خۆیان تی
نەگەیەنن. ئەگەر ڕێگەیشیان پی گرتن خۆیان پێوە خەریک نەکەن. بابی تێپەڕین
تەقەوتۆقیان لە گەڵ بکەن. زۆری پێشمەرگەکان شەو لە سەر ڕێگاکە ئاگریان کردەوە و
خۆیان دا بە ئەرزدا بۆ نوستن. هێزەکانی جود کە لە بەرزاییەکان بون مەشخەڵاتی
ئاگرەکانیان ئەدی. خۆم چومە قەڵاتوکان و فەرماندەکانم بانگ کرد. سەر لە نوێ هێزەکانمان
ڕێک خستەوە و ئەرک و فرمانم بە سەردا دابەش کردن. هێزێکمان نارد بۆ بەهێزکردنی
سەری مۆڵ، بۆ ئەوەی هەندێکیان لەوێوە شۆڕ بینەوە بۆ سەر سەنگەرەکانی جود. ٤ هێزی
تریشم ئامادە کرد بۆ سەر ٤ جێگا لە کانی گاتوان، گەری گازی، سەری ساوین.. هەمو
قولەکان هۆکی تۆکیان پی بو.

*

پێش ئەوەی لە ناوزەنگ بە ڕێ بکەوین ناردم چەند تۆپێک خامی سپیان کری و،
دام بە تاقمەکەی مامە ڕیشە هەڵی بگرن. شوانی ڕەئوف نوری جێگری ڕیشە بو، کوڕێکی
قسە خۆش بو، ڕوی تی کردم وتی: «دیارە ئیمەت داناوە بۆ مردن، وا کفن تەسلیمی ئیمە
ئەکەی؟» من لە سەری نە ڕویشتم. جلوبەرگی پێشمەرگەکانی جود و یەکێتی، زمان و
سەروسیمایان و چەکەکانیان لە یەک ئەچو، بۆ ئەوەی لە کاتی تێکەڵاو بون دا لە یەکتری

جیا بکرێنەوە، پێش دەس پێ کردنی هێرشەکە. خامەکەمان لە شێوەی شریت دا بری و، هەر پێشمەرگەیەکی یەکێتی پارچەیەکمان دایە ببەستێ بە بازوی چەپیەوە.

*

تا نیوەرۆ لە خۆئامادەکردن بوینەوە. غەریب سەعید بە سواری گوێدرێژێک پەیدا بو. سەروگوێلاکی خوێناوی بو. هەندێ وردە پارچەی نارنجۆکێکی بەر کەوت بو. گالۆکێکی بە دەستەوە بو، لە بەردەمی دا درێژی کرد بو. شەو لە کاتی تێپەڕین دا ئەمان دوابین تاقمی کاروانە درێژەکەمان بون. کەوت بونە بەر شالاوی لە ناکاوی بارەگەکەی حشع لە رەزگە. وریای مام قادر کوژرا بو، ئەمیش بریندار بوبو. یەکێ لە پێشمەرگەکان کە سەیری دیمەنی غەریبی کرد بە سەر کەریکەوە، وتی: «سەیرا لە مەلا نەسرەدین ناچی؟»

هەر تاقمە ئەرکەکانی خۆیمان بە وردی بۆ رون کرد بوەوە. لە سەعات ١٣ دا هەر ٤ هێزەکە بە ناو لێرەوارەکەدا بەرەو شوێنی دیاریکراو جولان. منیش، لە گەڵ کوێخا عەلی قەلاوی، بە شێنەیی دوایان کەوتم و، بەردەوام بە هۆکی تۆکی قسەم لە گەڵ فەرماندەی قۆلەکان ئەکرد. دەوروبەری سەعات ١٦ هەمو ئەو شوێنانەی دیاریمان کرد بو گیران. هێزەکانی جود هەندێکیان کوژران و هەندێکیان هەڵاتن. هەمو شوێنە بەرزەکانیان لە دەس دا و خێوەت و کەلوپەل و خۆراکیان بە جێ هێشت. عەلی مام رەسوڵ، لێپرسراوی زیندانەکەی حسک بو، ئاگاداری کردین کە ئامادەیە: هەمو گیراوەکان لە گەڵ خۆی بهێنێ و، بێتە ریزی یەکێتیەوە. هەواڵمان بۆ نارد بێت. یەکێ لە گیراوەکان سەید براهیم بو، سەید براهیم فەرماندەی کەرت بو لە تیپی ٢١ کەرکوک، لە تەقوتۆقەکەی ئاسۆس دا گیرا بو، گەیاند بویانە ئەوێ.

ئازاد هەورامی بش هێزەکانی مەڵبەندی سێ ی ساز دا بو لە قۆڵی کوێستانەوە هێرشی بۆ کرد بون، هەندێ پێشڕەوی کرد بو.

قۆناغی یەکەمی کارەکەمان ئێوارە تەواو بو، شەوەکەیمان دانا بۆ حەسانەوە. هەوا سارد بو، ئێمە بۆ حەسانەوە چوینە ناو خێوەتێکی ئەوانەوە. یەکێک رادیۆی حشعی کرد بوەوە، ژنێک بە دەنگێکی ناساز جنێوی پێ ئەداین و، هەڕەشەی لێ ئەکردین. پێشمەرگەیەکیش لە داپەزینی سەری مۆڵ دا بریندار بو بو، گوللەیەک لە سمتی دابو، دیار بو ئازاری زۆری هەبو، زۆری هاوار ئەکرد، دو سێ کەسیش لەو لاوە گاڵتەیان لە گەڵ ئەکرد، ئەیانوت: «هاوار مەکە تۆ لە راکردن دا گوللەت بەر کەوتوە، بۆیە لە دواوەی داوی!»

بەیانی رۆژی داهاتو، ریکەوتی ٢ ی مایسی ٨٣ هێزەکەمان دەستی کردەوە بە هێرش. هەندێ کۆنە رەبیەی جەیش بە بەرزاییەکەوە بو بەرامبەر قرناقاو و پشتاشان، لە گەڵ هەندێ لە فەرماندەکان من چومە ناو رەبیەکەوە. حشع بە هاوەنی ١٢٠ ملیم دایان گرتینەوە و، بە دۆشکا دور بە دور تەقەیان لێ ئەکردین. هێزەکانی ئێمە رژانە ناو قرناقاو و دەستیان بە سەر بارەگاکانی حسک و پاسۆک دا گرت. پێشمەرگەیەکی بالەک: عومەر عەلی دەربەندی کوژرا. لە گرتنی حانوتەکەی حسک دا چەند ساردییەکی ناوقوتوی لە دوای یەک خوارد بوەوە، لە کاتی خواردنەوەی کوکایەکی قوتودا گوللەیەک لە سەری دابو. لەو کاتەدا تاوێک بارانی دەنک گەورە بە خوڕەم دەستی کرد بە بارین. سەرانی حسک و پێشمەرگەکانیان بە قەندیل دا هەڵگەڕان. هێزەکانمان هەندێکیان کەوتنە راونانی ئەوان و

هەندێکیان هەڵیانکوتایە سەر بارەگاکانی حشع لە پشتاشان. منیش ئیتر دابەزیم بۆ دۆڵەکە.

*

## پی کا کا لە قەندیل

لە بەردەمی پشتاشان دا راوەستا بووم تەقە گەرم بو چەند کەسێکیان هێنا بۆ لام. بانگم کردن قسەیان لە گەڵ بکەم، بە کرمانجی ئەدوان، لێم پرسین: «ئێوە چین؟»

وتیان: «ئێمە پی کا کا ین؟»

وتم: «پی کا کا چی ئەکا لێرە؟»

وتی: «هات بووین بۆ ناوبژی ئێوە و جودا»

وتم: «کاکی برا قسەیەکی پێشینان ئەڵی: ئەگەر کەچەڵ حەکیم بوایە تەداوی سەری خۆی ئەکرد! ئێوەیش لە گەڵ هەمو گروپ و حیزبەکانی کوردستانی تورکیا لە شەردان بۆچی ناچن لە گەڵ ئەوان رێک بکەون لە باتی خەریکی ناوبژی ئێمە بن؟»

یەکێکیان زۆر بە داخ بو، بە چەپۆک لە سەری خۆی ئەدا، هاوڕێیەکی کۆمیتەی ناوەندییان کوژرا بو، لە لایان زۆر بەرێز و خۆشەویست بو، ئەیوت: «ئێوە هەڤاڵێکی ئێمەتان کوشتوە، تورکیا و ئەمەریکا و هەمو ئیمپریالیزمی جیهانی بە دوایەوە بون، نەیانتوانی هیچی لی بکەن، کەچی ئێوە لێرە کوشتتان»

داخی خۆمم دەربڕی سەبارەت بە کوژرانی هاوڕێکەیان، وتم: «ئەوە لە ئەنجامی هەڵەی خۆتان دا بوە کە هاتوننەتە ناو ئەم شەڕەوە. ئێستایش بچن چەکەکانتان وەربگرنەوە و، بۆ کوێتان ئەوێ بە ڕێتان بکەم؟»

ئەمانە مەفرەزەیەک بون لە گەڵ حشع لە نزیک کومتان بون، کە شەر دامەزراوە بە شیوعییان زانی بون. داوایان لی کرد بون تەسلیم بن. یەکێکیان جنێوی داو وت بوی: «ئێوە چین تەسلیمتان بین؟» گوللەیەکیان لە سنگی عەزیزی داود داو خەریک بو بمری. ئیتر ئەوانیش پەلاماریان داون، کوڕێکیان لی کوژرا بو بە ناوی خالید و، ئەوانی تریان گیرا بون. کە زانی بویان پێشمەرگەی پی کا کان نارد بویانن بۆ لای من. منیش ناردمن بۆ لای ئازاد هەورامی چەکەکانیان بۆ وەربگرێتەوە و وەکو خۆیان ئەیانویست بە رێیان بکا بۆ روستی.

*

عەسری هەمان رۆژ شەر بە ئازانجی یەکێتی بە لادا کەوت. لە گەڵ ئازاد هەورامی و هێزەکانی مەڵبەندی سێ یەکمان گرتەوە. بنکە و بارەگاکانی حشع گەڕان. بۆ ئەوەی شتەکان بە ساغی نەکەوێتە دەس یەکێتی، خۆیان زۆر شتی نەخۆشخانە، چاپخانە، رادیۆکەیان، هاوەن و دوشکاکانیان خراپ کرد بو. هەندێکیان بە قەندیل دا هەڵگەران بەرەو ئێران. بەفر قەندیلی بەر ئەدا بو. لەم شەڕەدا دو پێشمەرگەی یەکێتی کوژران: عوسمان کاژاوی و، غەفور پشتاشانی. ئاگاداری هێزەکانی خۆمانم کرد کە ئیتر دویان نەکەون و وازیان لی بهێنن.

*

هێزەکانی یەکێتی لە جود بە داخ بون، بەلام تیپی کۆسرەت لەوان زیاتر، چونکە هەموی چەند رۆژی بو فەرماندەی تیپەکەیان و جێگرەکەی و ۳ پێشمەرگەیان کوژرا بو.

دوای بە لاداکەوتنی شەڕەکە لە کاتێک دا خەریکی کۆکردنەوەی بەڵگەکان بوین، شۆڕش حاجی کە ئەوسا ڕابەری سیاسی تیپی کوسرەت و، بە ڕێکەوت لە بۆسەکەی بادآوان دا نەکوژرا بو، کەوت بوە تەماشا کردنی بەڵگەکان. بە تووڕەبونێکی زۆرەوە هەندی لەو بەڵگانەی بۆ من هێنا سەیریان بکەم. من لەو کاتەدا نەمئەپەرژایە سەر ئەوەی سەیری شرە و پرە بکەم، ئەمویست هەرچی زوە بگەینە لای هێزە گەمارۆدراوەکەی مەڵبەندی چوار. بەڵام شۆرش پێ ی داگرت کە هەر ئەبێ سەیریان بکەم و سەرنجی بۆ دوانیان ڕاکێشام:

یەکێکیان، ڕاپۆرتێک بو دەربارەی ڕوداوەکەی بادآوان بۆ عەزیز محەمەد و مەکتەبی سیاسی حیزبەکەیان نوسی بو. لەم ڕاپۆرتەدا نوسی بویان تاقمی چەکداری جەلالی لە گوندی بادآوان کەمینێکیان بۆ هاوڕێیانی ئەوان و هەڤالاتی حیزبی هاوپەیمان: حسک دانا بو. بەڵام هاوڕێیانی ئەمان لێیان هاتنە دەست و کەمینەکەیان شکاند و، پێنجیان لە جەلالیەکان کوشت. ئەمەش بە تەواوی پێچەوانەی ڕاستیی ڕوداوەکەوە بو.

دوەمیان، دەفتەرێکی گەورە بو بە قەوارەی (ئەی چوار) تەرخان کرا بو بۆ لێکۆلینەوە و هەلسەنگاندنی سەرکردایەتی و فەرماندە و هێزەکانی یەکێتی لە سەر شێوەی ئەو ڕاپۆرتانەی دەزگاکانی ئەمن و ئیستیخبارات دەربارەی حیزبەکانی موعارەضە ئامادەیان ئەکرد. زۆر بە دریژی ژمارەی پێشمەرگە و ناوی فەرماندە و ئەندامانی سەرکردایەتی و کادرە پێشکەوتوەکانی و، ڕادەی دلسۆزیی و ئازایەتییان، تەنانەت ئەوەندەی بۆیان کۆ کراپوەوە، زانیارییان لە سەر پلەی خوێندەواری و پیشە و، ناوی ژن و منداڵ و خوشک و برا و کەس و کاریشیان نوسی بو.

سەیر ئەوە بو، شتێکی لە بابەتی ئەمەیان دەربارەی حیزبی بەعس و جەیشی عیراق و دەزگا سەرکوتکەرەکانی و، هیچ حیزبێکی تر نەکرد بو.

*

هەمو خەلکی کوردستان بە پەژارەوە گوێ قولاغی هەواڵی ئەم شەڕانە بون. بە هاودەردیەوە لە گەڵ یەکێتی، کە لە لایەکەوە عیراق و، لە لایەکەوە ئێران و، لەم لایەشەوە هێزەکانی جودی تێ وروکا بو. دوستانی یەکێتی، تەنانەت خەلکی بێلایەن، خەمی چارەنوسی یەکێتییان بو، ئەترسان بفەوتی. ئێوارەی هەمان ڕۆژ بە بێتەل قسەم لە گەڵ ڕادیو کرد و، هەواڵی سەرکەوتنی یەکێتی و شکانی هێزەکانی چوار براکەی جودم ڕاگەیاند.

مەبەستی سەرەکیم لەو قسانە ڕوخاندنی وورەی هێزەکانی جود و بەرزکردنەوەی وورەی هێزەکانی یەکێتی بو، کە لەو کاتەدا لە دەرەشێر و سەرچاوەی مەلەکان گەمارۆ درا بون.

*

لە بنکەکەی حسک دا چەکێکی دژی فڕۆکە گیرا بو، بەڵام هەندێ پارچەیان لێ دەرهێنا بو. بە پێشمەرگەکانم وت: «بەو شوێنەدا بڕۆن کە ئەوانی پێ دا ڕۆیشتون بەڵکو بیاندۆزنەوە!» پاش نەختێ هاتنەوە پاچ و خاکەناز بەین وتیان چاڵێکمان دۆزیوەتەوە تازە هەڵکەنراوە ڕەنگە لە وێ دا شاردبێتیانەوە. چون چاڵەکە هەڵ بدەنەوە. برایم ڕەبەن، کاتی خۆی پێشمەرگەی یەکێتی بو، لە قرناقاو دانیشت چاوی لێ بو، وتی: «بۆچی ئەو چاڵە هەڵئەدەنەوە؟» وتیان: «بە دوای پارچەی دیمێترۆنەکەدا ئەگەڕێین» برایم وتی: «ئەوە پارچەی دیمێترۆفی تێ دا نیە، بەڵکو لاشەی خوالێخۆشبو حەمە تاتەی تێ دایە!»

منیش هەلم دایە وتم: «خولە لە سویدە»
وتی: «پێری گەیشتەوە و، دوێنێ کوژرا!»

*

ڕۆژی ڕابوردو هەندێ لە سەرکردە و کادرەکانی حشع ڕۆیشت بون. هەندێکیان دەرباز نەبوبون، لەوانە: کەریم ئەحمەد، مەلا ئەحمەدی بانیخێلانی، قادر رشید ناسک.. من لە دولی خانەقا بوم کە ئەمانەیان هێنا. هەندێ قسەم لە گەڵ کردن و مەفرەزەیەکم جیا کردەوە بەریم کردن بۆ ناوزەنگ، بە مەفرەزەکەم وت بو کە بە ڕێزەوە رەفتاریان لە گەڵ بکەن و، بە سەلامەتی بیانگەیێننە لای مامجەلال. گیراوەکانی تر نەیردران بۆ وەرتی. حشع سەرەتا هەمو گیراوەکانیان بە کوژراو دانا. لە دنیادا وایان بلاو کردەوە.

*

ئیتر ئەمو خومان ئامادە بکەین بۆ شکاندنی گەمارۆی مەلبەندی ٤. بلاو بونەوەی هەوالی گیرانی سەرکردایەتی حسک و حشع، ورەی هێزەکانی جودی لە دولی بالیسان و ناوچەکانی تردا دابەزاند. چوینە وەرتی هێزەکامان کردە دوبەش:
- بەشێکیان لە وەرتێوە بە ساوسپوەک دا بو سەرچاوەی مەلەکان.
- بەشێکیان لە دەرگەلەوە بو سەران و گەروان.
لیرە لە باتی خامی سپی، پەرویەکی زەردمان کردە بازوی ڕاست.
هێزەکان بی بەرگری گەیشتنە شوێنەکانی خۆیان. لە گەڵ کەمال خۆشناو و هێزەکەی مەلبەندی ٤ لە سەرچاوەی مەلەکان یەکمان گرتەوە. دولی مەلەکان و پشتی خەتی و پشتی شیخ وەسان کە ئەیروانی بە سەر مەلەکان دا، بە دەس هێزەکانی جودەوە بو، بە تەقە نەیانئەهێشت بە ئاسودەیی ئاو لە کانیەکە بهێنن بۆ خواردنەوە.
ئەو ڕۆژە لەوی ماینەوە بۆ پشودان. بە تەما بوین ڕۆژی دوایی لە بەرە بەیان دا پەلاماریان بدەین. ئەوان لە ئیوارەوە دەستیان کرد بە کشانەوە. ناوچەکەیان بە تەواوی چوڵ کرد. ڕۆژی دوەم کە چوینە بالیسان بە هەزاران کەس و بە سەدان ئوتومبیل لە هەولیر و شوینەکانی ترەوە هات بون بە پیرمانەوە. تا ئەو کاتە ئەمشەڕانی حشع وا چارەڤورس و بیزراون لە ناو خەلک دا، زورایەتی خەلک ڕقیان لیان بو بە «مایەی فیتنە» و «هۆی ئاژاوە» یان ئەزانین.

*

تەفسیری جود بۆ ڕوداوەکان
دوای ئەوەی سەرانی جود و هێزەکانیان کشانەوە بۆ ئیران، سەرکردایەتی جود پیکەوە بەیانیکیان لە سەر ڕوداوەکان دەرکرد و، هەرلایەنەش بە جیا بەیانی خوی دەرکرد.
جود لە بەیانەکەی دا نوسی بوی:
«وكانت ذروة هذه الاعمال الاجرامية، الهجوم الغادر المفاجئ الذى شنته قيادة (اوك) على منطقة پشت آشان لتصفية عدد من مقرات الحزب الشيوعى العراقى والحزب الاشتراكى الكردستانى و الحزب الاشتراكى الكردى (پاسوك)، هذا الهجوم الذى يمر عبر مرحلة جديدة من الانحطاط والتدهور، وارتكاب ابشع المجازر الدموية بدعم مفضوح من النظام الدكتاتورى الدموى...»

حشع لە بەیانەکەی دا نوسی بوی:

«.. وهل يمكن لاى متتبع للاحداث ان لايربط بين سلوك قادة الاتحاد الوطني الكردستاني هذا والمفاوضات التي تجري بينهم وبين السلطة الدكتاتورية وصفقة المساومة والاتفاق مع صدام. ان كل ديماغوغية قادة الاتحاد الوطني وبراعتهم البهلوانية في الدعاية لايمكن ان تغطي تواطئهم المفضوح مع طغمة صدام حسين.. هذا التواطؤ الذي ظهر في تحضيرهم لهذه الحرب بالتعاون مع اجهزة السلطة ومخابراتها و مرتزقتها..»

پدک لە بەیانەکەی دا نوسی بوی:

«ان الطبخة التي ينفذها (اوك) ساهمت في الاعداد لها دوائر الامبريالية العالمية بزعامة الامبريالية الامريكية واقطاب الاشتراكية الدولية (سوسيال ديمكرات)، وكافة الانظمة والقوى الرجعية السوداء من اعداء الشعب العراقي والشعب الكردي..»

حسک لە بەیانەکەی دا نوسی بوی:

«لە رۆژی ١ - ٣ ئاياری ١٩٨٣ دا تاقمی سەوداکاری بە ناو (یەکیتی نیشتمانی کوردستان)، بە گوێرەی نەخشەیەکی گلاوی تاوانکارانە، کە ماوەیەکی زۆرە ئیشی بۆ دەکەن، بە هاوکاری رژێمی فاشی بەغداد و ئاغاکانیان لە ئیمپریالیزم و هەندی سەرکردایەتی سوشیال دیموکراتەکانی رۆژئاوا، وەک ئەلقەیەک لە زنجیرەی نەخشە و پیلانەکانی ئیمپریالیزم و زایۆنیزم و هێزی کۆنەپەرست بۆ تاو تێکردن و گەمارۆدانی بزوتنەوەی رزگاری خوازی لە ناوچەکەدا، هێرشێکی کتوپری نامەردانەیان کردە سەر بارەگاکانی سەرکردایەتی حیزبمان.. و لایەنەکانی تری جود بە کەلک وەرگرتن لە کۆکردنەوەی چەکدارەکانیان بە ئاگاداری و لە بەرچاوی رژێمی فاشی بەغدا و بە پشتیوانی هەندی لایەنی هاوپەیمانیان و بە هاوکاری و هاوهەنگاوی راستەوخۆی هێزە چەکدار و جاشە خۆفرۆشەکانی رژێم، بە نیازی قەلاچۆ کردن و لە ناوبردنی تەواوی سەرکردایەتی حیزبمان و حیزبی شیوعی عیراقی و پاسۆک وە بە مەبەستی ئەنجامدانی ئەرکی پێ سپێراویان و جێ بە جێ کردنی مەرجێکی تر لە مەرجەکانی دەست تێکەلاو کردنە پیلانگێری یەکەیان لە گەل رژێم دا..»

پاسۆک لە بەیانەکەی دا نوسی بوی:

«پەردەیەک لە دواپەردەکانی ئەم شانۆ گالتەجاریە جاش مودێرنەی جەلالی ئەو هەمو کارەسات و مەینەتی و خەیانەت و خۆفرۆشی و کوردکوژی و ریزتێکدەری و گەرەلاوژی و ئالۆزی و ناپاکیەی ئەم چەند سالەی دوایی جەلالیزمی بێ ئابڕوە، کە لە ژێر لافیتەی مانشێتی دیوجامەسایی (یەکیتی نیشتمانفرۆشانی کوردستان)..»

پێش شەری یەکەمی قەندیلیش جود و لایەنەکانی لە شەری پروپاگاندەدا دژی یەکێتی زۆریان لەم قسانە کرد بو. ئەمە، یەکی بو لەو هۆ بنەرەتیانەی، زەمینەی پەلاماردانی سەرکردایەتی جودی ساز کرد.

*

## تضامنی امی، یان قیرەی قازا

حشع لە سەرانسەری دنیادا هێرشێکی پروپاگاندەیان دەس پێ کرد. شتی وایان لە گەل حیزبی بەعسیش نەکرد بو. ئێمە بە هۆی دابڕاویمانەوە لە دنیا زور ئاگاداری ئەم بەزمە نەبوین و گوێمان نەئەدایە. بەلام زۆری نامە و بروسکەکانیان ئەنارد بۆ بارەگاکەی شام و،

رادیوی پارتی هندیکیانی بلاو ئەکردەوە. ئەوە یەکەم جار بو ناوی هندی لەو ریکخراوانە بیبیستین. قاز بە پۆل ئەگەرین. هەرچەن یەکیکیان بقیرینی، بی ئەوەی ئەوانی تر بزانن چی قەوماوە، هەموویان بە یەک دەنگ ئەقیرینن. پۆلە قازەکانی ئەم لا و ئەو لاش کە گوییان لیْ ی بیْ بۆیان ئەسیننەوە. ئەمجارەیان (تضامن) و (اممی) یەکەی حیزبە شیوعیەکان لە گەل حشع دژی یەکیتی دەریان بری، لە قیرەی قازەکان ئەچو. چونکە بی ئەوەی راستی روداوەکان بزانن بۆ پشتیوانی لە حشع کەوتنە ناردنی بروسکەی نارەزایی بۆ یەکیتی و، پەلاماردانی. یەکیتی هیزیکی بی پشتیوان و بی کەس بو، نە پەیوەندی بازرگانی لە گەل ئەو ولاتانە هەبو رایبگری، نە نەوتیشی هەبو تا لییان ببری. دوژمنایەتی یەکیتی، بۆ ئەوان، هیچی تی نەئەچو.

مەکتەبی سیاسی یەکیتی یادداشتیکی دەربارەی رەوتی روداوەکان ئامادە کرد و، ناردی بۆ حیزبە شیوعیەکان، ئامادەیی خۆی دەربری بۆ قبولکردنی لیژنەیەکی بیلایەن لەو حیزبانە کە لە روداوەکان بکۆلیتەوە بۆ ئەوەی لایەنی بەرپرسیار دیاری بکری.

*

## ئیتیهامەکانی حشع

حشع، شەری پشتاشانی کرد بو بە کەرستەی پروپاگاندە دژی یەکیتی. راستیەکەی زۆری ئەو قسانەی ئەیان کرد درۆی دروستکراو بون:

– ئەیانوت: «ئەم هیرشەی یەکیتی لە سەر داوای حکومەتی بەعس و، بە یارمەتی ئەوان و، بۆ رازی کردنی ئەوان بو، وەکو بەشی لە نرخی ریککەوتنی لە گەل یەکیتی»

لەو کاتەدا هیزی سەرەکی لە مەیدانی خەبات دا دژی رژیمی بەعس، هیزەکانی یەکیتی بو، هیزەکانی جود قورسایەیەکی سیاسی - چەکداری ئەوتۆیان نەبو. چالاکی گەورەیان خەریک کردنی هیزەکانی یەکیتی بو، بە ململانی ی دەسەلات و شەری لاپەلاوە. لە کاتی شەرەکانی قەندیل دا، هیزەکانی یەکیتی بەر هیرشی بەعس کەوت، نەک هیزەکانی ئەوان. گەورەترین چەکی دەستی پیشمەرگەکان: ئاربیجی و بیکەیسی بو.

– ئەیانوت: «هەمو دیلەکانیان کوشتوین»

لەو شەرەدا زۆریان کشانەوە بۆ ئیران، زیاتر لە ٥٠ کەسیان گیرا. لە ناو گیراوەکان دا: کەریم ئەحمەد، ئەندامی م س. مەلا ئەحمەدی بانیخیلانی، ئەندامی ک ن و مەکتەبی ئیقلیمی کوردستان. قادری رەشید ناسک، ئەندامی مەکتەبی ئیقلیم. ئەمانە ٣ کەس بون لە سەرانی حشع، دەسبەجی بە ریزەوە بە ری کران بۆ ناوزەنگ. گیراوەکانی تریش نیردرانە وەرتی. ریگایان درا بو بە ئارەزوی خۆیان کۆبونەوەی سیاسی بکەن، تەنانەت کۆبونەوەیەکیان بۆ چلەی کوژراوەکانیان کرد. کەس ریگەی لی نەگرتن. پاش ماوەیەک هەموویان بەر دران.

– ئەیانوت: «ژنەکانیان کوشتوە و، دەستدریژییان کردوتە سەر خیزانەکان»

دوای کشانەوەی سەرانی حسک و حشع و چەکدارەکانیان، هەمو خیزانەکانیان لە ناوچەکەدا بە جی مابون. لە ناو ئەواندا خیزانی فاتیح رەسول و فریشتەی خوشکی دلزار.. بە ریزیکی زۆرەوە رەفتاریان لە گەل کرا. هەر کەس ویستی ناوچەکە بە جی بهیلی ولاخی بۆ دابین کرا و، ئەوەی پیویستی بە پارە بو یارمەتی درا و، ئەوەی مایەوە کەس زۆری لی نەکرد بروا. تەنیا ١ ئافرەتی شیوعی کوژرا بو، ئەویش وەکو دوایی خۆیان لە ژیننامەکەی

دا نوسی بویان، تا دوا فیشەک ئازایانە شەڕی کرد بو.

- ئەیانوت: «بارەگا و مالەکانیان تالان کردوین»

جیگەی داخە، تالان و رواورووت بەشیکە لە نەریتی کۆنی شەڕوشۆڕی کوردەواری. دوای کشانەوەیان هەمو کەلوپەلی بارەگاکانیان: بەلگە و کتیب، چەکی قورس، بەتانی و خەیمەت، ئازوقە، دەرمان.. کەوتە دەس هیزەکانی یەکیتی. هەشع زوری بارەگاکانی خوی تیک دابو. رادیو، کەلوپەلی نەخوشخانەکانیان خراپ کرد بو، پارچەی گرنگی هاوەن و دۆشکاکانیان دەرهینا بو بۆ ئەوەی یەکیتی کەلکیان لی وەرنەگری.

*

زۆری بەلگەکانی حسک، پاسۆک، حشع کەوتە دەس و دەستبەجی نیردران بۆ ناوزەنگ. لە سەر ئەم شەڕە نامیلکەیەکی تایبەتی پشت ئەستور بە بەلگە گیراوەکان بلاو کرایەوە. بەلگەکان لە ئارشیفەکەی مامجەلال دا هەلگیراون.

*

## خۆشناوەتی

خۆشناوەتی بەو ناوچەیە ئەلین کە شوینی ژیانی عەشیرەتی خۆشناوە. خۆشناو پیک هاتوە لە تیرەکانی: میر مەحمەلی، میر وسویی، پشت گەری (پشت گەلی) و، ئەوانیش ئەبن بە چەند بەرەبابەوە. لە لای سەرویەوە لەگەل عەشیرەتەکانی هەروتی و سورچی و، لە لای خوارویەوە لە گەل پیران (بلباس)، لە لای رۆژهەلاتیەوە لە گەل ئاکۆ و، لە لای رۆژئاوایەوە لە گەل گەردی و هەرکی هاوسنورە. لە روی بەریوەبەرایەتیەوە دابەش بوە بە سەر ناحیەکانی مەرکەزی شەقلاوە، کۆیە، هیران، لە پاریزگای هەولیر و، ناحیەی بیتواتە لە پاریزگای سلیمانی.

عەشیرەتی خۆشناو سەرۆکایەتیەکی یەکگرتویان نەبوە. ریچ، لە گەشتەکەی دا بۆ کوردستان سالی ۱۸۲۰، لە دانیشتنیک دا لە گەل پیاوماقولەکانی بابان لە سلیمانی، کە باسی یەکیتی فیدرالی ولاتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکای بۆ کردون، یەکیکیان وتویەتی جۆری بەریوەبەریتییەکەیان لە هی خۆشناو ئەچی. مەبەستی ئەوە بوە کە سەرۆکایەتیەکی یەکگرتویان نەبوە کیشەکان بە لادا بخا، بەلکو چەند کەسی لە سەرۆکەکانی تیرەکانیان ئەنجومەنیان گرتوە بۆ باس و بریاردانی.

سەرۆکەکانی خۆشناو ئازناوی بەگیان هەیە، بەلام عەشیرەتەکەیان پییان ئەلین: میر و میران. میرەکانی خۆشناو رەفتاریان لە گەل جوتیارەکان زۆر خراپ بوە و، سزای قورسیان داون، وەکو دەماودەم ئەگیرنەوە بۆ چاوترساندن و بۆ سزادان، تەمامی گویزیان لە سەر سەری زەلامی زیندو ئاشتوە و، بە پێ ی پەتی بە سەر ستیری (درکە زی) دا گیرەیان پی کردون.

صدیق بەگ، یەکی لە سەرۆکە دەسرۆیشتوەکانی عەشیرەتی خۆشناو، یا وەکو خۆیان پییان ئەوت صدیق میران، لە گەل مەلا مستەفا ناکۆک بو. تاقمی لە کاوانییەکانی، کە خۆشناو و ئەندامی پارتی بون، راسپارد بۆسەیەکیان بۆ دانا کوشتیان. حکومەتی قاسم لە سەر ئەوە فەرمانی گرتنی ئیبراهیم ئەحمەد، کە ئەوسا سکرتیری پارتی بو، دەرکرد. دوای ئەم روداوە ئەم بنەمالەیە ئیتر بە لای حکومەت دا کەوت و، بو بە یەکی لە چەکهەلگرە دلسۆزەکانی حکومەت و، بەشدار بو لە دروستکردنی فورسان صەلاحەدین، مەفرەزە خاصە،

قەوجی خەفیف...

ئەنوەر بەگ، یەکێکی کە لە سەرۆکەکانی خۆشناو، لە سەرەتای دەس پێ کردنی شۆرشی ئەیلول دا بەشداری کرد و، یەکێ لە بنکە سەرەکییەکانی لە بیتواتە دانرا. سەرەنجام لە گەڵ کاربەدەستەکانی بارزانی بە تایبەتی عەلی شەعبان، کە بیتواتەی کرد بو بە بارەگای خۆی، تێکچو، ئەنوەربەگ چوە پاڵ حکومەت و، بو بە یەکێ لە چەکهەڵگرە دڵسۆزەکانی حکومەت و، بەشدار بو لە دروستکردنی فورسان صەلاحەدین، مەفرەزە خاصە، قەوجی خەفیف...

جیا لەمان هەزاران کەس لە روشنبیر و جوتیارانی خۆشناوەتی لە شۆرشی ئەیلول و، لە شورشی حوزەیران دا بەشدار بون.

خۆشناوەتی بە گشتی شاخاویە. گوندەکانیان کەوتۆتە بناری شاخەکانی ماکۆک، شیشار، هەوری، سەفین، پیرمام، بنەباوێ. ئاوەهەوای خۆش و کانی و ئاوی سازگار و دیمەنەکانی جوان و دلگیرن. ئاژەلداری و، کشتوکاڵ: رەز و باخ، دانەویلە، توتن و سەوزە ئەکەن و، دۆشاوی ترێ ی خۆشناوەتی بە ناوبانگە. بزنی مەرەز راتەگرن و، بیتواتە جۆلای هونەرمەند و زانای لی بو، «کر» ی تەنک و ناپابیان دروست ئەکرد.

*

## پەندێک لە خۆشناوەتی

ئافرەتێکی بێوەژن دو هیزە دۆشاو، هیزەیەک دۆشاوی رەش و هیزەیەک دۆشاوی سپی، ئەدا بە کوڵی دا بیبا بۆ فرۆشتن. لە رێگایەکی چۆڵ توشی کابرایەک ئەبێ. کابرا لی ی ئەپرسی: «ژنەکە کۆڵەکەت چیە؟»

ژنەکە ئەڵی: «دۆشاو».

کابرا ئەپرسی: «ئەیفرۆشی؟»

ژنەکە ئەڵی: «بەڵێ». ژنەکە لە دلی خۆی دا ئەڵی ئەگەر لەم نیوەی رێگایە کریارێکم لی پەیدا بێ لیم بکری باشتر نیە لەوەی ئەو رێگا درێژە بپیوم؟

کابرا ئەپرسی: «ئەتوانم تامی بکەم؟»

ژنەکە ئەڵی: «بەڵێ». کۆلەکەی دائەگری. دەمی هیزەیەکیان ئەکاتەوە.

کابرا پەنجەیەکی لی ئەدا و تامی ئەکا. ئینجا ئەڵی: «حەز ئەکەم ئەوی تریش تام بکەم».

ژنەکە ملی هیزە کراوەکەی بە دەستەوە ئەبێ، دەمی هیزەکەی تریش ئەکاتەوە بە دەستەکەی تری ئەیگری. کابراکە دەس ئەکا بە یاری کردن لە گەڵ ژنەکە و دەس ئەبا بۆ ران و ناوگەڵی. ژنەکە ئینجا تێ ئەگا مەبەستی کابرا چی بوە، بەڵام کەوت بوە هەڵوێستێکی دژوارەوە: دەس لە هیزەکان بەر بدا، بۆ ئەوەی خۆی لە کابرا بپارێزی، دۆشاوەکەی ئەرژێ، دەس لە هیزەکان بەر نەدا کابرا سواری ئەبێ. ژنە لە داماوی دا نازانێ کامیان هەڵبژێرێ، ئەڵی: «وای لە قونێ! وای لە دۆشاوێ!»

ئەمە نمونەی «ئیبتیزاز» و «حیز فرسەتی» ە لە زمانی کوردی دا.

*

چوینە بالیسان. دۆلی بالیسان بە ناوی گوندی بالیسانەوە ناو ئەبرا. کەوت بوە نێوان زنجیرەیەک چیاوە: ماکۆک - دەرە شیر - باری خەتی. زنجیرەی هەوری - کلاوقاسم

- بنی هەریر. چیای شیشار. ڕۆژهەلاتی سەر بە سلیمانی و، ڕۆژئاوای سەر بە هەولیر بو. دۆلیکی ئاوەدان و پڕ لە ئاوایی بو. گوندەکانی: شیرە، دەراش، میرگەسەر، خەتی، توقمی، زینی، چیوە، وەری، مەلۆک، بیراوە، کانی بەرد، ئەندیک، ئەنگوز، نواوە، دواوە، زیوە، هەرتەل، هەرمک، سویرە.. لە بناری ئەم شاخانەدا بون. بارەگای مەلبەندی چواری یەکیتی لە بالیسان و، بارەگای لایەنەکانی جود: پارتی لە بالوکاوا و، حشع لە شیخ وەسان و، حسک لە . جادەیەکی قیری گرنگ بە ناوەراستی دۆلەکەدا کرابوەوە ڕانیەی ئەبەست بە خەلیفان، واتە بە جادەی هەولیر - حاجی هۆمەرانەوە.

چەند ڕۆژی لە بالیسان ماینەوە، خەلکیکی زۆر لە هەولیر و سلیمانیەوە هاتن بۆ لامان. مەلبەند چوەوە جیگای خۆی. سەرلەنوی تیپەکانی: سەفین، هەوری، کۆسرەت، دەشتی هەولیرمان ڕیکخستەوە و، هەندی ئالوگۆرمان لە سەرتیپەکان دا کرد. هەندی لە هیزەکانی حسک کشا بونەوە ناوچەکانی نازەنین، سماقولیەکان، دەشتی هەولیر..

*

بەرەو سەفین

دوای چەند ڕۆژی لە گەل تیپەکانی سەفین، کۆسرەت، دەشتی هەولیر، کەرکوک، گەرمیان، سەگرمە.. بە شاخی هەوری دا چوین بۆ نازەنین. نازەنین لە بناری سەفین دایە. کەوتۆتە ئەنیشت هیران کە ناوەندی بەریوەبەرایەتی ناحیەی خۆشناو بو. گوندیکی ئاوەدان و خۆش و کانی زۆری تی دا بو، ڕەز و باخی خۆشیان هەبو. باخەکانیان زۆری هەنار بو. هەناری نازەنین بە ناوبانگە. ترش و شیرین و میخۆشیان هەبو. سرکەی ئاوایان لی دروست ئەکرد. یەکیتی لە ناو خەلکی نازەنین دا ئەندام و لایەنگری زۆری هەبو. کۆمەلەش ڕیکخستنیکی باشی هەبو.

*

مەلای معاشخور

پیش چەند ڕۆژی لە پیکدادانیک دا، لە نیوان مفرەزەیەکی یەکیتی و مفرەزەیەکی جودا، پیشمەرگەیەکی یەکیتی کوژرا بو. تەرمەکەیان برد بوە نازەنین بینیژن. مەلای مزگەوتەکە سەر بە بەعس بو، نەیهیشت بو تەرمی پیشمەرگەکە بینە مزگەوتەکەی و، لە گۆرستانی ئاوایی دا وەکو موسولمان کفن و دفنی بکەن. وت بوی: «ئەمانە کافرن!» پیشمەرگەکە خەلکی ئەو ناوچەیە نەبو، مەلاکەیش نەیناسی بو. تەنها ئەوەندەی زانی بو کە پیشمەرگەی یەکیتی بوە و، یەکیتی یش لەو کاتەدا شکا بو.

مەلاکەم بانگ کرد، هەندی سەرزەنشتم کرد، وتم: «تۆ نویژ بە پارە ئەکەی. هەر نویژی بە دیناری ئەکەیت، ئەگەر معاشەکەت ببڕن، ئیتر مەلایەتی ناکەیت و، ڕەنگە واز لە نویژکردنیش بهینی، کەچی حەقت بە خۆت داوە بی ئەوەی ئیمە بناسی بە کافرمان ئەدابنی ی و، نەهیلی لە گورستانی ئیسلام دا بیانیژن. ئەبی لیرە بڕۆی!» کابرا لە گیانی خۆی ئەترسا و، پەشیمانی لە قسەکانی دەرئەبری، بەلام بایەخم بە قسەکانی نەدا داوام لی کرد ناوچەکە بە جی بهیلی.

*

دوای چەند ڕۆژی بە سەفین دا چوینە دولی سماقولی. خۆم لە سماقولی سەروچاوە و، هیزەکانی تریش لە قەلاسنج، زیارەت، سوسی، گرتک.. بلاو بونەوە و، بارەگایان دانا.

مەفرەزەکانی حەسەک زیاتر لە ۲۰ ئوتوموبیلیان لە دوای خۆیان بە شاردراوەیی بە جێ هێشت بو. ئوتوموبیلەکان ئەوەی هی خەڵک بو دامانەوە بە خاوەنەکانی و، ئەوەی هی حکومەت بو دابەش کران بە سەر تیپەکان دا. لەم میراتیە منیش پیکاپێکی دەبل کابینم پی برا. تیپەکانی هەوری، سەفین، دەشتی هەولێر، کۆسرەت.. مان ناردەوە شوێنەکانی خۆیان.

*

## سماقولیەکان

سماقولی چوار گوندن لە ریزی یەک: سەروچاوە، گرتک، سپنان، گەلی. هەرچواریان کەوت بونە بناری سەفین بەرامبەر شاخی بنەباوی.

«سماقولی» رەنگە کورتکراوەی ئیسماعیل قولی بی. قولی بە تورکی ئازەری واتە: بەندە، کۆیلە. هەتا ئیستایش لە ئیران دا عەلی قولی، حسەین قولی، رەزا قولی زۆرە کە لە جیگای عبدالعلی، عبد الحسین، عبدالرضای عەرەبی بە کاری ئەهێنن و، لە کوردی دا ئەبی بە بەندەی عەلی، بەندەی حسین و بەندەی رەزا. سماقولی واتە بەندەی سمایل.

«گرتک» وەکو لیرە ناوی گوندە لە پشدەر و بالەکایەتی یش هەمان ناو هەیە.

گرتک: گردک، گردۆلکە. گردی بچوک.

سەروچاوە، سەرچاوەیەکی گەورەی ئاو و چەند کانیەکی لی بو. رەز و باخی خۆش و سپیداری راست و بالا بەرزیان هەبو. کوێخا عەزیز و کوێخا عەبدە هەردوکیان لە سەروچاوە دانیشتان دو پیاوی کوردپەروەر و بەریزی ناوچەکە بون. هەرچەندە خزمی یەکتری بون، بەلام لە گەل یەک ناکۆک بون. کوێخا عەبدە بە منالی لە کویە خوێند بوی. خوێندەوار و تیگەیشتو بو.

دولی سماقولی بەستراوە بە دولێکی تروە پی ی ئەلێن دۆلی ئەسحابان لە سەر ئاوی هیزوپ تەواو ئەبی. بە دریژایی دۆلەکە هەزاران گۆری لی یە. وەکو دانیشتوانی ناوچەکە ئەگیرنەوە لەم دۆلەدا شەریکی قورس لە نیوان ئەسحابە و کافرەکان دا بوە. ژمارەیەکی زۆر ئەسحابە کوژراون و، لەو شوینانەدا نیژراون. بەلام هیچ بەلگەیەکی میژویی پشتیوانی لەم قسانە ناکا. رەنگە ئەفسانە بی.

لە ناوی روباری هیزۆپ دا لە ئاستی جەلی کانیەک هەلئەقولی گەراوە. ئاوەکەی گەرمە زۆرجار پیشمەرگە بە زستان خۆیان لی ئەشت.

شوینەواری هەندی قوللە و قەلا لە ئاوەگرد مابو. ئاوەگرد بەشیکە لە زنجیرەی سەفین خەڵک ئەیانوت هی سەردەمی میر محەممەدی میری سۆرانە. ئەبی پیش ئەویش ئاوەگرد قەلای لی بوبی، چونکە یەکی لە لەشکرکیشیەکانی والی بەغداد بۆ سەر میرەکانی بابان لەم دۆلەدا بە گرتنی ئاوەگرد تەواو بوە.

چەند وشەیەکم لەو ناوە بیست وابزانم وشەی تایبەتی خۆشناوەتی بن، چونکە لە شوێنی تر باو نەبون، لەوانە:

ئەوک: ناو قورگ، گەرو.

خوزی: تەرایی ناو گەرو. وەکو: خوزی لە ئەوکمدا هیشک بوە.

کەپک: تەپلە سەری شاخ. وەکو کەپکی خانزاد و کەپکی شیلانە لە سەفین و کەپکی حەمەداغا لە بنی هەریر. رەنگە ئەمیش لە کەپو، وەکو لوتکە لە لوتەوە داتاشرا

بی.
گەف: هەرەشە.
شێلو: لێڵ بونی ئاو.
زیندی: ئەسپی.

*

فشە

کە گەیشتینە خۆشناوەتی، بە گاڵتەوە بە هەندێ لە فەرماندەکانی هێزەکەم وت: «لەم ناوچەیەدا سەید کاکە فشەی کردوە بە باو. ئەوەی فشەی زل و درۆی گەورە بکا دەربارەی ئازایەتی خۆی بە پیاوێکی رەشید ناو دەر ئەکا. ئێوەش تا لەم ناوچەیەداین بە ئارەزوی خۆتان فشە بکەن!»

لە گوندێکی خۆشناوەتی دو کوڕی خزمی نزیکی یەکتری، بەڵام لە گەڵ یەک ناکۆک بون. هەردولایان کوردپەروەر و دۆستی پێشمەرگە بون. ئەمویست ئاشتیان بکەمەوە. گوندەکەیان دوژمنایەتی تێ دا نەنما و، ئیمەش لە یەکگرتنەوەی ئەوان قازانجمان ئەکرد. سامان و روستەمم راسپارد بۆ یەکەونە بەینیانەوە و، خەریکی رێکخستنەوەیان بن و منیش دوا قسەی تێ دا بکەم. هەردولا رەقیبیان ئەنواند و ملیان نەئەدا و، مەرجەکانی یەکتریان قبوڵ نەئەکرد.

یەکێ لە ناوبژیکەرەکان سەیر ئەکا بە قسەی خۆش و ئامۆژگاری کەسیان نایەتە سەر ریگای ئاشتبونەوە و رێککەوتن، لە مزگەوتەکەدا کە ئەوان و، زۆری پێشمەرگە و فەرماندەکانیانی لێ ئەبێ، ئەڵێ: «ئەزانن لە دێ یەکێ گەرمیان لە گەڵ دو کەس زۆر خەریک بوین رێکیان بخەینەوە. کەڵکی نەگرت بۆ ئەوەی ئاژاوەکە بکوژێنمەوە هەردوکیانم گرت. ئەوتم پێ دا کردن و، هەردوکیانم سوتان. ئیتر ئاوایییەکە رزگاری بو لە دەستیان...»

یەکێ لە برادەرەکانم هاتەوە بە پێکەنینەوە وتی: «تۆ بە ئێمەت وت فشە بکەن! مەبەستت ئەوە بو: فشە بۆ خۆمان بکەین یا بۆ خەڵک؟» وتم: «بۆ خەڵک» وتی: «فلان فشە بۆ خۆمان ئەکا!» چیرۆکەکەی بۆ گێڕامەوە کردمان بە پێکەنین.

*

گردەسور و حەمامۆک

لەم ماوەیەدا دو چالاکی پێشمەرگەیی گەورە بو، لە سەرانسەری کوردستان دا دەنگیان دایەوە. یەکێکیان بۆسەیەک بو تیپی ٢١ ی کەرکوک لە حەمامۆکی نزیک کۆیەوە بۆ هێزێکی هاویەشی دەزگا سەرکوتکەرەکانی نایەوە. ١٨ کەسی تێ دا کوژرا. زۆریان تکریتی بون. ئەوی تریان، شەرێک بو لە گردەسور تیپی ٨٦ ی دەشتی هەولێر کردیان. هێزێکی گەورەی جەیش بە پشتیوانی کۆپتەر چو بوە سەریان. هێزەکەی حکومەتیان شکاند و کوشتارێکی زۆریان لێ کردن و لاشەی کوژراوەکان لە شەرگەکەدا بە جێ مان.

*

شەهابە چەپەڵ

لە سەرچاوە، لە ژورەکەی بەرامبەرمان تاقمێ لە پێشمەرگەکان بۆ پاریزگاری ئیمە ئەنوستن. رۆژێکیان یەکێ لە پێشمەرگەکان هات وتی: «هەمومان تورشی گەری بوین»

ورگ و ملی پیشان دام کریشبکی زوری کرد بو نەیەنزانی لە چییەوە توش بون. زیاتر لە ۲۰ پیشمەرگە نەخوشیی پیستیان گرت بو. لەوانە بو بگاتە ئیمەش. پزیشک هات سەیری کردن. چارەی نەخوشییەکەی دوزییەوە. ئەبو هەمو روژی بە ئاوی شلەتێن خویان بشون و، جوری دەرمانی بو نوسین، خویانی پی بهەنون. فانیلە و کراسی تازە لە بەر بکەن. نوینەکانیان بگورن یا هەمو روژی لە بەر خوز هەلی بخەن.. تا چاک ئەبنەوە. لەو هەلومەرجەدا کاریکی گران و، مەسرەفیکی زور بو. هەوالمان نارد بو ریکخراوی هەولیر دەرمان و جلوبەرگ بنیرن.

ویستم هوی بلاو بونەوەی بدوزمەوە. دوای توژینەوە دەرکەوت کوریکیان لە گەلە لە میژە ئەم نەخوشییەی گرتوە و لی ی کزن کردوە قسەی نەکردوە، بە ئەنقەست هەمو روژی جلوبەرگی پیشمەرگەکانی تری لە بەر کردوە و، بە نوینەکانی ئەوان نوستوە. بەم شیوەیە هەمویان گرتویانە. ئەمە جەنابە (موظف صحی) هیزەکەیانە و، ناوی شەهابە و، خەلکی خانەقینە.

رەوشتی ئەم کابرایەم بە لاوە سەیر بو، پیشمەرگە ئەبی خوی لە سەر هاوریکەی بە کوشت بدا، کەچی ئەم نەخوشی تی دا بلاو کرد بونەوە، لە کاتیک دا خوی لە بواری تەندروستی دا کاری ئەکرد. بریارم دا لە پیشمەرگایەتی دەری بکەم، بەلام پیش ئەوە نیوە گیانی بکەم بو ئەوەی جاریکی تر تاوانی وا دوبارە نەکاتەوە. بانگم کرد زورم لومە کرد و، وتم: «لە بەر ئەوەی تو ئەم تاوانەت کردوە، لەوانەیە خەلکی تریش توش بکەیت، بریارمان داوە بتسوتینین!» بە تورەییەوە بە پیشمەرگەکانم وت: «بیبەن بیسوتینن!»

کابرا تا ماوەیەک وایئەزانی بە راستی ئەیسوتینن. شەهاب لە پیشمەرگایەتی دەرکرا. بەلام مانگی زیاتری پی چو تا پیشمەرگە نەخوشەکان چاک بونەوە.

*

مەفرەزەکانی جود، بە تایبەتی هی حسیک، کەوتنە هەلوەرین: هەندیکیان هاتنە ناو یەکیتییەوە، هەندیکیان چونە پال رژیم و بون بە جاش و، هەندیکیشیان لە بەرانەتیەوە چون بو برادوست و بارزان. چەکداری جود لە ناوچەکەدا نەما. دوای چەند حەفتەیەک منیش ئیتر ئیشم لە سماقولیەکان تەواو بو، گەرامەوە دۆلی بالیسان.

*

## مەلای خەتی

ماوەیەک لە قوتابخانەکەی گوندی «خەتی» دابەزیم. خەلکی خەتی و، دانیشتوانی ناوچەکە بە گشتی لە گەل ئیمە دوست و هاوکار بون. مەلای خەتی خەلکی ئەم گوندە بوە. لە ناو میژوی کوردا تاوانی خیانەتی گەورە لە نەتەوە و نیشتمان ئەدریتە پال دو مەلا: ئیدریسی بتلیسی و مەلای خەتی.

دوای شەری چالدیران، بەشی زوری سەرزەمینی کوردستان و، میرایەتیەکانی کورد کەوتە ژیر دەستی عوسمانییەوە، هەندی کەس تاوانی ئەمە ئەخەنە ملی مەلا ئیدریس. بە پی ی لیکولینەوەکانی من: مەلا ئیدریس میژونوسیکی گەورە و ئاگادار و، دیپلوماتیکی زانا و زیرەک و، کوردیکی دلسوز بوە. ئەوانەی ئەم تاوانەی بە پال ئەدەن هیچ بەلگەیەکی میژوییان بە دەستەوە نیە. ئەوی ئوبالی داگیرکردنی کوردستانی لە مل دایە دوبەرەکی ناو میرەکانی کورد بوە، نەک ئیدریسی بتلیسی.

به گوێرەی بەندوباوی ناو خەڵک و، گێڕانەوەی هەندێ لە مێژوونووسەکانی کورد، وەکو: حوزنی موکریانی لە «میرانی سۆران» و عەلادین سەجادی لە «شۆرشەکانی کورد» ا، مەلا محەممەدی خەتی، یەکێ لە مەلا گەورەکانی سەردەمی خۆی و، موفتی میرایەتی سۆران بوو. کە لەشکری تورک هێرشی هێناوەتە سەر میر محەممەدی میری سۆران، مەلا محەممەد فتوای داوە: «بەرەنگاریی لەشکری خەلیفەی ئیسلام جائیز نیە و، هەرکەسی شەری لە گەڵ بکا تەلاقی ئەکەوێ.» لە ئەنجامی ئەم فتوایەدا لەشکرەکەی میری سۆران بڵاوەیان لێ کردوە، میری سۆران خۆی داوە بە دەست لەشکری تورکەوە. بە گێڕاوی رەوانەی ئەستەمولیان کرد و، هەرگیز نەگەرایەوە و، هەواڵی نەبو. میرایەتی سۆران کۆتایی هات.

*

## مەلیخا

حوزنی لە کتێبەکەی دا: «میرانی سۆران» باسی کتێبێک ئەکا، وەکو سەرچاوەی سەرەکی بۆ گێڕانەوەی رووداوەکانی سەردەمی میر محەممەد بە ناوی «مەلیخا»، کە میرزا محەممەدی وەقائیع نیگار بە شیعر هەڵی بەستوە. جەلیلی جەلیلیش لە پێشەکی کتێبەکەی دا دەربارەی «میرایەتییە کوردیەکانی ناو ئیمپراتۆریی عوسمانی» باسی دەستنووسێکی ئەم کتێبە ئەکا، کە لەشکری روسیای قەیسەری لە شەڕەکانی یەکەمین جەنگی جیهانی دا لە داگیرکردنی رەواندزدا دەستی کەوتوە و، لە یەکێ لە کتێبخانەکانی یەکیتی سۆڤیەتی جاران دا بوە. لە زۆر مەلا و خوێندەواری ناوچەکەم پرسی و، چەندی سۆراخم کرد، نە لە لای کەس هەبو و، نە هیچیان لێ ئەزانی.

حوزنی وا باس ئەکا میری سۆران کانی ئاسنی لە روستی دۆزیوەتەوە، ئاسنی لەوێ دەرهێناوە بۆ دارشتنی چەکەکانی. رەنگە ئەمە وابێ، بەلام دانیشتوانی ناوچەکە، وەکو لە زمانی باووباپیرانیانەوە ئەیانگێرایەوە: هەرچی پارچە ئاسنی شکاو و ناڵ و، هەوجەزش لە ناوچەکەدا هەبوە کۆیان کردۆتەوە، لولەی تۆپەکانیان لەوە دروست کردوە نەک لە کانە ئاسنی روستی.

*

## حەسەن مارگر

یەکێ لەو پێشمەرگانەی شاهۆ هەڵی بژارد بون، لە دەستەکەی من بێ، کورێکی گەرمیانی وریا بو، ناوی حەسەن بو. پێشمەرگەکان ناویان نابو: حەسەن مارگر. چونکە مار و دووپشکی ئەگرت و، ترسی پێشمەرگەکانیشی لە گرتنیان ئەشکاند. حەسەن شارەزاییەکی زۆری پەیدا کرد بو لە مار و دووپشک و جۆرەکانیان دا.

ئەوەندەی من گەراوم لە سەرانسەری کوردستان دا مار و دووپشک هەیە. مارەکان، هەندێکیان زەهراوین و هەندێکیان زەهراوی نین، بە گشتی گەورە نین، بە دەگمەن هەیە لە مەترێک درێژتر بێ. ئەژدیها، کە لە هەندێ شوێن پێ ی ئەڵێن حەزیا یا شامار، لە فۆلکلۆردا باسی ئەکرێ، دەعبایەکی ئەفسانەییە، بە راستی نەبوە، یا نەماوە.

لەو هەمو ساڵانەدا، ئەوەندەی من بیستومە، تەنیا دو جار رێکەوتی کردوە مار بە پێشمەرگەیەوە داوە. ئەویش لە تاریکایی شەودا نەیان دی بو پێیان پێ دا نابو.

مار، چەند جۆری هەیە، وەکو: تیرە مار، رەشمار، زەردە مار، سجە مار، سفرە

مار، سیسە مار، شلە مار، کوێرە مار، کولە وەیباب، کولە کوێر.. هەندی لەمانە لە هەندی شوێن هەن و لە هەندی شوێنی تر نین.

تولە مار، بەچکەی مارە.

مار لە زستان دا سڕ ئەبێ، لە بەهاردا کاژ فڕێ ئەدا، ئەگەزێ یا پێوە ئەدا، کە ماندو یا تینوی ئەبێ ئەیشکێنێ، بۆ ڕۆیشتن ئەکشێ و، بۆ پشودان پەپکە ئەخوا، ئەگەر ئازاری ئەدری بە زوری بێ وەزن ئەبێ.

دوپشکیش چەند جوری گەورە و ناوەنجی و پچوک و، زەرد و رەش و کاڵی هەیە. جورەکانی و ناوەکانی بە گوێرەی ناوچەکان ئەگوڕێن: چزەپیالە، کلاشدوم، سۆلسۆلە، جەرراحە، دمارەکوڵ، دوپشکە ڕەشە.. هی هەندی ناوچە کوشندەن، بە هەر کەسێکەوە بدەن بە دەگمەن لە مردن دەرباز ئەبێ.

حەسەن زۆر ڕۆژ ماوەیەکی باش خۆی ون ئەکرد، بە دوای مار و دوپشک دا ناو کەلەکی بەرد و چەم و پەرژین و کون و کەلەبەر ئەگەڕا.

کە ماری ئەدۆزییەوە بزەقەتەی ملی ئەگرت و، بەنێک یا گوریسێکی بەنی لە دانی گیر ئەکرد. دانی هەڵ ئەکێشا ئەوسا یاری پێ ئەکرد. زۆر جار بەری ئەدان.

کە دوپشکی ئەدۆزییەوە چیلکەیەکی ئەخستە سەر پشتی. دوپشکەکە کلکی کلاقە ئەکرد بە چیلکەکەوە بدا، گری ی پێش چزوەکەی ئەگرت و، بە شتێکی ڕەق نوکی چزوەکەی، کە زۆر کورت و لە مو باریکترە، ئەشکاند. ئەوسا ئەی خستە سەر دەستی یاری پێ ئەکرد.»

تا چوینە بەری مەرگە حەسەن لە گەڵمان بو، ئیتر پێویستیمان پێ ی نەما، ڕێگەم دا بگەڕێتەوە ناوچەکەی خۆیان، لە چالاکییەکی پێشمەرگەدا کوژرا.

*

چەند کەسی لە کادرەکانی ناوچەی هەولێر لە ناو خۆیان دا کەوتبونە قسە و قسەلوک کە گوایا من سلێمانچیەتی ئەکەم، هەرچی خەڵکی سلێمانی نەبێ ڕێگای نادەم کاری بەرپرسیارێتی و باوەڕی پێ ناکەم.

ڕۆژێک لە بالیسان کۆبونەوەیەکم پێ کردن بۆ ئەوەی ئەم قسەیەیان لە گەڵ باس بکەم، بە ژمارە ئەندامانی م س، ک س، مەسئولی مەڵبەندەکان، ئەندامانی مەڵبەندەکان، لێپرسراوی ڕێکخراوەکانی کومەڵە، سەرتیپەکانی پێشمەرگەم.. بۆ باس کردن و یەک بە یەک شوێنی لە دایک بون و گەورەبونیانم بۆ ڕون کردنەوە. دەرکەوت ئەم قسەیە هیچ بناغەیەکی نەبو. ئینجا پێم وتن: «ئەم بیرکردنەوەیەی ئێوە سەیرە. ئێوە خۆتان بە ئینتەرناسیونالیست دائەنێن. هەندێکتان خۆی بە کۆزموپۆلیتیست ئەزانی. ئەبو بە لاتانەوە گرنگ نەبێ مەسئول خەڵکی کوێ یە؟ بەڵکو چەندە خزمەتی شۆڕش و کومەڵە و یەکێتی ئەکا» زۆرجار مرۆڤ چەندە ئیدیعای گەورە بێ، بەڵام دنیا هەر لە کونی قازانجەکانی خۆیەوە ئەبینی.

*

بارەگاکەی من کە لە قوتابخانەکەی خەتی دا بو زۆر قەرەباڵغ بو. جەنگی عێراق - ئێران لە ناوچەی حاجی ئومەران زۆر گەرم بو. هەمو ڕۆژێ چەند جارێ پۆلە فڕۆکە و هالیکۆپتەری عێراق بە سەر خۆشناوەتی دا ئەچون بۆ مەیدانی شەڕ. ترسام ڕۆژێک ئێمەش

پردومان بکەن، گویزامانەوە سەر «کانی بەرد». شوینەکەی قایم و، بو خوپاراستن پیچ و پەنا و، تاشەبەردی زوری لی بو.

*

رقی ئافرەت

خولی یەکەمی شەری جود تەواو بو. ئەو کاتە من ناوم کەوت بوە ناوان. دوستەکانی جود بە خراپ و، دوستەکانی یەکیتی بە چاک تیبان ئەروانیم.

روژیکیان پوله فروکەی عیراق وەکو شارە زەردەوالەی وروژاو ئەفرین بەرەو ناوچەی حاجی ئومەران. ئیمە لە «کانی بەرد» دانیشت بوین، وەکو روژەکانی تر خەریکی کاری روژانەی پیشمەرگە بوم. عەلی پچکول لە خەتی بو، نامەیەکی بو ناردم نوسی بوی: دو کچی ناسیاوم لە سلیمانیەوە هاتون ئەیانەوی بین بو سەردانت، ئەگەر ماوەت هەبی بیانبینی. زورم پی خوش بو. حەزم ئەکرد نەختی کەشی کوری دانیشتنەکانم، کە بە زوری لە گەل پیشمەرگە و لادیی بو، بگورم. وەلامم دایەوە بیان نیری.

کچەکان گەیشتن بە گەرمی پیشوازیم کردن و بە خیر هاتنم کردن. پیکەوە دانیشتین. پیشمەرگەکان ئاو و چایان بو هینان. پرسیارم لی کردن: ناویان چیە و، خەلکی کوین و، ئیشیان چیە؟ هەردوکیان فەرمانبەر بون. یەکیکیان خەلکی لای کەرکوک و، ئەوی تریان خەلکی لای سلیمانی بو. کەرکوکیەکەیان جلوبەرگی ئاسایی لە بەردا بو، شوی کرد بو بەلام لە سەر جیاوازی بیروباوەری سیاسی لە گەل میردەکەی ناکوک بو، ئەم سەر بە جولانەوەی کورد و میردەکەی سەر بە حکومەت بو. سلیمانیەکەیان ئافرەتیکی بالابەرز و جلیکی کوردی رازاوەی تەنکی لە بەر کرد بو، هیشتا شوی نەکرد بو. بە دەم و دوانیان دا وریا و زیرەک و تیگەیشتو بون..

وتم: «هیچ کاریکی تایبەتیتان هەیە بە من بکری بوتان بکەم؟»

وتیان: «هیچ کاریکمان نیە. هاتوین لە نزیکەوە تەعاروف و ئەگەر کاتت هەبی هەندی موناقەشەت لە گەل بکەین؟»

وتم: «فەرموا بە ئارەزوی خوتان موناقەشە بکەن»

سلیمانیەکەیان پرسی: «باوەرت بە خوا هەیە؟»

بە لامەوە سەیر بو موناقەشەکانی بەم پرسیارە دەس پی کرد، بەلام تیگەیشتم خوی بە چەپیکی ئازادیخواز و سەربەست و کراوە ئەزانی. وتم: «ئەوە شتیکی تایبەتیە، پەیوەندی بە ویژدانی مروڤ خویەوە هەیە»

وتی: «نەء! تو سکرتیری ریکخراویکی مارکسیت ئەبی رەئی ئاشکرات هەبی!»

وتم: «ئەوە شتیکی تایبەتیە، کار لە باوەری سیاسی ناکا. لە ناو ئیمەدا زور کەس هەن باوەری قولیان بە خوا هەیە و، لە هەمان کات دا خویشیان بە مارکسی ئەزانن»

وتی: «ئەوە بە یەکەوە ناگونجین، یەکی کە مارکسی بی ئەبی مادی بی..» لە سەر ئەمە رویشت و، بەلگە و بیانوی مارکسیە کلاسیەکە توندرەوەکانی دوبارە ئەکردەوە، زوری لە گەل خەریک بوم تا باسەکەم پی گوری.

هاتە سەر کیشەی ژن، پرسی: «رەئیت بەرامبەر بە ژن چیە؟»

کردم بە گالتە لە گەلی، وتم: «ژن نیوەی کومەلە و دایکی نیوەکەی تریشە»

وتی: «مەبەستم ئەوەیە: رەئیت بەرامبەر یەکسانی ژن و پیاو چیە؟»

وتم: «لە گۆڤاری کۆمەڵەدا وتارێکی درێژ لە سەر کێشەی ئافرەت بڵاو کراوەتەوە من نوسیومە، لەوێ دا باسی یەکسانی ژن و پیاوم کردوە.»

وتی: «ئەی بۆ ڕێگەتان نەداوە بە ژن، وەکو پیاو، لە شۆرشەکەدا بەشدار بن. ئەوانەیش کە هاتون لە بەر ئەوەی ڕێگای کارکردنیان نەدراوەتێ وازیان هێناوە؟»

وتم: «ئێمە بە هۆی جەنگی پارتیزانییەوە خزاوینەتە ناوچە شاخاوییە سەختەکانەوە، ئەو ناوچانەیش بە هۆی دابڕانیانەوە لە پێشکەوتنی شار و شارستانی لە ڕیزی ناوچە هەرە دواکەوتوەکانی دنیادان. ناتوانین بە پەلە و بە زۆر بیروبۆچون و ئارەزوەکانی خۆمان بخەینە جێگەی قانونەکانی ئەوان.. ناچارین ڕێزی نەریتە باوەکانیان بگرین، ئەگینا داتەپەڕین و دەرمان ئەکەن.»

زۆر بابەتی جۆراوجۆری فەلسەفی، کۆمەڵایەتی، سیاسی، فەرهەنگی.. باس کران، باسەکان سەرەتایان هەبو کۆتاییان نەبو. لە زۆری دا بیروڕامان جیاواز بو، بەڵام بۆ هەردوکمان خۆش بون: بۆ من چونکە ماوەیەک بو ماندوی شەڕوشۆڕێکی بێهودە بوم و، زۆر لە مێژ بو گوێم لەو جۆرە باسانە نەبوبو. بۆ ئەو، چونکە ئەیتوانی بە ئازادی بیروڕاکانی خۆی بۆ یەکێ دەرببڕێ کە بە جیددی گوێ ی لێ ئەگرێ و، موناقەشەی لە گەڵ ئەکا.

نزیک عەسر کەوتینەوە. گفتوگۆکانمان ئەوەندەیان لق و پۆپ لێ بوبوەوە، ناسیاوییەکەی ئەو تەنیا چەند سەعاتەمانی وەها قوڵ کرد بو، ئەتوت زۆر لە مێژە یەکتری ئەناسین، بۆیە وەها بە ڕاشکاوی ئەدواین. ویستم بە ئوتومۆبێل ڕەوانەیان بکەم بۆ خەتی بۆ لای عەقلی یا بۆ ئەو شوێنەی خۆیان ئەیانەوێ. ناردم بە شوێن شوفێرەکەدا و، وتم: «ئەتانەوێ بۆ کوێ برۆن؟»

لە ناو چەند تاشە بەردێکی قوچ دا لە سەر لپادێک دانیشت بوین، پشتمان دا بو بە ڕیزە چیای دەرە شیر - باری خەتێ و، دۆڵی بالیسان و ڕیزە چیای هەوری - کلاو قاسم - زینەتیر بەرامبەرمان بو. شوێنێکی هەتا بڵێ خۆش بۆ سەیرانی خەڵکی شار و، ڕۆمانسی بۆ دلدار و دڵخواز و، قایم بۆ پێشمەرگە..

کچی تایەن پڕ بە دڵ حەزی ئەکرد بمێنێتەوە درێژە بە باسەکانی بدا، منیش پڕ بە دڵ، حەزم ئەکرد دڵی ڕابگرم، بەڵام نەمئەتوانی چونکە لە قسەو باسی ناو پێشمەرگە ئەترسام، ئەو قسە و باسانەی ئەو نرخی فلسێکی بۆ دانەئەنان و، لای وابو ئەبێ لێ ی باخی بین.

پێشمەرگەکە ئوتومۆبیلەکەی هێنا. داوام لێ کردن سوار بن لە گەڵی. کچە بە ڕوگرژی و بە دڵشکاوی هەستا ڕۆیشت. ترمەز لە دڵی خۆی دا قینێکی قوڵی لێ هەڵگرت بوم، ئەوەندە دڵگران بو بو: لە بەڵێنەکەی پەشیمان بوەوە کە دابوی لە نەخۆشخانەی ناوەندی کار بکا. لە ڕێکخستن وازی هێنا و، لە هەر جێیەکی بۆی بکرایە منی تاوانبار ئەکرد بە دوژمنایەتی ژن و، ئەیوت: «باوەڕی بە یەکسانی ژن و پیاو نیە و، ڕقی لە ژنە!»

لە کاتی ڕاگرتنی شەڕی بەعس - یەکێتی دا سالی ٨٤ هاوسەرەکەم لە نەخۆشخانە بۆ عەملیاتی لە دایکبونی نما کەوت بو. ئەم خانمە لە نەخۆشخانە چو بو بۆ لای، لێ ی پرسی بو: «تۆ ژنی فلانی؟» وت بوی: «بەڵێ» لێ ی پرسی بو: «چۆن ئەتوانی لە گەڵی هەڵ بکەی؟» وت بوی: «بۆچی؟» وت بوی: «ڕقی لە ژنە!» ئەم بەندوباوە تا چەند ساڵ بە

دوامەوە بو، گەیشت بووە دەم چەند ئافرەتێکی ناسیاوم. جارێکیان لە میانەی قسەدا یەکێکیان لی ی پرسیم: «بۆچی رقت لە ژنە؟»

وتم: «یەکی لەو شتانەی لە ژیان دا حەزم لی یەتی ژنە! کی ئەمەی پی وتوی؟»

وتی: «وام بیستوە»

سەرلەنوی چیروکەکەم هاتەوە بیر. بیگومان من ئەم ئەزانی ئەنجامەکەی وەها ئەشکێتەوە و ئەو جورە بە ری کردنە بە «ئیهانە» دائەنی، ئەگینا بە جوریکی وەها رەفتارم لە گەل ئەکرد بە دلی خوش و خەیالی ئاسودەوە بگەریتەوە.

*

ئاژاوەی ناو ئەدیبان

سالی ۱۹٦۹ بە بریاریکی م ق ث ریگەی دامەزراندنی یەکیتیی نوسەرانی کورد درا. کاکە مەم بوتانی و تاقمی لە نوسەرانی کورد داوای ئیجازەیان کرد و، ئیجازەیان پی دان. زوری نەخایاند بەهانی ئازار خویندرایەوە، ئەویش خرایە ناو دەسکەوتەکانی ئازارەوە. ئەم یەکیتیە، ئەگەرچی لە چاو تەمەنی دا بەرهەمی ئەدەبیی زوری لە دوای خوی بە جی نەهیشتوە، بەلام لە روی سیاسیەوە دوای ئاشبەتالیش خوی نەدوراند و، نەچوە ژیر باری زور و گوشاری بەعسەوە.

بەعس کوری زانیاری کورد کە جاران دەزگایەکی سەربەخو بو، بەهانی ئازاریش سەلماند بوی، کرد بو بە بەشی لە «المجمع العلمی العراقی» بە ناوی «الهیئه الکردیه» وە، ئەیویست «یەکیتی نوسەرانی کورد» یش هەلوەشینیتەوە و بیکا بە بەشی لە «اتحاد الادباء والکتاب». نوسەرانی کورد لە ناو خویان دا ناکوک بون لە سەر ئەوەی بچنە ناو یەکیتیە عیراقیەکەوە یا موقاطەعەی بکەن. (عبدالامیر معله) چەند کوبونەوەیەکی لە گەل کرد بون. عەبدولئەمیر ئەوسا راویژکاری روژنامەوانی صەددام و نوسەری چیرۆکی «الایام الطویله» بو. هەندی لە نوسەرانی پەیوەندیدار رشی ئیمەیان پرسی. ئیمەش بومان نوسین چون نوسەرانی گەلەکەمان لە مەیدانی پیشمەرگەیی و سیاسی دا باوەریان بە ئیمە هەیە، ئاوەها ئیمەش لە مەیدانی نوسین و ئەدەبی دا باوەرمان بە نوسەرانی گەلەکەمان هەیە، بریاردان لەو بارەیەوە بو خویان بە جی ئەهیلین و، هەر بریاری بدەن، ئیمە ریزی بریارەکەیان ئەگرین و، بە هی خومانی ئەزانین.

ئەمان موقاطەعەیان بکردایە، یا بەشدار بونایە، بەعس ریکخراوەکەی هەر هەلئەوەشاندنەوە. بو ئەوەی هەندی دەسکەوتی قانونی بە دەس بهینن کەوتنە گفتوگو لە گەل (عبدالامیر معله) و وەزیری ئیعلام (شفیق الکمالی). شەفیق کەمالی بەلینی هەندی دەسکەوتی تایبەتی پی دابون. لە سەر ئەوە زوری نوسەران رەشیان وا بو بەشداری ریکخراوە عیراقیەکە بن.

ناکوکی دورودریژی ناو جولانەوەی کورد و، ناکوکی شەخسی، لە ناو نوسەرانیش دا رەنگی دابوەوە، نوسەران لە ناو خویان دا ناکوک بون، تەنانەت تاوانی نارەوایان ئەدایە پال یەکتری. کابرایەکی کونە شیوعی بە ناوی حەمە سەعید حەسەن، کە خوی بە چەپیکی توندرەو و، بە نوسەر و شاعیر و رەخنەگر دائەنا، نامیلکەیەکی نوسی بو دابوی بە دەزگای راگەیاندنی یەکیتی بوی چاپ بکەن. لە نامیلکەکەی دا بە زمانی سەرسەری سەرجادە دوا بو، جنیوی پیسی بە نوسەر و ئەدیبەکانی کورد دابو، ئیتیهامی کرد بون بە ترسنوکی،

جاسوسی، جاشایەتی بەعس.. نامیلکەکە بڵاو بووەوە، بەڵام دەنگی نارەزایی لە هەموو تەوێیەکانەوە بەرز بووەوە. چەندین نوێنەر و نامەیان نارد و، ئەوەی ئەوانی زۆر نارەحەت کرد بوو، ئەوە بوو: نامیلکەکە، دەزگای راگەیاندنی یەکێتی چاپ و بڵاوی کرد بووەوە.

لە مەودا هەڵەیەکی منی تێ دابوو، لە کاتی چاپ کردنی دا ئەرسەلان بە بیستەڵ لە منی پرسی حەمە سەعید نامیلکەیەکی هێناوە بۆی چاپ بکەین، بیکەین یا نە؟ منیش بێ ئەوەی بزانم یا بپرسم ناوەروکەکەی چی تێ دایە، یا ئەرسەلان بۆم باس بکا، بە گوێرەی داهێنکردنی سەرەتای «نان و ئازادی» بۆ نوسەرانی کورد وتم بڵاوی بکەنەوە! تومەز ئەرسەلان خۆیشی ئەو جۆرە نوسینانەی پێ خۆش بو. لە سەرەتاوە ئەگەر ئەرسەلان ئەم هەڵەیەی بە من نەکردایە، ئەم بەزمەش دروست نەئەبو.

من کەوت بومە هەڵوێستێکی دژوارەوە: لە لایەک هەمو نوسەرەکان لە من زیز بون و گلەییان لێ ئەکردم، چونکە بە ئاگاداری من بڵاو کرا بووەوە. لە لایەکی ترەوە جنێو و تۆمەتەکانی حەمەسەعید راست نەبون و، ئەگەر لە دەزگای راگەیاندنی یەکێتیەوە بڵاوی نەکردایەتەوە هیچ نرخێکی نەئەبو. لەم بابەتە نوسەرانە هەبون، کە بەعس یان حەشع رایان ئەسپاردن بۆ پەلاماردانی نوسەرانی تر، بەڵام کەس بایەخی بە نوسینەکانی ئەوان نەئەدا، هی ئەم چونکە لە دەزگایەکی شۆرشەوە دەرچو بو، حسابێکی تری بۆ ئەکرا.

نوسەرەکان خۆیان نامیلکەیەکیان لە وەلامی نامیلکەکەی حەمە سەعیدا نوسی و، داوایان لە من کرد: هەم پێشەکی بۆ بنوسم، هەم لە دەزگای راگەیاندنی یەکێتی بۆیان چاپ بکەن. داواکەیانم جێبەجێ کرد. حەمە سەعید زیاتر خۆی قرشقی کرد و، ئەیویست خۆی بە «قوربانیی ئازادی بیر» پیشان بدا. بە درۆ وە خۆی لە هەموان گورگە کرد و کەوتە جنێودانی «مقفی و موزون». بەم کاسپیە نزمە لە رێگای حشعەوە خۆی گەیاندە سوید.

*

## شێرکۆ بێکەس

دوای ئاشبەتاڵ شێرکۆ بێکەس دور خرا بووەوە بۆ خواروی عێراق، لە ئاوایییەکی دواکەوتوی گەرم لە سەر روباری فورات دایان نابو. ئەم دورخستنەوەیە شێرکۆی لە شیعر نەخست بو. لەو ماوەیەدا چەند شیعرێکی سیاسی درێژی دانا بو. لەوانەی گەیشت بونە ئێمە: «کوچ» و «برایموک». لە ئاوزەنگ بە رێکوپێکی گۆڤار و رۆژنامە کوردی و عەرەبییەکان و، هەمو کتێبەکانی دەرئەچون پێمان ئەگەیشت.

«کۆچ» شیعرێکی سیاسی بو، بە زمانێکی ئەدەبی چیرۆکی ئاشبەتاڵ و چونی بە کۆمەڵی بۆ ئێران ئەگێرایەوە. پاش ماوەیەک دەستنوسی «داستانی هەڵۆ سورەکانی قەندیل» مان پێ گەیشت. ئەمە شیعرێکی سیاسی بو چیروکی دەس پێ کردنەوەی شۆرشی ئەگێرایەوە. شیعرەکانی بە لای منەوە زۆر بەرز و کاریگەر و، پر بون لە دیمەنی جوان و، ئاوازی خۆش. جا نازانم هۆی ئەمە ئەگەرایەوە بۆ ئەوەی کە باسی قۆناغێکی خەباتی کوردی ئەکرد خۆمی تێ دا بەشدار بوم، یان هەر بە راستی شیعرەکان بە لای رەخنەوانێکی بێلایەنیشەوە وەها بو. لە سەر ئەم شیعرە پارتی بریاری کوشتنی شێرکۆیان دا.

لە مێژ بو لە گەڵ شێرکۆ دوریەدور ناسیاریمان هەبو، ئەگەرچی لە بیروباوەری سیاسی دا جیاواز بوین، بەڵام من هەمیشە بە رێزێکی زورەوە لە شیعرەکانی شێرکۆم

ئەروانی، ئەو کاتەی لە «روانگە» دا بانگی نوێ کردنەوەی ئەدەبی کوردییمان دا، ریزی لە لای من زیاتر پەیدا کرد. ئەمجارە ئیتر لە هەلویستی سیاسی دا لە یەکتری نزیک کەوتینەوە. نامەیەکم بۆ نارد و، ئەویش وەلامی دامەوە. ئیتر ئالوگۆری نامەمان بێ پسانەوە بەردەوام بو. سەیرم کرد شێرکۆ بە تەنیا شاعیر نیە، بەلکو روشنبیریکی گەورەی کوردە. خاوەنی بیروڕای سیاسی پێگەیشتو و کاملە. ئەوەندەی تر لە لای من خۆشەویست بو. زۆ زۆ شیعری ئەنارد لە ئیستگە بلاو ئەکرایەوە. شیعرەکانی لە ناوەروک و شێوەدا تازە بون و، بابەتیکی نوێ و داهێنراو بو لە شیعری سیاسی کوردی دا. بۆ پێشمەرگە و بزواندنی گیانی شورشگێرانەیش لە هەناوی مرۆڤی کوردا کاریکی بێ وینە بو.

تا لە ناوزەنگ بوم نەمتوانی روبەرو بیبینم. کە چومە دولی بالیسان چەند جاری لە گەل رەوف بیگەرد، مستەفا سالح کەریم، تایەر سالح سەعید بە نهێنی هاتن و، پێکەوە دائەنیشتین. قسە و باسی جوراوجوری سیاسی و ئەدەبیمان ئەکرد.

*

حەسنۆ لە چاسوسان

لە دریژەی شەرەکانی حەدکا - تیران دا هێزیکی پارتی لە چلەی زستان دا بە سەرکردایەتی حەسنۆ میرخان ژاژلی و، بە یارمەتی تیران لە ئالوەتانەوە هەلکشا بون بۆ چیاکانی پشتی دولە تو نزیک لوتکەی چاسوسان، بەرامبەر ناوزەنگ. بەفریکی ئەستور سەرتاپای شاخەکەی لوس کرد بو، ئەوان بۆ ئەوەی سەرمایان نەبی چادرەکانیان لە بەفر گرت بو، بۆ ئەوەی ون نەبن لە ریگاکەی بناری شاخەکەوە تا چادرەکانیان پەتیان رایەل کرد بو، بە پەتەکەدا ریگاکەیان ئەدۆزیەوە و، بە کزلٚ خواردەمەنی، سوتەمەنی، تەقەمەنی و کەلوپەلی تریان سەرئەخست. چارویار خانوەکانی ناوزەنگیان ئەدایە بەر هاوەن. ناوزەنگ ئیتر لە مەترسی کەوتن دا بو. ئەبو مشوری جیگایەکی تر بخوین بۆ بارەگای دەزگا سەرکردەییەکان، بیرمان لە ناوچەی باوزی کرد بوەوە.

پیش راگویزان ناوچەکە چەندین گرندی وەکو: باوزی، سەرشیو، رازان، ئەشکەنە، قندول، چەکوان، دەوژان، بەرکیشان، بالیلان، گەناوی تی دا بو. شوینیکی شاخاوی خۆش، پر دار و دەوەن و، کانی و ئاو، پشتی دابو بە چیای چاوناسکەوە، کە بەشی بو لە زنجیرەی چیای هۆمل، زەردکە، بولفت... تیپی جوتیاران سەر لەنوی ناوچەکەیان ئاوەدان کردەوە. فەرماندەی تیپی جوتیاران: محەمەد رازانی و، فەرماندەی کەرتەکانی لە کویستانەکانی بۆری، بیوەکە، قزرغان، سیرکان، سانیە.. بارەگایان دانا بو، خانوبەرەیان لی دروست کرد بوەوە.

بریارمان دا هەندی لە دەزگاکان بنیرینە ئەوی. پیشەکی هیزیکمان نارد هەندی جیگای ئەمین بۆ دەزگای راگەیاندن دیاری بکەن. دەزگای رادیویان گواستەوە و، ئیستگاکەیان لە شوینیک دامەزراند لە پشتی ئەشکەنە ناوی قزلەگی بو.

لە دەوروبەری نەوروزەوە دەستیان کرد بە گویزانەوە. هەندی لە ئەندامانی مەکتەبی سیاسی و دەزگای راگەیاندن.. چونە ئەوی و، چەند جیگایەکیان ئاوەدان کردەوە. بەشی لە کەلوپەلی بارەگاکانی ناوزەنگ گویزرایەوە بۆ ئەوی.

*

### هاتنی مامجەلال بۆ خۆشناوەتی

دوای ئەوەی شەڕی قەندیل بە لادا کەوت. هێزەکانی جوود دەرکران بۆ ئێران. بارەگاکان لە ناو زەنگ کەم بوبونەوە و، زۆری ئەندامانی سەرکردایەتی بە ناوچەکان دا بلاو بوبونەوە ئیتر کاتی ئەوە هات بو، هێزەکانی ناوزەنگ تەنک بکرێن و ئینجا چۆل بکرێ. ملازم عومەر و هێزێکی کەم مانەوە. مامجەلال بەرەو خۆشناوەتی هات. لە نزیک گوندی بالیسان بارگەی خست و، کەپریان دروست کرد و خێوەتیان هەلدا. ئەوە جاری یەکەم بو مامجەلال لە شارەکان نزیک ببێتەوە، بە هەزاران کەس لە توێژی جوراوجوری خەلکی گوند و شارەکانی کوردستان ئەهاتن بۆ سەردانی.

*

### جەمال تاهیر: مردنێکی ناوەخت

جەمال تاهیر لە سلێمانی لە دایک بوە، خوێندنی سەرەتایی و ناوەنجی لە سلێمانی و، خانەی مامۆستایانی تەواو کرد. بو بە مامۆستا. هێشتا هەرزەکار بو تێکەلاوی ژیانی سیاسی بو. ئەندامی یەکێتی قوتابیانی کوردستان و پارتی بو.

ئەندامی شانە سەرەتاییەکانی کۆمەلە بو.

دو جار گیرا و، هەردو جار دوای ئەشکەنجەدانی زۆر لە «ئەمن»ـ ی سلێمانی بە ڕێکەوت پێش تەواو بونی لێکۆلینەوە و درانی بە دادگا، بەر لێبوردنی گشتی کەوت و بەر بو. لە کاتی گرتنی دا ئازایەتیەکی بێ وێنەی نواند بو. سالانی ١٩٨٠ - ١٩٨٣ لێپرسراوی ڕێکخستنە نهێنیەکانی ناوشاری کۆمەلە و، لێپرسراوی مەفرەزەکانی ناو شار بو. کە هاتیشە شاخ بۆ بە بەرپرسی دەزگای ناوەندی ڕێکخستن. یەکێ بو لە سەرکردە هەلکەوتوەکانی کورد.

ڕۆژی ١٧ ی تەموزی ٨٣ ئەیەوی بروا بۆ گەران. جەباری حاجی عوسمان بانگ ئەکا بە ئۆتومبیلەکەی من بیبات بۆ گەران. جەبار لێخوڕینەکەی باش نەبو، چەند جاری پێم وت بو ئۆتومبیل لێ نەخوڕێ. مامۆستا جەمال زۆری لێ کرد بو لە گەلی بڕوا. ئۆتومبیلەکە پیکابێکی دەبل کابینە بو. خۆی لە پێشەوە سوار ئەبێ و، جەبار لێ ی ئەخوڕێ و، خانەی ناوەڕاست و پشتی ژمارەیەکی زۆرتر لە باری خۆی پێشمەرگە سواری ئەبێ. لە کاتی ڕۆیشتن دا پێشەکەی سوک و پشتەکەی زۆر قورس ئەبێ. لە سەر جادەی بالیسان، کە جادەیەکی تەخت و خۆش بو، لە تاسەیەک دا هەلگەرابوەوە و، دەستبەجێ مامۆستا جەمال مرد بو، چەند پێشمەرگەیەکیش بریندار بو بو.

کە هەوالەکەیان دا بە من یەکسەر چوم بۆ بالیسان تەرمەکەیان برد بو بۆ مزگەوتەکەی ئەوێ. پاش شتن بە خاکمان سپارد و لە سەر گۆڕەکەی هەندێ قسەمان کرد. لە سەردەمی خوێندنی ناوەنجیەوە، بە هۆی کاری سیاسیەوە، هاوڕێ ی یەکتری بوین. لە دامەزراندنی کۆمەلەدا لە گروپەکەی ئیمە بو. مردنی مامۆستا جەمال زیانێکی گەورە بو لە کۆمەلە و یەکێتی و بزوتنەوەکەی گەورەی دروست کرد. لە کاروباری ڕێکخراوەیی دا یەکجار شارەزا و، لە بیر و لێکدانەوەی سیاسی دا زیرەک و ورد و، لە ڕوبەڕوبونەوەی کێشە و گیروگرفت دا ئازا و چاونەترس بو. دژی دەستەگەری و چەپایەتی توندڕەو بو. ئەم مردنە ناوەختە بۆ من کۆستێکی ڕاستەقینە بو، هاوڕێیەکی دلسۆز و پشتیوانێکی پتەوم لە دەس چو. جەبار هیچی لێ نەهات بو، بەلام لە ترسی من خۆی شارد بوەوە و، تا ماوەیەکی درێژ

ئەبوبرا خۆی پێشانی من بدا، چونکە لە ریزی پێشمەرگایەتی دەرم کرد بو. چەبار لە ١٩٧٨ موە لە گەڵ خۆم پێشمەرگە بو، کوڕێکی وریا و ئازا و مشورخۆر بو، بە راستی دڵسۆزی من بو، منیش زۆرم خۆش ئەویست و ریزم ئەگرت. ماوەیەکی درێژ کاروباری ماڵ و بارەگاکەمی بە رێوە ئەبرد. دوای ئەوەی ئائومێد بو سەری خۆی هەڵگرت بۆ ئەڵمانیا.

*

کۆبونەوەی سەرکردایەتی کرا. لەم کۆبونەوەیەدا چەند بڕیارێکی گرنگ درا. بۆ یەکەمین جار یەکێتی دروشمی: «دیموکراسی بۆ عیراق و، مافی چارەنوس بۆ گەلی کورد» ی بەرز کردەوە و، ناوی رادیۆکەی لە «دەنگی شۆرشی عیراق» وە کرد بە «دەنگی گەلی کوردستان».

*

## کۆنفرەنسی کۆمەلە

سەرکردایەتی کۆمەلە بڕیاری دا خۆی ئامادە بکا بۆ سێیەمین کونفرەنس. بۆ ئەو مەبەستە دەزگای رێکخستن کە پێکهات بو لە: ئازاد هەورامی، قادری حاجی عەلی، رێکەوتی عوسمان بەگ. راسپارد سەرپەرشتی کۆنفرەنسەکانی کەرتەکانی رێکخستن بکەن بۆ هەڵبژاردنەوەی ئەندامانی کەرت و، نوێنەرانی کۆنفرەنسی سێیەم. هەرسێکیان بە رێ کەوتن بۆ بەجێهێنانی ئەرکەکەیان.

*

## شەری دوەمی جود

هەواڵ هات هێزەکانی جود سەر لە نوێ هاتونەتە ناوچە سنوریەکانی قەندیل، لە قەلاتوکانەوە تا دۆڵی بالەیان بڵاو بونەتەوە. هێزی تیپەکانی بالەک، کاروخ، هەریمی ١٤ لە دۆڵی خانەقا پەڕینەوە، چیاکانی مامە روت، کەلەکی بالەیی، گرت و لێیان دامەزران. جەیش هێرشێکی کرد و، هەندی شوێنی ناوچەکەی گرت و هالیکۆپتەر کەوتە فڕین و سوڕانەوە. هێزەکانی یەکێتی لە چیاکانی سەروی دۆڵی خانەقا کشانەوە چیاکانی خواروی دۆڵەکە. جەیش کشایەوە. هێزەکانی جود شوێنەکانیان گرت و، هەمو چیاکانی سەروی جادەی خانەقا کەوتە دەستیان و، رادیۆی پارتی گرتنی ناودەشت و دۆڵی خانەقای وەکو سەرکەوتنێکی گەورەی جود باس کرد.

هەر ٤ لایەنەکەی جود: پارتی، حشع، حسک، پاسۆک، هەمو هێزەکانی خۆیان بۆ ئەم لەشکرکێشیە ئامادە کرد بو. ئێرانیش کارئاسانی بۆ کرد بون، یارمەتی دابون و، چەند پاسدارێکیشی وەکو ئەفسەری پەیوەندی لە گەڵ نارد بون.

ئەوسا زۆری ئەندامانی سەرکردایەتی یەکێتی بۆ کۆبونەوە هات بون بۆ دۆڵی بالیسان. بڕیارمان دا هێزێک بە سەرکردایەتی عەلی پچکۆل و سەید کەریم بنێرین ئەهیلن زیاتر پێشڕەوی بکەن و ئەگەر بۆیان بکری دەریان کەن. عەلی و سەید کەریم لە بەرەبەیانی ٨٣/٨/١٣ دا هێرشێکیان بۆ کرد بون بۆ چیاکانی ئەوبەر جادە، دەستیان لە چەند شوێنێکی گرنگ گیر بویو، لەوانە کەلەکی بالەییان، بەلام نەیانتوانی بو درێژە بە هێرشەکەیان بدەن و، بە تەواوی دەریان بکەن.

زارگەلی

لە دۆڵی بالیسانەوە بەری کەوتم. ناظمی حەمەی سلێمان و، عەلی نەبی پێشم لە گەڵ

بون. لە بناری کاروخەوە دابەزینی هالیکۆپتەر و شەڕە تۆپی هێزەکانی ئێران و عێراق لە «گرد مەندیل» بە چاکی ئەبینران. عێراق گردمەندیلی ناو نابو: «گردە مەند» و ئێرانیش ناوی نا بو: «تەپەی شەهید صەدر». هێرشەکەی جوود هاوزەمان بو لە گەڵ هێرشی ئێران بۆ سەر ناوچەی حاجی هۆمەران و، بە ئاگاداری و بۆ هاوکاری ئەوان بو. پێشمەرگەکانی پارتی لە گرتنی حاجی هۆمەران دا، شان بە شانی هێزەکانی ئێران، بەشدار بوبون. صەددام تۆڵەی ئەم بەشدار بونەی لە بارزانییەکانی ئۆردوگای قوشتەپە و بەحرکە کردەوە.

بنکەی فەرماندەییم لە زارگەڵی دانا. زارگەڵی گوندێکی راگوێزراو بو ئاوەدانی تێ دا نەبو. لە سەر جۆگاکە لە نزیک جادەکە و لە ناو گەڵیەکەدا جێگەمان چاک کرد. ئەو زەمانە من لەشم ساغ و تەن دروست بوم. لە جۆگاکەی بەردەمان دا گۆمێکی پچوکم دروست کرد بو هەمو شەوێ بەر لەوەی بۆ نوستن رابکشێم، خۆمم لە ئاوە ساردەکەی هەڵئەکێشا. جگە لە بەختیاری برام کە کاروباری پەیوەندی بێتەل و بروسکەی رائەپەراند، عەبدولرەحیم عەبدوللا، شورش حاجیم.. لە گەڵ بون. هاوڕێیەتی لە گەڵ عەبدولرەحیم دا زۆر خۆش بو. پیاوێکی ئازا و بەزات و قسە خۆش و وریا بو. لە شوێنی خۆی دا «تەعلیق» ی خۆشی ئەدا. لەم سەفەرەدا لە گەڵ حاجی خدر ئاغای ئێنی ئاشنایەتیم پەیدا کرد. هەمو رۆژێ لە بەیانیەوە تا ئێوارە لە لامان ئەبو. حاجی ئاغا پیاوێکی بە سالاچوی بەرێز و قسە خۆش و بە زات بو. کورەکانی پێشمەرگە بون. کەمالیان لەم شەڕانەدا رانی شکا و، ماوەیەکی درێژ لە جێگادا کەوت.

فەرماندەی قولەکانم بینی و، هەلومەرجی ناوچەکە و هەردولام هەڵسەنگاند. کەوتینە خۆئامادە کردن بۆ دەرپەڕاندنی هێزەکانی جوود.

*

## هەنگەوانی

لە لای سەروومانەوە ئەشکەوتێکی گەورەی دەم کراوەی لێ بو. هەنگێک هێلانەی لە قلیشی بنمیچەکەی دا کرد بو. دیار بو هەنگێکی قەرەبالغ و کۆن بو. هەنگوینی زۆری تێ دابو. هەرکەس ئەهات بۆ لامان و ئەیبینی تەماعی تێ ئەکرد. بەڵام شوێنەکەی وا هەڵکەوت بو هەرچی فیلیکیان[1] لە گەڵ بەکار ئەهێنا نەیانئەتوانی بیگەنێ و بیبەن.

هەنگ، بۆ جیاکردنەوەی لە مێشە ڕەش لە هەندێ شوێن پێی ئەڵێن: «مێش هەنگوین».

هەنگ «نێر» و «مێ» و «شا» ی هەیە.

نێرەی هەنگ لە مێ گەورەترە. رەنگی بۆرە، هەنگوین ناکا. «چزو» ی نیە و ناتوانێ پێوە بدا.

مێ لە نێر پچوکترە. باریکەڵەیە رەنگی تێکەڵاوە لە زەرد و رەش. هەنگوین ئەکا. چزوی هەیە. پێوە ئەدا لە گەڵ پێوەدان دا چزوەکەی دەردێ و ئەمرێ.

هەنگ لە بەهاران دا پورە (:شەقە) ئەدا. «پورەدان» ئەوەیە شایەک لە پورە ئەسلییەکە جیا ئەبێتەوە، ئەفڕێ بۆ دەرەوە هەنگەکانیش شوێنی ئەکەون. شا لە سەر لقی درەخت، یا گوێسوانە یا هەر شوێنێکی تر ئەنیشێتەوە، هەنگەکانی تر هەمویان تێ ی ئەورووکێن و لە شێوەی هێشودا لێ ی کۆ ئەبنەوە.

بۆ گرتنەوەی ئەبێ «خەلیَف» (پلورە، شەقە، کەنو) یەکی تازە بهێنن ناوەکەی

هەنگوین یا هەر شیرینییەکی تری تێ هەڵئەسوون و، لە ژێر پووری هەنگەکەدا دائەنرێ. بە گوێرەی شوێنەکە یان بە کەوچک هەنگەکانی تێ ئەکەن، یا ئەیتەکێننە ناو پوورەکەوە، کە شاکەیانی تێ چوو ئەوانیش دیسان لێ ی کۆئەبنەوە و تێ ی ئەوروکێن. پشتی خەلیفەکە ئەگیرێ، تەنیا کونی بەردەمی ئەهێڵرێتەوە بۆ هاتوچۆ. تا ئێواری لە هەمان شوێن دا دائەنرێ، کە تاریکی کرد ئەگوێزرێتەوە بۆ «هەنگەلان». هەنگەلان شوێنێکی تایبەتیە تەرخان کراوە بۆ دانانی خەلیفی هەنگەکان لە هاوین دا لە هەتاو ئەیپارێزێ و لە زستان دا لە بەفرو باران.

هەنگەکان خۆیان ناو خەلیفەکەیان بە «بەرەمێو» کونیپ ئەکەن. بەرەمێو، مادەیەکی شینی رەقە. زستانیش دەمی دەرگاکەیان بە هەمان مادە دائەخەن.

هەنگ لە ناو خەلیفەکەدا لە «مێو» «شان» هەڵئەبەستێ. شانەکان ئەگەر لە باری درێژی هەڵبەسترا بن پێ ی ئەڵێن: «تیرە شان» و ئەگەر لە باری پانی هەڵبەسترا بن «پەپکە شان». شانەکان پڕ ئەکەن لە هەنگوین. هەندێ جار فریا ناکەون هەمو شانەکان پڕ بکەن، ئەوی بە بۆشی مایەوە پێ ی ئەڵێن: «کەمرە شان». ئەگەر پوورەیەک چالاک و قەرەبالغ بێ، «دوبەرە» ی زیاد لە پشتی پوورەکەی ئەبەستێ. دوبەرە لە قوڕ وەکو گونج، یا لە تەختە وەکو کەللەی هێلەک دروست ئەکرێ و، دوای پڕکردنی لێ ی ئەکرێتەوە.

هەنگ بە درێژایی بەهار و هاوین خەریکی دروستکردنی هەنگوینن. لە پایزدا ئەیبڕن، واتە زۆری شانەکانی لێ دەرئەهێنن و کەمێکی بۆ خواردنی زستانی هەنگەکە بە جێ ئەهێڵن. لە کاتی بڕین دا بە دوکەڵی تەپاڵە «قانگ» ی ئەدەن. دوکەڵەکە لە ناو پوورەکەی دا کۆ ئەبێتەوە زۆری هەنگەکان پوورەکە بە جێ ئەهێڵن ئەوسا بە چەقۆ شانەکان لە دیواری پوورەکە ئەکەنەوە. بڕینی پەپکە شان ئاسانترە لە بڕینی تیرە شان، چونکە تیرە شان بە تەنیشت یەکەوە هەڵبەستراون ورباییەکی زۆری ئەوێ بۆ ئەوەی لە کاتی بڕینی یەکێکیان دا ئەوانی تر خراپ نەبن.

دانیشتوانی ناوچە شاخاوییەکان لە بەهاردا هەنگەکانیان ئەگوێزنەوە بۆ مێرگەکانی کوێستان تا پایز لەوێ دایان ئەنێن، لە پایزدا ئەیانهێننەوە بۆ هەنگەلانی زستانە لە ناو ئاوایی دا. مێوی هەنگوینی ئەم شوێنانە سپی و هەنگوینەکەیان زەردی کاڵە. سەرچاوەی مێوەکە گوڵی گەوزی کەتیرە و سەرچاوەی هەنگوینەکەیش هەڵاڵەی گوڵە بۆنخۆشەکانی کوێستانەکەیە.

هەنگ چەند دوژمنێکی هەیە: زەردەواڵە، شەوگەرە و مارمێلکە، هەنگەخۆرە و کەندەسە.. ئەیخۆن.

مرە، کە جۆرە پەپولەیەکە، ئەچێتە ناو پوورەکەیەوە لە ناو شانەکانی دا گەرا دائەنێ. شانەکان وێران ئەبن و هەنگەکە ئەمرێ.

ورچ کە بە شوێنەکەیان قەبر بو ئەویش پوورەکە ئەشکێنێ و هەنگوینەکەی ئەخوا و، هەنگەکان سەرگەردان ئەبن.

هەندێ جار زەردەویی ئەگرێ بۆ چاککردنەوەی بە دوکەڵی ئێسکە ماسی قانگی ئەدەن. هەروەها تووشی رەوانی ئەبێ. هەندێ جاریش لە بڕسان دا پەلاماری پووری یەکتری ئەدەن و، بە هەزاران دانە لە بەر دەرگای پوورەکانیان دا لە یەکتری ئەکوژن. بۆ ئەوەی ئەم شەڕە بکوژێتەوە ئەبێ هەنگوین یا شیرینیان بۆ دابنرێ.

جۆرە هەنگێکی کێوی هەیە وردترە لە هەنگی ئاسایی لە ناو کونە بەردا هێلانە ئەکا، لە هەندێ شوێن پێ ی ئەڵێن: «شەمەتلینکە» و لە هەندێ شوێنی تر: «شەپەتوکە». ئەمیش شان هەڵئەبەستێ و هەنگوینی تێ ئەکا. تامی هەنگوینەکەی خۆشترە لە هەنگوینی ئاسایی، بەڵام کەمە، هەر بەشی پارویەکە. پێم وانیە لە سەر شەمەتلینکەی کوردستان هیچ لێکۆڵینەوەیەکی زانستی کرا بێ.

دوای راگوێزانی دێهاتی سنور ژمارەیەکی زۆر هەنگ بەرەڵڵا بوبون، لە کلۆری دار و کونی بەرد و ئەشکەوت دا جێگیر بوبون. هەنگدزز ئەیان دزینەوە. لە سەر کانی چاودێری هەنگەکەیان ئەکرد کە ئەهات بۆ ئاوخواردنەوە و، دوای هەستانی بۆ فڕین چاودێری هەنگەکەیان ئەکرد چەند بەرز ئەبێتەوە و، بەرەو کوێ ئەڕوا، پەوەدا شوێنەکەیان دیاری ئەکرد و ئەچون بۆ دزینەوە و گرتنەوە و بڕینی.

پێشمەرگەکانی دولی بالیسان و هەندێ لە خەڵکی ناوچەکە هەندێ هەنگیان گرت بوەوە و، کردبویانە شەڵکەوە و، لە هەنگەڵانی پچوک و ئەبینراودا دایان نابو. لەشکرەکەی پارتی کە هات بون، دوای ئەوەی زۆریان بری بو شەڵکەکانیشیان لە ناو هەڵکێشا بو، بۆ ئەوەی هەنگەکان بەرن.

*

## کاروباری لوجستیکی

لە تەقەمەنی و خواردەمەنی و پەیکەرف دا ناتەواو بوین. شورش حاجیم کرد بە لێپرسراوی کاروباری لوجستیکی کرینی ئازوقە، تەقەمەنی.. تەقەمەنی مان لە قاچاخچی بە نرخێکی گران ئەکری. چەردەیەکی باش فیشەکی کلاشینکوف، بی کەی سی، گوللەی ئاربیجی، نارنجۆکمان.. کری. ئازوقەیش بە زوری نان و هەندێ خواردنی قوتو بو. پێشمەرگەکان هەمو رۆژێ رادیوی پارتیان ئەکردەوە. جنێوی زۆر ناشیرینیان بە یەکێتی ئەدا و، باسی لێشاوی خواردەمەنی، تەقەمەنی، کەلوپەلی ئەکرد کە عیراق بە لۆری لە دولی خانەقاوە بۆ یەکێتی ئەنێری. ئەم پروپاگاندە درۆیەی کە هەمو رۆژێ رادیۆکەیان دوبارەی ئەکردەوە، لە دو لاوە بۆ ئەوان بە زەرەر بو:

– وورەی هێزەکانی خۆیانی ئەروخاند، کە ژیانیان لە بەرزاییەکانی قەندیل دا بە هۆی سەرما و برسیتی و دوریان لە کەسوکار و چۆڵیی ناوچەکەوە زۆر ناخۆش بو.

– قینی پێشمەرگەکانی یەکێتی هەڵئەساند و، رقیانی لە جود ئەوەندە ئەستور ئەکرد کە بە هیچ جورێ دەستیان لێ نەپارێزن و، وەکو خائینی دوژن و، بەکرێگیراوی بێگانە رەفتاریان لە گەڵ بکەن. پێشمەرگەکان دانە جیرەیان بو لیبان.

*

شوێنێک لە زنجیرەی بییە بە ناوی بەرمەیدانەوە بە دەس چەکدارەکانی پارتیەوە بو، ئەیروانی بە سەر جادەکەدا و، بە سەر بەشێکی هێزەکانی ئیمەدا، زۆرجار لێوەوە تەقەیان ئەکرد و، خەڵکیان بریندار ئەکرد. حەسەن کوێستانی و عەلی نەبی بە تەما بون پەلاماری بدەن ئەو شوێنەیان لێ بسێنن. شەو بو بە تەقەیەکی گەرم و، گوللەی ئاربیجی لە تاریکی شەوەکەدا وەکو پشکۆی ئاگر ئەهات و ئەچو. من لە زارگەلێوە چاودێری شەڕەکەم ئەکرد. وامزانی هێزەکەی ئیمە پەلامار ئەدەن، کەچی هێزەکانی پارتی هەمان شەو پەلاماریان داپو شوێنەکەی ئیمە بگرن. لەم شەڕەدا براێەکی تری حەسەن و پێشمەرگەیەکی تر کوژران، بەڵام

حەسەن شوێنەکەی بەرنەدا و دانەبەزی تا هێرشەکەی پارتی تێک شکێنرا.

*

کۆبونەوەیەکم لە گەڵ فەرماندەکانی پێشمەرگە کرد کە چی بکەین؟ دو رەئی جیاواز بون: هەندێکیان ئەیانوت لەم شاخە ساردە بکشێینەوە چیاکانی خواروی جادە: درە بی و تەورە و، لەوی دابەزرێین. هەندێکی کە ئەیانوت ئێمە پەلاماریان بدەین و، بیانکەینەوە بە دیوی ئێران دا. ناظم، کە یەکێ لە فەرماندەی بەتالیونە ئازا و هەلکەوتوەکانی شۆرشی ئەیلول بو، لەم رەئیەدا بو، وتی: «ئەوانەی ئەڵێن لەم شاخانە بکشێینەوە بۆ شاخەکانی تەویەر، لەوێشەوە کە هاتنە سەرمان ئەڵێن با بچینە کاروخ و بەرمکە دیفاع بکەین، لەوێش کە هاتنە سەرمان ئەڵێن با بچینە هەوری.. ئاخیریەکەی وای لی دێ ئێمە لە دەشتی کەرکوک شەریان لە گەڵ بکەین.. چاکتر وایە شەرەکە لێرە بکەین و لێرە بیانشکێنین!»

*

خۆ ئامادە کردنمان تەواو کرد. لە گەڵ پێشمەرگەکانی گەرمیان دا بە کەلەکی باڵەبیان دا سەرکەوتم بۆ نزیک سەنگەری پێشمەرگەکان. چەند کەسێکی شارەزام هەڵبژارد بچن بۆ نورینی شوێنەکانی جود. هاتنەوە ئاگاداریی وردیان لە سەر شوێنەکانیان و قەوارەی هێزەکانیان کۆ کرد بوەوە.

هەندی سەرچاوەمان پەیدا کرد بو دەنگوباسەکانی ئەوانمان بۆ ئەناردین. ئەوانیش زانیاری باش و بە کەڵکیان دەس ئەکەوت. هەواڵەکانی بۆمان ئەهات وایان ئەگەیاند ئیدریس لە دێیەکی نزیک ئەوان بو لە دیوی ئێران ئاگاداری کرد بون کە دێت بۆ سەردانیان. من بەم هەواڵە زور خۆشحاڵ بوم. چەند ساڵ بو بنەماڵەی بارزانی لە واشینتون و کەرەج دانیشت بون و، خەلکیان بۆ شەری ئێمە ئەنارد، وا ئیستا خۆی دێت بۆ مەیدانی شەر. ماوەیەک هێرشەکەم راگرت بە هیوای گەیشتنی ئیدریس. هەر دەر نەکەوت. ژیانیشمان بە شاخەکەوە زور ناخۆش بو، ئاوی کانیەکانی ئەوەندە سارد بو بە زەحمەت دەس و دەموچاوی پی ئەشۆرا. هەمومان پشتی دەست و رومەتمان قڵیشا بو، روخسارمان تاریک هەڵگەرا بو. شەو زور سارد و خواردنمان زور خراپ بو. هێڵەکانی روبەرو بونەوەمان لە یەکتری نزیک بو، لە تەقەی بەرامبەردا ۲۰ کەس زیاتر برینداربوبو. بەڵام هیچ کەسی لە پێشمەرگەکان خۆی نەئەدزیەوە.

*

شەرە جنێو بە هوکی تۆکی

رۆژێکیان هوکی تۆکیەکەم کرد بوەوە لە گەڵ عەلی پچکۆل قسەم ئەکرد. کابرایەک هاتە سەر خەت. قسەکانی پی بریم. پرسی: «تۆ فلانی؟»

وتم: «بەلی!»

جنێوێکی بە دایکم دا وتم: «دایکم نەماوە!»

جنێوێکی بە ژنەکەم دا وتم: «ژنم نیە!»

جنێوێکی بە خوشکم دا وتم: «هەمویان شویان کردوە مێردیان هەیە!»

وتم: «بۆچی لە مەسئولەکانتان ناپرسن لە باتی ئەوەی هەمو ساڵێک جارێک بتانهێنن بۆ سەر یەکیتی و هەندێکتان بە کوشت بدەن و بە شکاوی بتانگێرنەوە بۆ ئێران، بۆچی لە گەڵ یەکیتی رێک ناکەون بە خۆشیی و بە بی شەر بێنەوە بۆ کوردستان؟»

وتی: «ئیمە عەیبەک لە چاوەکانی پشتناشان نین - مەبەستی شیوعیەکان بو کە لە شەری ئایاردا تیشکا بون - ئیمە شیر و پلنگەکانی بادینانین.. ئیمە هاتوین دایکت.....»

کورەکە بە کرمانجی ئەدوا، لام سەیر بو بادینانی کە بە ئەدەب و مەعریفەت ناسراون، جنیوفروشی وەهایان تی دا بی. سەیرم کرد قسەکانم کاری تی ناکا، وتم: «شیر و پلنگی بادینان گوی بگرە! هەولیری قسەیەکیان هەیە ئەلین: مەیدان مشکان نەیانخواردوە! لە مەیدانەکەدا یەکتری ئەبینین»

بە هەمو هۆکی تۆکیبەکانم راگەیاند: ئیتر دایبخەن و جاریکی تر قسەی پی نەکەن تا خۆم بە نامە ئاگاداریان ئەکەمەوە.

*

مەیدانی شەرەکەم کرد بو بە ۳ شەرگە:

شەرگەی سەرەکی زنجیرە چیای بیبە بو کە هیزەکانی پارتی و بارزانیەکانی لی دامەزرا بو.

شەرگەی خەریک کردن، ئەمیش دو قۆل بو:

قۆلی یەکەم، لە سەر چیای بیبە، نزیک بنکەکەی من کە ئەبو عەلی ئەبی پەلاماریان بدا و، هەمویان لایان وابو ئەمە هیرشی سەرەکی لی ئەکری.

قۆلی دوەم، زنجیرە گردیکی نیوان جادەی خانەقا و گوندەکانی ئەندزی، لیوژی، سلێ و بۆلی.. کە هیزەکانی حسک و حشعی لی دامەزرا بون، ئەبو هیزەکەی عەلی پچکۆل پەلاماری بدا.

لە شەری مانگی مایس دا، حشع و حسک جەزرەبەیان پی گەیشت بو، ئەمانویست ئەمجارەیان جەزرەبە لە پارتی بسرەوینین و، غرورەیان بشکینین. لە بەر ئەوە تەرکیزمان کردە سەر ئەوان.

جاریکی تر تاقمیک پیشمەرگەی تیکەلاو لە شارەزا و نەشارەزام نارد بچن بو سەیری شوینەکانیان و، ریگاکانی پەلاماردانیان. خۆم ناوچەکە شارەزا بوم. جاری یەکەم سالی ۱۹۷۱ و جاری دوەم لە کاتی کارەساتی هەکاری دا سالی ۱۹۷۸ دی بوم و، ئەو چەند رۆژەیش کە بە شاخەکەوە بوم، بەردەوام سەیرم ئەکرد و لە شارەزاکانم ئەپرسی و، بیرم لی ئەکردەوە: رویەرو پەلاماریان بدەین، یان لە لاوە؟

رویەرو توشی زیانی گیانیی زور ئەبوین و، ئەوانیش وایان چاوەری ئەکرد لەویوە پەلامار بدرین. بەلام بە دریژایی دولی خیلاپ بۆشایی بو، ئەوان پەیان نەکرد بوەوە و هیزیان لی دانەنا بو. ئەمانتوانی لەویوە بە نهینی لێیان بسورینین. دولەکە دریژ بو ئەوان بە دریژایی بەرمەیدان - کونەکۆتر - بیبە دامەزرا بون و، یەکی لە بنکەکانی فەرماندەییان لە سەر کانی کونەکۆتر دانا بو. لە پاش ئەوەی بە ریچکە و لە یەک ریزدا پەلاماری یەک شوین بدەن، من وەهام دانا کە بە پانایی شاخەکە لە شیوەی «گەلە درەو» دا لە ۸ جیگاوە پەلاماریان بدەن.

هیزەکانم گولبژیر کرد، چالاک و تەندروست و بە زاتەکانم جیا کردەوە، شارەزا و نەشارەزا و، پیشمەرگەی ناوچەکە و پیشمەرگەی دەرەوەی ناوچەکەم تیکەلاو کرد و، ۸ تاقمی ریکوپیکم لی پیک هینان.

هەر تاقمی فەرماندەی یەکەم و دوەم و سێهەم و، شوێنی هێرشەکەیان و ئامانجەکەیانم بۆ دیاری کردن و، داوام لێ کردن سەعات ٩ ی شەو خۆیان و پێشمەرگەکان بێن بۆ دوایین کۆبونەوەی پێش هێرشەکە.

لە کاتی دیاریکراودا ئامادە بون. هەمویان ۲۳ کەس بون. بەڵام هەڵبژاردەی هێزەکەی یەکێتی و، لە پیاوە هەرە ئازا و دڵسۆزەکانی کورد بون. لە قسەکانم دا گرنگیی سیاسی هێرشەکە و، شکاندنی جودم بۆ رون کردنەوە و ئاگادارم کردن کە:

– نابێ لە کاتی رۆیشتن دا قسە و، دەنگە دەنگ بکەن و یەکتری بانگ بکەن.
– نابێ لایتی دەس بە کار بهێنن، پێڵەکانی هەڵبگیرنەوە، نابێ جگەرە بکێشن.
– نابێ هۆکی تۆکی بەکار بهێنن تا تەقە دەس پێ ئەکا.
– هەمو کەسێ ئەبێ پێشمەرگەکەی بەردەمی و، ئەوەی دوای خۆی بناسێ و، نابێ ئەو ریزە لە هیچ حاڵەتێک دا، جگە لە کوژران و بریندار بون، تێک بدا.
– هەر کەس کوژرا لە شوێنەکەی خۆی بە جێ ی ئەهێڵن تا شەر بە لادا ئەکەوێ و، هەرکەس بریندار بو یەک کەس لە گەڵی ئەگەڕێتەوە.
– ئەگەر فەرماندەی یەکەم کوژرا، جێ دوەم جێگەی ئەگرێتەوە و، جێ دوەم کوژرا، جێ سێهەم جێگەی ئەگرێتەوە لە ئەنجامدانی ئەو کارەدا کە پێیان سپێردراوە.

سەعات ۱۰ ی شەو خواحافیزیم لە تاقمی یەکەم، کە رێگاکەی لە هەمویان دورتر بو، ئینجا تاقمی دوەم و سێهەم تا هەشتەم کرد و، بە رێ کەوتن.

*

عەلی نەبی خۆی ئاگاداری جوڵانی هێزەکە و، ئەرکەکانی خۆی بو، بە نامەیش ئاگاداری قوڵی عەلی پچکۆلم کرد: کە گوێیان لە تەقەی شەر بو، لە بەرزاییەکانی پیبە، ئەوانیش هێرشەکەیان دەس پێ بکەن و، هۆکی تۆکییەکانیان بکەنەوە.

سەعات ۲،٤٠ دەقیقەی بەیانی رۆژی ۱ ی ئەیلول، هێشتا تاریک و رون بو تەقە دامەزرا و، لە هەمو شوێنەکان وەکو دامان ناپو شەر دەستی پێ کرد. دوای ۱۵ دەقیقە هۆکی تۆکیەکانی: سەید کەریم، رەحمان سەیدە، عەزیزی داود، برایمی حاجی کوێخا، قادر خەیات.. مژدەیان دا کە ئەرکی خۆیان بە جێ هێنا و، هێزەکانی پارتی دەستیان کرد بە هەڵاتن. عەلی نەبی پێش سەرکەوت، من و حەسەن کوێستانی و عەبدولرەحیمیش بە دوای دا.

*

یەکێ لەو دیمەنانەی هەرگیز لە بیرم ناچێتەوە لە کاتی سەرکەوتن دا پێشمەرگەیەکی تیپی سەفین ناوی فاروق بو بە سەختی بریندار ببو، لە بن بەردێک دا دانیشت بو خوێن لە برینەکەی سنگی ئەچۆڕا، دوای مردنی کە گیرفانی گەڕا بون ۲٥ فلس لە گیرفانی دا بو، کە سەرکەوتم بۆ شەرگە و لاشەی کوژراوێکی پارتیمان پێشان دەم ۲۰۰ تمەن لە گیرفانی دا بو، لە دڵی خۆم دا بە زەییم بە خۆم و بە گیانبازەکانی گەلەکەم دا هاتەوە. لەم شاخە بەرزە لە سەرچی شەر ئەکەن؟

شەری سەرەکی تەواو بو. دنیا روناک بوەوە. هێزێکیان لە لوتکەی بۆڵی دانا بو کشانەوەکەیان بپارێزێ. چاومان لێ بو بە کۆمەڵ بە قەندیل دا بە رێ کەوتن بەرەو ئێران. لەم سەفەرەدا بە زوری عەبدولرەحیم بە هۆکی تۆکیەکەی من قسەی ئەکرد. وتم: «بزانە شێر

و پلنگەکانی بادینان نادوزیتەوە هەندی قسەیان لە گەل بکەم!» عەبدولرەحیم چەندی هاواری
کرد کەسیان وەلامی نەدایەوە، نازانم خەریکی راکردن بو، یا کوژرا بو.

*

حەسۆ لە کونەکۆتر
پارتی، بە تایبەتی بارزانییەکان، زەرەرێکی زۆریان لی کەوت. دو لە فەرماندە
ناسراوەکانیان: حەسۆ میرخان ژاژۆکی و عەبدولرەحیم جەسیم کوژران. هەردوکیان لەوانە
بون لە گەل مەلا مستەفا چو بون بۆ مەهاباد و، دوایەتر بۆ یەکیەتی سۆڤیەت. لە شورشی
ئەیلول دا حەسۆ فەرماندەی هێزی کاوە بو لە قەلادزە و، عەبدولرەحیم فەرماندەی هێزی
حەمرین بو لە بادینان. حەسۆ میرخان دولەمەری بە سەختی بریندار بو بەلام دەرباز بو.
حەسۆ ژاژۆکی سالێک بو بە دوامانەوە بو لە کوێلان نەنەبوەوە. بە زستان جاسوسانی لی
گرتبن و هێزی ئێرانی هێنایە سەرمان و، بە هاوین قەندیلی لی گرت بوین. لە سەر
کانیەکەی کونەکۆتر کوژرا بو، هەگبەیەکی لی بە جی مابو، یادداشتەکانی خوی و هەندی
نامەی ئیدریس و مەسعود و، کەسانی تری تی دا بو. چەند پاسدارێکی ئێرانیشی لە گەل
کوژرا بو.

لە یەکیەتی یش دو لە فەرماندە ئازاکانی کوژران: ئەحمەد مەولود، فەرماندەی تیپی
کاروخ، بەیانی زو لە پەلاماردانی بیبەدا. ناظمی حەمەی سلیمان، فەرماندەی تیپی
خالخالان، لە دوای نیوەرودا لە راونانی شکستەی هێزەکەدا لە نزیک بولی.
بە درێژایی روژ هالیکوپتەری عیراقی چاودێری مەیدانی شەرەکانی ئەکرد و،
جاروبار رێزێکی کوێرانەی بە سەردا ئەتەقاندین.

*

من هێشتا لە بیبە بوم مەحمودی حەمە بور گەیشتە سەر شاخ. مەحمود زو زو
ئەهات بۆ لام و نامەی ئەم و ئەوی بۆ ئەهێنام، بەلام ئەمجارە پێم سەیر بو لەم کاتەدا هات
بو. دەمەو ئیوارە هەمو شت تەواو بو دابەزینەوە بۆ بنکەکەی زارگەلی. مەحمود کورێکی لە
سلیمانیەوە لە گەل خوی هێنا بو داوای پارەیان لی کرد بو، ئەیویست بیبەخشن.
من کەوتمە ئامادە کردنی چەند وتاری بو رادیو، کادرێکی راگەیاندنی مەلبەندیشم لە
لا بو، باسەکانی هەموی تایپ کرد و، نامیلکەیەکی درێژی لی دەرچو چاپ و بلاو کرایەوە.
ریپورتاجێکی درێژی لە سەر شەرەکان و، یادداشتەکانی حەسۆ و، نامەکانی ئیدریس و
مەسعود و، ناوی کوژراوەکان تی دایە.

*

عەرەب و ئیسرائیل چەند جاری تەرمی کوژراوەکانیان ئەگوزیەوە و، چەند جاری
کوژراوی ئیسرائیلی کە ئەکەوتە لای عەرەب لە گەل گیراوی زیندوی عەرەب دا
ئەیانگورینەوە. منیش ویستم چاو لەوان بکەم. لە گەل پیشمەرگەکان قسەم کرد، وتم: چەند
جار ئەوان لە هەورامان و لە هەکاری پیشمەرگەی ئیمەیان کوشتوە و، نەیانهێشتوە
کەسوکاریان تەرمەکانیان وەربگرنەوە. ئیوەش لاشەکانی ئەمان بشارنەوە بەلکو «جەنازە
بەرامبەر بە جەنازە» پێیان بگورینەوە. قەندیل پەناو پەسیری زۆرە. پیشمەرگەکان ئەوەندە
رقیان لە حەسۆ و تاقمەکەی بو، زۆر زو تەرمەکانیان لە کون و پەناو پەسێری شاخەکە دا
شاردەوە. حەسۆ ئەو زەمانەی کە فەرمانەدی هێزی کاوە بو لە پشدەر ژنێکی لە خەلکی ئەو

ناوچەیە هینا بو. خەزوورەکەی و هەندی لە کەسوکاریان هات بون تەرمەکەی ببەنەوە. منیش پیم وتن: «خیزانەکانی، عەلی عەسکەری و خالید سەعید و شیخ حسین چەند سالە بە تاواتەوەن شوینی گۆڕەکانیان بزانن. کەی شوینی گۆڕەکانی ئەوانتان بۆ دۆزینەوە ئیمەش شوینی تەرمەکانتان پیشان ئەدەین!»

*

## عەلی پچکۆل و چا

خواردنمان خراپ بو، پارەمان کەم بو، یەکدوورۆژ بو چامان لی برا بو. عەلی پچکۆل چەند جاری داوای کرد: هیزەکان ئیزن بدەین، من جاری مانەوەیانم بە پیویست ئەزانی تا دلنیا ئەبوم لە کشانەوەی یەکجاریی هیزەکانی جود. عەلی رۆژیک نامەیەکی بۆ نوسی بوم، ئەلی پیشمەرگەکان ٣ رۆژە چایان نەخواردۆتەوە، سەریان ژان ئەکا ناتوانن ئەرکەکانیان بە جی بهینن، ئەگەر چامان بۆ نەنیری، پلاوەی لی ئەکەین. منیش بۆم نوسی: من مەسئولی عەسکەری جبهەکەم نەک مەسئولی چا. نابی پیشمەرگەکان، لە بەر نەبونی چایی، ئیزن بدا. لە سەر ئەمە تورە بوبو، خوی و مەفرەزەکەی لیبان دا بو گەرابونەوە بۆ ناوچەی چەمی ریزان.

*

مەکتەبی سیاسی بە بۆنەی ئەم شەرەوە بەیانیکی دەرکرد. لە بەیانەکەدا لایەنەکانی جودی بانگ کرد بو بۆ چارەسەرکردنی سیاسی کیشەکان و بۆ ئاشتبونەوە. ئاگاداری نوسەرەکانی رادیومان کرد بو زنجیرەیەک وتار بەم مەعنایە بنوسن. رادیوی پارتی بە جنیو وەلامی ئەدایەوە و، هەرەشەی ئەکرد. منیش بە بیتەل قسەم لە گەل یەکیکیان کرد و داوام لی کرد تەعلیقیکیان لە سەر بنوسی بە ناونیشانی: «رینگۆ تەفاهوم ناکا» ئەم عینوانە لە هەمو وتارەکانی کە زیاتر وروژاندنی بۆ جنیودان.

*

هیزەکانی جود ئاوا بون بۆ ئیران و، تا چەند سالی ئیتر وازیان لە گەرانەوەی بە کۆمەل و لەشکرکیشی هینا.

*

کە هیزەکانی جود لە کوردستانی عیراق دەرکران، دانیشتوانی دیهات لە یەکیتی زیاتریان پی خۆش بو، نەک لە بەر ئەوەی یەکیتیبان لە هەمویان خۆشتر ئەویست، بەلکو لە بەر ئەوەی ئەرکی ٤ حیزبیان لە کۆل بوەوە، تەنیا هی یەکیکیانی لە سەر مابو.

*

## گیرانی بارزانیەکان

ئەو کاتەی ناوچەی حاجی هۆمەران بو بو بە مەیدانی گەرمی جەنگی عیراق – ئیران. بنەمالەی بارزانی و سەرانی پدک بە ئاشکرا هاوکاریبان لە گەل هیزەکانی ئیران ئەکرد دژی جەیشی عیراقی. کۆکردنەوەی دەنگوباسی عیراق و هیزەکانی و، چاوساغی و ریبەری هیزەکانی ئیران و، هینان و بردنی دیدەوانی تۆپخانەی ئیرانی ئەمە بەشیکی کەمی ئەو هاوکاریبە ئاشکرایە بو. لە هیرشەکانیش دا ئەوان وەکو هیزی پارمەتیدەر و خەریککەر و لیدانی پشتەوە بەشدار ئەبون.

بەر لە هیرشەکانی ئیران بۆ حاجی هۆمەران، بەعس وەکو لە گەل یەکیتی دەستی

بە پەیوەندی و ئالوگۆڕی بیروڕا کرد بوو، لە گەڵ بنەماڵەی بارزانی یش دا هەمان کاری دەس پێ کرد بوو. لە بەر ئەوەی ئەوان لە ناو ئێران دا دانیشتبوون و، ئاشکرا کردنی پەیوەندی لە گەڵ عێراق، ئەبوو بە هۆی غەزەبی ئێران، ئەمەیان شارد بوویەوە. لەو کۆبوونەوەیەدا کە لە ناوزەنگ لە نێوان نوێنەرانی یەکێتی و نوێنەرانی حکومەت دا کرا، ئەبو ئەحمەد (عقید رکن خلیل محمد شاکر) جێگری سەرۆکی ئەوسای دەزگای موخابەرات بارزان تکریتی، بە راشکاوی دانی پیادا نا کە لە گەڵ بنەماڵەی بارزانی هەمان پەیوەندی و ئالوگۆڕی بیروڕایان کردووە.

بەشدار بوونی بنەماڵەی بارزانی و هێزەکانیان لە هێرشەکانی ناوچەی حاجی هۆمەران دا، لە لای صەددام جگە لەوەی بە خیانەتی نیشتمانیی دائەنرا، بۆ خۆیشی بە خیانەت و دەسبڕین و فێل لێ کردن ئەژمارد. بارزانییەکان لە عێراق مابوونەوە لە ئۆردوگای بەحرکە و قوشتەپەدا کۆ کرا بوونەوە. زۆری پیاوەکانیان بوو بوون بە چەکهەڵگری «جەیشی شەعبی» و بە دڵسۆزی ئەرکەکانی خۆیان بە جێ ئەهێنا.

شێخ عوسمانی کوڕی شێخ ئەحمەد و عیماد و ئەدهەمی کوڕی بوو بوون بە بەعسی. عیماد سکرتێری مەجلیسی تشریعی بوو. عوبێد و لوقمان و صابیر لە بەغدا دانیشتبوون. عوبێد بۆ شکاندنی باوکی ماوەیەک لە وەزارەتی بەعسییەکان دا بوو بە وەزیری دەوڵەت. داوودەزگاکانی بەعس لە راپۆرت و نووسینەکانیان دا بە بنەماڵەی بارزانییان ئەوت: «سليلي الخيانه».

صەددام بۆ ئەوەی تۆڵە لە بنەماڵەی بارزانی بکاتەوە، هێزێکی حەرەسی جمهووری لە بەغداوە نارد دەوری ئۆردوگاکانی قوشتەپە و بەحرکەیان گرت. هەر پیاوێکی بارزانییان بەردەس کەوت لە گەنج و پیر هەموویان گرتن. شێخ عوسمان و کوڕەکانی و، کوڕەکانی مەلا مستەفا: عوبێد و لوقمان و صابیریان چنییەوە. سەر و سۆراخیان نەما. دوای گرتنیان بە ماوەیەکی کورت صەددام لە یەکێ لە وتارەکانی دا لە تەلەفزیون دا وتی: ئەوانە خیانەتیان کردووە لە بەر ئەوە: «ارسلناهم الى الجحيم». وا باو بوو کە مەسعود و ئیدریس، هاوزەمان لە گەڵ هێرشەکانی ئێران دا بۆ حاجی هۆمەران، هەواڵیان بۆ بارزانییەکان ناردووە خۆیان ئامادە بکەن بۆ چەک هەڵگرتن و گەڕانەوە بۆ ناوچەکانی سنوور.

لەو کاتەدا کە بەعس ئەم تاوانە گەورەیەی بەرامبەر بە بارزانییەکان کرد من لە خەتێ بووم. ڕۆژێکیان کوڕێکی بارزانییان هێنا بۆ لام ناوی عەبدولباقی بوو. باسی کارەساتەکەی بۆ گێڕامەوە. لە یەکێتی دڵنیا نەبوو، چونکە تازە شەڕەکانی قەندیل بووبوو وای ئەزانی ئێمە ڕقمان لە هەموو بارزانییەکە. دوای ئەوەی لە گەڵ مامجەلال قسەم کرد عەبدولباقیم بینییەوە و لە زمانی سەرکردایەتی یەکێتییەوە پێم ڕاگەیاند: «ئەگەر ئەیانەوێ بڕۆن بۆ ئێران ئێمە هەموو کارئاسانییەکیان بۆ ئەکەین بۆ ڕەوانە کردنیان. ئەگەر لە کوردستان و لە شوێنەکانی خۆیان ئەمێننەوە هەر یارمەتییەکیان لە ئێمە بوێ بە پێی توانا پێشکەشیان ئەکەین. هەر کەسێکیشیان ئەیەوێ لە گەڵ یەکێتی بێ بە پێشمەرگە بەخێرهاتنی ئەکەین». عەبدولباقی گەڕایەوە هەولێر و لە گەڵ هەندێ لەوانەی مابوون قسەی کرد، دیسان هاتەوە لامان و بڕیاری دابوو ببێ بە پێشمەرگە. ناردم بۆ لای مامجەلال. مامجەلال دڵنەوایی زۆری کرد بوو. عەبدولباقی بوو بە پێشمەرگە و کرا بە فەرماندەی کەرت. کوڕێکی دڵسۆز و وریا بوو.

جارێکیان یەکێ لە بارزانییەکان وتی کوشتنی ئەوانە بە تایبەتی شێخ عوسمان و

کوڕەکانی مەلا مستەفا وەکو بیتاقە وابو بۆ مەسعود دەرپچی. بەعسییەکان بەم کارە
سەرۆکایەتی عەشیرەتی بارزانیان بە تەنیا بۆ مەسعود هێشتەوە بە تایبەتی کە ئیدریس
مرد. لە ناو کوڕەکانی مەلا مستەفادا کەس نەما بۆ مونافەسەی بکا و، وەکو عەشیرەتەکانی
تر ئەمانیش پارچە پارچە بێن و، هەر کوڕێک چەند تیرە و تایفەیەک بە لای خۆی دا
رابکێشی. ئەوانەی مابون هەموویان لە دایکی خۆی و، لە خۆی منالتر بون.

*

## بەرەو ئاسۆس

هەلومەرجی کوردستان زۆر ئالۆزا بو. نەمانئەتوانی هەمو ئەندامانی سەرکردایەتی،
یاخود مەکتەبی سیاسی پێکەوە لە یەک شوێن کۆ بینەوە، ئەبو دابەش بین. لە لایەکەوە
بۆ سەلامەتی خۆمان وا باش بو، لە لایەکی ترەوە بۆ ئەوەی لە نزیکەوە خۆمان سەرپەرشتی
کارەکان بکەین. من لە مێژ بو بڕیارم دابو بچم بۆ بەری مەرگە.

کە ناوەزەنگیان بە یەکجاری چۆل کرد، مولازم عومەر چو بو بۆ کانی کەنێر لە
پشتی کانی تو لە بەری مەرگە، ماوەیەک بو هات بوە دولی بالیسان، بڕیارمان دا پێکەوە
بگەڕێینەوە. ئاوات قارەمانی بەش بانگ کرا بو بۆ لێپرسینەوە و ڕێگای درابو بگەڕێتەوە
شارباژێر، ئەویش تێکەلاوی کاروانەکەی ئێمە بو.

هێزەکەمان بە ئوتومبێل بەرەو بناری هەورێ بە ڕێ خست.

چوینە سکتان. دێ یەکی گەورە بو بەلام بە هۆی دوژمنایەتی ناوخۆیانەوە
گوندەکەیان ویران بوبو، چەند کەسێکیان لە یەکتری کوشت بو، لە ڕقی یەکتری هەر
لایەکیان چو بو لە لای یەکێکی دەسەلاتدار بوبو بە جاش.

شەو بە لای مەعسکەری هێزوپ دا ڕەت ئەبوین ئوتومبێلێک لە سەر جادەکە
لایتەکانی لە ئێمەی ئەدا ڕێچکەکەمان لەو شەوە تاریکەدا بەرچاو ئەکەوت. هەمو خۆمان دا
بە ئەرزدا بۆ ئەوەی نەیبینریین. لە کابرای شوفێرمان خوڕی لایتەکەی بکوژێنێتەوە.
شوفێرەکە پەشۆکا بو نەیئەزانی چی بکا. شتێکی پیاوەری ئەکراو بو لەم شوێنەدا توشی
پێشمەرگە بێ. هەرچۆنێ بو ئوتومبێلەکە ڕۆیشت. ئێمە هێشتا خۆمان دا بو بە ئەرزا لە
ناو ئێمەوە بلێسەیەکی گەورە بەرز بووەوە و گرمەیەکی گەورە هات. لە ڕیزەکەدا عومەر لە
پێش منەوە بو. بە دەم ڕێگاوە قسەمان ئەکرد. ماوەیەک بو تۆزرا بو. زۆر ئەترسام شتێکی
لێ هات بێ. لە ناو هەموویان دا خەمی ئەوم بو یەکسەر وتم: «کاک عومەر سەلامەتی؟»
وتی: «سەلامەتم!» ئەگەر شتێکی بە سەر بهاتایە ناحەز و دوژمن ئەیانوت: پیلانی خۆیان
بوە. سەرەتا وامانزانی هاوەنی مەعسکەرەکەیە. کەوتینەوە ڕێ چوینە داری قەستەران. تا
ئەوسا کەس خۆی نەکرد بو بە خاوەنی. دەرکەوت پێشمەرگەیەکی دەستەکەی ئاوات
ئاربیجییەکەی لە سەر پێ بوە، لە شلەژاوی دا لە دەستی دەرچوە. کەللە سەری
پێشمەرگەیەکی برینداری کرد بو.

ناوچەکە بە ڕەبیە و مەعسکەر تەنرا بو نەمانئەتوانی بێینەوە. شەو چوینە گوندی
میوژە لە بناری کۆسرەت و، ڕۆژەکەیشی هەر لەوێ ماینەوە، بۆ عەسرەکەی چوینە ئالیقە.
پێشتر چەند بەلەمێکیان بۆ ئامادە کرد بوین. لە تاریکایی شەودا بە بەلەم لە ناوی
ئەستێلی دوکان پەڕینەوە بۆ بەری مەرگە. لە کەناری ئاوەکە و لە کەلکی مەرگە پێشمەرگە

چاوەڕێیان ئەکردین. هەر ئەو شەوە چوینە ئاوەژێ. جەیش بە پەرینەوەی ئێمەی زانی بو، ڕۆژی دوایی هالیکوپتەر پەلاماری پەلمی ماسیگرەکانی دا زۆری سوتاند.

*

چیای ئاسۆس لەوەڕگایەکی دەوڵەمەندە بۆ بە خێوکردنی ئاژەڵ و، گیا و پوشی زۆری هەیە، بەڵام ئاوی کەمە، چینی بەردەکانی ئەستورنە. لە بەرزاییەکانی دا تەنیا چالەبەفری لی یە، هاوینان دەری ئەهێنن و ئەیتوێننەوە. هەندێ جێگا «ماقۆر» لی یە. لە قەرەچوخ بە ماقۆر ئەڵێن «هەرکەو». ماقۆر ئەو ئاوەیە کە لە چاڵایی سەر بەردا ئەمێنێتەوە. کەو و کێوی لە هاوین دا لی ی ئەخۆنەوە. «گادەر» و «کوڕیس» لە لوتکە بەرزەکانیتی. بە مەڕی گوێ شۆڕ ئەڵێن: «کوڕیس»، بەڵام ناوی «گادەر» لە چەند جێگای تریش هەیە: ناوە بۆ شاخ و، ناوە بۆ ئەو ڕوبارەی کە لە سەر سنوری عیراق - ئێران هەڵئەقوڵی و بەرەو شنۆ ئەکشێ. تاک و تەرا بزنە کێوی لی ما بو. وەکو ئەیانوت سەردەمی زو پڵنگی لی بینراوە.

*

بەری مەرگە

بنگرد، ناوەندی ناوچەکە بو، بنکەی ناحیەی لی بو. ئوردوگایەکی گەورەشی لی کرا بوەوە نزیکەی ٤ هەزار ماڵی تی دا بو.

ناحیەی بنگرد پێک هات بو:

گوندەکانی بناری ئاسۆس: ویسی، بیخری، بیترخی، بیانە، دولە گزم، سەرتەنگ، نیزکی، خانەلی، کانی هەنجیر، سەرچیا.. ڕاگوێزرا بون و، گەرمکان، ناودەشت، کەلەکان، بناویلی ئاوەدان بون.

گوندەکانی بەری مەرگە: کانی تو، چنارنی، ئاوەژێ، هەوارەبەرزە، خورخورە، باخیان، گزمەزەڵ ڕاگوێزرابون، لزتەر، هەلزنە، نزلچکە، سۆفیان، مەرگە، پاشکیش، مەلا سەفی، بیوەکە، بیگمی، شارستین، دولە بی، سیدەر ئاوەدان بون.

هەردو دیوی ئاسۆس گوندە ئاوەدان و ڕاگوێزراوەکانی لە ژێر دەستی پێشمەرگە دا بو، بەڵام گوندەکانی: کوێرەکانی، هەنجیرە، بنگرد، خۆشاو، بیمۆشە، بەردەشان، سیوکان، سیناجیان، قەرەتەپە، دیبیژە، مەمەنداوا، بەردەکوز، سەرسیان کە هەندێکیان لە سەر جادە و، هەندێکیان لە لیواری ئەستیلەکەی دوکان دا بون، لە ژێر دەسەڵاتی بەعس دا بون.

هەندێ لە خەڵکی شوێنە ڕاگوێزراوەکان لە ناوچەکە دورخرابونەوە بۆ ئوردوگای تەکی لە سەر ڕێگای چەمچەماڵ.

لە ڕوی پێکهاتنی خێڵەکییەوە ناوچەکە تێکەڵاو بو لە: شیلانە، جاف و ترکە ڕەشە.

ترکە ڕەشە تیرەیەکی پچوک بون لە سەرسیان و بەردەکوز دائەنیشتن.

شیلانە، ٣ تیرە بون:

پیرە، کە لە گوندەکانی بیمۆشە و هەلزنە و، هەندێکیشیان دوای ژێرناوکەوتنی گوندەکانیان چوبونە چوارقورنە، ژاراوە، ڕانیە، ئەسکی کەلەک.

شوانە، لە گوندەکانی بنگرد، سۆفیان، سەرچیا، هەندێکیشیان دوای ژێرناوکەوتنی گوندەکانیان لە سولتانەدی و ژاراوە دائەنیشتن.

رەجەب، یا ئالی (ئالی کوری رەجەب بوە)، ئەمانیش لە بەردەشان و، هەندێکیشیان دوای ژێرئاوکەوتنی گوندەکانیان لە بازیان دائەنیشتن.

گوندەکانی: خورنەوزە، باخیان، گۆمەزەڵ، دۆڵبی، شارستێن، سیدەر، کویرە کانی و هەنجیرە بەشێ بون لە ناوچەی جافەتی.

*

ناوچەکە چەند گوندێکی تێ دایە ئەچینی لە ئاستی دا راپوەستێ، لەوانە: مەرگە، بەردەشان، کانی تو.

– مەرگە، کانی و ئاوی زور و، ئەرزی فراوانی چاندنی دانەوێلە و، باخی هەنجیری هەیە. چوار مزگەوتی تێ دابو: مزگەوتی کانی چاوان، کانی سەردەشت، گەرمک و جافان. مزگەوتەکان بە ناوی کانیەکانەوە ناو نرا بون. چەند گۆرستانێکی نزیکە. هەندێکیان گەورەن و، کێلی گۆرەکانیان بەرز و ئەستور و، هەندێکیان نیگاری شمشێر و خەنجەر و مەلیان لە سەر بو. کێلە کۆنەکانی هیچ نوسینێکیان لە سەر نیە. پێ ئەچێ مەرگە لە کۆنەوە ئاوەدان بوبێ. ئەم گۆرستانانە ئەچینی لێکۆلینەوەی مێژوییان لە سەر بکرێ. دانیشتوانی ناوچەکە هەندێ روداوی دەماودەم ئەگێرنەوە کە لە سەردەمی هاتنی لەشکری ئیسلام دا مەرگە پایتەختی قەرالێکی گەورە بوە و، دوای شەرێ قورس و خویناوی ئینجا ناوچەکە گیراوە و، بە شمشێر ئیسلامیان کردون. پشدەرییەکان بە مەرگەییەکان ئەڵێن: «مەرگەیی ئەسحابەکوژا». مەزاری «پیرۆتە سوری مەرگەیی» کە لە ناوچەکەدا بە شوێنێکی پیرۆز دائەنرێ کەوت بوە دامێنی گەورە قەلا و پشتی مەرگەوە. ئەوسا «رەبیە» یەکێ گەورەی جەیشی لێ بو. گوایە پیرۆتە سور لە گەڵ هاتنی ئیسلام دا موسوڵمان بوە و، لە شەرێکی دینیی دا کوژراوە و لەوێ ناشتویانە. گێرانەوەکان ئەفسانەن، پشت ئەستور نین بە هیچ بەڵگەیەکی مێژویی.

ئەوسا ناوەندی قەزاکەیان گواستۆتەوە بۆ قەلادزە. مەرگە سەردەمێک بنکەی ئەمارەتی بابان بوە. بە پێ ی «بەیتی کاکە شێخ و کاکە میر»، هەندێ لە میرەکانی بابان لەوانە ئەم دو میرەی بەیتەکەیان بە سەردا هەڵدراوە، لە ئەنجامی زورداری و بەدرەوشتی دا، بە دەستی مەرگەییان بە کۆمەڵ کوژراون. تا ساڵی ١٨٩٣ مەرگە ناوەندی قەزای پشدەر بوە.

وەکو ئەیانوت: مەرگە و لۆتەر و هەندێ گوندی تری ناوچەکە دوپشکی کوشندەیان هەبو. تا من لەوێ بوم چەند جارێ دوپشک بە پێشمەرگە و خەڵکی کەوەی دا، بەلام کەسی نەکوشت.

کاتێ خۆی مەرگە ناوەندی بەرێوەبەرایەتی ناوچەکە بوە، هەر بۆیە بە هەمو ناوچەکە ئەوترێ: «بەری مەرگە».

*

– بەردەشان گوندێکە کاتێ خۆی سەر بە مەرگە و دوایتر سەر بە بنگرد بوە. یەکێ لە بە ناوبانگترین بەیتبێژەکانی کورد: عەلی بەردەشانی، لەم دێ یەدا لە دایک بوە. حاجی قادری کۆیی لە باسی شاعیرەکانی کوردستان دا بەمجۆرە ستایشی کردوە:

دو عەلین وەکو حەسسان

حەریر و بەردەشانە مەسکەنیان

له دو عەلی، مەبەستی: عەلی حەریری و عەلی بەردشانی و، له حەسان مەبەستی: حسان کوری ثابتە. حەسسان شاعیرێکی عەرەبی گەورەی سەردەمی جاهیلی بوە، دوای ئیسلام بە ستایشی پێغەمبەر ناوی دەرکردوە.

ژمارەیەکی زور بەیت، چیرۆک، گۆرانی، لەسەی نەستەق.. بە سەر زمانی خەلکەوەیە، ئەدریتە پالی، کە هەموی نیشانەی بلیمەتی ئەون. کەچی سەرگروشتەی ژیانی خۆی رون نیە و، بابەتەکانی کەمیکی نەبی، کە لەم سالانەی دوایی دا تۆمار کراون، ئەوی تری نەنوسراوەتەوە، بەلام بەوەدا کە یەکی لە بەیتەکانی بۆ ئەورەحمان پاشای بابان وتوە، دیارە هاوچەرخی ئەو بوە.

بەردشان مەرکەزی عەشیرەتی شیلانە بو.

رەسول مامەند لە بەردشان لە دایک بوە. کە من لە ئاوەژی نیشتەجی بوم، کویخا پیرۆتی برای رەسول، یەکێکی ناردە لامان بۆ بەخێرهێنان. بێگومان ئەمەی لە پیاوەتی خۆی بو، چونکە هیچ ئیشێکی بە ئێمە نەبو، جگە لەوەش ئێمە لەو کاتەدا لە گەل حسک ناکۆک بوین.

*

- کانی تو کەوتۆتە بناری شاخەوە لە کۆتایی دولێک دایە لایەکی ئاسۆس و، لایەکی شاخی چل بزنیە. هەوای خۆش و دیمەنی جوان و، چەند کانییەکی سارد و سازگاری تی دایە، دوانیان لە بەرزایی هەلئەقولین و ئەرژینە قولایی دولەکەوە. زستان بەفرێکی زۆری لێ ئەباری.

زەویوزاری کشتوکال و دانەویلەیان کەمە، ئەرزەکانیان بە دەس بەردەبێر و چاک کراوە. رەزی تری و باخی میوە و ترشیان زورە. پیاو ئەبینی پشتاوپشتی خەلکی ئەم دی بە چەندە رەگیەیان لە گەل باخەکانیان داوە. میوەیەکی لێ بو، وەکو هەلوژە رەشە بەلام پچوکتر و تامیشی خۆشتر، پێیان ئەوت: «سپیکەرۆ».

ئاژەلداری ئەکەن. هەوای ناوچەکە بۆ پەروەردە کردنی ئاژەل، بە تایبەتی بۆ راگرتنی بزنە مەرەز، لە بارە.

دانیشتوانی ناوچەکە لە کۆنەوە شارەزاییەکی زۆریان هەیە لە ئەونگەری دا، ئافرەت لە ئەشی رستن و بەرهەمهێنانی داوی باریک دا و، پیاو لە چنینی بەرو دا. شالی کانی تو و چنارنی بۆ تەنکی و سفتی و جوانی بە ناوبانگە.

کانی تو و کانی کورکور ئەشی بکرین بە شوێنێکی توریستی خۆش. بە هاوین بۆ سەیران و بە زستان بۆ یاری سەربەفر.

*

ئەم ناوچەیەش وەکو خۆشناوەتی و، زۆر ناوچەی تری کوردستان بزن رائەگرن. بزن لە سەر هەرزانترە، بە خێوکردنی ئاسانترە، زۆرتر بەرگەی نەخۆشیی و سەختییەکانی سروشت ئەگری.

له کوردستان ٣ جۆر بزن هەیە: بزنی رەش، بزنی مەرەز، بزنی کێوی.

بەچکەی بزن: کار یا کارژۆلە (لە بونەوە تا تەمەنی ئەبی بە ٣ مانگ)، گیسک (لە ٣ مانگییەوە تا ئەبی بە ١ سال)، چتیر (لە ١ سالیەوە تا ئەبی بە ٢ سال)، ئینجا بە نێرەکانی ئەوتری: نێریی، سابرین، تەگە و بە مێ یەکانی: بزن.

کار تا لە خەم ئەرمەنی لە «کوز» دا پەروەردە ئەکری. کوز بە «تەیمان» چوار دەوری ئەگیری، بزن لە زستان دا ئەکریتە «پشتیر» یا «هۆڵ» ەوە.

ئەو ساڵەی بزن نەزێ، شیریشی نابێ، بزنی بێ شیر پێ ی ئەڵێن: «قسر».

بزنی رەش و بزنی مەرەز لە گەڵ نێریی یەکتری جوت ئەگرن، بەچکەکەیان «دوورە، یا دوورەگ» دەرئەچێ.

مووی بزنی رەش، زبر و رەقە بۆ دروستکردنی جلوبەرگ بە کەڵک نایەت، بەڵام گوریس، رەشماڵ، رەشکە، جەواڵ، تەپ، خەرار..ی، لێ دروست ئەکری.

مووی بزنی مەرەز، رەنگی جۆراوجۆری جوانی رەش، سپی، خورمایی، شینکی.. هەیە و، نەرم و خاوە، بۆزو (کر، شاڵ)، بەرماڵ، پۆپەشمین، جاجم، گۆزەوی، پۆزەوانە، دەسکێش، بلوز و، لە هەندێ شوێن بەتانی.. لێ دروست ئەکری.

بزنی رەش بەرگەی سەختی سروشت ئەگری و، لە شاخەوانی دا وریا و سوکەڵەیە، بەڵام زەرەری گەورە لە جەنگەڵ و باخ ئەدا، چونکە چرۆی تازە پێگەیشتووی درەخت ئەخوا و، تویکڵی قەدەکەی ئەکرێنێتەوە، دارەکە وشک ئەبێ. لە بەر ئەوە پێ ی ئەڵێن: «کوڵلەی رەش».

پەندی زۆر لە سەر بزن هەیە، وەکو: «بزن بۆ شەوی جێ ی خۆش ئەکا»، هەروەها: «بزن ئەجەلی بێ نانی شوان ئەخوا»، هەروەها: «خوا هەقی بزنی کوڵ بە سەر بزنی شاخدارەوە ناهێلی»، هەروەها: «گیا ئەوەیە بە دەمی بزن خۆش بێ»، هەروەها: «نەمخواردم و نەکردم، گیسکێ جرینگاندم».

بۆ یەکێ کە زۆ زۆ بکەویتە خۆشیەوە ئەڵێن: «وەکو بزنی دیلیزە ساڵی دو بەهار ئەخوا». بۆ یەکێ بەڵێنەکانی بە جێ نەهێنی ئەڵێن: «وەکو بزن وایە دەسنوێژ هەڵناگری». بۆ یەکێ هەمو جاری لە دوای خۆشیەک ناخۆشیەکی بە سەر بێ، ئەڵێن: «وەکو گیسکەکەی هەیاسی خاسی لێ هاتووە»

*

بارەگای تیپی ئاسۆس لە ئاوەژێ و کەرتەکانی بە درێژایی بناری ئاسۆس بڵاو بوبونەوە.

بارەگای تیپی ٦٨ ی مامەندە لە لۆتەر و، کەرتەکانی لە بناری ئاسۆس بە دیوی پشدەردا دابەش بوبون.

بارەگای تیپی ٤٤ ی چەکوچ لە گەرمکان و، بارەگای تیپی ٤١ ی کورەکاژاو لە کەڵەکان بو. ئەم دو تیپە لە چاو ئەوانی کەدا بە ژمارە کەمتر بون.

هەندێ لە کەرتەکانی تیپی ٦١ ی جوتیارانیش، بە هۆی شەرەکانی عیراق - ئیرانەوە، پەری بونەوە بەری ئاسۆس هەندێکیان لە کانی تو بارەگایان دانا بو. ئەم هێزانە هەمویان سەر بە مەڵبەندی دو بون کە بارەگاکەی لە سەرگەڵو بو.

کاکەمین قادر بەرپرسی کەرتی رێکخستنی قەڵادزە لە چنارێ بو.

کە گەیشتینە ناوچەکە، تازە خەریکی ئاواکردنەوەی گوندە وێرانکراوەکانی بون، لە بەر ئەوە شوێنێکی ئەوتۆی ئامادەی لێ نەبو بیکەین بە بارەگا، ئەبو خۆمان خانو دروست بکەین. پێشمەرگەکان لە ئاوەژێ و مەرگە جێگەی کاتیان پەیدا کرد و، منیش چەند رۆژێ لە ماڵی عەبدولرەحیم بوم لە ئاوەژێ.

ئاوەژی گوندێکی بچووک بوو. پشتی داببوو بە ئاسۆسەوە رووی لە قەرەسەرد بوو. چەند کانی و کاریزێکیان هەبوو، بەڵام زەوییوزاری کشتوکاڵیان کەم و لێژ و، بەرداوی بوو. نزیکەی ٢ ماڵێکیان لە تەکیەوە هات بوونەوە بنەیان دانا بوو. رەزی تری و ترش و باخەکانیان وشک ببوو، تازە خەریکی ژیاندنەوەی بوون. ژمارەیەکی کەم بزنی سەرەز و بزنی رەش و گاوگۆتاڵیان پەیدا کرد بوو. دانیشتوانی ئاوەژی کەم دەرامەت و، ژیانێکی هەژارانەیان هەبوو، بەڵام تەبیعەتیان دەوڵەمەند و نەفسیان بەرز و، لە میوانداری دا دڵ و دەروون فراوان بوون. هەر لە ئاوەژی ماڵی کامەرانی بەهجەتی عەونی، زیرۆی عەبدوڵلا رەوی، ئەحمەدی حاجی محەممەدی قەرەتەپە، حەمەی حەمەباقی.. لێ بوو.

خەڵکی ناوچەکە بە گشتی پێیان خۆش بوو، ئێمە لەوێ جێگیر ببین، لایان وابوو تیتر هێزەکانی جەیش ناتوانن بە ئاسانی بێتە سەریان و، جارێکی تر رایان بگوێزێ.

مام ئەحمەد

مام ئەحمەد لە سەرەتای دەس پێ کردنەوەی شۆڕشەوە ببوو بە پێشمەرگە. زۆرجار کە لە قسەکردن دا ناوی یەکێکی لە بیر بچوایە «وانیک» ی بە کار ئەهێنا بە پاسەر عەرەفاتی ئەوت: وانیک عەرەفات و، بە قاسملوی ئەوت: وانیکلو.. لە بەر ئەوە ناویان نا بوو مام ئەحمەد وانیک، ئەگەرچی لە بنەماڵەیەکی ناسراوی خەڵکی ناوچەکە بوو، بەڵام پێشمەرگە و خەڵک هەر بەم ناوەوە ئەیانناسی.

دوای ئەوەی رێگای مەرگە - بەرگەلو کرایەوە تراکتور و ئوتومبێل هاتوچۆی پێ دا بکەن. رۆژێکیان دلێر بە ئوتومبێل هات بوو بۆ ئاوەژی. مام ئەحمەد ئەیویست بڕوا بۆ بەرگەلو. بە دلێری وت بوو: «کە رۆیشتی منیش لە گەڵ خۆت ببە!» دلێر وت بووی: «باشە، بەڵام من زۆر زۆر شتم لە بیر ئەچێ بۆ ئەوەی لە بیرم نەچێ لە سەعات ئەوەندەوە لە سەر رێگاکە چاوەڕێ بکە کە هاتم سوارت ئەکەم» مام ئەحمەد وای زانی بوو نایەوێ سواری بکا. وت بووی: «ئەگەر ئەوەندە زۆر زۆر شتت لە بیر ئەچێ ئەوە بۆچی رۆژی لە بیرت ناچێ لە باتی بەرگەلو بچی بۆ بنکرد؟» بنکرد ئەوسا هێزەکانی حکومەتی لێ بوو.

خاڵە مین

خاڵەمین، یەکێ لە پیاوە ریش سپییەکانیان ئاوەژی، ژوورێکی لە دوو ژوورەکەی ماڵی خۆیان بۆ من تەرخان کرد. بە درێژایی ٦ مانگی رابوردوو، بە هۆی گەران و سووران و شەڕوشۆڕەوە، لە هاوسەرەکەم دابڕا بووم. ناردم بە دوای دا ئەویش هات لەوێ نیشتەجێ بووین. تا خانووەکەی خۆم تەواو بوو، چەند حەفتەیەک میوانی ئەو بووین. ئەو ماوەیە تێکەڵاویمان زۆرتر و دۆستایەتیمان بە هێزتر بوو. خاڵەمین خۆی نموونەی پیاوی جوامێر و، هاوسەرەکەی نموونەی خانمی خانەدان و، منداڵەکانی نموونەی مرۆڤی بەرز بوون.

مام باپیر

مام باپیر، یەکێکی کە لە پیاوە ریش سپییەکانی ئاوەژی، کانییەک و پارچەیەک ئەرزی دامێ ماڵ و بارەگای لە سەر دروست بکەم. شوێنەکە ناوی «کوروان» بوو نزیکی ئاوەژی بوو. مام باپیر پیاوێکی ژیر و بەڕێز، شارەزای کاروباری عەشائیر و قسە خۆش بوو. حەمەی کوڕیشی بە دڵسۆزییەکی بێ ئەندازەوە کاروباری هێنان و بردنی بەرید و پێویستییەکانی تری ئەنجام ئەدا.

خاڵە مین و مام باپیر خاڵ و خوارزا بوون و، هەردووکیان باوکیان لە شۆڕشی شێخ

محمودا له سەرەتای سییەکان دا کوژرا بو، خزیشیان له شۆرشی ئەیلول دا پێشمەرگایەتیان کردبو، بەلام دانویان بە یەکەوە نەئەکولا.

*

خانو دروست کردن لیرە کاریکی زەحمەت نەبو. جادەی قیر بۆ ناوچەکە راکیشرا بو، ئەمانتوانی کەرەستەی خانو دروستکردن: بلۆک، چیمەنتو، گەچ، دەرگا و پەنجەرە.. لە شار بکرین. دیسان کەوتینەوە خانو دروست کردن. بناغەکەیمان دانا. خانویەکی دە ژوری بۆ پێشمەرگەکان و، چەند خانویەکی دو ژوری بۆ خۆم و مالەکانی تر. لە هەمویان دا تەوالیت، حمام، چیشتخانەی تایبەتی مان دروست کرد. گەوریکیشمان بۆ ئاژەل و ئیستر دروستکرد و، لە دەوروپشتی خانوەکان چەندین چالمان بۆ خۆپاراستن لە هێرشی ئاسمانی و تۆپباران هەلکەند. وەستا و کریکاری هەمو خانوەکان پێشمەرگەکان خۆیان بون.

خانوەکان تەواو بون. کاتی خۆی کەلوپەلی پارەگاو مالەکانمان لە ناوزەنگەوە گویزابوەوە هەرزنە و، دوای ئەویش هینابویانە ئاوەژێ. پێشمەرگە پارەکانیان گومرگ کرد بو، ئەوی بە کەلکیان هات بو برد بویان، تەنیا شتی نەیان برد بو کتیبەکانم بو، وەکو خۆی مابو. سەرلەنوی مشوری کەلوپەلی پارەگا و مالمان خوارد.

*

بەرو

هەندی شوینی بناری ئاسۆس دارستان بو. داری بەرو، قەزوان، گویز، بەلالوک.. ی لی بو. پشتی چنارنی لە هەموی چرتر بو. پاش دانانی بنکەکانی پێشمەرگە، کەوتنە داربرین: بۆ سوتاندن و بۆ دارەرای خانو. چەند کەسیکی خەلکی چنارنی هاتن بۆ دەربرینی پەژارە و نارەزایی. شارەزاکانیان ئەیانوت: لیرەوارەکەی پشتی چنارنی دانیشتوانی ناوچەکەی چەند جاری لە قاتوقری و برسیتی و، ئاژەلەکانیانی لە مردن، رزگار کردوە: خەلک بەری داربەرویان خواردوە و، ئاژەلەکەیش گەلاکەی. لە پەژارەی ئەوەدا بون ئەم سامانە بە نرخە لە ناو بچی.

دارستانی پشتیکە لە سامانی نەتەوەیی، لە زۆر جیگا دابەش کراوە و، هەر جوتیاریک «قەدەغە» ی خۆی هەیە، کەسی کە بۆی نیە بیبری، گەلاکەی ئەکەن بە «گەلا» بۆ ئالیکی زستانی بزن و، لق و پۆپەکەی بۆ سوتاندنی خۆیان بە کار ئەهینن، ئەم جۆرە برینە کاری تی ناکا. بەلام برینی بی پلان و خەلوز کردن، بەشیکی زۆری فەوتاندوە و، ژیاندنەوەی سەر لە نوی ی کاریکی یەکجار دژوارە.

داری بەرو، چەند جۆرە و، چەند بەری جیاوازی هەیە:

١. بەرو، دانەی بەرو دریژکۆلە و رەنگی قاوەیی تیرە. هەندیکیان گەورەن پی ی ئەلین: «وێلو». کلاویکی پراوپری سەرەکەی لە سەردایە پی ی ئەلین: «جەوت». پێشینان وتویانە: «خوا کلاوی بۆ بەرو کردوە». جەوت بۆ خۆشکردنی کوندە، مەشکە، هیزە.. بە کار ئەهینری و، بەرویش بە زستان لە ناو ژیلەمۆدا برژاندویانە، یا پێشاندویانە و خواردویانە. لە قاتوقری دا هاریویانە و بۆ خواردن «خەپلە» یان لی دروست کردوە. بە زوری تامەکەی تفت و تالە. بە زەحمەت، بە بی ئاو، قوت ئەدری.

وەکو دەربرینی بیزاری لە دوبارە بونەوەی خواردنیکی ناخۆش ئەلین: «بەرو بە کالی، بەرو بە کولاوی، بەرو بە برژاوی..» و، یەکی کە بە پلە و بی پسانەوە قسە بکا

پێ ی ئەڵێن: «ئەلی ی بەرووی لە دەم دا تەقیوە!» و، وەکو نیشانەی یەک کەوتن و
نەخۆشیی گران، ئەڵێن: «بەلە بێ و، بەرووان نەخوا!».
٢. مازو، بەرێکی خڕ و سەختە. لە پایزدا ئەیچنن و لە بازاردا بە کیشانە ئەیفرۆشن. بۆ دەباغی پێستە بە کار ئەهێنرێ. پێشینان وتویانە: «بە زۆر بیبەی بۆ مازوچنین بە دارەکەی دا ناڕوانی».
کاروانچی و ئەوانەی زۆر بە ڕێگادا ئەڕۆن، کە پێیان «تلۆق» ئەکات و، پێستی نێوان پەنجەکانیان ئەسوتێتەوە، مازو ئەهاڕن و لە گەڵ خەنە دا ئەیگرنەوە، لە پێیانی ئەدەن، پێستی پێیان «پەنگر» ئەکاتەوە.
٣. گزگل.
٤. سیچکە، لە هەندێ ناوچە پێ ی ئەڵێن: «گڵوان»، بەرێکی تری بەروە خڕە لە شێوەی هەڵوژە ڕەشدا. تویکڵەکەی ڕەق و قاوەیی تیرە، ناوەکەی جۆرێ لە ئاردی زەردی تێ دایە. نرخێکی بازرگانی ئەوتۆی نیە. پێشینان وتویانە: «بە مازوان تێ شکاوە، ئێمەی بە سیچکان هەڵسێتەوە».
هەندێ ساڵ گەزۆ لە سەر گەڵای داربەرو ئەباری، گەڵاکەی کز ئەکەنەوە و ئەیکوتن لە بازاردا بە کیشانە ئەیفرۆشن، پاش کوڵاندنی «شۆزکە» و «گەزۆ» ی لێ دەر ئەهێنرێ.
لێکۆڵینەوەی زانستی دەری خستوە گەزۆ ناباری، بەڵکو جانەوەرێکی پچوکە بە چاو نابینرێ لە سەر گەڵای داری بەرو زیاد ئەکا و، لە ئەنجامی هەندێ «تفاعل» ی کیمیایی دا دروست ئەبێ.
داری بەرو سەخت و قورسە، بە کەڵکی داردرای خانو نایەت چونکە ئەوەندە قورسە دیوار بەرگەی ناگرێ، بە زۆری بۆ سوتاندن بە کاری ئەهێنن، بەڵام لە ئەوروپا دیکۆری قەشەنگی لێ دروست ئەکەن، نەخشی جوان لە قەدی دارەکەدایە.

*

## مەلبەندی یەک لە ناو شەڕی عیراق - ئێران دا

هێزەکانی ئێران تا ئەهات لە کوردستانی عیراق نزیک ئەبونەوە. زەمانەی شەڕ گەیشت بوە ناوچە سنورییەکانی حاجی ئۆمەران، قەڵادزێ، پێنجوێن. عیراق و ئێران، هیچ لایەکیان دەستیان لە ئێمە نەئەپاراست. هەندێ جار «ڕصد» ەکانی ئێران کە بە چاوساغی پێشمەرگەکانی پارتی و حسک ئەهاتنە پێشەوە، شوێنەکانی ئێمەیان بۆ ئەکردن بە نیشانە.
شەڕی حاجی ئۆمەران کاری لە مەلبەندی سێ و، شەڕی قەڵادزە کاری لە بارەگاکانی سەرکردایەتی کرد بو. ناوچەی ناوزەنگ - شێنی مان چۆڵ کرد بو، ناوچەی باوزێ پشیان پێ چۆڵ کرد بوین. داوودەزگای ڕاگەیاندن و ڕادیو گواستبویانەوە دۆڵی جافەتی.
شەڕ بە گەرمی کەوتە ناوچەی پێنجوێن. مەلبەندی یەک کوت بوە مەترسییەوە. هەمو ڕۆژێ بۆردومان ئەکرا. ئەوسا بەکری حاجی سەفەر، لە جێگەی مەلا بەختیار، کرا بو بە لێپرسراوی مەلبەندی یەک. ئێمە ئاگاداری بەکری حاجی سەفەرمان کرد، فەرمان بە هێزەکانی یەکێتی بدا پەلاماری جەیشی عیراق نەدەن، بۆ ئەوەی بتوانی هێرشەکانی ئێران ڕابگرێ، چونکە هاتنی ئێران بۆ ناوچەکە ئەبو بە هۆی چۆڵکردنی ناوچەکە و وێرانبونی و، لە ئەنجامی ئەوەیش دا ئەبو بارەگاکانی مەلبەندی یەک و تیپەکانی شارباژێر چۆڵ بکەن.
ماهیر عەبدولڕشید تکریتی قائیدی فەیلەقی یەک بو. ماهیر بەعسیەکی

رەگەزپەرست بو، لە بەهانەکانی دا جنێوی بە «فورسی مەجوس» و «نەوەکانی دارا و روستەم» ئەدا! هەندێ پێشمەرگە و، هەندێ لە دانیشتوانی ناوچەکە، گوێیان نە دابوە فەرمانی مەلبەند، بۆ ڕەخنەگری چەک و تەقەمەنی بە دزی مەلبەندەوە، هەندێ پۆستەیان بۆ هێزەکانی جەیش نابوەوە تازاریان دا بون. ئەویش چەند بەهانێکی پڕ هەڕەشە و جنێوی بە سەر ئاسمانی شارباژێردا بە فرۆکە بڵاو کردەوە. جگە لەمەیش «تعمیم» یکی بە پروسکە بە سەر کەرتەکانی فەیلەقەکەی دا بڵاو کردبوەوە لە یەکێکیان دا نوسی بوی: «تقرر اباحه عرض و مال المخربین وذويهم».

مەلبەندی یەک توشی کەروگرفتێکی گەورە بوبو. ناوچەکەیان بەردەوام لە ژێر تۆپباران و بۆردومانی هێزەکانی عێراق دا بو. ناچار بون بیر لە گواستنەوە بکەن. لەو کاتەدا بەهادین لەو ناوە بو، کە ئەم پەشیوانە ئەبینی، لە سەر ئاوازی یەکێ لە سرودەکان ئەم بالۆرەیەی ڕێک خست بو:

ئەی هاوڕێیان! من ڕەنجەڕەم
من ....م
قوڕی دنیا بە سەر سەرم
جاش و عەسکەر هاتنە سەرم
مەلبەندی یەک بۆ کوێ بەرم؟

*

## شەڕ لە ۳ مەیدان دا

ئێمە لە ۳ لاوە لە شەڕەوە گلا بوین: شەڕ لە گەڵ عێراق، شەڕ لە گەڵ ئێران، شەڕ لە گەڵ جود. زۆر کەس بە شێتیان ئەزانین و، ئامۆژگاریان ئەکردین بۆ ماوەیەکیش بێ، شەڕ لە یەکێ لەم مەیدانانەدا سارد بکەینەوە.

هەوڵەکانی خۆمان لە گەڵ جود بەری نەگرت.

هەمو ئەو وتارانەی لە رادیو بە نیازی بانگکردنی لایەنەکانی جود بۆ ئاشتی، بەو پەڕی توندی و، بە جنێوی ناشیرین، لە رادیوی پارتیەوە وەڵامیان ئەدایەوە.

هەمو ئەوانەی ئامادەییان پیشان دا بو بۆ ناوبژی لە نێوان یەکێتی و جودا، ئێمە قبوڵمان کرد بو، لە ناو ئەوانەدا مەلا، ریش سپی، سەرۆکی عەشیرەت، ئەدیب، مامۆستای زانستگایان تێ دا بو. نە پارتی و نە حشع گوێیان نەئەدایە قسەی هیچ کامێکیان. پەیوەندی لە گەڵ سەرانی جود بۆ کەسانی کە لە سلێمانی و بەغدا ئەژیان کارێکی دژوار بو، چونکە ئەوان لە ئێران بون و، کەس بە ئاسانی دەستی نەیان ئەگەیشتێ.

مامجەلال نامەی بۆ کاربەدەستانی سوری و، بۆ خالید بەگداش سکرتێری حیزبی شیوعی سوری و، بۆ نایف حەواتمە سکرتێری جەبهەی دیموکراتی فەلەستین نوسی بو، داوای لێ کرد بون لە نێوان یەکێتی و حشع دا ناوبژی بکەن. حشع گوێیان نەدانێ و، ئامادەی ئاشتبونەوە نەبون.

ئۆمێدێکمان نەمابو بەو نزیکانە لە گەڵ جود ئاشت ببینەوە، بە تایبەتی سەرانی جود لەو کاتەدا زیاتر کەوتبونە ژێر «ئیهتیماز» ی ئێرانیەوە، ئێران خۆی ئامادە نەبو لە گەڵ یەکێتی پێک بێ، لە بەرئەوە ڕێگەیشی بە جود نەئەدا لە گەڵ یەکێتی ئاشت ببنەوە.

ئێمە لە گەڵ دەرەوە پەیوەندیمان زۆر کز بو. زۆرجار بە رادیو پەیامی کورتمان بۆ

ئەناردن. لە پەیامەکان دا ناوی نهێنی ئێمە بە کوردی: «ئاسودە» و بە عەرەبی: «صابر» و، هی هەڤالانی دەرەوە کە لە شام وەریان ئەگرت بە کوردی: «ئاوارە» و بە عەرەبی: «صامد» بو. پەیامەکەی خۆمان بە رادیۆکەی یەکیتی دا ئەنارد و، پەیامەکەی ئەوانیش لە رادیوی «صوت العراق» وەرئەگرت کە بەعسیە عیراقیەکانی سەر بە سوریا سەرپەرشتییان ئەکرد.

پەیامیکمان نارد بۆ هەڤالانی دەرەوە. کورتیەکەی ئەمە بو:
ئیمە لە ۳ لاوە لە شەرەوە گلاوین. هەولی زورمان داوە لە گەل جود پیک بیین. سەری نەگرتوە. لە گەل سوریا و لیبیا و فەلەستینییەکان هەول بدەن شەری ئیمە و جود رابگرن و، ئیران ئیتمان بۆ نەهێنی، ئەگینا ناچارین خۆمان هەول بدەین شەر لە گەل عیراق رابگرین.

لەو کاتەدا د. فوئاد مەعصوم، عەبدولرەززاق فەیلی، دارۆی شیخ نوری، سەرپەست بامەرنی، حسین سنجاری.. لە شام بون.

*

## ئازادکردنی بیتواتە

بیتواتە گوندیکە کەوتۆتە بناری چیای ماکۆک و چیای شەششار بە سەری دا ئەروانی. جیگایەکی خۆش و ئاووهەوای سازگارە. پێ ئەچی لە زۆر کۆنەوە ئاوەدان بوبی، هەندی شوینەواری دیرینەی تی دا دۆزراوەتەوە. خەلکی بیتواتە لە پەنچوکردنی بزنی مەرەز و، دروستکردنی کردا شارەزاییەکی زۆریان هەبو. زۆر مال دەزگای تەونگەری تی دا بو.

لە سەرەتای شۆرشی ئەیلول دا عومەر مستەفا بنکەی پیشمەرگەی تی دا دانا و، بو بە بنکەی هیزی کاوە. پاشان مەلا مستەفا عەلی شەعبان بارزانی لی دانا، کە یەکی لە هاوسەفەرەکانی سۆڤیت و باوەرپیکراویکی نزیکی بو. عەلی شەعبان کابرایەکی زۆردار بو. ریزی دانیشتوانی ناوچەکەی نەئەگرت. بیگاری پی ئەکردن و، خەریکی خۆ دەولەمەن کردن بو. بە زۆر کچی یەکی لە بنەمالە ناسراوەکانی ناوچەکەی هینا.

ئەنوەر بەگ، کە لە بنەمالەی میرانی خۆشناو و، ژنبرای عەباسی مامەند ئاغا بو. لە پەنجاکان دا کریکاری دائیرەی غابات و، لە سەرەتای شۆرشی ئەیلول دا بەشداری خۆپیشاندانی چەکداری عەشائیر بو، هاتە ریزی شۆرشەکەوە، لە بیتواتە دائەنیشت، بە بیانوی کیچەلی عەلی شەعبانەوە هەلات و، پەنای بۆ حکومەت برد. هیزیکی جاشی لە ناوچەکەدا پیکەوە نا. ئەم هیزە تا بەیانی ئازاری ۷۰ مایەوە. دوای ئەوە چو بۆ بەغداد لەوی دانیشت. بۆ دابینکردنی گوزەرانی خیزانەکەی چاخانەیەکی دانا بو.

کە بەعس کەوتەوە جاش گرتن. ئەنوەر بەگ سەرلەنوی چەکی بۆ حکومەت هەلگرت دژی شورشەکە. دوای ئاشبەتال گەرایەوە بیتواتە و، بو بو بە دەسەلاتدارترین کەسی ناوچەی خۆشناوەتی. لە دوای دەس پیکردنەوەی خەباتی چەکدار ئەنوەر بەگ سالی ۱۹۷۷ دیسان مەفرەزەیەکی جاشی دروست کردەوە. لە لەشکرکیشیەکانی حکومەت دا بەشداری ئەکرد و، هەندی جار هیزەکەی ئەنارده راوی پیشمەرگە. ئەگەر جاران بەهانەی ئەوە بو لە دژی بارزانی بوە بە جاش ئەمجارەیان هیچ بیانویەکی لەو بابەتەی نەبو، چونکە ئەم پیشمەرگانە بارزانی نەبون، بەلکو پیشمەرگەی یەکیتیی نیشتمانی و، هەندیکیشیان خۆشناو بون. ئەنوەر بەگ بە هۆی ئەم دەسەلاتەوە ترس و لەرزیکی زۆری خستبوە ناو دلی دانیشتوانی ناوچەکەوە،

هەرکەس گوێڕایەڵی نەکردایە و، دڵسۆزی نەنواندایە، ئازاری ئەدا.

مینێک لە ژێر ئۆتۆمۆبێلێک دا تەقیەوە. یەکێ لە کوڕەکانی ئەنوەر بەگ لە ناو ئۆتۆمۆبێلەکەدا کوژرا. لە سەر ئەمە ناردی کوێخا ڕەسوڵی بێتواتە بگرن. کوێخا ڕەسوڵ لە ڕانیە دانیشتبو، هاوڵاتیەکی ئاسایی بو، تەنیا تاوانی ئەوەبو باوکی ڕەشۆ بو کە پێشمەرگەی یەکێتی بو. کوێخا ڕەسوڵ بە مەی زانی لە دەستیان هەڵات و پەنای بۆ بارەگای حیزبی بەعس برد لە ڕانیە. ئەنوەر بەگ ناردیە ناو بارەگای بەعس کوێخا ڕەسوڵیان دەرهێنا. بارەگای بەعس کوێخا ڕەسوڵیان نەپاراست. هەر لەوێ دا کوشتیان و، لاشەکەیان بە دوای ئۆتۆمۆبێلێک دا تا بێتواتە ڕاکێشا و، لەوێ بە بەر چاوی خەڵکەوە لاشەکەی سوتاند. ئەم تاوانە بێ سزا تێ پەڕی.

ئەو کاتەی هێزەکانی ئێمە هاتنە خواری بۆ دۆڵی باڵیسان، سنوری دەسەڵاتی ئەنوەر بەگ لە بێتواتە و ڕۆژهەڵاتی دا بو. بەڵام کە بارەگای مامجەلال گوێزرایەوە بۆ دۆڵی باڵیسان و دواتر بۆ بۆتێ لە دۆڵە ڕەقە. ئەنوەر بەگ ویستی دەس بە سەر ناوچەکەدا بگرێ، ڕێگای ڕانیە بۆ خەلیفان بۆ هێزەکانی حکومەت بکاتەوە و، بارەگا و هێزەکانی مەڵبەندی چواری یەکێتی لە دۆڵی باڵیسان دەربکا. کردیە سەر هەمو گوندەکانی ناوچەکە کە ئەبێ چەکی جاشایەتی بۆ حکومەت هەڵبگرن. دانیشتوانی ناوچەکە کوردپەروەر بون نەیان ئەویست بین بە جاش کەوتە گەف و هەڕەشە لێیان.

ئەنوەر بەگ بە تێرێک دو نیشانی ئەشکاند. سەرکەوتنێکی جەنگیی بە سەر یەکێتی دا بۆ حکومەت بە دەس ئەهێنا و، جادەیەکی ستراتیجی بۆ هاتوچۆی هێزە چەکدارەکانی عێراق ئەکردەوە. لە هەمان کات دا ئەیکرد بە منەتێکی گەورە بە سەر جودا، یەکێتی جودی لە خۆشناوەتی دەرکرد بو، ئەویش یەکێتی دەر ئەکا. بەشێ لە چەکدارەکانی جود کە تەسلیم بوبونەوە لای ئەنوەر بەگ بوبون بە جاش و، چەندین جاش - پێشمەرگەی پارتی لای ئەنوەر بەگ ئامێر مەفرەزە بون.

د. کەمال خۆشناو، لێپرسراوی مەڵبەندی چوار، ئەویش بەگزادەی خۆشناوە. بە زمانی شیرین هەواڵی بو نارد کە زۆر لە دانیشتوانی ناوچەکە نەکا و، واز لەو پلانە بهێنێ. ئەنوەر بەگ وەڵامی دابوەوە کە ئەو گەورەی ناوچەکەیە و، ناوچەکە هی خۆیەتی، ئەبێ مامجەلال و مەڵبەند ناوچەکە بە جێ بهێڵن. لە هەمان کات دا کردیە سەر سەرگەورە و ڕیش سپیەکانی ناوچەکە، هەمویانی گل دایەوە و، بە زۆر گوندەکانی زیوە، هەرتەل، وەری، نیوە، سەردۆڵ، مێرگەسەر، چیوە.. ی چەکدار کرد و، بە شۆفل و بلدۆزەر سەنگەر و ڕەبیەی پێ دروست کردن. کار وا بروێشتایە هەمو ناوچەکەی ئەگرت.

لە ناو بێتواتەدا کۆمەڵە ڕێکخستنی باش و بەهێزی هەبو. ئاگاداریی وردیان لە سەر هێز و شوێنەکانی چەکدارەکانی ئەنوەر بەگ و حکومەت هەبو. مامجەلال خۆی لە بۆتێ بو، کە نزیک بو لە ناوچەکەوە. لە سەر بنچینەی ئاگاداریەکانی شانەکانی کۆمەڵە و، بە پرس و ڕاوێژی ئەوان، نەخشەیەکی دانا بۆ گرتنەوەی ئەو گوندانەی گیرا بون و، بۆ دەرکردنی ئەنوەر بەگ لە بێتواتە. مامجەلال هێزەکانی مەڵبەندی ٣ و چواری ساز دا و، لە مەڵبەندەکانی ١ و ٢ هەندێ هێزی تری داوا کرد.

*

### نەخشەی سەرکەوت

مامجەلال نەخشەکەی بە ناوی حیزبیی مامۆستا جەمال تاهیر «سەرکەوت» ەوە ناو نا بو، کە تازە بە هێزی وەرگەرانی ئۆتۆمۆبیلەوە لە دۆلی بالیسان کۆچی دوایی کرد بو.

هێزەکانی کرد بو بە ۳ بەش بۆ ئەوەی لە ۳ قۆلەوە پەلامار بدەن:

قۆلی یەکەم، هێزەکانی مەلبەندی چوار بە سەرپەرشتی شەوکەتی حاجی موشیر بۆ شاخی هەوری و گرتنەوەی چیوە و سەردۆل و میرگە سەر.

قۆلی دوەم، هێزەکانی مەلبەندی سێ بە سەرپەرشتی حەسەن کویستانی بۆ شاخی شیرە و گرتنەوەی دەرە زیوە.

قۆلی سێیەم، هێزەکانی مەلبەندی یەک و دو بە سەرپەرشتی مامجەلال خۆی، لە دۆلی شاورەوە بو سەر شاخی ماکۆک و ئینجا دابەزین بۆ ناو بیتواتە.

رۆژی ۲۰ ی تشرینی یەکەم قۆلەکەی مەلبەندی چوار هێرشەکەی دەس پێ کرد. گوندی نێوەیان گرت و شکانی جاشەکان دەستی پێ کرد و، لە هەمو قۆلەکانەوە پەلامار دران. بو رۆژی دوایی هەمو دۆلی بالیسان و بیتواتیش کەوتە دەس پێشمەرگەی یەکیتی و، هەمو هێزەکان لە بیتواتە یەکیان گرتەوە.

ئەمە شەرێکی گەورە بو، هێزێکی گەورە بەشداری تێ دا کرد و، لە ناوچەیەکی شاخاوی فراوان دا بو. توانای یەکیتی بۆ شەری گەورە دەرخست. سەرکەوتنێکی گەورە بو بۆ پێشمەرگە و بۆ دانیشتوانی ناوچەکە، وورەی خەلکی زۆر بەرز کردەوە. بەلام تالان و راووت، بە تایبەتی لە بیتواتە، رەونەقی ئەم سەرکەوتنەی کەم کردەوە. مالی هاورێکانی کۆمەلەیش لە بیتواتە کە دەورێکی کاریگەریان هەبو لەو سەرکەوتنەدا بەر تالان و سوتان کەوت. مامجەلال لەم تالانە زۆر نارەحەت بو. فەرماندەکانی کۆ کردەو و سەرزەنشتی کردن و، لیژنەیەکی لێکۆلینەوەی دانا بۆ وەرگرتنەوەی کەلوپەلی تالانی. راستیەکەی ئۆبالی ئەم کارە لە پلەی یەکەم دا ئەکەوتە سەر دەزگای راگەیاندن، بە تایبەتی رادیو، نەک پێشمەرگەکان. چونکە دەزگای رادیو، وەکو بەشێ لە راگەیاندنی شەر بۆ بەرزکردنەوەی وورە و، تاودانی هەلمەتی شۆرشگێرانەی پێشمەرگەکان، هانی دابون: دەستیان لێ نەپارێزن و، مالیان تالان بکەن و، خانوبەرەیان ئاگر تێ بەر بدەن.

*

### مفاوەضە لە گەل بەعس

لەو چەند مانگەدا کۆنفرەنسی ناوچەیی کەرتەکانی رێکخستنی کۆمەلە تەواو بو. ئازاد هەورامی، رێکەوتی عوسمان بەگ، قادری حاجی عەلی بەگ، کە سەرپەرشتی کۆنفرەنسەکانیان کرد بو، هاتنە ناوزەنگ بۆ ئەوەی ئەنجامی کارەکەیان بۆ من باس بکەن.

ئەرکەکانی کۆنفرەنس چەند شتێ بو:

١. هەلسەنگاندنی هەلومەرجی رێکخراوەیی، پێشمەرگەیی، دارایی.. کەرتەکە و، هەلومەرجی سیاسی کوردستان و عیراق.

٢. هەلبژاردنەوەی ئەندامانی کەرت.

٣. هەلبژاردنی نوێنەرانی کەرت بۆ کۆنفرەنسی سێیەم.

٤. وەرگرتنی بیروڕای ئەندامان لە سەر گفتوگۆ لە گەل بەعس، ئاخۆ زۆرایەتی لە

جگە لە مان، د. سەید عەزیزی شەمزینی و صەلاحەدینی موهتەدی و چەند کەسێکی تر بەردەوام نامەیان لە گەڵ مامجەلال ئاڵوگۆر ئەکرد.

*

کۆمەڵە لە ئێران لە ناو خۆیان دا بڕیاریان دابو خانەی موعینی کە یەکێ لە کادرەکانی سەرکردایەتییان بو، تازە لە زیندان بە سەربەرزی دەرچو بو، بنێرن بو کوردستانی عێراق بو لای ئێمە. محەممەدی مەلا عەلی هێنا بوی بو ناوچەی ئالان بەرەو رووی ئەحمەد فەتحوللا، جێگری فەرماندەی هەرێمی ٣ ی، کرد بوەوە بیگەیەنێتە لای ئێمە. لەو کاتەدا شوێنی ئێمە ئادیار بو.

چەند رۆژێ خانە لە گەڵ ئەحمەد بو، جەیش لە ٢١ ی حوزەیرانی ٧٨ دا هێرشی بو کردن بو سەر «کانی بێشو» لە نزیک گوندی «دری» لە ناوچەی ماوەت. لەم هێرشەدا ٦ کەس کوژران، یەکێکیان ئەحمەد و ئەوی تریان خانە بو.

خانە، وەکو هاورێکانی ئەیانوت گەنجێکی رۆشنبیر و تێگەیشتو و ئازا بو. برای شەهیدان: سولەیمان و عەبدوللا و، کوری محەممەد ئەمینی موعینی بو.

دوای کوژرانی خانە دو کەسی تر لە هاورێکانی بڕیار ئەدەن بێن بو کوردستانی عێراق، ئەوەدەم ئێمە لە دەراوی گورگان بوین لە قەندیل، هەردوکیان گەیشتن: د. جەعفەری شەفیعی خەڵکی بوکان و، ساعیدی وەطەندوست (کاک برایم) خەڵکی سنە بون. ساعید لە گەڵ خوی چەردەیەک پارەی بو هێنا بوین پاشەکەوتی کرد بو. د. جەعفەریش لەو کاتەدا بو ئێمە زور بە سود بو چونکە پزیشکمان نەبو. تەنها یەک برینپێچمان هەبو، ئەویش هەر ئێرانی بو، ئەندامی «سازمانی ئینقیلابی» بو.

دو پیاوی رۆشنبیر و تێگەیشتو و بە زات و ورە بەرز بون. حەزیان نەئەکرد کەس بزانێ کە ئێرانین و ناویان چیە

*

رۆژێکیان لە بەردەمی چادرەکەی خومان دا دانیشت بوین، حەمە سەعید لە دوورەوە دو کەسی بە دی کرد، یەکێکیان جلی کوردی و، ئەوی تریان پانتۆڵێکی جینز و کراسێکی زەردی لە بەر دا بو، پرچی بەر دا بوەوە. وتی: «وابزانم رۆژنامەنوسە».

کە نزیک کەوتنەوە پانتۆڵ لە پێکە عومەری حاجی عەبدوللا بو. زورم پێ خوش بو ئەویش بە سەلامەتی گەیشتەوە لامان. کاک عومەر لە گەڵ کاروانەکەدا رۆیشت بو بچێ بو سوریا و، لەوێوە بە یەکجاری بڕوا بو ئەوروپا. ئەم نامەیەکیان پێ دا نارد بو بو سەرکردایەتی کۆمەڵە. بە ناو ئێران دا لە مەهابادەوە بە نهێنی لە گەڵ یەکێکی شارەزادا

گەرا بوەوە. کردم بە گاڵتە لە گەڵی، وتم: «سەفەری دەرەوت کرد. دو وڵاتی بێگانەت بە بێ پاسپورت و ڤیزا بینی – مەبەستم تورکیا و ئێران بو – ئیتر هیچ گلەییت نەماوە!»
کاک عومەر لای ئیمە گیر نەبو ئیزنی خواست بو سەردانی کەسوکاری بگەڕێتەوە نزیک سلیمانی.
سەرانی قم، سامی سنجاری و هاوڕێکانی، چەند جارێ لە گەڵ ئازاد هەورامی و عومەر دانیشت بون. بەو ئیعتیبارەی هەردو ڕێکخراو: «قم» و «کومەلە» مارکسین، باسی ڕێککەوتنی دوقولی و هاوکاریان لە گەڵ کرد بون. بو دەربڕینی نیازی باشی خویان ئەم نامەیەیان نوسی بو و، داوایان بە عومەر بیهێنی و، دریژەی قسەکانیشمان بو بگێڕیتەوە.
قم تاکتیکیکی زیرەکانەی هەلبژارد بو: ئەیویست یەکیتی لە ناوەوە هەل بوەشێنێ. پیوەندی لە گەڵ کومەلە و بزوتنەوە، بە جیا لە یەکیتی یان وردتر بە جیا لە مامجەلال، دروست بکا. لەوی، لە گەڵ ئازاد و عومەر لە سەرکردایەتی کومەلە دانیشت بون و، ئەم نامەیەیان بو کومەلە نوسی بو، هەر بەو جورە لە گەڵ کاک تاهیر و سەید کاکیش لە سەرکردایەتی بزوتنەوە دانیشت بون و، پەیوەندییان لە گەڵ ڕەسول مامەند کرد بو.
تاکتیکەکەی سامی بە سەر ئیمەدا لە کومەلە تی نەپەری، ئیمە سور بوین لە سەر ئەوەی کە ئەگەر بیانەوی ڕیک بکەون ئەبی لە گەڵ یەکیتیی نیشتمانی ڕیک بکەون، نەک لە گەڵ بالەکانی و، داوامان لی کردن چارەنوسی هەڤاڵە بزرەکانمان ئاشکرا بکەن و، لە گەڵ ئەوان گفتوگوی ڕێککەوتن دابمەزرێنن.
بە ڕاوێژ لە گەڵ مامجەلال و د. مەحمود وەلامی نامەکەمان بو نوسینەوە. هەر ئەو کاتە ئەسلی نامەکەی قم و وینەی وەلامەکەی خومانم بو ئاگاداری و هەلگرتن نارد بو هەڤاڵانی دەرەوە. ئەبی لە لایان مابی.
بەلام تاکتیکەکەی سامی کاری لە بزوتنەوە کرد و، پشیوییەکی زوری خستە ریزەکانیانەوە. ڕەسول و هەندی لە هاوڕیکانی شاری کە ماوەیەک بو نارازی بون لە یەکیتی، ئەو کارەساتەی بە سەر یەکیتی هات بو دائەنا بە بەلگەی ڕاستیی بوچونەکانی خویان. بە تەنیا کەوتنە پەیوەندی و گورینەوەی نامە. ئەمەش پیچەوانەی ئەو ڕێککەوتنانە بو کە لە ناو خومان دا لە سەری پیک هات بوین. پەیوەندی لە نیوان هەر ۳ بالەکە دا: کومەلە، بزوتنەوە، خەتی گشتی، لە سەر بنچینەی جوری لە فیدرالیزم ڕیک خرا بو. لە ناو یەکیتی دا هەر بالە سەرکردایەتی تایبەتی و، سەربەخویی ئایدیولوجی و، ڕێکخراوەیی خوی هەبو، بەلام لە کاروباری پێشمەرگەیی و، دارایی و، پەیوەندی سیاسی

# بەڵگە

١. وتاریکی گۆڤاری «رۆژناهی»، شام، ژمارە ١٧، سالی ٢، ١ ی ئابی ١٩٤٣
٢. شەجەرەی بنەماڵەی بارزانی. دوای ئاشبەتاڵ داتەرەی «ئەمن» ئامادەی کردوە.
٣. لێدوانی «پراڤدا» لە سەر شەری کوردستان. رۆژنامەی «الاخبار» بەیروتیەوە، رۆژی ٦٣/٧/١٤
٤. لێدوانی رۆژنامەی «الجمهوریە» ی بەغدادی، رۆژی ٦٥/٣/١٤
٥. گفتوگۆیەکی رۆژنامەوانی شێخ ئەحمەد. رۆژنامەی «الهلد»، رۆژی ١٩٦٥/٢/٢٤
٦. نامەی حەبیب محەمەد کەریم بۆ ئەمیر.
٧. نمونەی موهاتەراتی سالی ٦٦ لە «خەبات» ی مەلایی و جەلالی دا.
٨. سەرژمێری چوار سالی شەری یەکێتی - بەعس. «الشرارە» ی مایسی ١٩٨.
٩. تەقریری «ئەمنی عام» بۆ صەددام حسین لە سەر خۆپیشاندانی شارەکان.
١٠. بەرنامەی کۆمەڵە بۆ: پێشکەوتنی کۆمەڵایەتی و، چارەسەرکردنی کێشەی نەتەوایەتی.
١١. نمونەیەک لە بڵاوکراوە ناوخۆییەکانی کۆمەڵە: «ژیانی رێکخراوەیی».
١٢. بەیانی یەکێتی و بەڵگە دەربارەی شەری یەکەمی جود.
١٣. بەیانی یەکێتی و بەڵگە دەربارەی شەری دوەمی جود.
١٤. راپۆرتێکی ئیستیخباراتی عەسکەری باسی دەوری خۆیان ئەکا لە خۆشکردنی ئاگری شەری ناوخۆی کوردا.

SAL 2
HEJMAR 17

YEKŞEMB
1 TEBAX 1943

# RONAHÎ

ANNÉE 2
NUMERO 17

DIMANCHE
1 AOÛT 1943

SUPPLÉMENT ILLUSTRÉ DE LA REVUE KURDE HAWAR

## PALEYIYA INGILÎSTANÊ



Di vî şerê xwînxwar de Ingilîstan ne bi tenê di qadên şer de, lê di her warî de xebateke zor xebitiye; guh daye cotkariyê jî. Resimê jorîn gundikî ingilîzî şanî dide yê ko digel keça xwe şixra xwe dikişîne. Lê welê dixuye ko ingilîz şixra xwe ne li ser ker û hêştiran lê li ser ereban dikişînin.

ÇAPXANA TEREQIYÊ
ŞAM — 1943

# ŞÊXÊ BARZAN
## ÇAWAN FIRANDIN?!..

Îro li nav kurdên nîvro gava şexê Barzan tête gotin, şêx Ehmedê ko bi Xudanê Barzan hatiye nasîn tê bîra mirov. Ev şêxê ko hatiye firandin ne Xudanê Barzan şêx Ehmed; bavê wî şêx Mihemed e. Der heqê Xudanê Barzan da jî, di hejmara pê vê da, ezê zanîna xwe binivîsim.

Ev çîroka ko dixwazime bêjim, ne tiştekî xeyalî ye; lê tiştekî qewimî û rast e. Berê, min ev çîrok ji devê şêxê Garisî şêx Evdirehman bihîst. Paşê min dûr û dirêj pirsî, dawiya ko min xwe gihandê, gotina şêxê Garisî ê rehmetî bi tevayî rast bi derket.

Şêx Mihemedê Barzan yek ji şêxên terîqê bû. Ji wan şêxên ko nizanin şêxîtî û mirîdîtî çi ye; bi tenê ji nezaniya milet destkewtî dibin û xwe di bin navê şêxitiyê da li ser serê kurdên reben dikin mezin û riya debareke şahane ji xwe ra, riya mezinahiya cihê ko tê da jî ji kurên xwe ra pêk tînin. Lê bi ser vê yeka han da; şêx Mihemed ne mirovekî beradayî bû. Teqez ji gelek şêxan qenctir û çaktir bû. Qe ne wek şêxên mayî di riya bêemiriya Xwedê da pêş da ne diçû. Heke gunehekî wî hebû, bê ko qeweteke manewî li cem hebe, xwe xwedî manewiyet da bû zanîn û di qeza Zîbarê da gelek mirov bi mirîdî li serê xwe civandi bûn. Ji xwe ev gunehê han bû ko bû bû sebeba firandina wî.

Di serê babilîska bîstan da li qeza Zîbarê şêx Mihemedê Barzan di nav eşîrên Mizûrî, Şêrwan û Berojiyan da navekî baş biri bû. Xelkê wî, ewçend jê hez dikirin ko di riya şêx da û ji bo daxwazên wî mirin, bextiyariyeke mezin dizanîn. Ji dilpaqijiya xelkê wî pêva, dilçakî û rûnermiya şêx jî ev hezkirina



BENDERA TÛNISÊ: Roja ko general De Gol gihaştiye Tûnisê balafirên fransizî di ser benderê re firiyane û hatina serekê Fransa Şerevanî şahînet kirine.

## کورتە پاوێژێک
## لە داوێنی بەشی ناوخۆدا

کومەلی کوردستان ، وەک هەر کومەلێکی ترەچینی ئەم دنیایە ، پێک هاتوە لەچەند چین و توێژی کومەلایەتی جیاواز ، کە هەریەکەیان بەپێی شوێنی جیاوازی خوی لە سیستەمی بەرهەمی کومەلایەتی دا ، خاوەنی قازانج و دەسکەوت ، بیر وبوچون ، بەلکو جیهانبینی تایبەتی خویەتی و لەروانگەی چینایەتی تایبەتی خویەوە سەیری رووداوەکانی کومەل ئەکا و لێکی ئەداتەوە و ڕێگە وشوێنی چارەسەرکردنی بە قازانجی خوی دا ئەنێت .

چینەکانی کومەل هەمیشە لە ململانێ دان ، بەتایبەتی لەسەر مەسەلەی دەسەلاتی سیاسی ، لەئاکامی جولانەوەیەکی وەکو جولانەوەی کوردا ، هەلبەتە لە ململانێ دا ئەبێ بو ئەوەی هەرچین وتوێژەی بەکوێرەی قازانجی چینایەتی تایبەتی خوی جولانەوەی کورد بەرەوە ببات و دەست بەسەر سەرکردایەتیەکەی دابگری و ڕێبازەکەی و شێوەی کەسار و چوارچێوەی پەیوەندییەکانی و سنووری دوست و دوژمنەکانی دیاری بکات ، وە بەکوێرەی جیهانبینی خوی بەرنامەکەی دابڕێژێ و هەولی جێبەجێ کردنی بدات .

مەسەلەی بنچینەیی لە شورشدا ، نەک هەر لەشورشی کوردستاندا ، بەلکو لە هەمو شورشێکدا لەسەرانسەری دنیادا مەسەلەی بەدەستهێنانی دەسەلاتی سیاسییە ، مەسەلەی ئەوەیە کە کێ سەرکردایەتی جولانەوەکە ئەگرێتە دەست ، ستراتیج و تاکتیکەکانی ، بەرنامەکەی ، دوست و دوژمنەکانی ، ڕێبازەکەی ، ئوسلوبی کارکردنی و شێوە جوراوجورەکانی دیاری ئەکات .

هەر لەبەرئەوە لەکوردستاندا ، لە توناغی ئێستادا ، کە جولانەوەیەکی پر تەوژم وبەجوش لەمەیدانی کومەلی کورد دایە ، شەری ناوخو شێوەیەکە لە شێوەکانی ململانێی چینایەتی بەپێی چین توێژە کومەلایەتییە جیاوازەکانی ناو کومەلی کورد لەمەیدانی بەدەستهێنانی دەسەلاتی سیاسی ، یان بەواتایەکی ڕوونتر ، لەمەیدانی بەدەستهێنانی پێشڕەوایەتی وسەرکردایەتی جولانەوەی کوردا .

توند وتیژی یا نەرمی وخاوی ناکوکییەکان و تەقینەوەیان سەرهەلدانیان دیاردەیەکی بابەتییە لەسەرووی ویست و ئارەزووی کەسەخێرخواز وخێرنەویستەکانەوەیە ، بەلکو بەندە بە تەرازووی هێزی چینەکانەوە ، لەبواری ئابوری ، سیاسی ، کومەلایەتی ، چەکداری ... هتد دا .

دەرەبەگایەتی وسەرکردایەتی خێلەکی بەئارەزووی خویان لەشانوی مێژووی کورد دانابەزن بو چینی بورجوازی و هەروا بە ئاسانی دەور وتەسلیمی سەرکردایەتی جولانەوەی کورد لەگەل چینی بورجوازی دا ناکەن .

وە چینی بورجوازی بو سەرکردایەتی ورده بورجوازییش بە ئارەزووی خویان لە شانوی مێژووی کورد دانابەزن بو چینی کرێکار و رەنجدەرانی کوردستان وەهەروا بەئاسانی دەور وتەسلیمی سەرکردایەتی جولانەوەی کورد لەگەل رەنجدەرانی کوردستان دا ناکەن ، بەلکو تا دوا هەناسە پەلەقاژێ مانەوەی دەسەلاتی خویان ئەکەن ، زەبروزەنگ بەکار ئەهێنن ، کوشت وکوشتار ئەکەن ، ئەسات وسەودا ئەکەن ، دەست لەگەل بێگانە وتەنانەت شەیتان تێکەلا و ئەکەن بو ئەوەی بە ژیانی بەهێزتر دەسەلاتی خویان بکەن .

جولانەوەی کورد لە دوای سەد سال شکان وهەلسانەوە ، لەدوای سەد سال تەجروبە و ئەزموون ، لە دوای ڕیسوابوونی سەرکردایەتی دەرەبەگی و خێلەکی ، لەدوای ناپوت بوونی سەرکردایەتی بورجوازی ، لەدوای ئاشکرا بوونی بێکارەیی هەرە و جوزەی سەرکردایەتی ( خێلەکی و بورجوازی ) وئیسپات بوونی بوشیی بەرنامە و بیروبوچوی دروشمەکانی و چەوتی ڕێبازەکەی و نازانستیی بوچونەکانی وخراپیی جوری دیاریکردنی دوست ود دوژمنەکانی ، هەلەی ئوسلوبی کاری و شێوەکانی ... بەگرە ئیسپات بوونی سەرجەمی ستراتیج و تاکتیکەکانی ، جولانەوەی کورد ئیتر سەری بو سەرکردایەتی دەرەبەگی وخێلەکی و سەرکردایەتی بورجوازی و ورده بورجوازی دا نانەوێنێ ، سەنگی کرێکاران وفورسایی رەنجدەران زیادی کردوە ، لەتەرازووی هێزی چینایەتی ناو کومەل یدا ، جیهانبینی ئازی ، تێزێکی نوێ ، بیروبوچونێکی نوێ لەبەدیاریکردنی دوست ود دوژمن ، لەدیاریکردنی بەرنامە وڕێباز و دروشمدا ، لەدیاریکردنی ستراتیج وتاکتیکدا هاتوتە پێشەوە ، کرێکاران و رەنجدەرانی کوردستان ئیتر ئامادە نین لە پشت دەرەبەگ وسەروکی عەشیرەت و چینی بورجوازییەوە بڕون وچارەنووسی خویان تەسلیمی ئەوان بکەن ، بەلام چینی دەرەبەگ و چینی بورجوازییش ئامادە نین هەروا بە ئاسانی دەست لەسەروکی جولانەوەی کورد هەل بگرن ، هەلبەتە لەگەل گەشەکردنی ئابوری ، کومەلایەتی ، سیاسی مێژوویی ... کومەلی کوردستان دا

## هەواڵێکی تری ی ن ک :
## بۆ ئاگاداری بۆ شەری ناوخۆ
## هەڵوێستێکی تری ناشیانەی سەرکردایەتی بەرزانی بۆ هەڵگیرسانەوەی شەر

سەرەرای ئەو هەموو تاوانەی ق م هەر لە ١٩٧٥ ەوە تا ١٩٨١ بەرانبەر بە ی ن ك كرد بوی لەگەل ئەوەشدا لە كاتێكدا كە لە پاییزی ١٩٨١ دا لەگەلكۆمەڵێكی سیاسی ـ چەكداری چوارقولی جاشەكانی جودی تێكشكاند، شەری لەگەل وەستاندن و ئامادەیی خۆی نیشان دا بۆ پێكەوەژیانی هێمنانە لەگەل ق م لەكوردستانی عێراقدا بۆ ئەوەی بگەرێتەوە كوردستانی عێراق و دەس لە شەری شۆرشی كوردستان هەڵبگری. ئەوەبوو دوجار نوێنەری خۆی نارده رازان ( بارەگای سەركردایەتی بارزانی ) بۆئەوەی كات وشوێنی چاوپێكەوتنی نوێنەرانی هەردولا لەسەر هەر ئاستێكی ئەوان ئەیانەوێ ولەهەر شوێنێكی ئەوان ئەیانەوێ، دیاری بكەن. كەچی هەردو جارەكە نوێنەرەكانمان بەدەستی بەتال گەرابوەوە. تا لە بەرپرسیان بە كەلەكایی لە شارەزوور و شارباژێرەوە خۆیان بگەنەوە بە كوردستانی عێراق دا. لەگەل ئەوەشدا هەم لەسنووری سلێمانی دا وهەم لەسنووری هەولێردا دو پێكەوتنی مەیدانییان لەگەل ئێمەدا كرا بۆئەوەی بێ شەر وبێ تەگەرە هێزەكانی خۆیان لەدیوی ئێرانەوە بپەرنەوە بۆناو كوردستانی عێراق. بەلام ئەوان نەك هەر هێزی راستەقینەی خۆیان و سەركردە و بەرپرسەكانی خۆیان نەهێنایەوە كوردستانی عێراق وە نەك هەم قورسایی یەكی عەسكەرییان لەسەر عێراق دروست نەكرد و شەریان نەكرد. وەنەك هەر دەستیان لە هێرش بردنە سەر شۆرشی كوردستانی ئێران هەل نەگرت، بەلكو وەستیان لە رێگەی ئەو گەنجەر وگوجەرانەوە كە ناردبویانەوە بۆ شارباژێر وخۆشناوەتی هەم سەرچاوەی زیاد كردنی بەشەری پەیدا بكەن بۆ ناردنیان بۆ جاشیەتی بەدیوی ئێران. وە هەم بە شێوەیەكی زۆر نامەردانە كەوتنە شەر فرۆشتن بە هێزەكانی یەكێتی وخەریك كردنیان بە دروستكردنی رووداوی لاوەكی. ئەمە سەرەرای ئەوەی بە جۆرێكی بەربلاو كەوتنە دەس تێكەلاو كردن لەگەل ئەرتەشی پاسدار و بەسیجی ئێرانی دا بۆ داگیركردنەوەی مەحوەری خانە ـ سەردەشت پەلاماردانی بنكەكانی حزبی دیموكراتی كوردستانی ئێران و كۆمەلەی شۆرشگێری زەحمەتكێشانی كوردستانی ئێران. تا كار گەیشتە ئەوەی هێزەكانی خۆیان لە ئالوتان و دوایی تر لە كونەمشك لە نزیك بارەگاكانی سەركردایەتی ی ن ك لە مۆل دا بە نیازی پەلاماردانی ناوچەكانی ناوزەنگ، زەلێ، شنێ كە ماوەی ٥ سال بو بارەگا گرنگەكانی سەركردایەتی ی ن ك ی لێ جێگیر بوبو وە بوبوە بنكەی حەوانەوەی چەند بن تاقمی ئازادیخوازی عێراقی وكوردستانی.

ق م ماوەی چەند مانگە بەشێكی گرنگی هێزەكانی ی ن ك یان بەخۆیانەوە خەریك كرد ـ هەروەها بەد گرتنی خەلك لەبەردەمی مەزودا. سەبارەت بە نیازی شەر فرۆشانەی ق م، كومیتەی سەردەر... یەكێتیی نیشتمانیی كوردستان روونكردنەوەیەكی لەسەرهاتنی هێزی ق م بەسەركردایەتی سو حەسو میرخان بۆسەرگردی بەران لە بناری چیای جاسوسان بەرانبەر بارەگاكانی سەركردایەتیبوو سەبكردنی تەقە دەركرد.

سەرەرای ئەمانە هەموی ی ن ك هەولی دا لەگەل ق م كە ئاگربری شەری ناوخۆ بكات. لەرێگەی دوستانی سوری و لیبی و چەند حزب و رێكخراوی بیگانەوە. وە لەرێگەی حشع و چەند بن كەس ولایەنی ترەوە، هەولیدا كە شەر لەخۆی دوور بخاتەوە. تارادەی ئەوەی كە راستەوخۆ پەیوەندی لەگەل حەسو میرخان زازاكی كرا بۆ ئەوەی بزانن نیاز لە هاتنەكەی چییە؟ ئەگەر گەرمكێشی بێتەوە كوردستانی عێراق ئەوە كەس رێگەی لێ ناگری، خۆ ئەگەر گەرمكێشی هێزەچەكدارەكانی حكومەتی ئێران بێنە وچە ئازادەكانی كوردستانی عێراقدا وەبكات ئەوە رێگەی پێ نادری. سەركردایەتی ی ن ك هەڤال محمدی رەشان فەرماندەی تیپی ٦١ ی كورەش كە لەبەرپرسراوێكی ناوچەكە بو لەگەل هەڤال علی وەیس كە رابەری سیاسی تیپەكەی ئاسوس بو راسپارد راستەوخۆ پەیوەندی لەگەل حەسو بكەن وئەگەر رازی بو بیبینن و گفت وگۆی لەگەل بكەن وهەول بدەن لەگەلی بگەنە ئەنجامێكی هێمنانە.

هەڤال محمد نامەیەكی بو حەسو نوسی

كوردستان یان نەمان

بو/ برای بەرێز كاك حەسو میرخان

سلاوێكی شۆرشگێرانەی گەرم

هیوادارم سەركەوتوبن بوخەباتی رەوای گەلە زوردەستەكەمان كە سالەهای سالە گەلی كورد مان چاوەروانیەتی

سلاوم هەیە بۆگشت ئەوبرادەرانەی کەلاتان موجودن

برای بەڕێز وەکو زانیومانە ئێوە نیازی گەڕانەوەتان هەیە بۆ کوردستانی داگیرکراومان بەلام دەبینی هەندێک تەنگەی دوورو درێژ رووی داوە لە نێوان هێزەکانمان .بۆیە براکانمان ئەگەر ئێوە نیازی گەڕانەوەتان هەیە پێتەوای ئەتانەوێ بێنەوە بەهەمەدوەک لامان بەرەوڕووی دوژمنی داگیرکەرا بوەستین وەخۆشت ئەزانی ماوەی چەند سالە ئێمە دژی شەری کورد بەکورد بەکوشتندا ئەبین .وە ئێستاش هەمیشە ئامادەین بۆ هاوکاری وبرایەتی لەرێگای کوردایەتی دا .جا زۆرمان پێ خۆشە ئەگەر مەجال هەبایە نوێنەرێکی ئێمە ونوێنەرێکی ئێوە چاویان بەیەک بکەوی وگفتوگۆلە گەڵ یەکتری بکەن وە روون کردنەوەی زیاتری وەزعی هەردوولامان .خۆشتان ئەزانن کە ئێستا هێزەکانی ئێمە و ئێوە لە هەموو شوێنەکانی کوردستان بەیەکەوە هاوکاری یەکتر ئەکەن لەیەک سەنگەردا ئەجەنگن دژی دوژمنی داگیرکەر هیوادارین لەمەولاش هەر بەم شێوەیە بێت و چونکە جەماوەر چاوەڕوانی برایەتی دەکات نەوەک شەری کورد بەکورد بەکوشتن دان وە بە نووسراو هەر ئەوەندە ئەکری بەلام ئەگەر بێت و هەردوولامان یەکتر ببینن بەلکو ئەنجامی زیاتر روون بێتەوە وباشتر بێت .

شەری ناوخومان لەبەرژەوەندی داگیرکەرانی کوردستانە نەوەک لەبەرژەوەندی گەلەکەمانە .

هەر سەرکەوتوبین

دلسوزتان محمد عثمان
١٩٨٣/٢/١٠

تێبینی

١) ئێمە زۆرمان پێ خۆشە لەم رۆژانەدا کە بەهاری کاری لەسەنگەرەکانی کوردستان دا بین و دژی دوژمن بجەنگین .

٢) تکایە جوابمان بۆ رەوانە بکەنەوە بە زووترین کات .

خەسرۆش وەڵامی نامەکەی بە هەڵگری نامەدا داوەوە و موافەقەتی کرد بۆ لەسەر دیتنی نوێنەرەکەی یەکێتی ، سەرکردایەتی یەکێتی بۆشایەتی وای بەچاک زانی نوێنەری حشع بشیان لەگەڵ بێ ، بۆیە هەڤاڵ محمد لە نامەی دووەمدا بۆ خەسرۆی نووسیوە کە ئەمە دەقەکەیەتی :

کوردستان یا نەمان

برای بەڕێز کاک خەسرۆ میرخان

سلاوێکی شۆڕشگێرانە ... هیوادارین سەرکەوتوبن

برای بەڕێز نووسراوت گەیشت دەربارەی چاوپێکەوتنەکە ئاگاداری سەرکردایەتیم کرد ئەوانیش زۆریان پێ کارێکی باش وبرایانەیە بەلام ئەگەر پێتان باش بێ ئەوا برادەرێکی حزبی شیوعی لەگەڵ خومان ئەهێنین بۆئەوەی هەر ٣ لامان پێکەوە دانیشین و قسە بکەین جا ئەگەر پێتان باش نیە ئەوانمان لەگەڵ بێ ئاگادارمان بکەنەوە هەر خومان لەگەڵ ئێوەدا کو ئەبینەوە .

وە شوێنێک دیاری ئەکەین بۆ دانیشتنەکە کە بۆ هەردوولامان نزیک بێت . هیوادارم تۆش رەئیت هەروابێت .

هاوکاری وبرایەتی نزیک بکەینەوە .خومان دوربخەینەوە لەشەری لا بەلا لەبەرئەوەی جەماوەر دژی شەری ناوخویە و پێی خۆشە ئێمە هەموومان بەیەکەوە دژی دوژمنی داگیرکەر لەیەک سەنگەردا بین

تکایە بەپەلە ئاگادارمان بکەنەوە بەلکو بەم زوانە چاومان بەیەک بکەوی ئەگەر هات و یەک دوو نەفەر بەرەو ئێوە هاتن تکایە رێگایان پێ بدەن

هەر سەرکەوتوبین .

دلسوزتان محمد عثمان
١٩٨٣/٢/١٢

خەسرۆ موافەقەتی لەسەر دیتنی نوێنەرانی یەکێتی و حشع کرد .هەڤاڵان محمد عثمان وعلی وەیسی بە نوێنەرایەتی یەکێتی و ابوشوان (قادر رشید ناسك) و محمودی حاجی خدر بە نوێنەرایەتی حشع چوونە دەشتی وەرتێ و خەسرۆ میرخان وازێکە، وحەمید رێکانیشیان دیت .

نوێنەرانی یەکێتی لەو کۆبوونەوەیەدا بە شایەدی نوێنەرانی حشع بە خەسرۆیان راگەیاند ئەگەر ئەو نیازی هاتنەوەی هەیە بۆ ناوچەی پشدەر یاخود بۆ هەر جێیەکی کوردستانی عێراق ،ئەوا پێویست بە شاخ گرتن و تەنگکردن ناکا چونکە هێزەکانی یەکێتی لە هیچ کوێیەک رێگەی پێ ناگرن ،بەتایبەتی ئەوکاتە لە سلێمانی ولە هەولێر دوو رێکەوتنی سەیدانییان لەگەڵ ئیمزا کرابوو ،وە هێزەکانی ئەوان بە ئازادی هاتوچۆیان ئەکرد .

دەیکراتەوە، باس لەوەی لەو ئەرکە ناشیرینانەیان لەوێ بۆ ئەنجام دا. ئینجا کەوتنە شەڕ فرۆشتن بە یەکێتی نیشتمانی کوردستان و هێزەکانی خۆیان لە ئاڵۆزەکان رکونسک بەرانبەر بە بارەگاکانی سەرکردایەتی ی.ن لە لەناوزەنگە، زەڵێ، شێنێ ... کۆکردەوە.

دیسان ئەوە چەند مانگە هەمو هەوڵ و تەقەلای خۆیان و هەمو هاوپەیمانەکانی تریان لە جودا تەرخان کردوە بۆ قانع کردنی کاربەدەستانی ئێرانی کە شەڕ بگوێزنەوە بۆ کوردستان بە بەهانەی ئەوەی کە گوایا هەمو خەڵکی کوردستان لەگەڵ ئێرانە وهەمو یەکگرتنیان هەمو خەڵك بە پیشوازی ئێران و لەشکری داگیرکەری ئێرانەوە ئەچی و چەکیان بۆ هەڵ ئەگرن؟

حەمە زاڵۆکی لە یادداشتەکانی خۆیدا لە سەرکانی گاتوانی ناوچەی مەنگوڕایەتی لەوبارەیەوە بەم جۆرەی نووسیویەتی:

چوارشەممە ٥ی مورداد بەرابەر ٢٧ی تەمموزی ٨٣

بەیانی زو هەستاینەوە چوینە سەرکانی تەماشەی ناوچەی پشدەری و سەنگەسەر کرد کومکو ئاینەی لە پێش چاوان بو کەوتە فکرکرد لەوەی وەزعی رابردوی خومان کە چون کاتی خوی خەڵکی ئەم ناوچەیەی کرنوشی بو ئیمە دەبرد وەچون دووپەند ور ئیستایان کەروگوز کرد بوین لەناوە وناسکاری ئەمروش ئەم خەڵکە چون خو لە ئیمە دور

[illegible]

Wed. 27 July چهارشنبه 5 مرداد

١٦ شوال

[illegible]

٧ ـ دەستنووسی حەمە زاڵۆکی یادداشتەکانی ١٣٦٢ خورشیدی

سێ شەممە ٢٨ ی تیر بەرانبەر ١٩ تەمموز

ئەمڕۆ بەقسەی حکومەت شاری خانە چۆڵ کرا کە زۆربەی زۆری ماڵەکان لە خانێ بارییان کرد وە وچوونە بۆ دەوروبەری خانێ • ئۆتۆمبێلی زۆری ئێرانی دەبینن وە دەچنە خانە کە خۆی ئامادە دەکات لە حاجی ئومەرانەوە هێرش بباتە سەرعێراق •

چوارشەممە ٢٩ ی تیر بەرانبەر ٢٠ تەمموز

دوێنێ شەوی لە سەعات ٨،٥ یەک ربعجا دەقیقە ئێران تەقەی دەستی پێ کرد وە بۆ سەر حاجی ئومەران — رایات — ئازادی وە دەربەند وە پێشمەرگەکانمان لە هەمرد ولای جادەکە لەگەڵ عەسکەر پاسداری ئێرانی چوونەتە بۆ سەر جادە وەچەند ربیەیان لە عەسکەری ئێران ستاندووە وە ئەمڕۆش هەر شەڕ بەردەوامە؛ فڕۆکەی عێراق ناوچەی خانەیان بۆمبە باران دەکرد ؟

پێنج شەممە ٣٠ ی تیر بەرانبەر ٢١ تەمموز

ئەمڕۆ لە مقەری لە سیلوێ بووم • شەڕی ئێران وعێراق لەبەرەی حاجی ئومەران کە لە شەوی پێش تر دەستی پێ کرد بوو هەر دەڕەوی هەیە • فڕۆکەی شەڕکەری عێراق نزیک گوندی بەرمکانیان وە نزیک گوندی خالداریان بۆمبە باران کرد کە لە خالدار دوو کەسی ئێرانی بریندار بوونە ؟

جومعە ٣١ ی تیر بەرانبەر ٢٢ تەمموز

ئەمڕۆ لە مقەری لە سیلوێ بووم • شەڕی عێراق و ئێران هەر دەڕەوی هەیە لەبەرەی حاجی ئومەران کە حاجی ئومەرانی لە ئاپلوقە دایە • ئێواری هێرشیان بردە سەر عەسکەری عێراق کە لە ئەنجامیدا حاجی ئومەران و ئازادی و رایەت وپاشکراوی کەوتە دەست عەسکەری ئێران و پێشمەرگەکانی ئێمە کە سەرکەوتنێکی زۆر گەورەیە •

شەممە ١ ی مورداد بەرانبەر ٢٣ تەمموز

ئەمڕۆ لە مقەری لە سیلوێ بووم • پاش نیوەڕۆ لەگەڵ سالح عارس بە ئۆتۆمبێلی مام عومەر چووینە شیناوی لای مەسعود بارزانی وە لە پاشان گەڕاینەوە بۆ مقەری • ئێران سەرکەوتنەکانی بە خۆشییەوە لە راد یو بڵاو دەکردەوە • مەسعود بارزانی دوێنێ لە شنۆوە هاتۆتە خانێ • ١٠ ـ دەستنووسی بیرخانی حاجی بیرخان

یادداشتەکانی ١٣٦٢ خورشیدی — JULY

Mon. 25 — Sat. 23

[illegible]

Sun. 24

[illegible]

یەکشەممە ٢ ی مورداد بەرانبەر ٢٤ تەمموز

ئەمڕۆ بەیانی زوو سەعات ٥،٦ ی بەر لەبەیانی مەسعود بارزانی لە شیناوی هاتە لای ئێمە مقەرەکەمان وە بۆ نیوەڕۆ لە سیلوێ مایەوە، تا ئێواری رۆژ ئاوا لە سیلوێ بوو پاشان گەڕایەوە بۆ شیناوی • شەڕی ئێران و عێراق لەناوچەی دەربەند و ئازادی وە ناوچەی شەڕ کە لێیەتی هەر بەردەوامە •

[illegible]

چهارشنبه ١٨ خرداد ٢٦ شعبان Wed. 8 June

[illegible]

هەروەها حەسو زازوکی لە کۆبەندی رووداوەکانی مانگی خورداد وا تە بەشێکی مانگەکانی مایس وحوزەیراندا؛ هێشتا لە کونە مشکێ دەشتی وەزنێی لای سەرد هشت بوە ، نوسیوێتی :

ئەم مانگەی رابردو ئەم شتانەی خوارەوە تێدا روداون :

١) تورتی ئیمە لە جبهەی ئالوتان زیاد کرد بە نیازی حەرکەت کردن بو داخلی عیراق وە لەناوبردنی تورتی جلال لەناوچەی

٢) هەمیەتێك لە دەولەتانی خلیج فارس پێك هات وە کەوتە هاتوچوکردن لە بەینی عیراق و ئێران بە دوزینەوەی ریگا یەك بو هاتوچوکردنی کشتی تجارەت لە اوی خلیج فارس وە هەولدانی بـــــــو راوەستاندنی شەری عیراق و ئیران .

٣) بەهۆی نیشتمان (جود) یانی پارتی دیموکراتی کوردستانی عیراق ، حزبی شیوعی عیراق وحزبی سوسیالیستی کوردستان عیراق و پارتی سوسیالیستی کورد قراریان داشەری مان ونەمان لەگـــەل جلال و تاقمەکەی بکەن وە کاك ئید ریس بارزانیان کرد ە قائدی حرکە (مسولی سیاسی) وە کـــاك مسعود بارزانی کرایە قائدی عام بزوتنەوەی کورد .

٤) حیزبی شیوعی عیراق و حیزبی سوسیالیستی کورد ستان عیراق بە جوداگانی بیانیان لەسەر تاقمی جەلال ( یەکێتی نیشتمان ) دەرکرد وە خیانەت و جاشەتیان بە پالدا ( لە اداعەی پارتـــــــی خوێند رایەوە ) ٠
٥) جەیشی تورکیەی ١٥ کیلومیتر داخلی خاکی عیراقی بو لە کورد ستان عیراق بو سەرکوتکرد نـــــی بزوتنەوەی کورد لە عیراقی لەسەر رەزامەندی دەولەتی عیراق ٠
٦) دو پێشمەرگە لەمقەری من خیانەتیان کرد و التحاقیان بە دوژمن کرد ٠
٧) کەمینەك لەلای تاقمی تاسلوی دانراوە بو قوەتی ئیمە لە خانەی ٧ شەهید و ٨ بریندارمان دان٠
٨) دەولەتی ئیران بە رێگای سەردەشت و قەلادزێ حەرەکەتی کرد گەشتە سنووری عراق و تاقمی تاسلوی شکاند ٠

ئەم مانگە رابردو ئەم شتانەی خوارەوەی تیدا روداون :ـ
① قوەتی ئیمە لە ... زیاد کرد بە ... لە داخلی عراق ... قوەتی جەلال لە ...

Note

[illegible]

لە قوەتی ئیمە لە خانەکان ۷ شەهید و ۸ بریندارمان دان
⑧ دەولەتی ئێران بە رێگای سەردەشت و قەلادزێ حەرەکەی کرد گەشتە سنووری عراق وە تاقمی تاسلوی شکاند.

بەهوی‌یە ئید ریس و مەسعود کە بونەتە فەرماندە و سەرگەورەی جاشەکانی جود و جاشەکانی جود یش هاوڕێ لەگەڵ هێزەکەی ئێراندا بوسەر حاجی ئومەران کەوتنە رێ بەرەو ناوچەکانی سنور ٠ ئید ریس چەند بن نەفەر پاسدار و نەفەر و دەرەجەدار و سەربازی لەگەڵ هێزی جاشەکانی جود ناردە دەبوی کورد ستانی عیراق و ..

١٥ ـ دەستنووسی حەمە زاوری
یادداشتەکانی ١٣٦٢ خورشیدی

لەناو ئەمەشدا بارەگایەکی تایبەتییان بۆ دانابوو کە کابرایەکی بارزانی بەناوی ئەیوب سەعید سەرپەرشتی ئەیانی -
ئەکردن ، ئەمە جگە لەوانەی کە لەبەرسڤاوی جیهازی بیتەل بوون باخود لەگەڵ تاقم ودەستەکانی سەرشاخ
چوبون بۆ کێشانی نەخشەی ناوچەکە ،
هەموو پاسدار و ئەفسەر و سەربازی ئێرانی لەگەڵ هێزەکانی حزدا هەڵبەتە هەندێ پرسیار و گلەیی و
نارەزایی لەناو هەندێکیاندا دروست کردوە ، بەتایبەتی لەلای چەکدارە سادەکان ، بۆیە لەلای هەندێک
ئاشکرایان کردووە وشاردویانەتەوە و لە هەندێ شوێنی تر بەناچاری باسیان کردوە :
لە بروسکەیەکدا کە جیهازی ( سەقین ) واتە بیتەلەکەی مەلا محمد ، کوێرەی لەبەرسڤاوی لقی ٢ ی تیادە و
موخەتە بۆ جیهازی ( باران ) واتە بیتەلەکەی حەسۆ میرخان دۆڵەمەری ناردوە لە راستی هاتنی ٢پاسدار
ئەپرسێ ، حەسۆ دۆڵەمەریش لە وەڵامدا ئەڵێ راستە هاتون وە ئەمەش دەقی بروسکەکەیە :

بۆ سەقین

لە باران

کاکە راستە هاتون بەلام بۆ چەند رۆژێک رصدی طوپەن ، بۆ ئاگاداری ،

بۆ / سەقین

لە / باران

کاکە راستە هاتون بەلام بۆ چەند رۆژێک رصدی طوپەن بۆ ئاگاداری

هەر لەم بارەیەوە ئەیوب سەعید لە ٢٩/ ٨/ ٨٣ دا نامەیەکی بۆ حەسۆ دولەمەری نوسیوە کەوا دەقەکەی
ئەنوسینەوە :

بۆ هەڤاڵ حەسو میرخان

سلاوێکی شۆرشگێرانە

داوا لە خوادی گەورە دەکەین کە هەر سەرکەوتو بن لەسەر دوژمن ، جماعتی حزب شیوعی برایەکیان نوسیوە
دەربارەی سربازەکانی ئێرانی گوتەیان داوا لە حزبی پارتی دیموکراتە کرد بێتمان دەریان بکە لە منطقە و
ئەوانیش دەریان نەکرد بە تایە ئەو برانە بەد بێ بان نە وڵام بە یلە ئیمە بیمان وتوە لا سلکی راو ستاوە ئیمەش
ئاگاش ولام ولام
براتان / ئەیوب سەعید

هەمان ئەیوب سەعید نامەیەکی بۆ حەسو نوسیوە دەربارەی ئەمینتنی هەمو پاسدارەکان بۆ لای ئەو کە ئەمە
دەقی نامەکەیەتی :

برای بەرێز حسو میرخان

سلاوێکی شورش گێرانە

داوا لە خودای گەورە ئەکەین هەمو سەرکەوتوبن بەسەر دوژمن ئەو بانی وعلی نارت تان بو لامان هەمیجیان لەبەرە
نیەنە دیار نیەنە لە دوێنی ئەو سعات ١٠ دیار نیەنە هەستریان لەبەرو بەخویان لەبرە نیەنە ، ئەوەمان و طعاطە
وخیار هێزبو بوتان رەوانەمان کرد وە دەبونی رونتم بو تا ئفلك هەندك شتم کری ارد و رون وشکر ، بەسەرام
پاسدارەکان هەمویان هاتن بولای ئیمە حتی پاسدارکانی ملا محمد ئوانیش هاتن بولای ئیمە وبقر بویسان
کرد نەوە و ئەمزانم بی دان ،
لیتر بەخواتمان ئەسپێرم
براتان / ئەیوب سەعید ٣١/ ٨

جگە لەم چەند نامەیە ، دوای ئەوەی کە وەزعی جاشەکانی جوەد بەرەو شکان و خراپ بون ئەرۆیشت لەژێر
گوشاری هێزی پێشمەرگەدا تەنگاوتر ئەبون ، بۆیە بەهیتا بەهیتا بە بروسکە لەلایەن لیژنەی عەسکەری جود و لە
لایەن ئەفەرماندەکانی تیادەوە داوای هاتنی ئیدریس بۆ سەرکردایەتی جەبهەکە و هاتنی هێزێکی زۆرتر ئەکرا
تا بتوانن خۆیان رابگرن و لەو شوێنانەدا بمێننەوە ، ئیدریسیش ٣٠ جاشی تیادە و ٢٠ سەرباز و دەرەجەدار
تر بەهانایانەوە ئەنێرێ و حەسۆ زازۆکی لەم بارەیەوە لە یادداشتەکانی دا نوسیویەتی :
جمعە ٤ ی شەهریوەر بەرانبەر ٢٦ ی ئاب
ئێواران تا دەرەنگ دەمچوینە کەمین وە بۆ خەوتنی دەگەرامەوە بۆ بن بەردەکەی جوم زۆر دەرەنگیش دەخەوتم
بەلام زۆر زویش هەلدەستامەوە چونکە جەبهە بۆ جەبهەکەمان نە حالاتی دیفاع بو ئەمە لە حالاتی هجوم

١٨ ـ دەستنووسی حسو زازۆکی
یادداشتەکانی ١٣٢٢ خورشیدی

Fri. 26 August

Note

هەم هەمەلە کەوتبووە ناو پێشمەرگەی ئەو دەمەکوت هات و ئەو دەمەکوت ئیمە سەرناکەوین علی کل زووەی. زۆری ئیمە شەهارمان کرد بۆ بەلام لەگەڵ ئەوەشدا من زۆرم خۆشی دەکردەوە .وە بە برادەرانم دەگوت : ئەمانە هیچ نین خۆیان لەبەر ئیمە ناگرن وەچی جیگای بەزەحمەت بووا تووتەکەم دەبردەوی بۆ ئەوەی مەعنەویەتی لەشکەر بەرز بێتەوە لەرووش وەکو هەموو رۆژان زۆ هەستامەوە چووم دەست و نوێژم هەڵگرت و نوێژم کرد گەڕامەوە چاسان چاک کرد حسو دولەمەری جیرانمان بۆ بانگی لای خۆم کرد نانی بەیانیمان خوارد دیتم برادەرەکی شەری دارزازی شل وشل چاوتەنشووراوی دەعارقی رەش فرمێسکی هاتە لابان گوتی :

تووتەکی ٣٠ کەسی وا لە ڕیگا دی و نزیکەی ١٠ سەرباز و دوو برجەدار و ئەفسەرێکی ئیرانی وا لە ڕیگا دەبین لەبەرسان کەوتوونەوە نانی بەرنە پێش دەمنا ناگەنە ئێرە ئێمەش دەست بەجێ ئانمان بۆ رەوانە کردن وا بۆ هاتن

شەمە ٥ی شەهرپور بەرانبەر ٢٧ ی ئاب

وا بۆ ئیواری لەگەڵ جماعەتی چوومە کەمینی تا نزیکی سەعات ١٢ بوو کە گەڕامەوە زۆ خەوتم .بەیانی هەستامەوە لە سەعات ٥ جماعەت لەکەمینی گەڕانەوە من و دوو کەسیتر لەکەمین ئەوین چاین بۆ چاک کرد .

٢٠

